




ژیانی ئەمیری باوەڕداران

خەلیفەی پێنجەم

# حەسەنی کوڕی عەلی

(خوا لێیان ڕازی بێت)

نووسینی

د. علي محمد الصلابي

وەرگێڕانی

عبدالله فاضل گەرمیانی

نارین

دار المعرفة
بەیروت

## ژیانی ئەمیری باوەڕداران

## خەلیفەی پێنجەم

# حەسەنی کوڕی عەلی

(خوا لێیان رازی بێت)


نووسینی

د. علي محمد الصلابي

وەرگێڕانی

عبداللە فاضل گەرمیانی



پێداچوونەوەی

لێژنەیەك لە کتێبخانەی نارین



# پێناسی کتێب




ناوی کتێب: ژیانی ئەمیری باوەڕداران
خەلیفەی پێنجەم
حەسەنی کوڕی عەلی
(خوا لێیان رازی بێت)

نووسینی: د. علي محمد الصلابي

وەرگێڕانی: عبدالله فاضل گەرمیانی

پێداچوونەوەی: لێژنەیەك لە کتێبخانەی نارین

دیزاین : نورالدين عبدالله (چاپخانەی گوڵ)

چاپ: یەکەم - بەیروت. 2008 ز/1429 هـ






کتێبخانەی نارین

هەولێر – چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید – بازاڕی زانست بۆ کتێب وچاپەمەنی

تەلەفۆن : 2511982-66(00964)

ئیمەیل: nareen_1@yahoo.com

# پێشەکی

## بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

بەو پێیەی خوێندنەوەی مێژوو مەبەست لێ ی شارەزابونە بەڕوداوەکانی ڕابردوو لەپێناو پەند وەرگرتنی بۆ ئێستاو بەرچاو ڕوونی بۆ داهاتوە، ئەوە لە هەنگاوناغان بۆ ناسینەوەی باس و کارەسات و ڕوداوەکانی گرنگی زۆری هەیە بەو مەرجەی بەر چاو ڕونیەکی کرداری بێت لە ژیانماندا و ئاوێنەو تەرازووی پێوانەکردنی کارو هەڵس وکەوتەکانمان بێت و سنوری قسەی سەر زارەکی تێپەڕێنێ و لە مەیدانی کاردا شوێنەواری هەبێت و ژیانمان بەجوانیەکانی بڕازێنینەوە، بەتایبەتی بۆ ئێمەیەك کە هەڵگری ناسنامەی موسڵمانیەتین و خۆمان بە موسڵمانێتی ناساندووە، سەرباری ئەوەی حەقیقەت و ناوەڕۆکی ئاینەکەمان کردارین زیاتر لەوەی قسە بێت، قسەو وتنیش زۆر جار بۆ ناساندنی ئەو کارە جوانانەیە بەوەی هەڵقولاوی ئەو ئاینەیە کە بۆ کاری جوان و دروستکردنی شارستانیەتێکی مرۆڤیانە هەنگاومان پێ هەڵدەگرێ.

مێژووی کەسە هەڵکەوتەکانی ئەم ئومەتە زۆرێك ڕوبەڕووی شێواندنی و لە بیرکردن بۆتەوە، ئەو دەنگانەش کەمن کە پێنسوسی بوارەکەیان پێیەو زەڕەنگەر ئاساکا دوعای ڕەسەن و نا ڕەسەن لێك جیا دەکەنەوە، ئازاری ئەو بێ سەرو بەری و بێ ئینسافیەی لە خوێندنی ئەکادیمیادا ئەکرێ دەردی زۆر خستۆتە دڵ و دەرونی تامەزرۆیانی بواری مێژوو هەروەها خوێندکارانی مێژوو کە لە زانکۆکاندا لە بێ سەرچاوەیی ونەشیارەزا بوون لە زمانی عەرەبیدا بیرو مێشکیان دەیا ن و سەدان پرسیاری تەمو مژاوی تەنیوێتی و بەئازاری ئەو چەند لاپەرەیە ئەتلێتەوە کە پڕ بەقسە و مەبەستی ژەهراوی و بێ بنەما لەبەرگی لێکۆلینەوەدا دەخرێتە بەردەست و لە ڕاستی بابەتەکەو لەهەندێ حاڵەتدا تووشی شۆك ئەبێ !

مێژوو کەسایەتی ئیمام حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) وەکو پێویست لە نێو موسڵمانانیدا وونە، کارە گرینگەکانی سەردەمی خیلافەتەکەی باسی لێوە ناکرێ و گرنگ نازانرێ، وەهاش خۆمان پیشان ئەدەین کە ئەو پیاوە گەورانە پێشەوای ئێمەن و چاویان لێ دەکەین، بەلام حەقیقەتی کارەکانمان پێمان ئەڵێنن بەهەر هەنگاوێك هەڵیدەگرین هەنگاوێك لەو پیاوانە دوور دەکەوینەوە!، ئەو کارە دەگمەن و زۆر جوانانەی دکتۆر (علی محمد محمد الصلابی) پێ ی هەڵساوە هێنادی ئاواتە گەورەکەی (طبري) مێژوو نوس و

شەرعناس، دوای چەندین سەدە خەونێکی (طبري) دێتەدی (طبري) لە نوسینەوەی مێژووەکەیدا ئەڵێ ئێمە وەکو ئەمانەتێك و بۆ دەوڵەمەندکردنی مێژووی ئەم ئوممەتە هەموو ڕاست و درۆیەکمان تۆمار کردووە بەناساندنی کەسە گێڕەرەوەکانیشەوە، بەڕاستی جوانی پێکاوە ئەوەیە ئەرکی مێژوو نوسی هەر وەکو دکتۆر (صلابي) لێ ی نزیك بۆتەوە و بەبەڵگەوە وەڵامی ئەو هەمو درۆیەی داوەتەوە کە کەسێکی ئەکادیمی لە نێوەندە ئەکادیمیەکاندا ئەیفرۆشێ و ! ئەو موسڵمانە هەژارەش کە هەر ئەڵێ ئاساییە موسڵمان هەڵەدەکات وەکو پاساوی کرداری ناشیرین بدات!

ئومێدو ئاواتی (طبري) و مێژوو نوسانی تریش پوختکردنەوەی ئەو مێژووەیە کە ئەوان کۆیانکردۆتەوە، صەلابیش پێچەوانەی ئەوانی تر کە بۆیان پوختناکرێ و خوڵ و خاشاکی تریشی دەخەنە سەر هاتووەمێژوونوسانەو دەستپاکانە حسن و ڕووداوەکانی سەردەمی بەکەسە کاریگەرەکانیشەوە تاوتوێبکات و بەوەی ئێمە لە ژیانماندا باوەرمان پێ ی هەبێ لە قورئان و سوننەت و خەلیفە ڕاشیدیەکان و زانا پایە بەرزەکانەوە لە مەسەلەکان بۆ ئەوەو ژیانی ئەو پێشەوا پایەبەرزەی لە نێوچون و تەمو مژاوی ڕزگار بکات و خزمەتێکی زانستیانە بکات ـ خوا پاداشتی بداتەوە ـ.

گرنگی ئەو پێشەوا پایەبەرزەو کەمی سەرچاوەکان و بەتایبەت لە کتێبخانەی کوردیدا و تامەزرۆیی ئەو خوێندکارانەی دەمناسین و لە بارەیەوە دەیانپرسی و تامەزرۆی ناسینی پێشەوا حسن بوون(رضي الله عنه) پاڵنەرێکی بەهێز بوون تاوەکو بەشانازیەوە بۆ وەرگێڕان کتێبە عەرەبیەکەی لە کتێبخانەی (نارین) وەربگرین، بەو هیوایەی پڕکردنەوەی کەلێنەکان بێت و خزمەتی نەوە تامەزرۆ کەمان بێت، خوای گەورەش ئەم کارەمان قبوڵ بکات و لە خۆمان و باوك و دایك و هاوسەر و دۆستانمان ڕەحم بفەرموێ و بۆ هەنگاوی ساڵحانە ڕێنیشاندەرمان بێت، بەئومێدی دوعاتان.

| عبدالله فاضل- گەرمیانی | ڕزگاری (صمود) |
|---|---|
| ١٤ /١٤٢٩/٥ك | ١٩ /٢٠٠٨/٥ز |

# جێ باسی یەکەم

## حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبوتالێب لەساڵی لە دایك بوونیەوە تاکاتی جێ نشینیەکەی.

# باسی یەکەم

## ناو و ڕەچەڵەکی نازناوی(کونیەکەی)، خەسڵەت و بنەماڵەکەی لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ).

### یەکەم: ناوو ڕەچەڵەك و نازناوەکەی (کونیە):

باوکی محمد حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تالێبی کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشمی کوڕی عبد منافی هاشمی قوڕەیشیە[1] لە مەدینە شەهید بووە[2] کچە زاو ڕەیحانەی دونیای پێغەمبەری خواو پێشەنگی لاوانی بەهەشتە، کوڕی خاتوو فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوایە، باوکی ئەمیری ئیمانداران علی و(ﷺ)نەوەی خدیجەی دایکی موسڵمانان، پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدینە.

### دووەم: لە دایکبوون و ناو لێنان و نازناوی تێگەیشتنی پێغەمبەر لە ناو نانی منداڵاندا:

بە پێ ی ڕیوایەتێکی صحیح لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی سێ یەمی کۆچی لەدایك بووە، ووتراوە لە شعبان، ووتراوە دوای شعبان لە دایك بووە، لە لیثی کوڕی سعد ڕیوایەتکراوە دەڵێ: فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ)لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی سێ یەمی کۆچی حەسەنی بوو. حسین لە چواری کۆچی شەوە کانی دوای شعبان هاتە دونیاوە.[3]

---

١ ـ سیر أعلام النبلاء(٣/٢٤٦).

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ نسب قريش (١/٢٣) الدوحة النبوية، لا ٧١.

بەرقی ئەحمەدی کوڕی عبداللە کوڕی عبدالرحیم دەڵێ: حسن لەنیوەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی سێ یەمی کۆچی لە دایك بوو[١]، (إبن سعد) لە (طبقات)ە کەیدا هەروەها دەڵێ.[٢]

علی(رضي الله عنه) دەڵێ: کاتێك حسن هاتە ڕوی دنیا ناوم لێ نا(حرب)، پێغەمبەر(ﷺ) هات و فەرمووی: (کوڕە شیرینەکەم نیشاندەن چ ناوێکتان لێناوە ؟) ووتمان: ناومانناوە (حرب) فەرمووی: نەخێر ناوی حەسەنە، کاتێك حسین لە دایك بوو ناوم نا(حرب) پێغەمبەر(ﷺ) هات و فەرمووی: چ ناوێکتان لێناوە؟ ووتمان (حرب) فەرمووی: ناوی حسینە، بە هەمان شێوە کوڕی سێ یەمم ناو نا(حرب) پێغەمبەر(ﷺ)ناوی نا محسن، پاشان فەرمووی: من وەك کوڕەکانی هارون ناوم نان(شبر و شبیر و مشبّر)،[٣] پێغەمبەر(ﷺ)بەم نەوە نوێیەی زۆر دڵشاد و کامەران بوو، خەڵك لە هەموو لایەکەوە ڕویان لە دایك و باوکی دەکرد بۆ دەربڕینی پیرۆز بایی و خۆشحاڵی خۆیان، پێشینە دڵپاکەکان پێشبڕکێیان دەکرد لە بلاوکردنەوەی هەواڵی لەدایك بوونی ئەم منداڵە نوێ یە لە نێو خزم و خوێشدا. حەسەنی بەسرِی دوعایەکی هەیە لەکاتی لە دایك بونی منداڵدا دەیفەرموو: (بُركَ في الموهوب و شكرت الواهب ورزقت برّه وبلغ أشده). لێرەشدا دەردەکەوێت و تێبینی دەکرێت کاتێك پێغەمبەر خودا(ﷺ) حسن و حسینی ناونان هەموو ئەو ناوانەی پێش ئیسلامی ڕەتکردەوە کە بۆنی کوشتن و خوێن ڕێژیان لێ دێت و شیرنترین و ناسکترین و پڕ ماناترین ناوی بۆ هەڵبژاردن.[٤]

حسن لە نێو خەڵك بەگەورە (سید) ناو براوە، ئەم نازناوەش پێغەمبەر (ﷺ) بۆی داناوە، هەر وەك لە فەرموودەیەکی صەحیح دا هاتووە: ((إن ابني هذا سيد ولعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين))[٥]، واتە: (کوڕە شیرنەکەم سیدە ئومێدم وایە خوا

١ ـ الذرية الطاهرة للدولابي، لا ٦٩.

٢ ـ الطبقات(١/ ٢٢٦٥).

٣ ـ مسند أحمد(١١٨/٩٨/١) صحيح إبن حبان(١٥/ ٤١٠) إسناد الحديث صحيح.

٤ ـ الحسن بن علي ودوره السياسي، فتيخان كردى، لا ١٦.

٥ ـ البخاري (٣٠٦/٢).

ئاشتەوایی نێوان دووکۆمەڵەی موسڵمانان پێ بکا) لەم دیاریەی پێغەمبەر(ﷺ) وانەیەکی بایەخدار و پڕ بەها لە ژیانماندا فێر دەبین، ئەویش پێداگرتنە لەسەر هەڵبژاردن و دیاری کردنی جوانترین ناو بۆ ڕۆڵەکانمان. ئەوەش بە پلە یەك ئاڕاستەی دایك و باوك دەکرێت، لە هەڵبژاردنی ناوێکی جوان لە ماناو دەربڕیندا لە چوار چێوەی شەرعی و زمانی عەرەبی دا، ناوەکە دەبێت: جوان بێت، شیرین بێت لەسەر زمان، نەرم و خۆش بێت بۆ گوێ، هەڵگری واتایەکی پیرۆز و بەڕێزبێت، ڕاستگۆیی لێ بەدیبکرێت، دووربێت لەو شتانەی شەریعەت هێمای یاساغ و نا پەسندی خستۆتە سەر، وەك: ئەو ناوانەی خەوش و گەردی وێکچون و واتای سستی و خاویان بۆ دابڕاوە. لێرەدا دەردەکەوێت باوکی موسڵمان دوای ئەوەی ناوێك بۆ ڕۆڵەکەی دیاری دەکات، دەبێت دڵنیا بێت لە دروستی ووشە و واتاکەی لەسەر زانیاری و هۆشیاری و پەی پێبردن.

ڕاوێژ بەکەسی شارەزابکات لە ڕووی دروستی و نادووستی یەوە، ئەمە زۆر ساغ و تۆکمە ترە، ئەو وتەیەش کە زۆربڵاوە: مافی ڕۆڵە لەسەر باوك ئەوەیە دایکی ڕێزداری بۆ هەڵبژێرێ، ناوێکی شیرن و جوانی بۆ هەڵبژێرێ و خورەوشتێکی باشی بۆ بە جێبێڵێ.

زانایان ڕونیان کردۆتەوە ناوە مەشرعەکان پلەو شوێنی خۆیان هەیە، زۆر خێرە، بەم شێوازەی خوارەوە.

١- سونەتە منداڵ ناو بنێ بەم دووناوە: (عبدالله و عبدالرحمن) کە خۆشەویسترین ناون لە لای خوای پەروەردگار، هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە، هەروەکو لەفەرموودەدا بەو جۆرە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) چەسپاوە ئەو ناوانەیە واتای بەندایەتی تۆخ دەکەنەوە لە ناوە کانی تر جیاوازترەو ڕاسترین گوزارشت بۆ کرۆکی بەندایەتی مرۆڤ و هەژاری و کزۆڵی بۆ خودا پێشان دەدەن. لە عبدالله کوڕی عمر ڕیوایەتکراوە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((إنَّ أحب أسمائكم إلى الله: عبدالله و عبد الرحمن))[1]، واتە: (خۆشەویسترین ناو لای پەروەردگار: عبدالله و عبدالرحمنن) ئەمەش لەبەر ئەوەی گشتگیری بەسەر واتاو خەسڵەتەکانی بەندایەتیدا هەیە. خوای پەروەردگار لە قورئان بەندایەتی تایبەت کردوە بەم

١ ـ مسلم رقم: ٢١٣٢.

دووناوە، جگە لە هەموو ناوە جوانەکانی تری خۆی و دەفەرمووێ: ﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَداً﴾ [الجن: ١٩] هەروەها خوای گەورەلەئایەتێکی تر فەرموویەتی: ﴿وَعِبادُالرّحمنِ الَذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأرضِ هَوناً وَ إذا خاطَبَهُمُ الجهِلُونَ قالُواْسَلماً﴾ [الفرقان: ٦٣]

لە ئایەتێکی تر هەردوو ناوی کۆکردووەتەوەو دەفەرمووێ: ﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيّاً مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى﴾ [الإسراء: ١١٠].

پێغەمبەر (ﷺ)کوڕی مامی خۆی عباس ناو نابوو: عبدالله و لە نێو یاوەرانیش سێ سەد کەس ناویان عبدالله بوو. یەکەم کۆرپەی (موهاجیرین)کۆچەرەکان دوای کۆچکردنیان بۆ مەدینە، ئەم ناوەیان لێنا عبدالله کوڕی زوبێر بوو.[١]

٢- ناو نان بە ناوی پەیامبەر و پێغەمبەرەکان: چونکە ئەوان گەورەی هەموو ئادەمی زادەکانن و، بەرێزترین ئاکارو ڕەوشتیان هەیە و ، کردارەکانیان لە چلە پۆپەی پاکی دایە، ناونانی منداڵ بە ناوی ئەوان یاد کردنەوەی خەسڵەت و ڕەوشت و حاڵ و باری ئەوانە زانایانیش یەکدەنگن لەسەر دروستی ناونانی منداڵ بە ناوی پێغەمبەران، بۆ ئێمەش پێغەمبەر محمد (ﷺ) سەرمەشقە و کوڕەکەی خۆی ناوناوە ئیبراهیم. لە باشترین ناوەکانی پێغەمبەرانیش پێشەواو پێغەمبەری ئێمەیە محمدی کوڕی عبدالله (ﷺ) لە ئەو و برا پێغەمبەرەکانی بە گشتی.[٢]

٣- ناونان بە ناوی پیاو چاکانی موسڵمانان و، یاوەرانی پێغەمبەر تا ڕۆژی زیندووبونەوە، هاوەڵانی پێغەمبەریش(ﷺ) تێڕامانێکی دڵگیر و وردیان بۆ ئەم باسە هەبوو، ئەوەتا زوبێری کوڕی عەوام هەر نۆ ڕۆڵەکەی خۆی بە ناوی هەندێك لە شەهیدانی بەدر ناونان، کە ناویان: عبدوالله و، المنذر، عروة، حمزة، جعفر، مُصعب، عُبيد، خاليد.

٤- پاشان ئەو ناوانە دێن کەڕاستگۆیی لە مرۆڤ بەرجەستە دەکەن: بەمەرج و ئادابەکانی، ناوی کۆرپەلە سیفەتێکی شەرعی وەردەگرێ هەرکاتێ مەرجەکانی تێدا ڕەخسان، هەندێك لە مەرجەکانی ئەمانەن: گونجانی مەبناو ماناکەیە لە زاراوە شەرعی و

---

١ ـ تسمية المولود، بكر عبدالله أبو زيد٣٣.

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

زمانەوانیدا، بەمەش هەموو ناوە یاساغ یان ناپەسندەکان جیا دەکرێن چ لەڕووی ڕواڵەت یان مانا یان هەردووولاوە. گەرچی لە یاسای عەرەبی وا باوە ناونان بەهەرچی کە مانای تەزکیەی لێ بەدیبکرێت، یان لەو ناوانەی نا پەسەندو جنێو ئامێزن، بەڵام دەبێت ناو ڕاست و ڕەوایی ببەخشێت[1]، هەروەك پێغەمبەر بەم کارە هەستاوە.

شەریعەتی ئیسلام ناونانی منداڵ بە هەر یەك لەم ڕوانگانەی خوارەوە قەدەغە کردوە:

١- هەموو موسڵمانەکان کۆڕان لە حەرامی هەر ناوێکی پەرستراو لە جیاتی خوا وەك عبدالرسول، عبدالنبی، عبد علی، عبدالحسین، عبدالامیر، ـ واتە فەرمان ڕەوای بڕواداری علی کوڕی أبوتالیب (ﷺ)، عبدالصاحب هەموو بەدیهێنراوێك(مخلوقێك) هەرچەند لە پلەو پایە یەکی بەرزبێش دابێت بەندەگەلێکی مل کەچ و زەبوون و هەژارن بەرامبەر بەخوا. هەر خۆی(الله) بە تەنها شیاوی پەرستشە، بۆیە نابێت بەهیچ پەرستنێکی جگەلە خواناوی بەندەکان بنرێت عبودیەت بنرێتە پاڵ ئەوان.

٢- ناونان بە ناوی منداڵی بێگانەی کافرەکان کەتایبەت بەوانەو، موسڵمانی دڵنیا بە ئاینی خۆی لەم جۆرە ناوانە دوور دەکەوێتەوە و بەهیچ شێوەیەك ڕوویان لێ ناکاتەوە، بە داخەوە ئەم تەنگەژەیە لە چاخی ئێمەدا پەرەی سەندووە، ناوی کافر لە ئەوروپاو ئەمریکاو دەوڵەتانی تر هەڵدەگرێت، ئەمەش لە بەهێزترین پێگە کانی تاوان و هۆکارەکانی دابڕان و خەجاڵەتباریە بۆنمونە: بطرس، جرجس، جۆرج، دیانا...هتد.

ئەم لاسایی کردنەوەی بێباوەڕانیش لە ناونانی منداڵان بەناوی ئەوان، ئارەزو بازی و گێلیەتی بێت، ئەوە گوناهو تاوانێکی گەورەیە[2] شێخ بکری کوڕی عبدولا ئەبو لەکتێبەکەیدا (تسمیە المولود) بە پوختی باسیکردووەو هەر کەسێك زیاترو فراوانتری ئەوێ بابگەڕیتەوە بۆی.[3]

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٣٩.

٢ ـ تسمية المولود، بكر بن عبدالله بن زيد، لا٤٧.

٣ ـ تسمية المولود، بكر بن عبدالله بن زيد، لا ٤٧.

سێ یەم: بانگ دانی پێغەمبەر بە گوێچکەکانی حسندا

کاتێك حسن لەدایك بوو پێغەمبەر(ﷺ)لە هەردوو گوێچکە کانیدا بانگی دا، هەروەك لە ئەبو رافیع[1] ڕیوایەتکراوە.

دەهلەوی دەڵێ: حیکمەت لەبانگدان ئەوەیە:

١- بانگ لە دروشمەکانی ئیسلامە.

٢- ڕاگەیاندنی ئاینی ئسلامە.

٣- پێویستە منداڵەکە تایبەت بکرێ بە بانگ دان لە گوێچکەکانیدا.

٤- یەکێك لە تایبەتیەکانی بانگ، هەڵهاتن و ڕاکردنی شەیتانە لەم شوێنە، چونکە شەیتان ئەزیەتی منداڵ دەدات لە سەرەتای گەشە کردنی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:((مَامِنْ مولود يولد الآ والشيطان يمسُه فيستهِل صار خاً منْ مسِ الشَيطان[2] إلاَ مَريَمَ و إبنهـا))[3] واتە: (هەر کۆرپەیەك چاوی بە دونیا هەڵدێنێ، شەیتان دەستی خۆی لێ ئەوەشێنێ و، کۆرپەلە خۆ پیس دەکات و، لە دەستی شەیتان ئەقیژێنێ، تەنیا مەریەم و کورەکەی نەبێت)، لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە: ((إذا نودي للصلاة أدبر الشيطان ولـه خراط حَتى لا يَسْمَعُ التأذين))[4] واتە: (کاتێك بانگ درا بۆ نوێژ شەیتان پشت هەڵدەکاو ئەقرێ بۆ ئەوەی گوێ ی لە بانگ نەبێت).

(إبن القيم)یش (بەڕەحمەت بێ) چەند نهێنیەکی تری بانگدان باسدەکات و دەفەرمووێ:

٥- ئەو ووشە گەلەی بۆ یەکەم جار بە گوێچکەکانی منداڵدا دەچرپێنن. ئەو وشانە بن کە گەورەیی و شکۆداری خوا دەخەنە ڕوو، شایەتومان بێت کە کلیلی هاتنە نێو ئیسلامە، ئەمە وەکو خوو پێ گرتن و فێر کردنی دروشمەکانی ئیسلامە کاتێك دێتە ڕوی

---

١ ـ سنن أبى داود (٥١٠٥) إسناده ضعيف، فيه عاصم بن عبدالله، ضعفه إبن معين وقال البخاري منكر الحديث كما في الكاشف(٢٥٣٠).

٢ ـ حجة الله البالغة (٢/٣٨٥).

٣ ـ البخاری(١٩٦/٥) رقم: ٤٥٤٨.

٤ ـ البخاری (١/١٧٠) رقم: ٦٠٨.

دونیا، هەروەك بە هەمان شێوە کاتێك دونیا بە جێدێڵێ تەلقین دەکرێت بە یەکتا پەرستی.

٦- گەیشتنی کاریگەری بانگ بۆ دڵی کۆرپەلە بە خراپ دا نەنراوە هەرچەند هەستیشی پێنەکات، لەگەڵ ئەوەشدا سودێکی تری هەیە کە بریتیە:

٧- ڕاکردنی شەیتان لە ووشەکانی بانگ، کە هەمیشە خۆی مەلاس داوە بۆ لە دایك بونی کۆرپەیەك، نزیکی ئەو تەنگ و چەڵەمانەی دەکاتەوە، کە خوا نەخشەی بۆ کێشاون، گوێبیستی شەیتانەکەی دەبێت لە لاواز کردن و کینە بەسەردا ڕشتنی لەیەکەم ساتدا کەپێ دەگات.

٨- مانایەکی تر دەردەخات ئەوەش بانگەواز بۆ لای خوا و ئایینەکەی و پەرستنی، کە زۆر لە پێش بانگەوازی شەیتان سەری هەڵداوە هەروەك سروشتی خوا کە مرۆڤەکانی لەسەر بە (فطرة) پەروەردەکرووە پێش گۆڕانکاری و سرتەی شەیتان کەوتووەو لێ ی پاراستوویەتی، ئەمەش یەکێك لە حیکمەتەکانە.[1]

لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) فێر دەبین وا سونەتە بانگ لە گوێچکەی ڕاستی دا بدرێ و قامەتی نوێژیش لە گوێچکەی چەپی دا بدرێ، یەکەم شتێکیش گوێچکەکانی هەستی پێدەکەن بانگەوازە بۆ پایە یێکی تۆکمەدار لە ئایندا ئەوەش لەدوای یەکتاپەرستی خوای پەروەردگار.[2]

## چوارەم: شیرن کردنی مەلاشوی کۆرپەلە:

لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) ڕیوایەتکراوە پێغەمبەر(ﷺ)مندالی هێنراوەتەوە لای، دوعای بۆ کردن و دەم و مەلاشوی شیرین دەکردن[3] کەواتە حسن زۆر لە پێش ترە بۆ دوعا بۆ کردن و شیرن کردنی دەم و مەلاشوی. نەوەوی لەسەر ئەم فەرمودەیەی عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ (فیبرك علیهم) واتە: دوعای بۆ کردن و دەستی

---

١ ـ منهج التربية النبوية للطفل، محمد سويد، نقلاً عن تحفة المودود لإبن القيم ص٥٤، تحقيق فواز أحمد زمرلي.

٢ ـ موسوعة تربية الأجيال المسلمة، نصرالعنقري، ص٦٦.

٣ ـ مسلم (٢٣٧/١) رقم: ٢٨٦.

بەسەردا هێنان، ووشەی (فیحنکهم): زانایانی زمانەوانی دەڵێن: وێنەی خورما یان هەرشتێك لە وێنەی ئەو. لە پاشان دەستپێداهێنان و شیرنکردنی مەلاشوی کۆرپەلە پێ[1]، باش وایە مەلاشو شیرن کردن لەدوای بانگدان بێت ئەگەر گونجا باشتر وایە ئەگەر ڕەخسا پیاو چاکێ بەم کارە هەستێ، خورما بەکار بێنێ ئەگەر دەست کەوت، ئەگەر نا هەر شتێکی شیرین. هۆی ئەمەش ئەوەیە:

١- خورما وەك شیری دایك وایە، هەموو ئەو ڤیتامینانەی لەخۆ گرتووە کە جەستەی منداڵ پێویستی پێەتی.

٢- کۆرپەلە بە هەستی چێژ لە دایك دەبێت، کاتێك خورمای پێدرا ئەم هەستەی بێداردەبێتەوە. و دەم و زمانی دەکەونە جوڵە، هێز و وزەشی زیاتر دەبێت بۆ هەڵمژینی شیری دایك.

٣- گەدە زۆر بەخێرایی شیرەمەنی هەرس دەکات و، شیرنی دان بە کۆرپەلە هیچ مەترسیەك بۆ ڕیخۆڵەکانی دروست ناکات[2]، دکتۆر فاروق مساهل ـ لە گۆڤاری (الأمة القطرية) ژمارە (٥٠) لە بابەتێکی لە ژێر ناونیشانی (گرنگی دانی ئیسلام بە خۆراك پێ دانی منداڵ) لەسەر فەرموودەی مەلاشو شیرن کردن دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بە هەموو پێوەرەکان سەراسیمە(معجزة) یەکی پێغەمبەرایەتیە لە بواری پزیشکیدا، مرۆڤایەتی چواردە سەدەیە دۆشداماوە لە زانینی ئامانج و حیکمەت لەم کارەدا، تاکو پزیشکەکان بۆیان ڕوون بۆوە منداڵە بچوکەکان بە تایبەت تازە لە دایك بوان و شیرە خۆرەکان بەرەنگاری مردن ئەبنەوە، کە ڕێکەوتی یەك لەم دوو کارانە بوون:

- ئەگەر ڕێژەی شەکر لە کاتی برسیبووندا لە نێو خوێندا کەم بوو

- ئەگەر پلەی گەرما لە جەستەیان دابەزی و بەهۆی ڕوبەڕوبونەوەی کەشێکی ساردی دەوروبەریان.[3]

---

١ ـ شرح النووی علی صحيح مسلم.

٢ ـ موسوعة تربية الأجيال المسلمة، ل٦٨٠.

٣ ـ منهج التربية النبوية، ل٦٤.

## پێنجەم: تاشینی قژی حسن (ﷺ):

جعفری کوڕی محمد لە باوکی خۆی ڕیوایەتیکردووە: کە فاتیمە قژی حسن و حسینی لە ڕۆژی حەوتەم تاشی و، کێشی قژەکانی کردن، پاشان هێندەی کێشی تاڵە موەکان زیووی بەخشی[1]، فەرموودەکان لەم بارەوە هەموویان (صحیح)ن بەگشت ڕێگاکانیانەوە[2]، شیخی دەهلەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەسەر ئەم فەرموودەیە دەفەرمویێ: هۆی بەخشینی زیو ئەوەیە کۆرپەلە کاتێك لە شلەوە ئەگواسترێتەوە بۆ جیهانی منداڵی نیعمەتێکە پێویستە سوپاسگوزاری دەر ببڕێت و جوانترین سوپاسی گوزاریش قەرەبوکردنەوەیە... وە تایبەتکردنی زیویش لەبەر ئەوەیە زێڕ گرانە و تەنها دەوڵەمەندەکان دەستیان ئەکەوێت، کەلوپەلەکانی تریش هیچیان هیندە بایەخ دارنین قژی منداڵیان پیێ کێش بکرێت.[3]

## شەشەم: گوێزەبانە(العقیقة)

(إبن عباس)(ﷺ) ڕیوایەتکردووە: پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەریەك لە حسن و حسین بەبەران گوێزەبانەی کردووە[4] لە ڕیوایەتێکی تر دووبەران دووبەران[5].(ئەبو رافیع) ڕیوایەتکردووە حەسەنی کوڕی علی کاتێك لە دایك بوو، دایکی ویستی دووبەرانی بۆ سەر ببڕێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لاتُعقي عنه، و لكن احْلِقي شعر رأسه فتصدقي بوزنه من الورق))، (گوێزەبانەی بۆ مەکە، بەڵام قژی بتاشە و هێندەی کێشی پارە ببەخشە) بۆ لەدایك بونی حسینیش هەروایانکرد[6]، پێغەمبەر لەگۆزەبانە (العقیقة) لای دا بۆ هەندێك ئارامی لەسەر گوێزەبانە نەك وازهێنانی یەکجارەکی. ئەم فەرموودەیەی علی(ﷺ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)گوێزەبانەی بۆ حسن کرد بەبزنێك یان

---

١ ـ الطبقات، الطبقة الخامسة (١/٢٣١)، إسناده مرسل.

٢ ـ موسوعة تربية الأجيال، لا ٧٢٠.

٣ ـ حجة الله البلغة (٢/٣٨٥).

٤ ـ سنن أبي داود في الأضاحي رقم: (٢٨٤١)، إسناده ضعيف.

٥ ـ سنن النسائي(٧/١٦٦) باب: كم يعق عن الجارية، إسناده صحيح.

٦ ـ مسند أحمد (٦/٣٦٦).

مەڕێك، پێغەمبەر(ﷺ) بە فاتیمەی فەرموو: ((یافاطمة احلقي شعر رأسه فتصدقي بوزنه من الفضة)) ئەی فاتیمە قژی بتاشە و کێشی بکە بەزیوو لە پاشان زیوەکە ببەخشە، فاتیمە دەڵێ کێشمانکرد و نزیکەی درهەمێك یان کەمتر دەرچوو.[1]

(إبن عباس) لە ڕیوایەتێکی تردا لە فاتیمە ڕیوایەتیکردووە، کە گوێزەبانەی بۆ(حسن و حسین)کردوە و، دینارێك و ڕانەمەڕێکی بە مامان بەخشیوە، بەم شێوە فاتیمە بەراوردی بەخششی کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) دوو تەگەی لە یەك ڕۆژدا بۆ حسن سەر بڕیووە، سەری تاشیوە و کێشی کردوە دوای بارتەقای کێشی قژی خێری کردوە بەدەستی موبارەکی سەری بۆنخۆشکردوو بۆیەیکرد پاشان فەرمووی: ((یاأسماء، الدم مِنْ فعل الجاهلیة))[2]، واتە: (ئەی ئەسماءە خوێن بۆیەکردن کردەوەی نافامەکان بووە) لە گوێزەبانەی کۆمەڵێ سودت دەست دەکەوێت لەوانە: قوربانی کردنتە بۆ منداڵ لەسەرەتای هاتنی بۆ دونیا و سوپاسگوزاری دەردەبڕیی لەسەر ئەو نازونیعمەتانەی خوای گەورە دایڕژاون بەسەرت دا، جگە لەمانەش سودی زۆر لە خۆ دەگرێ شێخی دەهلەوی(بەڕەحمەت بێ) دەفەرموێ: سونەتە هەرکەسێ دوومەڕی دەست کەوێ بابۆ کوڕی سەرببڕێ ئەمەش لەبەرئەوەیە کوڕ لەلای خەڵك سودبەخشترە لە کچ بۆیە دەبێ زۆرترو زیاتر سوپاسی خوای لەسەربکەن. هۆی فەرمان دانیش بە گوێزەبانە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی عەرەب کاتێك منداڵیان دەبوون گوێزەبانەیان بۆ دەکرد، گوێزەبانە کارێکی پێویست و گرنگ و سونەتێکی خێردار بوو لای ئەوان، وە کۆمەڵێ بەرژەوەندی ئابوری و شارستانی و دەروونی لە خۆ گرتبوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هێشتیەوە و کاری پێ ی کرد، خەڵکیش تامەزرۆییان بۆ کردنی بەلاّ دروست بوو، بەلاّم پێغەمبەر(ﷺ) هێندێك لە نەریتەکانی گۆڕی، لە(بریدة)ەوە(ﷺ)ڕیوایەتیکردووە دەفەرمووێ: لە زەمەنی نەفامی دا ئەگەر منداڵێکمان لە دایك بووبایە مەڕێکمان بۆ سەردەبڕی و قژمان دەتاشی و سەریان بە خوێن دەکرد،

---

[1] ـ سنن الترمذي رقم: ١٥١٩.

[2] ـ ذخائر العقبى في مناقب ذوى القربى لأبي العباس، لا٢٠٧.

بەڵام لەسەردەمی ئیسلام کاتێك منداڵێك لـە دایـك دەبـوو مـەڕێکمان بـۆ سـەردەبڕی و سەریان دەتاشی و، سەریان دەخستە ناو زەعفران.[1]

ئەمە لە فیقهو تێگەیشتنی پێغەمبەرە(ﷺ) کاتێـك بینـی نـەریتێکی سـود بـەخش تێکەڵ بە هەندێك خورافەو لاڕێی و ـ سەری منداڵ دەخوێن نان بووە بە ڕەهـایی حـەڵاڵی نەکرد بە پاساوی پێویستی خەڵك، هاوکات بەڕەهایش قەدەغەی نەکرد بە بیانوی هەندێك لادان و لاڕێی تێدا. وەلێ پارێزگاری کرد لـەوەی بـۆ مـرۆڤ لـەم نەریتـە ڕیـشەدارە دێتـە بەرهەم و جەختیشی لەسەر کردەوە وە جڵەو گێریشی کرد لە نـەریتی نەفامانەوقەدەغـەی کرد، ئەمەش حیکمەتی پێغەمبەرایەتیە و شیاوی گرنگی پێدان و تێڕامانە.

## حەوتەم: خەتەنەکردنی[2] حەسەنی کوڕی علی(ﷺ):

جـابر(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) گۆزەبانـەی بـۆ حـسن و حـسین کـردو لـە ڕۆژی حەوتەمیش خەتەنەی کردن،[3] محمدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) حسینی لـە حەوتەم ڕۆژیدا خەتەنەکرد[4]، خەتەنـەکردن یەکێکـە لەشـتە (الفطـرة)یـەکان. أبـوهرەیرە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: خۆڕسك(فطـرة)و سروشـتیەکان پێـنجن: ((الفطـرة خمس: الختان، والاستحداد، و قص الشارب، وتقليم الأضافر، ونتف الإبـط)) خەتەنە کردن، تاشیتی بەر(عـەورەت تاشین)، کـورت کردنـی سمێـڵ، قرتانـدنی نینـۆك، سـافکردنی بـن هەنگڵ.[5]

خەتەنەکردن چەشن و ڕەنگی ڕاستاڵیە، بۆ پاکان هێمـای گۆڕانکاریـە، وەك خۆشـۆردن بەئاوی قەداسەت وایە لای خاچپەرستان و، واگومان دەبەن منداڵـەکانیان پاکدەبنـەوە بـە بۆیە کردن و شۆردنیان بەناوی (بـاوك و کـوڕ و ڕۆحـی قـودس)ەوە. دەڵـێن: ئێـستا بـوو بەگاورێکی کامڵ، خوای گەورەش ڕێبازی یەکتا پەرستی (حنيفية)ی بۆ یـەکتا پەرسـتان

---

١ ـ المستدرك للحاكم (٢٣٨/٤).

٢ ـ خەتەنە: واتە: بڕینی پێستی سەری زەکەر.

٣ ـ سنن البيهقي (٣٢٤/٨)، إسناده ضعيف.

٤ ـ البخاري (١٨٤/٧) رقم: ٦٢٩٧.

٥ ـ مسلم رقم: ٢٥٧.

داناو خەتەنەی سروشت کرد[1]، هەروەك بۆ خۆی دەفەرمووێ: ﴿صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ﴾ [البقرة: ١٣٨].

سروشتی خوا ئەو ڕاستیە یە دڵ و دەروونمان ڕەنگین دەکات بە ناسین و خۆشەویستی و دڵسۆزی نواندن و بەندایەتی بۆ کردن و بڕیار نەدانی هاوبەشی بۆی. ڕەنگ ڕێژ کردنی جەستە بە خەسڵەتە خۆرسکی (فطرة)و سروشتی (الطبیعي)ەکان، خەتەنە کردن و تاشینی مووی بەر و کورت کردنی سمێڵ و قرتاندنی نینۆك و سافکردنی بن هەنگڵ و ئاو لە دەم و لووت وەردان تارەت کردن و سیواککردن مرۆڤ جوان و ڕازاوە دەکەن و لەونێوەندەدا سروشتی خوا تروسکە دەدات لەسەر دڵ و جەستەی ڕاستە ڕێیان[2]، یەکێك لە (لطیفة)ە خۆشەکانی فقهی لە باسی خەتەنە کردن هەیە، خەطابی باسی کردوەو دەڵێ: خەتەنە کردن هەر چەند لە نێو ڕشتەی سونەتەکان ناو دەبرێ، بەڵام لەلای زۆربەی زانایان واجبە، چونکە دروشمی ئاینە، موسڵمان لەگەڵ کافر بەمە جیا دەکرێتەوە، ئەگەر کەسێکی خەتەنەکراو لەگەڵ کۆمەڵە کوژراوێکی خەتەنە نەکراو تێکەڵ بوو، نوێژی لەسەر دەکرێ و لە گۆڕستانی موسڵمانانیش بەخاك دەسپێردرێ.[3]

### هەشتەم: (أم الفضل) دایەنی حسن بوو.

(أم الفضل) دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا لە خەودا بینیم یەکێك لە ئەندامەکانت لە ماڵەکەی مندا بوو، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ((تلد فاطمة غلاماً إن شاء الله فتكلفينه))، واتە: (فاتیمە منداڵێکی دەبێت تۆ دەبێتە دایەن و چاودێری) دەڵێ: ڕۆژێك چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) حسنم بینی میزی لەسەر پشتی پێغەمبەر کرد، منیش توند گوشیم، پێغەمبەر فەرمووی: (واز بێنە ڕەحمەتی خوات لێبێت کوڕکەمت ئەزیەتدا)

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا١٥٣٠.

٢ ـ موسوعة التربية الأجيال، لا ٧٥.

٣ ـ منهج التربية للطفل ٦٩.

منیش ووتم: پەشتە ماڵەکەت بێنە بیشۆم. فەرمووی: (نا، بەئاو بی پڕژێنە، چونکە میزی کوڕ ئاو پڕژێن دەکرێ).[1]

أم الفضل هاوسەری (عباسی کوڕی عبد المطلب)ە ناوی لوبابەی کچی جارسی هیلالیە و لوبابەی گەورەیە، پێش کۆچکردن بۆ مەدینە ئیسلام بووە[2]، إبن سعد دەڵێ: (أم الفضل یەکەم ئافرەت بووە لە دوای خدیجە بڕوای هێناوە.[3] أم الفضل فەرموودەی لەپێغەمبەر(ﷺ)ڕیوایەتکراوە، عبدالله و تەمامی کوڕی و عومەیری کوڕی حاریسەو عبدالله کوڕی حاریس و زۆری تر فەرموودەیان لە أم الفضل ڕیوایەتکردووە. عبداللە کوڕی عەبباس ووتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەم چوار خوشکە بڕوادارن: أم الفضل، (میمونە)، کە خوشکی أم الفضلە ئەسماء سەلمی خوشکی ئەوانن لە باوکیانەوەو، کچی عومەیسی خوسعمین[4]، (عُمیس الخثعمیة) أم الفضل پوری خالیدی کوڕی وەلیدە[5]، دایکی خالید ناوی لوبابەی بچوك (لبابة الصغری) بوو کچی حارسی هیلالیە[6]ووتراویشە بەدایکی أم الفضل ڕێزدارترین و خۆشەویسترین کەسی بنەماڵەی ژن و ژنخوازی (میمونە)ی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە. عباس لوبابەی (أم الفضل)ی مارەبڕی، حمزە سەلمای خوشکی (أم الفضل)ی مارەکرد، جعفری ئەبو تاڵیبیش بە هەمان شێوە ئەسمای خوشکی دایك و باوکی مارەکردوە، پاشان ئەبو بکری صدیق مارەی کردووە، دواتر علی کوڕی ئەبو طالب[7]، عبدالله کوڕی عمر دەفەرموێ: (أم الفضل) لە خاتوونە هەرە خانەدانەکان بوو، پێغەمبەر هاموشۆی دەکرد.[8]

---

١ ـ المستدرك (١٦٦/١) وصححه ووافقه الذهبي، وهناك من ضعفه.

٢ ـ الطبقات لإبن سعد (٢٧٧/٨).

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

٤ ـ موسوعة عظماء حول الرسول، خالد العك (٢١٦/٣)

٥ ـ سيرة ال بيت النبي صب الله الأطهار، مجدى فتحي، لا ٣١.

٦ ـ الإستيعاب رقم الترجمة: ٦١.

٧ ـ الإصابة في تميز الصحابة (٨/ ٤٥٠).

٨ ـ الأستيعاب في معرفة الأصحاب (١٩٠٨/٤).

- له فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە خەڵك منجەمنجیان دەکرد لەسەر بەڕۆژوو بونی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی عەرەفە تا (أم الفضل) یان بە فنجانێك شیرەوە بۆ لای نارد، پێغەمبەر(ﷺ) شیرەکەی خواردەوە، ئەو سازانیان بە ڕۆژوو نیە[1]، أم الفضل قسەمان بۆ دەکات و دەفەرموێ: کۆتا سورەت، کە گوێم لەپێغەمبەر(ﷺ) بوو لە نوێژی مەغریب دا دەی خوێند (والمرسلت عرفا)[المرسلات:١] بوو، بۆیە بەکوڕکەی خۆی دەووت: ئەی کوڕی شیرینم بە خوێندنی ئەم سورەتە یادگاریت بیرخستمەوە، ئەمە دواین سورەت بوو لەنوێژی مەغریب خوێندیەوە. [2] أم الفضل لە هەرسێ خیلافەتەکانی ئەبو بکر و عمر و عثمان دا ژیاوە، بە کەمێك پێش عباسی هاوسەری کۆچی دوایی کردوە[3]، شەش منداڵیان بووە، منداڵی عباس لە (أم الفضل). شەش کەڵە پیاو، کە هیچ دایکێك وێنەی نەدیوون ئەوانیش: الفضل، کە ناز ناوی دایك و باوکی بوو (أم الفضل)، أبو الفضل، عبدالله فەقیە، عبیدالله فەقیە، معبد، قوسەم(قثم)، عبدالرحمن. دایکی حەبیبە حەوتەمیان بوو.

عبدالله کوڕی یەزیدی هیلالیش لە گەورەیی و دایکی الفضلدا دەڵێ:

مَا ولدت نجيبة مِنْ فحـــل ‌‌ ‌ ‌بجبل نـعلمه وسَهْـــل
كستة من بطن أم الفضـــل ‌ ‌ ‌ أكرم بها من كهلة وكهـل
عم النبي المصطفى ذي الفضل ‌ ‌ ‌ وخاتم الرسل وخير الرسل[4]

نۆیەم: هاوسەرگیری حسن و، خێزانەکانی، ئەو ڕیوایاتانەش کەلەبارەیانەوە هاتووە:

مێژوو نوسان باس لە خێزانەکانی حسن دەکەن و، دەڵێن: هەندێك لە خێزانەکانی ناویان: خەولەی فەزاریە، جەعدەی کچی ئەشعەس، عائیشەی خوسەعمیە، (أم إسحاق)ی

---

١ ـ البخاري، كتاب: الحج رقم ١٦٦١.

٢ ـ البخاري، رقم: ٧٦٧.

٣ ـ الإصابة في تميز الصحابة (٨/ ٤٥١).

٤ ـ الإستيعاب في معرفة الأصحاب (٤/١٩٠٨).

کچی تەلحەی کوڕی عبیداللە ی تەمیمی، أم بَشیری کچی ئەبو مسعودی ئەنصاری، هیندی کچی عبدالرحمنی کوڕی ئەبو بکر، (أم عبداللە)ی کچی شەلیلی کوڕی عبداللە برای (جریر البجلي)و، ژنێك لە تیرەی سەقیف و ژنێك لە هۆزی عمری کوڕی أهبم المنقری و، ژنێك لە وەچەی شەیبای بنەماڵەی (همام بن مرة)، لەوانەیە ئەم ژمارەیە کەمێك زیادەڕەوی تێدابێ، هەروەك دەبینرێ سەرکێشی نیە بۆ زۆرێکی گومان لێکرا و لە نەریتی چاخی ئەواندا، بەڵام ئەوەی ڕیوایەت کراوە ئەسەرەکانی باسیان کردوە، کە حسن حەفتا ژنی مارە کردووە، یان لە هەندێ ڕیواتەتیی تردا نەوت و لە هەندێکی تر دووسەد، لە هەندێکی تر سێ سەد، لە مەش زیاتر باسکراوە، هەموو ئەو ڕیوایانەش بەڕیز پەڕ(شاذ)دادەنرێن، ئەو زۆری مارە بڕینەش گوماناوی و هەڵبەستراوە:

ڕیوایەتەکان بەم شێوازانەی خوارەوەن.

١- ڕیوایەتی یەکەم: (إبن أبي الحدید)و چەند کەسێکی ترباسیان کردوو[١]، لە علی کوڕی عبداللە بەسری ناودار (بەمەدئینی بەناوبانگ) وەرگرتووە، کە لە ٢٢٥ کۆچی کۆچی دوایی کردوە، ئەویش یەکێك لەو کەسانەی لەبەر لاوازی پشت بەفەرمودەکانی نابەسترێ، بۆیە مسلیم لە صەحیحەکەی توخنی ڕیوایەتەکانی نەکەوتوە.[٢] (إبن عدی)یش لە (الکامل) بە لاوازی ناوزەد دەکات و دەڵێ: کەسێکی بەهێز نیە لەڕوی فەرموودەی ناسیدا، خاوەنی (أخبار)ەو زۆرکەم ڕیوایەتی هەیە ئیسناد درابێت.[٣]

٢- ڕیوایەتی دووەم: فەرموودەی (المرسل)، (مرسل)یش جۆرێکە لە فەرموودەی لاواز[٤]

٣- ڕیوایەتی سێ یەم و چوارەم: خاوەنی (قوت القلوب) ئەبو تالیبی مەکی باسی کردوو، هەرچەند ئەم کتێبەش ناخرێتە پاڵ خاوەنەکەی، بەڵام بەهەر حاڵ ژمارەی پێوەری

---

١ ـ حیاة الإمام الحسن بن علي (٢/٤٤٥ ـ ٤٦٠).

٢ ـ میزان الإعتدال (٣/١٣٨).

٣ ـ لسان المیزان (٤/٢٥٢).

٤ ـ مرسل: ئەو فەرموودەیە لەزنجیرەی گێڕانەوەیدا خاوەنی فەرموودەی تێداباس نەکراوە.

بۆ زۆری خێزانەکانی پێشەوای بڕواداران حسن، لە وەرگرتنی فەرموودەکاندا ئاماژە بە أبوتالێب دەکرێ. هەرچەند أبوتالیبی مەکی بەخوا پەرست و ئامۆژگار و زاهید ناوداربوو، ئەوە لە (القوت)چەند شتێکی دزێوو ناشیرینی باس کردوە.[1]

هەندێك فەرمودەی ناوهێناوە کە هیچ بنچینەیەکیان نیە.[2] لە پەرتووکە کەیدا (قوت القلوب) دا هاتووە، حەسەنی کوڕی علی دووسەدو پەنجا ژنی مارەبڕیوە، ووتراویشە سێ سەد، علی بەم کارە هەراسان و دڵی نارەحەت بوو لە شەرم و شکۆی ئافرەتی ئەهلەکەی، کە تەڵاق دەدرێن. فەرمووی ژن لە حسن مارە مەبڕن، چونکە تەڵاقیان دەدات، پیاوێکی هەمەدانیش پێ ووت: سوێند بەخوا ئەی پێشەوای بڕواداران ئەوەی ئارەزووی لێ یەتی لێ مارە ئەبڕین، ئەگەر حەزی کرد لای بێ و ئەوەی حەزی نەکرد بالێ جیابێتەوە بەم ووتە علی خەندە گرتی و ووتی:

لوكنتُ بواباً على باب جنةٍ لقلتُ لهمدان أن أدخلوا بسلام

واتە: ئەگەر دەرگەوانی بەهەشت بوامە، بەهەمەدانیەکانم دەووت بە ئاشتەوایی بۆ بەهەشت بەڕێکەون.

کۆمەڵە چیرۆکێك لە بارەی ژن هێنانی حەسەنەوە(رضي الله عنه) هاتووە، ئیسنادەکانی زۆر لاوازن، لەوانە:

١. لە (الهذلي)یەوە، ئەویش لە (إبن سرين) ڕیوایەتکردووە دەڵێ: هندی کچی سهیلی کوڕی عەمر ژنی عبدالرحمن کوڕی عتابەی کوڕی ئوسەید بووە[3] و بەکچی مارەی کردبووە، تەڵاقیداو ئینجا عبدالله عامڕی کوڕی کریز[4]، مارەیکرد، پاشان ئەویش

---

١ ـ لسان الميزان (٤/٢٥٢).

٢ ـ البداية والنهاية (١١/ ٣٤١).

٣ ـ عبد الرحمن بن عتاب بن أسيد باوکی والی مەککە بووە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و عبدالرحمن لەڕۆژی (جمل)دا لەگەڵ عەلیدابووە و لەو جەنگەدا کوژراوە، بڕوانە أنساب قريش، لا ١٩٣

٤ ـ عبدالله بن عامر بن كريز بن ربيعەی نەوەی عەبدالشمس کوڕی خاڵی عثمانی کوڕی عفان، لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لەدایك بوو، إبن حيانيش دەڵێ: کە پێغەمبەر(ﷺ)ی بینیوەو لەکتێبەکەمیشدا عوسمانی کوڕی عەفان لا ٣١٩ ژیاننامەی باسکردووە.

تەڵاقیدا، معاویەش نامەی بۆ أبو هریرە نوسی کە بۆ یەزید داوای بکات، حەسەنی کوڕی علی بە أبوهریرە گەیشت و ووتی: بۆ کوێ دەچی؟ ووتی: هیندی کچی سهلی عەمر بۆ یەزیدی کوڕی معاویە داوا دەکەم، حەسەنیش ووتی: باسی منی بۆ بکە، ئەبو هورەیرە چولای هیند و باسەکەی پێ ووت: هیندیش ووتی: تۆ بۆ منی دیاری بکە، ئەبو هورەیرەش ووتی: حەسەنی کوڕی عەلیم بۆ هەڵبژاردووی، ئەویش مارەیکرد، عبداللە کوڕی عامر هاتە مەدینەو بە حەسەنی ووت: ڕاسپاردەیەکم لای هیندە بۆیە حەسەنیش لەگەڵی چووە لای هیند و إبن عامر دڵی توند بوو، حەسەنیش ووتی: ئەتەوێ دەستی لێ هەڵگرم بۆت بێ؟ إبن عامریش ووتی: ڕاسپاردەکەم هیندیش دوو قوتووی دەرهێنا کە گەوهەری تێدا بوو، إبن عامر قوتوێکی هەڵگرت و ئەوەی تری وازلێهیانە، هندیش ووتی: حسن گەورەی گشتیان و إبن عامریش سەخترینیان و خۆشەویستری لەهەموویان بۆم و عبدالرحمنی کوڕی عەتابە[1] لە ئیسنادی ئەم چیرۆك و باسەش (الهذلي) دەڵێ: کۆ دەنگ و کۆڕای زانایان لەلاوازی ئەو پیاوە هەیە[2].

٢. لە (سحيم بن حفص الأنصاري) ئەویش لە (عيسى بن أبى هارون المزني)یەوە، کە دەڵێ: حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) حفصەی کچی عبدالرحمن کوڕی ئەبو بکری مارەی کرد[3]، مونزیری کوڕی زوبەیریش حەزی پێ دەکرد و شەیدا بوو بوو، ئەو حەز پێکردنەش بەحسن(ﷺ) گەیشتووە حەسەنیش تەڵاقی داوە، مونزیر هاتۆتە خوازبێنی کردنی، حفصەش ڕەتی کردۆتەوە شوی پێ بکات و دەڵێ: ناو بانگم بزڕێنە ئینجا عاصمی کوڕی عمری کوڕی خەتاب[4]، دیسان مونزیر دڵی بۆ توند بوو بۆیە عاصمیش تەڵاقیدا و، پاشان مونز خوازبێنی کرد بۆیە بەحەفسە ووتراوە: شووی پێ بکە، چونکە خەڵکی دەزانن درۆ و بوختانی بۆ هەڵبەستووی، مارەی کردوو خەڵکیش زانیان درۆی لەبارەی کردووە، ئینجا

---

١ ـ الطبقات الکبری، الطبقة الخامسة من الصحابة (١/٣٠٣).

٢ ـ دیوان المتروکین والضعفاء، لا ٣٥٢.

٣ ـ حەفسەی کچی عبدالرحمانی کوڕی ئەبو بکر لە پوورەکانی عائیشە (خوشکی باوك) أم سلمە (خوشکی دایك) بووە فەرموودەی ڕیوایەتکردووە لە عائیشەی پوری و (أم سلمە).

٤ ـ عاصم بن عمر بن خطاب تابیعەکی خەڵکی مەدینە و ساڵی ٧٠ك مردووە، تقریب التهذیب(١/٣٥٨).

حسن بە عاصمی کوڕی عمری ووت: بابڕۆین و مۆڵەتیێ لە مونزیر بخوازین و بڕۆینـە لای حەفسە، ڕۆیشتنە لای حەفسەو حەفسەش لە زیارت لە حەسەنی ئەیڕوانیە عاصم و قسەی بۆ نەرم و خۆشتر بوو، حسن بە مونزیری ووت: دەستی بگرە، ئەویش دەستی گرت و حسن و عاصمیش هەستان و ڕۆیشتن، حسن شەیدای حفصە بوو، بەڵام لەبەر دڵ پیوە بوونەکـەی (مونذر) تەڵاقیدا. حسن ڕۆژێك بە (إبن أبـی عتیـق) کـە عبـداللە کـوڕی محمـدی کـوڕی عبدالرحمانە، کە حفصە پووری بووە ووتوە: حەز دەکەی سەردانی عەقیق بکەین[1] ووتـی: بەڵێ، بەلای ماڵی حفصەدا تێ پەڕین إمامی حـسن چـوو بـۆلای دوای گفتوگۆیـەکی زۆر پاشان دەرچوو. ڕۆیشتنە لای و زۆر قسەیان کردو پاشان دەرچوو، بـۆ جـارێکی تـر حـسن بە(إبن أبی عتیق)ی ووت: حەزدەکەی برۆینە عەقیق، ئەویش ووتی: ئەی (إبن أم)بۆ نـاڵێ حەزدەکەی بچینە لای حەفصە[2]، لە ئیسنادی ئەم باسەشدا پیاوانێك هـەن لەکتێبـەکانی (الجرح والتعدیل) دا باسنەکراون و بەلاوەی زۆر لاوازە.[3]

٣. حاتەمی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جعفری کوڕی محمد، لە باوکیەوە ڕیوایەتیکردووە و دەڵێ: علی(ﷺ) فەرمووی حسن بەردەوام خەریکی ژن هێنـان و تەڵاقـدان بـوو، تـاکو مەترسی ئەوەم لێنیشت دوژمنداری و تەنگەژەمان لە نێوان هۆز و تیرەکانـدا بـۆ دروسـت کات[4]، ئەمەش ئەسەرێکی دابڕاو لاوازە.[5]

هەموو ئەو ڕیوایەتە مێژوویانەی ئاماژە بە و ژمـارە خەیاڵیـەی ژن هێنـانی حەسـەنی کوڕی علی(ﷺ) دەکەن، لەڕوی ئیسنادەو نەچەسپاون؟ بۆ پشت پـێ بەستنیـسش گونجـاو نین، بە تێڕمان لەو هەموو دژواری تا ئەو تۆمەتانـەی لـە دەوروبەریانـە خـول دەخـوات، ئەوەش ئەم باسە بە جۆش دەکات چەند باسێکە:

---

١ ـ (العقیق): دۆڵێکە لەشانی مەدینەو باخ و بێستانی تێدایە.

٢ ـ الطبقات الکبری الطبقة الخامسة و باخ و بێستانی تێدایە.

٣ ـ هەمان سەرچاوە(١/٣٠٥)

٤ ـ الطبقات الکبری الطبقة الخامسة الصحابة (١/٣٠٧)، هەمان سەرچاوە.

٥ ـ هەمان سەرچاوە (١/٣٠٥).

١. ئەگەر ئەو ڕیوایەتە ڕاست بێت، ئەو حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) زۆریك منداڵی هەبووە نەگونجاو بووە بەو حاڵەی کەباسی دەکرێ بەوەی بیست و دووکوڕی هەبووە، ئەو ژمارەیەش سەبارەت بەو سەردەمە بە سورشتی دادەنرێ، بەڵام هاودژ دەبێت و لەگەڵ ئەم هەموو ژنخوازیە یەك ناگرێتەوە.

٢. ئەوەی لەسەر هەڵبەستراوی و ناساغی ئەو تۆمەتانە دەبنە بەڵگە ئەوەیە، کە ڕیوایەتکراوە علی(ﷺ) کاتێك دەچووە سەر مینبەر دەیفەرموو: ژن مەدەن بە حسن(ﷺ)، چونکە تەڵاقیان دەدات، هەروەك خاوەنی کتێبی (قوت القلوب)باسی کردوە[1]، ئیمانداران لەسەر مینبەر ڕێگری لە نێو خەڵکی کردووە بۆ ژن دان بە حسن(ﷺ)، یان دەبێ بە نهێنی پێی ووتبێت و، حسن(ﷺ) گوێڕایەڵی نەبوو بێ، بۆیە بە ناچاری لە نێو خەڵك ڕایدەگەینێ، کە ژن لە حسن(ﷺ) مارە مەبڕن، یاخود دەبێت ئەم قەدەغە کردنە سەرەتا بێت و هێشتا حسن(ﷺ) بە تورەیی و پێ ی ناخۆشبوونی باوکی ئاشنا نەبوو بێت. هەر یەك لەم دوو بۆچوونەش زۆر لە واقیع دوورن، بۆ چوونی یەکەم، نابەجێ و دوورە، لەبەرئەوەی حسن (ﷺ) زۆر چاکە کاربوو لەگەڵ باوکی و هەرگیز سەرپێچی فەرمانەکانی نەکردووە، بۆچوونی دووەمیش، بە هەمان شێوە بێ بنەمایە، چونکە باشتر وأبوو علی بە گرژبوون و پێناخۆشبوونی کوڕەکەی ئاشنا بوو بایەو لەسەر مینبەر لەبەرامبەر ئەو هەموو خەڵکە ڕاینەگەیاندبایە، کەدواتر دەبێتە هۆی دڵە خورپە و دڵە ڕاوکێ لە پەیوندی خێزانی لە نێوان کوڕ و باوکدا، ئەمەی باسکرا یان دەبێت لە ڕوانگەی شەرع ڕاست و دروست بێت، یان بە پێچەوانەوە ئەگەر دروست بێت، مانەی ئەم قەدەغەکردنەی علی(ﷺ) چی بوو؟ ئەگەر دروستیش نەبووبێت چۆن حسن ئەنجامی دەدات. ئیمەش گومانمان نیە جۆشدان و هەڵبەستی ئەو تۆمەتانە لەلایەن ڕکابەر و دوژمنانی حەسەنەوە بەمەبەستی زڕاندنی ژیان و سەربوردە پاکەکەی[2]، کە ژیانی خستە گەڕ لەپێناو یەکخستنی ئومەتدا، نەریتی لە مێژینەی ڕاویە درۆزنەکان هەروأبووە لە ناشیرین کردنی ژیاننامەی پیاو چاك و مێژووی ئومەتە، لێرەدا ڕۆڵ وگرنگی زانستی

---

١ ـ قوت القلوب (٢/٢٤٦).

٢ ـ حياة الإمام الحسن (٢/٤٥١).

((جرح والتعديل)) و بڕیاردان لەڕیوایەتەکان ڕووندەبێتەوە ، هەروەها ئەو ڕۆڵە پڕبایەخەی کەزانایانی فەرمودەناس گێڕاویانە لە بەرچاو ڕونکردنەوەی ئەم جۆرە هەڵبەستراوانە. بۆیە ئامۆژگارانی لێکۆڵەوەرانی مێژووی سەرەتای ئیسلام ئەکەین، کە گرنگی بە ڕەخنەگرتنی ئەم ڕیوایەتانە بدەن تاوەکو چاك و خراپ لەیەك جیابکەنەوە وە خزمەتێکی پیرۆز بۆ ئەم ئوممەتە پیش کەش بکەن و لەوڕیوایەتانە نەگلێن هەروەك هەندێك لە گەورانە تێوەی گلاون و ئێمەش هیچ گومان لەسەرنیازی گلاویان ناکەین بەهۆی ئەوەی توێژینەوەکانیان بە ڕیوایەتی لاوازو هەڵبەستراو پشت ئەبەستن.

٣. ئەوەش کە بەڵگە گەورەکردنەوەی زۆری خیزانەکانی بێ ئەوەیە ڕیوایەتێکراوە بەوەی حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) کۆمەڵێ ئافرەتی بە پێ پەتی و خەفەتە کەوتونەتە دوای تەرمەکەو حسن (رضي الله عنه)و ووتویانە ئێمە هاوسەرانی ئیمام حەسەنیین (رضي الله عنه) ئەو گەروە کردنەش ڕوون و ڕاشکاوانە یە، چونکە تێڕوانی پاشاوی ئەم ئافرەتانە ناکەین بەپێ خاوسی و خەمەوە بەرامبەر جەماوەر هاوار بکەن کە ئەوان هاوسەرانی حسنن، گەرچی لەدەرچونیان دەرخستنی ئازارو ناخۆشیە و ئەویش پێویست ئەکات، کەوات پێویست چیە لەو خۆناساندن و ڕۆیشتن لەتەك ئەم کەژاوەیە قەرەباڵغد لە پیاوان لەکاتێکدا فرمانی دەرنەچوون لە ماڵەکانیان و خۆ داپۆشینیان پێ دراوە؟

ئەو (أثر)ەو هاوشێوەکانی بەڕاست دانانرێت و لەڕووی (إسناد)یشەوە ناسەلمێت، لەو هەواڵە دروستکراوانەش (الأخبار الموضوعة) کە هاوشێوەی ئەو باسەیە، ئەو ڕووداوەیە کە محمدی کوڕی سیرین ریوایەتکراوە، کە حسن(رضي الله عنه) ئافرەتێکی مارەکردوە سەد جارییەی کردۆتە مارەیی لەگەڵ هەر جارییەك هەزاردرهەمی بۆ ناردووە[1]، بۆیە زۆر دوورە، حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) ئەم سەروەتە گەورەیە بداتە مارەیی یەکێك لە ژنەکانی، چونکە جۆرێکە لە جۆرەکانی ئیسراف و بە فیڕۆدان کە لە ئیسلامدا ڕیگری لێکراوە، کەلە مارەیی فرمانی کەم مارەیی دانانی کردووە و هیۆکاری ئەوەش ئاسانکارییە لەکاروباری هاوسەریدا تاوەکو خێزان دروستکردن بەلای خەڵکیەوە سەخت و نارەحەت

---

١ ـ البداية والنهاية(١١/ ١٩٧).

نەبێ، دڵنیاییەوە حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ) پێچەوانەی سوننەتی باپیری(ﷺ)ناکات و، هیچ ڕێگەیەکیش ناگرێتە بەر دژ و پێچەوانەی پێغەمبەرەکەی بێ(ﷺ)، ئەو باسە و هاوشێوەکانیش لە (موضوعات) بۆ دووپاتکردنەی هاوسەردایە زۆرکەی زۆرگەورەکردنەوەی تیادایە.

جگەلە گێڕانەوانە بەڵگەك نیە زۆری هاوسەری حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) بسەلمێنێ لەبەر ئەوەش کە وەك ئەوانە بۆ سەلماندنی بەڵگەیە[1]، بۆزانینی ئەوەش، کە چۆن دوژمنان لەو ڕیوایەتە واز پوچانە بۆ زانینی ئەوەش کە چۆن دوژمنان لەو ڕیوایەتە لاواز پوچانە سود دەبینن ئەوەتان بۆ باس ئەکەین و ئەگوازینەوە کە (لامنس)ی ڕۆژهەڵاتناس لەبارەی خێزانەکانی حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) دەڵێ: تۆمەتی خستۆتە پاڵ و تانەی خێزانەکانی حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) دەڵێ و خستۆتە پاڵ و تانەی لە پیاوان و پارێزەر وشوێنەکەوتووانی داوەو لەبارەی هاوسەرەکانی حەسەنی کوڕی عەلیشەوە(ﷺ) بەم شێوەیە نوسیویەتی: حسن کاتێ گەنجینی تێپەڕاند، ساڵەکانی گەنجێتی خۆی لەهاوسەری و تەڵاقدا بەخشی و نزیکەی سەد ژنی هەبووە و نازناوی تەڵاقدەری پێوەلکاوە و عەلیش کەوتۆتە دوژمنایەتی و ڕق گەلێکی سەختەوە و حەسەنیش سەلماندوویەتی کە زۆر زیادەڕەوبووە و بۆ هەموو خیزانەانیشی خانو خزمەتکاری گرتووە پارێزەری تەرخان کردووە، بەوجۆرەش ئەبین و چۆن لەو ڕۆژگاری خیلافەتەکەی عەلیدا کە هەژاری سەخت بووە سەروەت و سامانی خەرج و بینراوە.[2]

ڕۆژهەلاتناسی ئینگلیزی (لامنس)لەبارەی ژن هێنان و تگلاق دان لەلایەن حسن پشتی بەستوە بەچەند ڕیوایەت و ئەسەرێکی لاوازو بێ بنەما (لامنس) بوختان و درۆی زیاترو خەسستر کردووە کەهیچ کەس وەك ئەوی نەکردوە.

---

١ ـ حياة الإمام الحسن بن علي(٢/٤٥٢).

٢ ـ دائرة المعارف(٧/٤٠٠).

(لامنس) دەڵێ:

أـ إمامی حسن لەگەڵ باوکی کەوتۆتە کێبڕکێی دژوارەوە سەبارەت بەوەموژن هێنان وتەلاقدانانە، هیچ کەس لەژیان نوسانی علی و حسن ئاماژەیان بۆ ئەم کێشەچڕوپڕانە نەکردووە، هەروەك (لامنس) واگومان دەبات.

ب- لامنس دەڵێ: پێشەوای بڕواداران حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) بۆهەریەك لەژنەکانی خانویەکی بەخزمەتکارو دەست و پێوەندەوە دابین کردوە، لەگەڵ ئەوەی هیچ مێژونووسێك کە من ئاشنام پێیان لەم بارەوە نەدواون، لەڕاستیدا ئەمەش درۆیەکی ڕوون و بوختانێکی ڕووتە.

ڕێکخراوە بەگاور کردنەکانی مەسیحی کە دژ بەئیسلام جەنگاون لە یاخی بوونەدان بۆی، ئەوانن ئەم قەڵەمانە هاندەدەن و پاداشت دەکەن و وە بەنەرمی دانەیان دەدەن بۆ گەیشتن بە ئیسلام، بۆ ڕوشاندن و زڕاندنی واقیعەکەی، بۆپوکاندنەوەی بەهای کەڵە پیاو و ناوادارەکانی، ئەوانەی بۆقافڵەی مرۆڤایەتی ڕێگەیان ڕۆشەنکردەوە و، بەیداخی شارستانیان لە جیهاندا بەرزکردەوە.[1]

## دەیەم: منداڵەکانی

وەچەی شەریفی ئەمانەن: حسن، زەید، تەلحە، قاسم، ئەبو بکر، عبدالله، ئەم شەش کوڕەی لە کەربەلا لەگەڵ مامی شەهیدیاندا حسین (ﷺ) کوژران. عەمر، عبدالرحمن، حسین، محمد، یعقوب، ئیسماعیل، حمزە، جعفر، عەقیل، دایکی حسین، لە وەچەی پیرۆزی تەنها حسن و زەیدی بۆماون. حەسەنیش پێنج منداڵی هەبووە دواتر باسیان دەکەین. دایکیشی خەولەی کچی مەنزوری فەزریە، زەیدیش تەنها کوڕێکی بوژیاوە بەناوی حسن. دایکی زەید (أم بشیر)کچی أبو مسعودی ئەنصاری بەدریە. حەسەنی کوڕی زەید مشوریمەدینەی بە أبو جعفری منصورکە باوکی خاتووە (نەفیسە)یە چەند کوڕێکی بووە بەناوی قاسم، عبدالله، إبراهیم، زەید، ئیسحاق، علی، ڕەزای خوا لە هەموویانبێت[1].

---

١ ـ حياة الأمام الحسن بن علي (٢/٤٥٥).

ئەمەی خوارەوەش سەربوردەیەکی کورتەی لەژیاننامەی هەندێك لەکوڕانی حەسەنە...(رضي الله عنه)

١. زەیدی کوڕی حەسەنی کوڕی علی کوڕی أبوتاڵیبە(رضي الله عنه):

دایکی زەید (أم بشیر)ە کچی أبومسعودە کەناوی (عقبەی) کوڕی عەمری کوڕی سەعلەبەی خەزرەجیە، زەید کوڕێکی بووە بەناوی محمد نەژیاوە، دایکی (أم الولد)ی ناوبووە، کوڕی دووەمی بەناوی حسن بووە، وەك باسمان کرد فەرمان و مشوری مەدینەی بۆ جعفری مەنصور هەڵسوڕاندووە، دایکی بەناوی (أم ولد) ناوزەد دەکرا، خاتوو نەفیسەش کچی زەید بووە و وەلیدی کوڕی عبدالملك کوڕی مەروان مارەی کردووە و هەر لەلای ئەو کۆچی دوایی کردوە، دایکی ناوی لوبابەی کچی عبداللە کوڕی عباسی کوڕی عبدالمطلیبی کوڕی هاشمە.

محمدی کوڕی عمر دەڵێ: عبدالرحمانی کوڕی أبو موال ووتی: خەڵکم دەبینی تەماشای زەید یان دەکرد، سەرسام بوون بە ئاکار و ڕەوشتە بەرزەکەی، دەیانووت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باپیرەیەتی. دووبارە محمدی کوڕی عمر دەڵێت: عبداللە کوڕی عوبیدە پێی ووتم: لە دوای باوکم دەڕۆیشتم لەو ڕۆژەی زەیدی کوڕی حسن(رضي الله عنه) کۆچی دوایی کرد بوو، هەر ئەو ڕۆژەش لە(بطحاء)إبن ئەزهەر بە چەند میلیك. دوورلە مەدینە وەفاتی کرد بوو، هەڵیان گرتبووە بۆ مەدینە دەیان هێناوە، هێشتا بەژداری سەرتای پرسەمان نەکرد بوو، لە پڕێکا لە نێوان دوو ئاڵادا لاشەی زەیدی کوڕی حسن لەنێو کەژاوەیەکدا لەسەر ووشتر دەرکەوت، عبدالله کوڕی حەسەنیش سەر قافڵە ئەڕۆیشت و بەپەشتە ماڵێك نێوەندی خۆی پێچابوو، پشتی ڕووت بوو، باوکم پێی ووتم: ئەی کوڕی شیرینم من دائەبەزم و جڵەوی ولاخەکە دەگرم، سوێند بەخوا گەرمن بە سواری و عبداللە ش بەپیادە بڕوا تا لە ژیان ماوم لای ئەو خەجاڵەت بار ئەبم. باوکم دابەزی و منیش سواری گوێ درێژبووم، باوکم هەر بەردەوام بوو

---

١ ـ جمهرة أنسان العرب لإبن حزم، لا (٩٨,٣٩)و سيرأعلام البنلاء(٢٦٩/٣) الدوحة النبوية الشريفة، لا ١٠٠.

لە ڕێگەبڕین تاکو لاشەی زەیدیان تەسلیم بە ماڵەکەی خۆیان کردەوە لـە هـۆزی (حُدیلـة) دوای شۆردنەوەی بۆ گۆڕستانی بەقیعیان بەڕێکرد.[1]

٢- حەسەنی کوڕی حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیب.

دایکی ناوی خەولەی کچی مەنزوری فزاریە، حـسن کـوڕێکی بـە نـاوی محمد هـەبوو دایکیشی ناوی ڕەملەی کچی سعیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلی کوڕی عبدالعُزای یـە، هەریەك لە عبدالله ئیبراهیمی کوڕانی إمامی حسن لە بەندیخانەی جعفری مەنصور لەگەڵ یەك وەفاتیان کرد. زەینەبی کچیشی شوی بە وەلیدی کوڕی مەروان کردو دواتر تەڵاقیـدا، کچێکی تری ناوی (أم کلثوم) بوو، دایکی هەموویان فاتیمەی کچی حسینی کـوڕی علـی کوڕی ئەبو تاڵیبە. دایکی ئەویش (أم إسـحاق)ی کـچی تەڵحـەی کـوڕی عبیـدالله بـەنی تەیمەیەو، منداڵەکانی ناویان، جعفر و داود و فاتیمە و دایکـی قاسـم کـە (قـسیمة)ەیـەو مولەیکەبوون و، دایکیان بەحەبیبەی فارسی بانگ دەکرا کە لە تیرەی أبو أبـسی جودیلـە بوو، وەك ئاشکرایە (أم کلثوم)کچی حسن بووە لە (أم ولد).[2]

لە هەڵوێستەکانی حەسەنی کوڕی حسن ئەو قسەیەی بەرامبەر پیاوێك کرد، کـە زێـدە ڕۆیی دەکرد لەخۆش ویستنی ئال و بەیت، پێی ووت: (ئەگەرلە نـاو بـچن ئێـوە بـۆ خـوا ئێمەتان خۆش بوێ، گەر گوێڕایەڵی خوامان کرد خۆشمانتان بۆێ و، گەر سەرپێچیشمان کرد ئەو ڕقتان لێمان ببێتەوە، پیاوەکەش ووتی: ئێـوە لـە نزیکـانی پێغەمبـەر(ﷺ)و ئـال و بەیتی ئـەون. حـسن پێـووت: لەنێوبـچی ئەگـەر خـزم و نزیکایـەتی بـەبێ گوێڕایـەڵی و فەرمانبەرداری خوا سودی هەبوایە ئەوە پێغەمبەر(ﷺ)سودی بـۆ دایـك و بـاوکی خـۆی دەبوو کە زۆر لە ئێمە بۆی نزیکتر بوون. سوێند بـە خـوا مـن دەترسـم سـزای سەرپێـچی کارمان گونا هو سزای دوو چەندادن بکرێت، بە ئومێدیشم پاداشتی چاکە خوازمان بە دوو پاداشت هەژمار بکرێت، دژواری بۆ ئێوە لە خوا بترسن بەڕاستی لە بواری ئێمەوە بـدوێن.

---

١ ـ طبقات إبن سعد (٣١٨/٥، ٣١٩).

٢ ـ سيرة أل بيت النبی (ﷺ) الأطهار ـ مجدي فتحي السيد، لا ٣١٢.

هەر ئەوە باشترە بۆ نیاز مەندیتان و ئێمەش بەوە لێیان ڕەزامەند دەبین. لە پاشان حسن فەرمووی: ئەگەر ئەوەی ئێوە دەیڵێن لە بەرامبەر دینی خوا ڕاست بێت کەواتە باپیرانمان خراپەیان لەگەڵ ئێمە دا نواندوە کە ئێمەیان لەم چەشنە کارانە ئاگادار نەکردوەتەوە و تامەزرۆیان بۆ دروست نەکردووین. کابرای رافیزی هاتە گۆو ووتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە علی(ﷺ) نەفەرمووە: (من کنتُ مولاە فعلي مولاه) ؟: حسن فەرمووی: سوێند بە پەروەردگار ئەگەر مەبەست کار ڕوایی و فەرمانڕوایی بێت ئەوە ئەوپەڕی دڵسۆزیان بۆ دەر دەبڕم، بە هەمان شێوە لە نوێژ و ڕۆژ و زەکات و حەج ئەنجامداندا، ئەو ووتەی خەڵکیش کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمو یەتی: (لە دوای من علی فەرمان ڕەواتانە) گومان نیە لە هەموو کەس دڵسۆز تر و ئامۆژگارتر بۆ خەڵك پێغەمبەر(ﷺ) بووە ئەگەر وابێت وەك ئەوان دەیڵێن خوا وپێغەمبەر (ﷺ) عەلیان هەڵبژاردوە بۆ فەرمان ڕەوایی دوای پێغەمبەر(ﷺ)، کەوابێ علی کەوتووەتە هەڵەیەکی گەورە، چونکە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) نەبووە هەر وەك فەرمانی پێداوە هیچ پۆزشێکیشی بۆ خەڵك نە هێناوەتەوە[1]. بەوجۆرەش هەڵویستی ئالوبەیت ڕوون دەبێتەوە لەدژایە تیکردنی زێدە ڕۆیی.

## یازدەهەم: براو خوشکەکانی

سەرەتا کورتەیەك لە ژیاننامەی خوشك و براکانی و لە خاتوو فاتیمە(ڕزای خوای لێ بێ) دەخەینە ڕوو.

### ١- حسینی کوڕی علی (ﷺ):

ئەبو عبداللە حسینی کوڕی علی کوڕی ئەبو طالبە، نەوەو کچەزای پێغەمبەرە(ﷺ) خۆشەویست و ڕەیحانە بۆن خۆشەکەیەتی کوڕی کچەکەیەتی، فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێ)، لە چواری کۆچی لە دایك بووە، ووتراوە ساڵێکی تر بووە، بە شەهیدش وەفاتی کردووە. لە ڕۆژی عاشورای مانگی موحەڕەمی ساڵی شەست و یەکی کۆچی لە شاری کەربەلای سەر

---

١ ـ طبقات إبن سعد (٣١٩/٥، ٣٢٠).

زەمینــی عێـڕاق ـ ڕەزای خــوای لێبێـت[1] لــە باســی گــەورەیی و جــوامێری حوســەنیش فەرموودەی زۆر هاتووە لەوانە:

أ- ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە بە پشت بەستن بە یـەعلای عـامری(ﷺ)(جارێـك حـسین لەگەڵ پێغەمبەر بۆ سـەر دەعوەتێـك چـوو، دەڵێـت پێغەمبـەر(ﷺ): لـە پـێش خـەڵك وەستابوو، حسینیش لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بیگرێت، بـەڵام حسین خۆی ڕاپسکاند و لەو شوێن بـۆ ئـەو شـوێن ڕایـدەکرد، پێغەمبـەر(ﷺ) بـەدەمی پێکەنینەوە بەشوێنیەوە بوو تاکو ووتی: ئەوسا پێغەمبەر(ﷺ) دەستێکی لە پـشتەمل و دەستەکەی تری لە ژێر چەناگەدانا و ماچی کرد، ئینجا فەرمووی: (حسین لە منەو منیش لە حسینم خودایە هەر کەسێك حسینی خۆشویست تۆش خۆشت بووێ حسین یەکێکـە لـە نەوە کانی من)[2] بەمە شـکۆ و گـەورەیی حـسین دەردەکـەوێ. بـە پێـداگرتن لـە سـەر خۆشویستنی، هەر وەك دەڵێی: پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار بووە بە نوری سروش، کە مەودوا چ ئاژاوەیەك لە نێوان حسین و گەلەکەی ڕوو دەدات، دژایەتی کردن و بە ڕودا هەڵـشاخانی بە حەڕام وتـاوان ڕەتدەکاتـەوە، بـە فـەرموودەی خـۆی: (أحـب الله مـن أحـب حـسیناً) خۆشویـــستنی ئـــەو ڕاکێـــشەر و وەدی هێنـــەری بـــۆ خۆشویـــستنی پێغەمبـــەرە(ﷺ) خۆشویستنی پێغەمبەریش(ﷺ) بەرەو خۆشویستنی خوا ڕاکێشمان دەکات.[3]

ب- لە فەرموودەیـەکی تـر بوخـاری بـە ئیـسناد لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (ﷺ) ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: عوبێدوڵای کوڕی زیاد[4] هات و، سەری حسینی هەڵگرتبو لـەنێو تەشتێك دایناو سپڵەیی و بێ وەفایی دەنوانـد و دەیـووت: دەڵـێن کـەمێك جـوان بـووە، ئەنەسیش ووتی: شێوەی لە پێغەمبەرمان(ﷺ) دەچوو، سەری بە وەسمە بۆیە کرابوو.[5]

ت- لە ڕیوایەتێکی تری ئەنەس دا: کاتێك (عبیدالله کوڕی زیـاد) لـە نێـو دەفرێکـدا سەری حسینی هێنا بێ ئەمەکانە لقە درەختێکی لە نێو ددانـەکانی ورەدەدا، ئینجـا دەی

---

١ ـ البدایة و النهایة (١٥٢/٨) الإصابة (٣٣١/١، ٣٣٤).

٢ ـ فضائل الصحابة رقم: ١٣٦١ إسناد حسن.

٣ ـ تحفة الأحوذي (٢٧٩/١٠).

٤ ـ عبیدالله لە سالی ٧٦٠ ﻫ کوژراوە ـ الأعلام (١٩٣/٤).

٥ ـ الوسمە: درەختێکە لە یەمەن بە گەڵاکانی قژ بۆیە دەکەن البخاري رقم: ٣٧٤٨.

ووت: وا گومان دەبەم ووتویانە حسین جوانە، منیش ووتم: سوێند بەخوا بەدکاریت کردوە من بەم چاونە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی ئەو شوێنەی ماچ دەکرد کە تۆ ئەم لقە درەختەت لەسەر داناوە، ووتی: دواتر لەسەری هەڵگرت.[1]

## ٢- مُحسن ی کوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیب:

هیچ لە بارەیەوە نازانین تەنها ئەو فەرموودەی هانی کوڕی هانی نەبێت کە لە علی(رضي الله عنه) ڕیوایەتکراوە و دەڵێت: کاتێك حسن لە دایك بوو پێغەمبەر(ﷺ) هات و فەرمووی: (کوڕەکەم پیشان دەن بزانم چ ناوێکتان لێناوە؟) منیش ووتم: ناومان ناوە (حرب)، فەرمووی: با ناوی (حسن) بێت، کاتێك حسین لە دایك بوو فەرمووی: (کوڕەکەم پیشان دەن ئاخۆ چ ناوێکتان لێناوە؟)منیش ووتم: (حرب)، فەرمووی: با ناوی (حسین) بێت، کاتێك منداڵی سێ یەمیشمان لە دایك بوو پێغەمبەر هات فەرمووی (کوڕەکەم پیشان بدەن چ ناوێکتان ناوە؟) ووتم: (حرب)، فەرمووی: با ناوی (موحسن) بێت دوایی فەرمووی: (من بە وێنەی ناوەکانی کوڕانی هارون ناوم ناون) کە (شبر و شُبیر و مشبر بوون)[2]، وا دەردەکەوێت موحسن بەمنداڵی وەفاتی کردبێت[3]، لەم ڕیوایەتە صحیحەدا دەفامرێتەوە کەموحسین هەر لە زەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردووە بەمەش گومانی درۆزن و زیادەڕەوان پوچ دەبێتەوە لە ڕیوایەتە درۆ ئامێزەکانیان کە گوایە عمر لە فاتیمەی داوە و کۆرپەلەکەی لە بار بردووە.

## ٣- أم کلثوم کچی علی کوڕی ئەبو تاڵیب(رضي الله عنه):

علی کوڕی ئەبو تاڵیب(رضي الله عنه)أم کلثومی کچی کە لە فاتیمە بوو، لە عمر مارە بڕی کاتێك خوازبێنی کرد، ئەمەش لە بەر متمانەی زۆر و داننان بە گەورەیی و جوامێریەکەی عمر، پەیبردن بە چاکە و جوانی سیرەتەکەی، بۆ ڕاگەیاندنی ئەو پەیوستیە بە هێز و پاکەی لە نێوانیان دا بەرجەستە بوو بوو، ئەو پەیوەندیە بە فەڕ و تۆکمە داریەی دڵی دوژمنە حەسود و چاو چنۆکەکانی ئومەتی ئیسلامی ئاگر دا و دەمیان بە نێو خۆڵدا

---

١ ـ فضائل الصحابة (٩٨٢/٢) رقم ١١٩٦، إسناده حسن.

٢ ـ مسند أحمد (٩٨/١)، إسناده صحيح.

٣ ـ التبين في أنساب القريشين لابن قدامة المقدسي ١٣٣.

دەكات و دەیدا لەبەرد.[1] (أم كلثوم) كچێكی لە عمر بوو بەناوی (ڕوقیە)و كوڕێكی بوو بە ناوی (زید)، ڕیوایەتكراوەكە زەیدی كوڕی عمرلەشەوێكدا ئامادەی تێكهەڵپڕژانێك دەبێت لە هۆزی عدی كوڕی كەعب، بە مەبەستی ئاشتكردنەوە دەچێت بۆ لایان گورزێكی تێدەسرەوێنن و سەری دەپێكن، ڕاستەو خۆ دەمرێت، دایكیشی كە بەم هەواڵە دەزانێ خەم و پەژارە دای دەپۆشی و لە تاوی زەید هەر ئەو كات وەفات دەكات، لە یەك كاتدا كوڕ و دایك بەخاك ئەسپێردرێن عبدالله كوڕی عمریش نوێژی لەسەر كردن، كە حەسەنی كوڕی علی پێشی خست و لەدوای عبدالله وە نوێژی كرد.[2] لە كتێبەكەم لەسەر ژیانی عمر درێژەی زیاترم داوە لە سەر ژیانامەی (أم كلثوم).

٤- زەینەبی كچی علی كوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه):

لە زەمەنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دایك بوو و كچێكی هۆشیار و ژیر و زرینگ بووەو باوكی دای بە برازاكەی كە عبدالله كوڕی جعفر بووە، چەند منداڵێكیان بووە، كاتێك كوژرا لە گەڵ براكەی بوو، ئینجا بۆ دیمەشق بە ڕێكخرا.[3]

٥- محمدی كوڕی حەنەفییە:

دایكی لە سوبایەی هۆزی حەنەفیەیە و خەولەی كچی جعفرە(رضي الله عنه)**محمد** زانایەكی ڕێزدارو دیندارو خوا پەرست بوو، خاوەن زانستو عبادەت بوو، ئازا و بەهێز بوو، حەكیم بوو، دەگێڕنەوە لە ووتەكانی، فەرموویەتی: ئەو كەسە حەكیم نیە، كە مامەڵەی جوان نە نوێنێ یان پەیوەست نەبێت بە هەڵسوكەوتی باش تاكو خوای گەورە دەرگایەكی خێری بۆ دەكاتەوە. دەفەرمووێ: خوای پەروەردگار بەهەشتی كردووە بە نرخی ئێوە، بە هیچ نرخێكی تر خۆتان نەفرۆشن، هەركەسێك خۆی بە ویقار و ڕێزدار كرد دونیا لەلای بێ بایەخ دەبێت، هەرشتێك بۆ ڕەزامەندی خوا نەبێت مایە پوچ دەبێت، **محمد** ساڵی ٩٣ی كۆچی وەفاتی كردووە.[4]

---

١ ـ الشيعة وَ أهل البيت، لا ١٠٥.

٢ ـ أسد الغابة (٤٢٥/٧) و نساء أهل البيت منصور عبدالحكيم، لا ١٨٥.

٣ ـ الإصابة في تمييز الصحابة (١٦٧/٨).

٤ ـ التبيين في أنساب القريشيين، لا ١٣٦.

## دوازدەم: مام و پورەکانی

### ١- تالّیبی کوڕی أبوتالّیب:

دوای جەنگی بەدر بە(موشریك)ی لە نێو چوو، ووتراوە: ڕۆیشتوە و نەگەڕاوەتەوە، هیچ شوێن و هەوالّێکیشی نەزانراوە، یەکێك بوو لە مەدهۆشانی سەر زەمین، پێغەمبەر(ﷺ) خۆش دەویست، خاوەنی چەند هەلّبەستێکە، بە دلّ ناخۆشی و بەزۆر بۆ جەنگی بەدر دەرچوو، لە کاتی دەرچوونی لە گەلّ قورەیش وتوێژیان کرد- ووتیان: ئەی وەچەی هاشیم بەڕاستی ئێمە زانیومانە ـ هەر چەند لە گەلّ ئێمەش هاتوون ـ حەز و نیازتان لە گەلّ محمدە(ﷺ)ئەوسا تالّیب لەگەلّ ئەو خەلّکانەی گەڕانەوە لە بەدر بۆ مەککە گەڕاوە، شعر و هەلّبەستێکی بە شان و بالّی پێغەمبەردا ووتوەو: هاوەلّانی قولەیبی بەدر دەستیان بە گریان کرد.[1]

### ٢ - عەقیلی کوڕی أبوتالّیب:

کونیەکەی ئەبو زەید بوو، موسلّمان بوونەی دوا کەوت تاکو (عام الفتح)، ووتراوە لە دوای جەنگی حودیبە موسلّمان بووە، لە سەرەتای هەشتەمی کۆچی کۆچی کردووەو، لە جەنگی بەدر بەدیل گیراوەو، عباسی مامی ئازادی کرد، لە صەحیحی موسلیمدا ناوی لە زۆر شوێن هاتووە، ئامادەی جەنگی مؤتە بووە، بەلاّم نەبیستراوە لە فەتحی مەککە و حونەین بە ژدار بووبێت، إبن سعد ئاماژە بۆ نەخۆشی ئەو دەکات، بەلاّم زوبێری کوڕی بکار بەسەنەدێك دەگەڕێتەوە لە حسینی کوڕی علی: دەلّێت: عەقیل یەکێك بوو لە بەژدارانی جەنگی حونەین، لە خیلافەتی معاویەشدا وەفاتی کردوە، لە(تأریخ البخاري الأصغر)دا هاتوە بە سەنەدێکی صحیح و ساغ لە خیلافەتی یەزید لە تەمەن نەوەدو شەش سالّی کۆچی دوایی کردووە.

---

١ ـ الجوهرة في نسب النبی وَ أصحابه من المرتضی للندوی، لا ٢٣.

### ٣ - جعفری کوڕ ئەبو تاڵیب:

یەکێ بوو لە زوو موسڵمان بووەکان، هەژار و نەدارانی خۆش دەویست و لایان دائەنیشت و خزمەتی ئەکردن و خزمەتیان ئەکرد. لە گەڵ یەك گفتو گۆیان دەکرد، بەرەو حەبەشەش کۆچی کرد، نەجاشی و دەست و پەیوەندەکەشی لە سەر دەستی ئەو موسڵمان بوون، لە کتێبی (السیرة النبویة)ەکەمدا ـ باسم کردووە، جعفر لە جەنگی موئتە لە شام لە پێشەوە شەهید کرا و پشتی لەجەنگ نەکرد.[١]

### ٤- أم هانی کچی ئەبو تاڵیب:

کچە مامی پێغەمبەر(ﷺ)، ووتراوە ناوی فاخیتە بووە ـ ووتراوە ناوی فاتیمەیە هەندێك دەڵێن: ناوی هیند بووە و ناوی یەکەمیش ناودارترە، هوبەیری کوڕی عەمەری کوڕی عائیزی مەخزومی مارەی کردووە، کوڕێکیان بووە ناویان ناوە عەمر باوکی بەو ناوەوە بانگکراوە، لە فەتحی مەککە أم هانی پەنای دوو پیاوی بەنی مەخزومی دەدات و، پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرمووێ: (پەنامان دا ئەوەی تۆ پەناتدا ئەی أم هانی) چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەر(ﷺ)ڕیوایەتکراوە لە شەش پەرتووکەکە (الکتب الستة) و چەند شوێنێکی تر داهەن[٢]، ترمذی و هەندێکی تر دەڵێن: تاکو دوای علی ژیاوە.[٣]

### ٥- جومانەی کچی ئەبو تاڵیب:

دایکی عبداللە کوڕی ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەڵیبە. إبن سعد ژیانی دایکی فاتیمەی کچی ئەسەد باسی کردووە و، لە ژیاننامەی کچە مامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنها لە سەری دواوە و دەڵێ: بۆ ئەبو سوفیانی کوڕی حارس، کچی

---

١ ـ المرتضى، لا ٢٤.

٢ ـ المرتضى، لا ٢٥.

٣ ـ الإصابة في تميز الصحابة (٩/٣١٧ ـ ٣١٨).

جعفری کوڕی ئەبو سوفیانی کوڕی ئەبو تالیب لـە دایـك بـوو، پێغەمبـەری خـوای بـاری خورمای خەیبەری پێ بەخشی.[1]

## سێزدەم: خاڵ و پورەکانی:

خاڵەکانی هەموویان لە تەمەنێکی بچوکدا مردوونە و هیـچیان نەگەیـشتونە تەمـەنی باڵغ بوون، ناویان: قاسم و ئیبراهیمە، زوبیری کوڕی بکار ـ (عبدالله)شی زیاد کردووە کـە ناوبراوە بە تەیب و تاهیر، چونکە لـە دوای پێغەمبەرایـەتی لـە دایـك بـووە[2]، زۆربـەی زانایانی ڕەچەڵەکناسیش لەسەر ئەم ڕایەن هەیە، ووتراوە: تەیب و تاهیر دوو کـوڕی تـرن. بە کۆ ڕای زانایان عبدالله و تەیب و تاهیر لە مەکە وەفاتیانکردوە [3]، گشت منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە خدیجەی کچی خوەیلیدن، تەنها ئیبراهیم نەبێ کە لە (ماریا القطبیـة) کە مقەوقەسی مصر پێشکەشی پێغەمبەری (ﷺ) کرد، کاتێك لە ساڵی شەشـی کۆچـی بۆ ئیسلام بوون بانگهێشتی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) بە بـاوکی نـاو ئـەبرا، ووتراویـشە لـە هـەموو منداڵـەکانی گـەورەتر بـووەو پـێش هەمووشـیان مـردوە، لـە مەککـە پـێش پێغەمبەرایەتی لە دایك بووە و هەر لە تەمەنی بچوکی دا کۆچی دوایی کـردوە، ووتـراوە تا ئەو ساڵەی فامی کردووە ژیاوە، ووتراوە: بە پێ دەڕۆیـشت[4]، ووتـراوە سـواری وڵاغ و بەچکە وشتر بووە[5]، پورەکانیشی زەینەب و ڕوقیە و (أم كلثوم) بوون.

### ١- زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا(ﷺ):

زەینەب گەورەترین پوری حەسەنی کوڕی علـی کـوڕی ئـەبو تالیبـە(رضي الله عنه)، موسـڵمان بووەو کۆچی کردوە لە مەککە بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) زۆری خۆشویستووە، یەکـەمین کچی بووە بە شوی داوە، عائیشە دەفەرمووێ: أبوالعاصی کوڕی ڕەبیعـی یـەك بـووە لـە پیاوە ژمێریارەکانی ـ سەرمایە و بازرگانی و سپاردە ـ لە مەککە، کوڕە خوشکی خدیجـە

---

١ ـ الإصابة (٤/٢٥٩/٢٦٠)، المرتضى، لا ٢٧.

٢ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٣١.

٣ ـ الإستيعاب (٤/٢٨١).

٤ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٣١ الذرية الطاهرة للدواليبى، لا ٤٢.

٥ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٣١.

بووە، دایکیشی (هالـة)ی کچی خوەیلیدی خوشکی خدیجە بوو، لەدایك و باوکەوە، خدیجـە لە پێغەمبەر(ﷺ)ی داوا کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) سەرپێچی نەکردووە، ئەمە لە کاتێـك بوو هێشتا وەحی دانەبەزیبوو، خدیجە وەك منداڵەکانی خۆی سەیری دەکرد، کاتێك خـوای گەورە پێغەمبەر(ﷺ)ی ڕێزی لێنا بە(وحی) خدیجـەو کـچەکانی تێکـڕا مـسوڵمان بـوون، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازی خوای بە قورەیش ڕاگەیانـد. ڕویـان لـە عاسـی کـوڕی ڕەبیع کرد و پێیا ن ووت: ئێوە محمدتان لە پەژارە دور خستووە، بـڕۆن کـچەکانی بەسـەر دا بدەنەوە و جەنجاڵی کەن وتیان: ئەی (أبو العـاص) لـە ژنەکـەت جیابـەوە، چ ژنێکـت لـە قوڕیش ئەوێت ئێمە پێت ئەدەین. أبوعاصیش ووتی: نا، نەخێر من لە خێزانی خـۆم جیـا نابمەوە و ژنی خۆشم بە ژنێکی قوڕیش ناگۆڕمەوە. پێغەمبەریش(ﷺ) دوعای خێـری بـۆ زاواکەی کردوە[1]. أبو عـاص کاتێـك لـە شـام لـە بازرگـانی ئەگەڕێتـەوە زەینـەبی بـیر ئەکەوێتەوە و دەڵێ:[2]

ذكرت زينب لما وركت إرما    فقلت: سقياً لشخص يسكن الحرما

بنت الأمين جزاهاالله صالحة    وَ كل بعلٍ يثني بالذي علمـــــا[3]

أ- ئەمکداری(وەفای) زەینەب بۆ هاوسەرەکەی:

چۆن أبو عـاصی کوڕی ڕەبیع دڵسۆز و بە وەفا بوو بۆ زەینەبی خێزانی، زەینـەبیش بـە هەمان شێوە بۆ أبو عـاص وەفا داربووە، أبو عاص لە مەککە حەزی نەیویـست موسـڵمان بێت، خێزانەکەشی بە موسڵمانی لە گەڵی مایـەوە. تـاکو جـەنگی بـەدر هەڵگیرسـا أبـو عاص لە ڕیزی کافرەکان بەشداری شەڕەکەی کرد و بـە دیـل گـیرا، خـەڵکی مەککـە بـۆ ئازادکردنی دیلەکانیان شتیان هێنا، زەینەبیش لەبری ئازادبونی أبـو عاصـدا سـەروەت و سامانی هێنا، لەنێو ئەوشتانەشدا کە خدیجەی دایکی پێـدأبوو لـە ڕۆژی هاوسـەر گیریـدا لەگەڵ أبو عاص ـ ویـستی بـۆ ئـازادکردنی مێردەکـەی بیخاتـە ڕوو، عائیـشەی دایکـی

---

١ ـ سيرة إبن هشام (٢/٢٩٦).

٢ ـ طبقات إبن سعد (٣٢/٨)، مستدرك الحاكم(٤٤/٤).

٣ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٣١.

بڕواداران دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر تەماشەی زەینەبی کرد زۆر بەزەیی پێدا هاتەوە بە موسڵمانانی فەرموو: (ئەگەر پێتان باشە گیراوەکەی ئازاد کەن و ماڵەکەی بۆ ڕەت کەنەوە)ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئازادی دەکەین و سەرمایەکەشی بۆ ئەگێڕینەوە.[1]

جێگەی خۆیەتی لێرەدا هەڵوێستەیەك بکەین و لەو ووتە بایەخدارەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕامێنین بۆ ئەو هەموو گوزارشتە جوانە و هونەر بەرزەی لە خۆ گرتووە ژیانی خۆمانی پێ جوان بکەین. پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانی لە أبو عاص وەرگرت: بۆ کاتێ لە زەینەب جابێتەوە و بۆ لای ئەوی بنێریتەوە، چۆن زەینەب لە مەککە چەوساوە، پێغەمبەر ئەم نهێنیەی پاراست و لە پەیمانەکەی ڕاست گۆ بوو، أبو عاص زەینەبی هەناردەوە بۆ مەدینە و زەنەبیش لە ڕێگادا توشی تاقیکردنەوەیکی گەورە بوو.[2]

ب- موسڵمان بوونی هاوسەری زەینەب و ئەمانەت پارێزی:

أبو عاصی کوڕی ڕەبیع لە مەککە نیشتەجێ بوو، زەینەبیش لە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە بوو، لەو ساتەی ئیسلام لە یەکتری جیاکردنەوە، تاکو کەمێك پێش فەتحی مەککە أبو عاص بۆ بازرگانی دەرچوو بۆ شام، لەناو خەڵکدا پیاوێکی ئەمین بوو، بۆیە قوڕەیش کەل و پەل وسەرمایەی خۆیان دەدایە دەست. کاتێك کاروباری بازرگانی لەو سەفەرەدا تەواو کرد و کاروانی بەڕێ کرد، لە ڕێگادا کەوتە بۆسەی تاقمە سەربازێکی پێغەمبەر (ﷺ)و دەستیان بەسەرداگرت، ناچاریان کرد ڕابکا، کاتێك بینی تاقمەکە بەرەو پێش کەوتووتە ڕێ بە سەرمایەکەوە، لە ژێر تاریکی شەو خۆی گەیاندە ماڵی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا داوای داڵدەدانی لێ خواست ئەویش داڵدەی دا. بۆ داوای سامانەکەی هاتبوو، کاتێك پێغەمبەر بۆ نوێژی بەیانی دەرچوو خەڵك لە دوای دەستیان کرد بە (ألله أكبر) زەینەب لە ڕیزی ژنان هاواریکرد و ووتی: ئەی خەڵکینە من أبو عاصم داڵدە داوە، دوای ئەوەی پێغەمبەر سەلامی نوێژی دایەوە ڕوی لە خەڵك کرد و

---

١ ـ سير أعلام النبلاء (٤٧٢).

٢ ـ التأريخ الإسلام للذهبي، المغازي، لا ٦٩.

فەرمووی: (ئەی خەڵکینە ئەرێ بیستان ئەوەی من بیستم) ووتیان بەڵێ: (فەرمووی سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە من لەو بارەوە هیچم نەدەزانی تاکو ئێستا) پاشان چوو بۆلای زەینەب و پێی ووت: (ئەی کچە شیرنەکەم ڕێزی بگرە، بەڵام با توخنت نەکەوێت، چونکە تۆ بۆ ئەو حەڵاڵ نیت)، ئینجا بەدوای ئەو کۆمەڵەیدا دا نارد کە دەستیان بەسەر کەل و پەلەکانی أبو عاص دا گرتبوو. فەرمووی (ئەو پیاوە لە ئێمەیە وەك زانیوتانە دەستان بە سەر کەل و پەلەکەیدا گرتووە، ئەگەر پێتان باشە کەل و پەلەکانی بۆ ڕەتکەنەوە ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە، ئەگەر حەزیش ناکەن ئەوە دەسکەوتی خودایی یەو ئێوە شایەنن پێ ی) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵکو سامانەکەی ڕەتدەکەینەوە، هەموویان بۆ گەڕاندەوە، هەتا پیاو هەبوو دۆڵکەی دەهێنا، یەکێ تر کۆنە مەشکە و مەتارەی بۆ دەهێنا، ئەوسا أبو عاص بۆ مەککە بەڕێکەوت و، ماڵی هەموو ئەو کەسانەی داوە، کە لای ئەو سپاردەیان کردبوو. ئەوسا فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی قوڕەیش ئایە کەس ماوە ماڵی لای من بێت نەمدابێتەوە؟ ووتیان: نەخێر، خوا پاداشتت بداتەوە، بە ڕاستی پیاوێکی دڵسۆز و وەفادار بووی بۆ ئێمە، فەرمووی: کەواتە من: ((أشهد أن لا إله الاالله و أشهد أن محمداً رسول الله))، سوێند بە خوا هیچ شتێك نە دەبووە بەر پەچ لەڕێ بڕوا هێنانم تەنها ترسی ئەوەم هەبوو ئێوە بڵێن بەو موسڵمان بوونەی ویستی ماڵمان کەل و پەلمان بخوات دوای ئەوەی هەموو کەل و پەل و ماڵەکەم پێدانەوە دەرفەت ڕەخسا بۆ موسڵمان بوون، ئینجا بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە ڕێ[1].

عامری شەعبی و هەندێکی تر ووتیانە: کاتێك أبو عاصی کوڕی ڕەبیع لە گەڵ ماڵ و سامانی (موشریکین) ڕێکەوت بۆ شام پێ ووترا: بۆچی موسڵمان نابیت و دەستیش بەسەر ئەو ماڵ و سامانەدا ناگریت، چونکە ئەوە سەرمایەی هاوبەش پەیداکەرانە ؟ أبو عاص ووتی: ئەوە دزێوترین کارە بێمە نێو ئیسلام ئەگەر خیانەت لە سپاردەم دا بکەم.[2]

---

١ ـ التأريخ الإسلامي للذهبي، المغازي، لا ٧٠.

٢ ـ دلائل النبوة للبيهقي (١٥٤/١).

له ووتەکانی أبو عاص(ﷺ) فێـری وانەیـەکی مـەزن دەبـین، سـپاردە پاراسـتن و خـۆ ڕازاندنـەوە بـە ئاکـاری بـەرز و هەڵسوکەوتی جـوان نوانـدن هـەتا لەگـەڵ بـێ دیـن و موشریکانیش بێ، ناگونجێ موسڵمان خیانەت لە سپاردەکەیدا بکات بەهەر هۆیەك بێـت. کاتێك أبو عاصی کوڕی ڕەبیع گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بە مـسوڵمانی، لەسـەر مارە بڕینی یەکەم زەینەبی هاوسەری پێداوە، هیچ گرێبەستێکی تریان نـەکرد(مارییـەکی نوێتر)[1]، ووتەو ڕیوایـەتی زۆر ووتـراوە لـە سـەر گەیـشتنی أبـو عـاص و زەینـەب بـە پێغەمبەر (ﷺ) لەمەدینە، بەڵام هەموویان یەکدەنگن لـە سـەر دڵـسۆزی و وەفـای أبـو عاصی کوڕی ڕەبیع بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وە یەکدەنگ لە سەر ئازار دانی زەینەب لە لایەن هاوبەش پەیدا کەرانەوە لە کاتی دەرچونی لەمەککەوە بۆ مەدینە.[2]

ج ـ کۆچی دوایی زەینەب و وەچەکانی:

لە عورِوەی کوڕی زوبێرەوە هاتووە: پیاوێك لە پێشوازی زەینەبی کچی پێغەمبەر بـوو دوو پیاو هاتن و کوشتیان و هێرشیان بـۆ سـەر زەینـەب بـرد، بـە پاڵـە پەسـتۆ بەسـەر بەردێکیاندا بەرداوە، زەینەب کەوتو خوێنی لێ چۆڕا، بۆ لای ئەبو سوفیانیان هێنا، ژنانی بەنی هاشم بۆ لای خۆیان برد، پاشان بە(موهاجیر)ی هاتـە مەدینـە، زەینـەب هـەر بـەو برینە ئەتلایەوە تاکو بەهۆی ئەم برینەوە وەفـاتی کـرد، هـەوالآن بـە شـەهیدیان ژمـاردە دەکرد. وەفاتیشی لە سەرەتای هەشتی کۆچی بووە[3].

پێغەمبەر (ﷺ) لە سەر ئامادەکردنەکەی ڕاوەستأبوو (ڕێوشۆنی شۆردن و ناشتنی) أم عەطیە دەڵێ: کاتێ زەینەبی کچی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە ئێمـە ووت: ((اغسلها وتراً، ثلاثاً أو خمساً، واجعلن في الخامسة كافوراً، أو شيئاً من كافور، فإن غسلتنها فأعْمِلنني))، واتە: (بە ویتر بیشۆن، سێ جار یان پێنج جار، لـە جـاری پێنجـەم بە کافور، یان بە شتێکی وەك کـافور بیـشۆن، کـە تـەواویش بـوون پـێم بڵـێن)، ووتـی:

---

١ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٤١.

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ مجمع الزوائد للهيثمي (٢١٦/٩)

شانەیەکی پێداین فەرمووی: (بەم شانەیە سەری شانە بکەن)[1]، بەم جۆرە قەبارەی ئەو بەڵاو تەنگەژەکان ئەبینین کە پێغەمبەر و کچەکانی ئارامیان لە سەر گرتووە و بەردەوام بوون لەسەر ڕێگای بانگەواز خوازی بە پشوێکی درێژ. لەوەوە شکۆ دار کردنی ئیسلام پێویستی بە ئارامی و فیداکاری هەیە.

زەینەب لە أبو عاصی کوڕی ڕەبیع بە دوو منداڵ بوو، بە ناوی ئەمامە و، علی، علی هەر لە منداڵیدا مردووە، ووتراوە: لە زەمەنی پێغەمبەردا وەفاتی کردووە، گەیوەتە تەمەنی پێ گەیشتن(البلوغ)، کاتێك پێغەمبەر بە سواری ووشترەکەی بەرەو مەککە بەڕێکەوت، علی لە پشتی پێغەمبەر(ﷺ) سوار بووبو، کچەکەشی ئەمامە. لە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێگەیەکی پیرۆز و گەورەی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ ئیمامەتی نوێژی دەکرد بۆ خەڵك ئومامە لە سەر شانی خۆی دائەنا، ئەبو قەتادەی ئەنصاری دەفەرمووێ: پێغەمبەر(ﷺ)م بینی لە نوێژ دا ئەمامەی کچی أبو عاص و کچەزای خۆی بە سەر شانیدا هێنأبوو کاتێك دائەچماوە دایئەنا و کاتێك هەڵئەستاوە هەڵی دەگرتەوە[2]، لەعائیشە ڕیوایەتکراوە کە ئەڵقەکی زیوینی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بەدیاری ناردبوو پێغەمبەریش(ﷺ) بۆ کچەکەی زەینەبی کچی نارد، نەجاشی پاشای حەبەشی بوو، فەرمووی (بەمە خۆت برازێنەوە ئەی کچەکەم)[3] لە گێڕانەوەیەکی تر پێغەمبەر(ﷺ) هات بە نێو ئەهل و خوێشی خۆی گوارەیەکی خەرزی یەمانی پێ بوو فەرمووی: (دەیدەم بەو کەسەی خۆشەویستە لام) ئێمەش ووتمان: ئەیدا بە کچی(أبو بکر)، پێغەمبەرکچی عاصی بانگ کرد، بەدەستی پیرۆزی خۆی لەبەری کرد، [4] لەسەر چاویدا تارماییەك هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی خۆی ڕایماڵی، ئەمامە ژیا، علی کوڕی ئەبو تاڵیب دوای مردنی فاتیمە مارەی کرد، أبو عاص ئەمامەی کچی ڕێنوێنی کرد بۆ زوبێری کوڕی عەوام، وعلی کوڕی ئەبو تاڵیب کردی بە هاوسەری ژیانی، تاکو شەهید بوونی علی(رضي الله عنه)

---

١ ـ مسلم، كتاب: الجنائز (٦٤٨/٢) طبقات إبن سعد (٣٤/٨).

٢ ـ مسلم رقم: ٥٤٣.

٣ ـ مسند أحمد (١٠١/٦، ٢٦١) سنده ضعيف، الدوحة النبوية الشريفة، لا ٤٣.

٤ ـ طبقات إبن سعد (٢٦١/٨)، الإستعاب لإبن عبدالبر (٢٤٥/٤)، الدوحة النبوية الشريفة، لا ٤٣.

هەر لە لای ئەو بوو، دواتر شوی بە موغەیرەی کوڕی نەوفەلی کوڕی حارسی کوڕ ئەبو تالّیب کرد هەر لە لای ئەویش کۆچی دوایی کرد، خاتوو ئەمامە نە لە علی و نە لە موغەیرە هیچ منداڵێکی نەبوو، هەرچەندە ووتراوە لە موغەیەرە منداڵێکی بووە بە ناوی یەحیا و مردوە، بەوەش ڕەچەڵەکی خاتوو زەینەب(خوا لێ ڕازی بێ) بڕاوەتەوە.

٢. ڕوقیەی کچی پێغەمبەر (ﷺ):

بەبۆچوونی ڕاست لە دوای خاتوو زەینەب لە سی و سێ ساڵەی تەمەنی پێغەمبەردا(ﷺ) لە دایك بووە، لە گەڵ خدیجەی دایکی موسڵمان بووە، لەگەڵ خەڵکیدا بەیعەتی بە پێغەمبەری خوا داوە، عوتبەی کوڕی أبو لهب خوازبێنی کردووە، کاتێکیش ئایەتی (تَبت یَدا أبی لهب وَتبَ) دابەزی باوکی پێی ووت: سەری من لە سەری تۆ حەڕام بێت گەر کچەکەی محمد تەلآق نەدەیت، پێغەمبەر داوای لە عوتبە کرد تەلآقی بدا. کچەکەش بەهەمان شێوە داوای جیأبوونەوەی کرد. ئەمە لە کاتێکدأبوو هێشتا عوتبە لەگەڵی جووت نەبووبو دایکی عوتبە (أم جمیل) ـــ هەڵ گری دڕك و داڵ ـ ووتی ڕۆڵە تەلآقی بدە ئەمە بووەڵە بووە، ئەوسا لێی جیابۆوە، خوای گەورە لە چنگی عوتبەی دەرهێنا وەك ڕێز نانێك لە ڕوقیە و، ڕیسوایەك بۆ عوتبە، عثمانی کوڕی عەفان لە مەککە مارەی کرد، دواتر کۆچی پێ کرد بۆ حەبەشە دواتر بۆ مەدینە، خاتوو ڕوقیە یەکێکە لەوانەی کە دوو جار کۆچیان کردوە[1]، لە دوای جەنگی بەدر لە مەدینە کۆچی دوایی کردوە ـ ئیبن و شەهابی زوهەری دەڵێ: عثمان لە جەنگی بەدر بە هۆی ڕوقیەی خێزانیەوە کەسورێژەی لێهاتبوو دواکەوت، زەیدی کوڕی حاریسە مۆژدەی سەرکەوتنی بەدری دەدا، عثمانیش لەسەر گۆڕی ڕوقیە بوو، ئەبو عەمرێ کوڕی عبدلبیر دەڵێ: هیچ خیلافێك لە نێو زانایانی ژیانامە نووساندا (أهل السیر)نیە کە عثمانی کوڕی عەفان تەنها لەبەر ڕوقیە لەبەدەر دوا کەوتوە و بە فەرمانی پێغەمبەر بۆیە بەش و پشکی بۆ

---

١ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٤٤، تفسير القرطبي (٢٤٢/٤).

دیاری کرد[1]، ڕوقیه له حەبەشه منداڵێکی له عثمان بوو، ناوی نا عبدالله، بۆیه کونیەی عثمان واته: (أبو عبدالله) بانگ دەکرا عبدالله دوو ساڵ ژیاوه، ووتراوه: شەش ساڵ ژیاوه کەڵەشێرێك به دەنوك چاوی هەڵدەکۆڵێ و ڕوخساری هەڵدەئاوسێ ئەوسا نەخۆش دەکەوێت و ئەمرێت. ووتراوه: منداڵێکی له عثمان له بارچوو دواتر عبدالله هاته نێو ژیان و مرد، هیچ منداڵێکی تری نەبوو[2] إبن سعدیش: له کتێبی (الطبقات) دا دەڵێت: عثمان دوو جار کۆچی لەگەڵ کردوه بۆ ئەرزی حەبەشه، له کۆچڕەوی یەکەمدا سکێکی له عثمان لەبار دەچێ و، دواتر کوڕێکیان دەبێت بەناوی عبدالله، عثمانیش بەو ناو دار دەکرا له ئیسلامدا [3]، بەم جۆرەش ڕوقیه ڕەچەڵەکی دەبڕێتەوه.[4]

### ٣- (أم کلثوم)ی کچی پێغەمبەر(ﷺ):

پوری سێ یەمی حسن(رضي الله عنه) أم کەلسومه، به کونیه کەی خۆی ناسراوه، نەزانراوه ناوێکی تری هەبێت، تەنها حاکم له موسعەبی کوڕی زوبیر دەگێڕێتەوه که ناوی (أمیة)ه بووه، (أم کلثوم) له فاتیمه گەورەتر بووه[5]، عوتەیبەی برای عوتبەی کوڕی ئەبو لەهەب مارەی کردبوو، هێشتا له گەڵی جووت نەبوو بو دایك و باوکی داوایان کرد تەڵاقی دات هەر وەك پێشتر داوایان له عوتبه کرد له ڕوقیه جیا بێتەوه، عوتەیبه هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و ووتی: باوەڕم به ئاینت نی یه، له گەڵ کچیشت جیا بوومەوه، نه تۆ منت خۆشبووێ نه منیش تۆم خۆش دەوێت، پاشان پەلاماری پێغەمبەری(ﷺ) داو کراسەکەی دڕاند، لەکاتێکدا عوتەیبه خەریکی خۆ ڕێخستن بو بۆ شام، پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێ کرد و فەرمووی: (( أما إني أسأل الله أن یسلط علیك کلباً من کلابه)) واته: (من داوا له پەروەردگار دەکەم یەکێك له سەگەکانی به سەر تۆ دا زاڵکات) عوتەیبه

---

١ ـ الإستیعاب (١٩٥٢/٤).

٢ ـ الذریة الطاهرة للدوالنبی ص٥٣٠، الدوحة النبة الشریفة، ل٤٥.

٣ ـ الطبقات (٣٦/٨).

٤ ـ الدوحة النبویة الشریفة، ل٤٥.

٥ ـ هەمان سەرچاوه، ل ٤٦.

لەگەڵ کاروانی بازرگانی بەرەو شام کەوتە ڕێ لە ڕێگا لە شوێنێك پشویاندا کە ناو ئەبرا بە (زرقاء) لەم شەوە دا شێر بە دەوریاندا خولی دەخوارد و دەورەیاندرا بوو بەشێر، عوتەیبەش دەیووت: (ئای لەو دژواریە دایکە، سوێند بە خوا ئەم شەو گورگ هەڵم دەپاچێ هەر وەك محمد دوعای لیێ کردم) شێر لە ناو هەموویان هێرشی بۆ ئەو هێنا و پڕ بە دەم قەپی لەسەری گرت و کوشتی[١]، دوای جیابونەوەی (أم کلثوم)یش لە عوتەیبەی کوڕی ئەبو لەهەب، لە مەککە لای پێغەمبەر(ﷺ) مایەوەو لەگەڵ پێغەمبەر کۆچیان کرد بۆ مەدینە لەگەڵماڵ و منداڵی پێغەمبەر(ﷺ).[٢]

أ ـ شووکردنی:

سعیدی کوڕی موسەیب دەفەرموێت: عثمان دوای ڕوقیەی کچی پێغەمبەر(رضي الله عنه) ڕەبەن مایەوە، حەفصەی کچی عمر بێ هاوسەر بوو، عومەر بە لای عثماندا تێپەڕی فەرمووی: دەتەوێ حەفصەت لێ مارە بکەم؟ عثمانیش لە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە حەفصە بیستبوی، بۆیە هیچ وەلاًمێکی عمری نەدایەوە، عمر ئەمەی لە لای پێغەمبەر(ﷺ) باسیکرد پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەتەوێت کارێکی لەمە خێر ترت بۆ بکەم. من حەفصەی کچت مارە ئەکەم و بۆ عثمانیش باشتر لە حەفصە (أم کلثوم)ی خۆمی پێشکەش دەکەم[٣]، مارەبڕینی (أم کلثوم)لە عثمانی کوڕی عەفان (رضي الله عنه) لە ڕەبیعی یەکەم ساڵی سێ یەمی کۆچی دأبوو لە، لە (جماد الآخر)یش زەماوەندی لەگەڵ ساز دا.[٤] باسێکیش هەیەکە پێغەمبەر(ﷺ) جارێك بۆ لای کچەکەی (أم کلثوم) هاتووە بینی

---

١ ـ المعجم الکبیر للطبرانی (٢٢/٤٣٥، ٤٣٦). وزهەیری کوڕی عەلائی تیادایە و (ضعیف) الذریة للدوالبی، رقم:٧٦.

٢ ـ الدوحة النبویة الشریفة، لا ٤٦.

٣ ـ مستدرك الحاکم (٤/٤٩) صحیح.

٤ ـ سنن إبن ماجه رقم: ١١٥ فیه ضعیف، الدوحة النبویة، لا ٤٧.

سەری عثمان دەشوا فەرمووی: ئەی کچەکەم چاکە لەگەڵ (أبو عبدالله) دا بنوێنە، چونکە هاوەڵێکە بەرزترین خوڕەوشتی هەیە.[1]

ب- کۆچی دوایی أم کلثوم:

(أم کلثوم) هەر لای عثمان(ﷺ) مایەوە تاکو کۆچی دوایی کرد لە مانگی شەعبانی ساڵی نۆی کۆچی، پێغەمبەر (ﷺ) بە خودی خۆی نوێژی لە سەر کرد و لە سەر لێواری گۆڕەکەی دانیشت و ئەنەسی کوڕی مالك ووتی: پێغەمبەرم(ﷺ)بینی لە کەناری گۆڕەکەی (أم کلثوم)دانیشتبوو هەردوو چاوی فرمێسکیان دەڕشت فەرمووی: ((ئایە کێ لە ئێوە ئەم شەو گوناهو تاوانی نەکردووە)) ئەبو تەلحە ووتی من ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: دابەزە نێو گۆڕی (أم کلثوم).[2] ئەسمای کچی عمریش شوشتنی، صەفیەی کچی عبدالمتلّبیش بینی، کە (أم عطیة)م بینی غسلی لێ دەر کرد، فەرمودەکەی پێغەمبەری خوام(ﷺ)بۆ باسکردبە سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر بەمە بیشۆن.[3] لە(إبن سعد) هاتووە، علی کوڕی ئەبو تاڵیب و فەزڵی کوڕی عباس و ئوسامەی کوڕی زەید لەگەڵ تەڵحە دابەزین بۆ نێو گۆڕەکە. ئەوانەی شوشتیشیان ئەسمای کچی عومەیس و صەفیەی کچی عەبدولوتەلیب بوون.[4]

ج- منداڵەکانی:

زانایان لەسەر یەکدەنگ ئەوەی (أم کلثوم) هیچ منداڵێکی نەبووە[5]، ئەوەی جێگەی سەر سوڕمانە هەندێك لە شیعەکان تانەو تەشەر لە دروستی ڕەچەڵەکی کچەکانی

---

١ ـ مجمع الزوائد و منبع الفوائد (٨١/٩). الهاشمي دەڵێ: موحەمەدی کوڕیعبدالله تێدایە کەلە (المطلب)ەوە ریوایەتیکردوەو نایناسم و پیاوەکانی تریش متمانەدارن(ثقات)ن.

٢ ـ البخاری، کتاب الجنائز (٢٠٨/٣)رقم: ١٢٨٥.

٣ ـ البخاری رقم: ١٢٥٣ الإستیعاب رقم: ٣٠٦٣

٤ ـ طبقات إبن سعد(٣٨،٣٩/٨)، الإستیعاب رقم: ٣٥٦٣.

٥ ـ طبقات إبن سعد (٣٨/٨) الإستیعاب لإبن عبدالبر (٤٨٧/٤). الإصابة (٤٨٩/٤)، مجمع الزوائد(٢١٧/٩)، عیون الأثر لإبن سید الناس(٢/ ٣٨٠)، الدوحة النبویة الشریفة(٤٩).

پێغەمبەر(ﷺ) دەدەن لەگەڵ ئەوەشدا خەیاڵ دەبەن و کە پێغەمبەریان(ﷺ) خۆش دەوێت، نازانن بەم بەد ڕەفتاریە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز و سونەتی ڕێزدار و مێژووی ئیسلام دەوەستنەوە. بۆ بەر پەچ دانەوەشیان وتەی خوای پەروەردگار بەسە کە دەفەرمووێ ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[الأحزاب: ٥٩].

# باسی دووەم

## دایکی حەسەنی کوڕی علی خاتوو فاتیمەی زەهرا(ڕەزای خوای لێ بێ):

فاتیمـەی کـچی پێـشەنگی لـە خواترسـان و گـەورەی وەچـەی ئـادەم پێغەمبـەری خوایە(ﷺ) دایکیشی خدیجەی کچی خوەیلیدە، کە بـە دایکـی بـاوکی نـاودار دەکـرا[1]، خاتوو فاتیمە پێش پێغەمبەرایـەتی لـە سـی و پێـنج سـاڵی تەمـەنی بـاوکی لـە دایـك دەبێت.[2] پێغەمبەر(ﷺ)ساڵی ٢ی کۆچی دوای جەنگی بەدر لە کوڕی أبوتـاڵیبی مـارە کرد، چەند مناڵێکیان دەبێت بە نێوی حسن و حسین و (أم کلثـوم)و، زەینـەب و مُحـسِّن، شەش مانگ دوای کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش کۆچی دوایی کرد. خـوای گـەورە لێـی ڕازی بێت.[3]

### یەکەم: مارەیی و ئامادەکرنی:

علی کوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: فاتیمە خوازبینی دەکرا لە لای پێغەمبـەر (ﷺ)خزمتکارەکـەم پـێ ی ووتم: ئـەرێ زانیوتـە فاتیمـە خـوازبینی دەکـرێ لـە پێغەمبەر(ﷺ) منیش ووتم: نەخێر ووتی: بەڵێ خوازبینی دەکرێ هیچ گرفتێك هەیـە لـە ڕێگای چونت بۆ لای پێغەمبەر بۆ ئەوەی پێشکەشت کات ـ ووتم: جـامن چیم هەیـە بـۆ مارەبڕینی، ووتی: گەر تـۆ بـچی بـۆ لای پێغەمبـەر (ﷺ) لێـت مـارە دەکـات. علـی دەفەرمووێ: ئەو ژنە بەردەوام تکای لێکردم تاکو لـە پێغەمبـەر(ﷺ)، کاتێـك لـە بـەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتم زمانم گیرا، سوێند بە خوا نەمئـەتوانی قـسە بەتـەواوی

---

١ ـ أسد الغاية (٥/٥٢٠)، الإصابة (٤/٣٦٥).

٢ ـ الطبقات لإبن سعد (٨/٢٦).

٣ ـ حلية الأولياء (٢/٣٩، ٤٣) سير أعلام النبلاء (٢/١١٨).

دەربڕم لە بەر سام و شکۆی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لعلك جئت تخطب فاطمة؟))، واتە: (ئومێد وایە بۆ خوازبینی فاتیمە هاتبیٚ)ووتم: بەڵێ فەرمووی: (هیچ شتێکت هەیە پێی لە خۆتی حەلاڵ کەیت؟) ووتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: (ئەی زریٚ پۆشەکە چی لێهات؟ سوێند بەو خوایەی گیانی علی بەدەستە ئەو زریٚ یە هی (الحطيمية)* بەهاکەی چوارسەد درهەمە)ووتم: بەڵێ لامە، فەرمووی: (من فاتیمەم مارە بڕی لێت، بنێرە بۆ زرێکە بۆ بنێد، بۆ ئەوەی لە خۆتی حەلاڵ کەیت)، مارەی فاتیمە کچی پێغەمبەر(ﷺ)تەنها ئەو زریٚ یە بوو، [1] پێغەمبەر(ﷺ)فاتیمە لە ناو قوماشی قەدیفە و ئامادەی کرد، لەگەڵ گلاسێك و سەرینێکی پێست، کە نێوە خنەکەی گیا و گوڵ بوو.[2]

لە ڕیوایەتەکانی شیعەکاندا باس لە بەشداری عثمانی کوڕی عەففان دەکات(رضي الله عنه)لە و هاوسەرگیریە مەیمون لەو ڕووەوەو دەڵێ: پیرۆزە، گوایە علی(رضي الله عنه) فەرموویەتی: زرێکەم هەڵگرت و لە بازاڕ بە چوار سەد درهەم بە عثمانی کوڕی عەففانم فرۆشت، کاتێك پارەکەم وەرگرت و زر ێکەم دایە دەست عثمان پێی ووتم: ئەی باوکی حسن، زرێکە بە من شایەنتر نیە، پارەکەش بۆ تۆ باشتر نیە؟ ووتم بەڵێ: فەرمووی: (زرێکەش لەمنەوە دیاری بۆ تۆ بێت) منیش زرێپۆشەکە و پارەکەم هەڵگرت و بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەم گرتە بەر، پارەو زریٚ یەکەم لەبەر دەستەکانی دانا، باس و خواسی عثمانم پیٚ ڕاگەیاند، پێغەمبەریش دوعای خێری بۆ عثمان لە خواکرد.[3]

دووەم: زەماوەندی

ئەسمای کچی عومەیس دەڵێت: لە زەماوەندی فاتیمەی کچی پێغەمبەردا(ﷺ) بەشدار بووم، کاتێك بەیانیمان کردەوە پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای دەرگا و فەرمووی: ( ئەی أم ئەیمەن دوعای خێر بکە بۆ براکەم ) ئەویش ووتی: چۆن کچەکەت دەدەیت بە

---

* الحطيمة/ زرێپۆشێکی قورس و پانە شمشێر نەشکێنیٚ(و ـ کوردی).

١ ـ دلائل النبوة للبيهقي (٣/١٦٠)، إسناده حسن.

٢ ـ صحيح السيرة النبوية، لا ٦٦٧.

٣ ـ كشف الغمة للأربلي (١/٣٥٩) نقلا عن الشيعة و أهل البيت، لا (١٣٧، ١٣٨).

براكەت ؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەی أم ئەیمەن)، دەڵێت: علی هات و پێغەمبەر(ﷺ) ئاو پرژێنی کردو دوعای بۆ کرد، دوای فەرمووی: (فاتیمە بانگ کەن) فاتیمە هات لە شەرمان نسکە نسکی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (بێ دەنگ بە تۆم لە خۆشەویسترین ئەهل و بەیتی خۆم مارە بڕیووە) ووتی: ئینجا ئاوی بەسەردا پرژاند و دوعای بۆ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) خەریکبوو دەگەڕایەوە ڕەشایەکی بینی لە پێش خۆی فەرمووی: (ئەمەکێ یە؟) ووتم: منم، فەرمووی: تۆ (ئەسمای؟) ووتم: بەڵێ، فەرموو: (ئەسمای کچی عومەیس) ووتم بەڵێ فەرموو (هاتوی - بۆ زەماوەندی فاتیمە وەك ڕێز نانێك لە من) ووتم بەڵێ: دەڵێ ئینجا دوعای بۆ کردم[1]، لەم چیرۆکە بەهایێکی بەرزی کۆمەڵاتی گەورە هەیە ئەویش کۆمەك و هاوکاری تاکەکانی کۆمەڵگایە بۆ یەکتر لە بۆنە کۆمەڵایەتیە هەمەچەشنەکان.

## سێ یەم: خواردنی زەماوەند(ولیمە)

بورەیدە دەڵێ: کە علی فاتیمەی خواست پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زەماوەند پێویستی بە زیافەتە وەلیمە) سعد ووتی: بەرانێك لە سەر من، کۆمەڵێك لە ئەنصارییەکانیش چەند (صاع)ێ خۆراکیان بۆ کۆکردەوە، کاتێك شەوی زاوا هات پێغەمبەر(ﷺ) بە علی فەرموو: (ئەی علی هیچ شتێك نەکەیت تابەمن دەگەیت.. ..) پێغەمبەر دوعای بۆ لە ئاو خوێند پاشان پێغەمبەر و علی دەست نوێژی پێ شوشت، ئینجا فەرمووی: (خوایە فەڕوبەرەکەت بخەیە نێوانیان فەڕوبەرەکەت بخە وەچەیان).[2]

## چوارەم: باری گوزەرانی علی و فاتیمە(ﷺ):

گوزەرانی ژیانی علی و فاتیمە - خۆشەویسترین کەسانی پێغەمبەرن(ﷺ)- گوزەرانێکی زاهیدانەو دوور لە دونیای ڕەفاهەتە، ئارامی و ڕەنج کێشان بووە. هەنناد لە (عطاء)ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: هەواڵیان پێدام کە علی دەڵێ: چەند ڕۆژێکمان بەسەر برد بەبێ هیچ پێخۆرێك، لای پێغەمبەر(ﷺ) هیچ دەست نە دەکەوت، دەرچووم بینیم دینارێك لەسەر ڕێگا فرێدراوە، دۆشدامام لە هەڵگرتنەوە و واز لێهێنانی دواتر لەبرسیەتی

---

١ ـ فضائل الصحابة (٢/٩٥٥) رقم: ٣٤٢ إسناده صحيح.

٢ ـ المعجم الكبير للطبراني ١١٥٣ فضائل الصحابة (٢/٨٥٨)، إسناده صحيح.

و شەکەتی هەڵمگرتەوە دام بە حەماڵەکان و هەندێك ئاردم پێکڕی، پاشان چووم بۆ لای فاتیمەو ووتم: بیشێلە و بیکە بە نان، فاتیمە کاتێك هەویری دەشێلا پەرچەمی بە ڕۆخی پێڵوەکان دەکەوت بە هۆی ئەو ماند و بوون و شەکەتیەی کە چەشتبوی. پاش تەواو کردنی نانەکە ـ ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەمەم بۆ باسکرد ـ فەرمووی (بیخۆن ئەمە ڕۆزیەکە خوا بە ئێوەی بەخشیوە).[1]

شەعبی دەڵێ: علی(رضي الله عنه) فەرمووی: من فاتیمەی کچی پێغەمبەرم(ﷺ)هێنا، نەمن و نە ئەو هیچ ڕایەخێکمان نەبوو جگە لە پێستە بەرانێك نەبێت بە شەو فاتیمە لە سەری ئەنوست و، ئەمان کرد بە خوان بە ڕۆژیش ئاو کێشمان بوو، هیچ خزمەت کارێکم نەبوو جگە لە خاتوو فاتیمە[2]، موجاهید ووتی: علی فەرمووی: جارێك لە مەدینە زۆر برسی بووم، دەرچووم و داوای کارم کرد، بینیم ژنێك قوڕێکی وشکی کۆکردوەتەوە، گومانم وا پێبرد کە داوای ئاو دەکات، چووم بۆ لایوو سەبارەت بە کرێیەکە لە گەڵی ڕێکەوتم: هەر دۆڵکە ئاوێك بە دانە خورمایێك، شازدە دۆڵکەم بۆ هەڵکێشا، بەری دەستەکانم هەڵاوسان چوومەوە بۆ لای و ووتم: ئەوەی نێو دەستەکانت بەسە ئەو شازدە دانە خورمایەی بۆ ژماردم. چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و حاڵی خۆم لا گێڕایەوە، لە گەڵمن دەستی کرد بە خورما خواردن.[3]

ئەم باسە شایەتی ئەدات لە سەر حاڵ و گوزەرانێکی ناخۆش کە باوکی حسن لە مەدینە بەسەری بردوە، لێرەدا وێنەیەکی ڕفتار ئامێز و ڕەوا وەردەگرین لە بەرەنگار بوونەوەی تەنگەژەکانی ژیان ـ ها ئەوەتە علی بە دەستەکانی خۆی کرێکاری دەکات. بۆ وەدەستهێنانی بژێوێکی شەرعی، دەست لە ئەژنۆ چاوی لە دەستی خەڵکی خێر خواز نیە. وێنەیەکی تر هێزی ئارام گرتنیەتی لە سەر ئەم کارە قورس و بە ئێشە لە کاتێکدا تینی برسیەتی ئەچەشت و هێزی جەستەی دەپوکایەوە. وێنەیەکی تر قوربانی و بە خشینێەتی لە پێناو خۆشەویستانی، سەرباری ئەو هەموو برسیەتی و ئازارەی بە کارەوە دەیبینی،

---

١ ـ كنز العُمال (٣٢٨/٧) المرتضى للندوى ٤١.

٢ ـ كنز العُمال (١٣٣/٧) المرتضى للندوى ٤١.

٣ ـ صفةالصفوة: (٣٢٠/١)، الموسوعة الحديثيه مسند أحمد ١١٣٥. إسناده ضعيف لإنقطاع.

لەگەڵ ئەوەشدا دانە خورمایەکان دەپارێزی و لە گەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەیانخوات[1]، لەهەموو وانەیەك گرنگ تر کە لەم چیرۆکە وەر دەگیرێ هەژاری و دەوڵەمەندی ماددی هیچیان گوزارشت لە خۆشەویستی و ناخۆشەویستی خودا ناکەن بۆ بەندەکانی، چونکە پێوەری ڕاست و حەقیقی تەنها تەقوای خوایە جێگەی خۆیەتی ئێمەش بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵکی لە سەر ئەم بنەمایە کار بکەین.

## پێنجەم: خواناسی و(زهد)و ئارامگرتنی فاتیمە (خودا لێ ڕازی بێت).

ژیانی باوکی حسن(ﷺ) لەو پەڕی سادە و ساکاری و دوور لە خۆشگوزرانی بووە، باری ژیانی فاتیمە سەخت بووە. ئەم چیرۆکەی خوارەوەش حاڵی و بوونی فاتیمەمان بۆ وێنا دەکات و، هەڵوێستی پێغەمبەریش(ﷺ) لەمەڕ ئەم کارە دەخاتە ڕوو، کاتێك فاتیمە داوای لێ دەکات خزمەتکاریان پێ ببەخشێ، علی(ﷺ) ڕۆژێك بە فاتیمەی خێزانی ووت: سوێند بە خوا هێندە لەسەر پشت ڕاکشام تاکو سکاڵای سینگم کرد، ها ئەوەتە خوای گەورە باوکتی هەنارد لەگەڵ خزمەت کارێك دەی بڕۆ داوای خزمەت کاری لێ بکە فاتیمە(ڕەزای خوای لێ بێ) ووتی: سوێند بە خوا منیش دەستەکانم هێندە خۆراکم پێ هاڕیوون هەڵاوساون، بۆیە چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ها کچە خۆشەویستەکەم بۆ چی هاتووی)) ووتم: بۆ سڵاو لێ کردنت هاتووم، شەرمم کرد داوای لێ بکەم گەڕامەوە، علی ووتی: چیت کرد؟ ووتم شەرمم کرد داوای لێ بکەم. بەیەکەوە بەڕێ کەوتین بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)علی ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا هێندە لەسەر پشت ڕاکشام تاکو گازندەی سینەم کرد. فاتیمە ووتی: منیش دەستەکانم هەڵاوساون هێندە شتیان پێ بهاڕم. [2] خوای گەورە تۆی لەگەڵ دیلێکی خزمەتکاریکی بۆ ئێمە نارد تۆش پێمان ببەخشە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بە خوا ناتان دەمێ، چۆن ئەهلی (الصفة)فەرامۆشکەم کە ورگیان قۆڕەی دێت لە برسان، گەرچی هیچم نیە ببەخشم، بەڵام پێان ئەفرۆشم و نرخەکەیان بەسەردا دابەش دەکەم)، گەڕانەوە ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هات

---

١ ـ التاريخ الإسلامي للحميدي (١٩/٤٩، ٥٠).

٢ ـ مسلم رقم: ٢٧٢٧، السيرة النبوية للصلابي (٢/٩٩).

بۆ لایان بینی هەردووکیان لە ژێر یەك پارچە قوماشی قەدیفە دانە کاتێـك سـەری خۆیـان دائەپۆشن قاچەکانیان دەردەکەوێ، کە قاچەکانیـشیان دادەپۆشـن سـەریان دەردەکـەوێت، ڕاچڵەکان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە جێگەتانە)، ئینجا فـەرمووی: (پێتـان بڵـێم باشتر لەوەی داواتان لیّ کردم) ووتمان: بەڵێ فەرمووی: جبریل چـەند ووشـەیەکی فێرکـردم (لە دوای هەموو نوێژێك دە سبحان الله، دە الحمدالله، دە الله أکبر) بکەن کاتێکیش چوون بۆ سەر جێگەی خەوتنتان سی و سێ جار سبحان الله، سی و سـێ جـار الحمـدالله، سـی و چوار جار الله أکبر بکەن).[1]

لەم چیرۆکەی ڕابـردوو چـەند بەهایـەك لـەخۆ دەگـرێ، لەوانـە، ئـەو ڕووداوە بۆمـان ڕۆندەکاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) چـۆن مامەڵـەی لەگـەڵ تەنگـەژەی ئـابوری دا کـردوە کـە دەوڵەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە پێیدا تێپـەڕ بـووە، ئەمـەش لەئـەنجامی ئـەو ڕێـز بەندیە بووە سەرەتایەکان، بۆ ئەو لەو یانەکان، کارە یەکجار گرنگەکانی شکاندنی تاسـەی برسێتی ئەهلی (الصفة) زۆر گرنگ و داخوازکراوە، وەلێ پێداویـستی علـی و فاتیمـە بـۆ خزمەتکار بە ئەندازەی پێویستی و گرنگی ئەهلی (الـصفة) نیـە. بۆیـە پێغەمبـەر(ﷺ) ئەهلی (الصفه) لەسەر ئەوان پێش دەخات. لای پێغەمبەر(ﷺ) هۆکارەکـانی چارەسـەری تەنگەژەی ئابووری هەمە جۆر بـوون، هـەر بۆیـە بـاوکی حـسن لـە ژێـر ئـەم پـەروەردە پێغەمبەریە کاریگەر بوو هەروەها زەمەن گوزەری کرد و، ژیان تێپەڕی بەسەر علی تـاکو ڕۆژێك دێت و دەبێتە خەلیفەی موسڵمانان، هەر لەژێر شوێنەواری ئەم پەروەردەیـە پـشت لە خۆشی دونیا دەکات، لە کاتێکدا هەموو گەنجینەو بەروبومەکانی زەوی لە ژێر دەسـتی ئەو دایە، بەڵام خوا ناسی دڵی ئاخنیوە و ژیانی داپۆشیوە، ئەو وەسیەتەی پێغەمبەریـشی پاراست و بۆ هەمیشە لە بیری نەکرد وەك بۆ خۆی دەفەرمووی: سوێند بەخوا ئەم زکرانـەم فـەرامۆش نـەکردووە لـەو سـاتەی فێریـان بـووم، یـەك لـە هـاوەڵان پێـی ووت: لەشەوی(صفین)شدا ووتی: بەڵێ لەشەوی(صفین)شدا.[2]

---

١ ـ البخاري رقم: ٣٧٠٥، مسلم رقم: ٢٧٢٧.

٢ ـ مسلم (٢٠٩٢/٤).

### شەشەم: خۆشەویستی و جگەر سۆزی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خاتوو فاتیمە:

سەوبان دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سەفەر دەردەچوو کۆتا سەردانی فاتیمەی دەکرد، کاتێکیش دەگەڕایەوە سەرەتا سەردانی فاتیمەی دەکرد.[1] لە ڕیوایەتێکدا ئەبو سەعلەبەی خەشینەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) نەریتی وأبوو کاتێك لە سەفەر یاخود جەنگێك دەگەڕایەوە سەرەتا لە مزگەوت دوو ڕکعات نوێژی دەکرد، ئەوسا دەچوو بۆ لای فاتیمە ئینجا بۆلای خێزانەکانی[2]، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێ: (هەرگیز کەسێکم نەدیوە هێندەی فاتیمە هاوشێوەی دۆخ و حاڵی پێغەمبەر(ﷺ) بێت لە هەڵسان و دانیشتندا، هەرکاتێك فاتیمە دەچوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) لەبەری هەڵدەستا و ماچی دەکردو دواتر لە کۆڕی خۆی دایئەنیشاند، ئەگەر پێغەمبەریش بڕیشتابایە بۆ لای فاتیمە لە مەجلیس هەڵدەستا و پێغەمبەری ماچ دەکرد و پێغەمبەری لای خۆی دای دەنیشاند،[3] لە ڕیوایەتێکی تر هاتوە، فاتیمە دەستەکانی پێغەمبەری(ﷺ) ماچ دەکرد.[4] ئوسامەی کوڕی زەید ووتی: پێغەمبەر فەرمووی: (خۆشەویست ترین کەسی ئال و بەیتی من فاتیمەیە).[5]

علی(رضي الله عنه) ویستی کچی ئەبو جەهل بەسەر فاتیمە بێنێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)وتاری بۆ خەڵك دا، ئەو ڕیوایەتەی خاتو عائیشە لە فەرموودەی پێشتر دا بەڵگەیە لەسەر حەقیقەتی خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ هەردوو خاتوون ـ واتە فاتیمە و عائیشە ـ نەك وەك هەندێك کین لە دڵ بانگەشەی بۆ دەکەن[6]، پێغەمبەر (ﷺ) لە وتارەکەیدا فەرمووی: ((فاطمة بضعة مني فمن أغضبها أغضبني)) واتە: (فاتیمە پارچە گۆشتێکە لە من هەرکەسێك ڕقی لێ دابگرێ ئەوە ڕق لەمن دادەگرێت).[7]

---

١ ـ مسند احمد (٢٧٥/٥) الدوحة النبوية، لا ٥٦.

٢ ـ الإستيعاب (٣٧٦/٤) لقستنتدةكتيدا (أبو فروة الرهاوي) هتية و لاوازخراوة. الدوحة النبوية، لا ٥٦٠.

٣ ـ مسلم رقم: ٢٤٥٠ صحيح سنن أبى داود رقم: ٥٢١٧

٤ ـ سنن أبى داود رقم: ٥٢١٧، و صححه الألباني في صحيح سنن أبي داود(٣/ ٩٧٩).

٥ ـ مسند الطيالسى (٢٥/٢) حسن صحيح.

٦ ـ أسمى المطالب في سيرة أميرالمؤمنين على بن أبي طالب(١٣٦/١).

٧ ـ البخارى رقم: ٤١٧٣.

مەنسوری کوڕی مەخرەمە(ﷺ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) لەسەر مینبەر فەرمووی: (تیرەی هاشمی کوڕی موغەیرە مۆڵەتم لێ داوا دەکەن بۆ مارەبڕینی کچی خۆیان لە علی، نەخێر مۆڵەتیان نادەم، مۆڵەتیان نادەم، مۆڵەتیان نادەم، مەگەر کوڕی ئەبو تالیب کچەکەی من تەلاق بدا و کچەکەی ئەوان بخوازێت، کچەشیرنەکەم پارچەگۆشتێکە لە من هەرکەسێك دڵی ڕاگرت ئەوە دڵی منی ڕاگرت، هەرکەسێك ئازاری دا ئەوە ئازاری منی داوە)[1]، (ترمذ)یش بەسەنەدێك لە عبداللە کوڕی زوبێری دەگێڕێتەوە، علی(ﷺ) باسی کچی ئەبو جەهلی کرد، ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە ـ فەرمووی: (فاتیمە پارچەیەکە لە من، ئازاری من دەدات ئەوەی ئازاری ئەو بدات منی شەکەتکرد هەرکەس ئەو شەکەت بکات)[2]، یەکێکی تر لە شانازیەکانی خاتوو فاتیمە گێرانەوەکەی حاکمە بە ئیسنادێ لە بورەیدە دەفەرمووێ:خۆشەویسترین کەس لە ئافرەتان لای پێغەمبەر(ﷺ) خاتوو فاتیمە بوو، لە پیاوانیش علی بوو.[3]

لێرەدا هیچ هاودژێك لە گەڵ فەرموودەی صحیح و دامەزراوی عەمرِی کوڕی عاص نافامرێتەوە، کاتێك پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرێت کێ خۆشەویسترین کەسە لای تۆ؟ دەفەرمووێ: (عائیشە) لە پیاوانیش (باوکی).[4] مەبەست لەم فەرموودەیە (واللە أعلم) فاتیمە و علی خۆشەویسترین ژن و پیاوی ئال و بەیتن لای پێغەمبەر هەر سەبارەت بەم باسەشە (إبن العربی)لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: (خۆشەویسترین کەس لە لای پێغەمبەر(ﷺ) أبو بکرە، لە خێزانەکانیشی عائیشەیە)، وە خۆشەویسترین ژن و پیاوی ئال و بەیتیش فاتیمە و علی یە: بەم پۆلێن کردنەش فەرموودەکان ئاوێتەی یەك دەکرێن و هاو دژیەکەکان دەپوکێنەوە.[5]

---

١ ـ البخاري رقم: ٥٢٣.

٢ ـ فضائل الصحابة (٧٥٦/٢) رقم: ٧ إسناده صحيح.

٣ ـ المستدرك، كتاب معرفة الصحابة (١٥٥/٣) صحيح الإسناد.

٤ ـ البخاري رقم: ٤٣٥٨.

٥ ـ عارضة الأحوذي (٢٤٧/١٣، ٢٤٨)، العقيدة في اهل البيت، ل ١٣٧.

## حەوتەم: ڕاستگۆیی زمان و قسە کردنی:

حاکم دەگێڕێتەوە عائیشە هەرکاتێك فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ)ی یاد دەکەوتەوە دەی فەرموو: کەسێکم نەبینی لە فاتیمە ڕاست گۆ بێت، مەگەر کوڕەکەی نەبێت.[1] بەمە شانازێکی ئاشکرا بۆ فاتیمە تۆمار دەکرێ، عائیشەی دایکی بڕواداران وەسفی فاتیمە دەکات بەوەی: فاتیمە هاوشێوەی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، لە شێوە و ڕوخسار و ڕێڕەو وجوانی و، هەر وەك پابەندیشی بە ڕاستگۆییەوە هەر لە شێوەی ئەو دەچوو.[2]

## هەشتەم: گەورەیی فاتیمە لە دونیاو دوارۆژدا

چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەری(ﷺ) ڕاست گۆ هاتوون و بەڵگەن لەسەر پایەی بەرزی فاتیمی لە دونیا و دوارۆژدا، ترمذی لەئەنسی کوڕی مالك ڕیوایەتیکردووە ـ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((حسبك من نساء العالمين مريم بنت آل عمران و خديجة بنت خويلد و فاطمة بنت محمد و آسيا امرأة فرعون))، واتە: (ئەی فاتیمە بەسە بۆ تۆ یەکێکی لە نێو ژنانی جیهان دا وەکو، مەریەمی کچی عیمران، خدیجەی کچی خوەیلیدە، فاتیمەی کچی محمد، ئاسیای خێزانی فیرعەون).[3]

حاکم بە پشت بەستن بە أبو سعیدی خودری ڕیوایەتیکردووە دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((فاطمة سيدة نساء أهل الجنة إلا من كان سيدة نساء أهل الجنة))، واتە:(فاتیمە گەورەی ژنانی بەهەشتە تەنیا مەریەمی کچی عیمران نەبێ[4])، بخاری لە باسی (شانازیەکانی فاتیمە) دەفەرمووێت پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (فاطمةُ سَيدةُ نِساءِ اهْلِ الجنة)، واتە: (فاتیمە گەورەی ژنانی بەهەشتە).[5]

---

١ ـ المستدرك (٣/١٦٠، ١٦١)، صحيح على شرط مسلم و وافقه الذهبي.

٢ ـ العقيدة في اهل البيت، لا ١٣٦.

٣ ـ فضائل الصحابة (٢/٢٥٥) رقم ١٣٢٥، صححه الألباني المشكاة(٣/ ٧٤٥).

٤ ـ فضائل الصحابة رقم: ١٣٣٢ ـ إسناده حسن لغيره.

٥ البخاري كتاب: فضل الصحابة (٤/٢٥٢).

## نۆیەم: أبو بكر و فاتیمە لە باسی میراتی پێغەمبەردا (ﷺ):

عائیشە دەفەرمووێ: فاتیمە و عەبباس(رضي الله عنه) بۆ داواكاری بەشە میراتی خۆیان لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ لای أبو بكر هاتن، داوای زەویەكەیان لە (فدك) و بەش و پشكەكەیان لە (خیبر) دەكرد، أبو بكر(رضي الله عنه) پێ فەرموو: بەلاّم من لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((لا نورث ماتركنا صدقة، إنما يأكل آل محمد(ﷺ) من هذا المال)) واتە: (میرات ناگرین لەو خێرو سەدەقەی لە دوای خۆمان بە جێ دەهێڵین، بەڵكو ئال و بەیتی محمد (ﷺ) لەو ماڵە دەخۆن)[1]، لە گێڕانەوەیەكی تر أبو بكر دەفەرمووێ: هیچ كارێكم پشت گوێ نەخستووە كە پێغەمبەر(ﷺ) كردبێتی من كردمەوە ئەترسم گەر فەرمانێكی فەرامۆش كەم لاڕێ بم[2]، دووبارە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێ: دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) هاوسەرەكانی ویستیان عثمانی كوڕی عەففان بۆ لای أبو بكر بنێرن سەبارەت بە میراتی پێغەمبەر(ﷺ)، عائیشە پێ ی فەرمووی ئەی لە پێغەمبەرتان(ﷺ) نەبیستوە دەیفەرموو: (لانُورث مَاتركناصَدقَة)، [3] ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وەڕسەی من بە پارە و پول دابەش ناكرێ، ئەوەی من جێدەهێڵم بژێوی هاوسەرەكانم و خەرجی كرێكارانمە، ئائەمەیە سەدەقە)[4]، بەم شێوەیە أبو بكر(رضي الله عنه) مامەڵەی لە گەڵ فاتیمە كرد بە پابەند بوون بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر بۆیە أبو بكر دەی فەرموو: (سوێند بە خوا كارێكم فەرامۆش نەكردوە كە پێغەمبەرم بینیبێت ئەنجامی دابێ)[5]، دایكی حەسەنیش وازی لەم كێشمە كێشمە هێنا دوای ئەوەی أبو بكر فەرموودەی بە بەڵگە بۆ هێنایەوە و ئەم باسەی بۆ ڕوون كردوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فاتیمە ڕاستی قەبوڵ كردووە و ملكەچی فرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، شیعەكان لە چیرۆكی میراتی پێغەمبەر(ﷺ) زیادەڕەوێكی زۆریان

---

١ ـ البخاري رقم: ٦٧٢٦.

٢ ـ مسلم رقم: ١٧٥٩.

٣ ـ البخاري رقم ٦٧٣٠، مسلم رقم: ١٧٥٨.

٤ ـ البخاري رقم: ٦٧٢٩.

٥ ـ البخاري رقم: ٦٧٢٦

کردوە، ئەم باسەم لە کتێبەکەمدا(أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علی بن ابي طالب) گفتوگۆی کردووە بەجوانی کێشەی میراتم لە نێوان أبو بکر و خاتو فاتیمەدا ڕوون کردوە تەوە.[1]

## دەیەم: دڵ نەرمی و چاو پۆشی فاتیمە لە گەڵ أبو بکر(ﷺ):

چەسپاو و سەلماوە کە فاتیمە لە دوای مەسەلەی میرات لە أبو بکر ڕازیبووە، وەفاتی کرد و لە أبوبکر ڕازی بوو. لەشەعبی ڕیوایەتیکردوە دەڵێ: کاتێ فاتیمە(ڕەزای خوای لێ بێت)نەخۆش کەوت أبو بکر هات بۆ سەردانی فاتیمە و داوای مۆڵەتی کرد، علی فەرمووی: ئەی فاتیمە أبو بکر داوای مۆڵەتت لێ دەکات، فاتیمە ووتی: تۆ حەز دەکەی بێت ؟ علی ووتی: بەڵێ، فاتیمە ڕێگەی پێدا و هاتە ژوورەوە و زۆر خۆشحاڵ بوو لە فاتیمە، ئینجا فەرمووی: سوێند بەخوا دەست بەرداری ماڵ و سامان و ئەهل و عەشیرەت بووم، تەنیا بۆ ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەر و قایل بوونی ئال و بەیت و ئێوەی ڕێزدار، فاتیمە هێندە خۆشحاڵ بوو منیشی شادومان کرد[2]، ئیبن و کەسیر دەڵێ: ئەم سەنەد زۆر باش و بەهێزە بۆ پشت پێ بەستن و دیارە عامری شەعبی خۆی لە علی بیستویەتی یان لە کەسێکی بیستوە لە علی بیستویەتی[3]، بەوەش تۆمەت و تانەی شیعەکان پوچەڵ دەبێتەوە کە لە سەر أبو بکریان هەڵبەستووە گوایە فاتیمە کینەی لێ داگرتووە وە تۆراوە. گەر واشمان دانا فاتیمە لە سەرەتای کارەکەدا تۆرا بووبێت خۆ لە دوایی دا تورەیی و گرژی سەبارەت بە أبو بکر دەڕەوێتەوە و بە دڵێکی ڕازیبونە لە أبو بکر سەر دەنێتەوە، ناشێ و ناکرێ کەسێکی ڕاستگۆ لە خۆشەویستی فاتیمە ڕازی نەبێت لێی[4]، ئەمەش لەگەڵ فەرموودەکەی عائیشە تێك ناگیرێ (تەنیا ئالی محمد لەم سەرمایە دەخۆن، من هیچ گۆڕانێك لە خێراتی پێغەمبەر دا ناکەم، چۆن هاتووە هەروا دەیبەم بەڕێوە. من هاوسەرەکانی پێغەمبەرم بەم شێوە فێر کردن بۆیە أبو بکر ڕێگای نەدا هیچ بدرێ بە

---

١ ـ أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علی بن ابي طالب (١/١٩٩).

٢ ـ سنن الكُبرى للبيهقي (٦/٣٠١).

٣ ـ البداية و االنهاية (٥/٢٥٣).

٤ ـ الإنتصار الصحب و الأل، لا ٤٣٤.

فاتیمە، سەبارەت بەم کارە فاتیمە تورە بوو تاکو مردن قسەی لە گەڵ أبو بکر نـەکرد)[1]، ئەمە بە گوێرەی زانیاری عائیشە ڕیوایەتی شەعبی زانیاری زیاتر دەدات، چونکە أبو بکر دواتر قسەی لە گەڵ کردوە و فاتیمە خۆشحاڵی خۆی بۆ أبو بکر دەربڕیـوە، عائیـشە ئـەم کارە ڕەتدەکاتەوە شەعبی چەسپاوی دەکـات، شـتێکی بەڵگـە نەویـستە لـە لای زانایـان ووتەی چەسپاو لە پێش ووتەی ڕەتکراو دایە لەبـەر ئـەوەی نیـشانەی چەسـپاو دەسـتەبەر دەبێت، بەبێ زانیاری ڕەتکار، بە تایبەت لەم باسەدا، سەردانی أبو بکر بۆ لای فاتیمە لـە کاتی نەخۆشی دا ڕووداوێکی هێندە گرنگ و گەورە نیە تاکو لە نێو خەڵك تەشەنە بکـات و هەموو کەس پێوە ئاگادار بن، بەڵکو کارێکی سادەو ساکارە و کەسێکیش نـەی بینێـت لێی بێ ئاگا دەبێت، بۆیە زۆر گرنگی نەدراوە بە هێنان و بردنی ئەم باسە لە نێـو خـەڵك، ئەوەی زانایان باسیانکردوە ئەوەیە فاتیمە خودا لێ ڕازیبێت لەگەڵ أبو بکر(ﷺ) بە هـیچ شێوەیەك قسەی نەبڕیوە، چونکە نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی دروست نـەبوونی زیـاتر لە سێ ڕۆژ قسە نەکردنی موسڵمانان لەگەڵ یەکدا دیار و بەرچـاوە، بـەڵام ئـەو ماوەیـەی قسەی لەگەڵ نەکردوە لەبەر بێ پێویستی بووە.[2]

قورتوبی لە بارەی ڕاڤەی فەرموودەکەی عائیشە وە دەڵێ: فاتیمە (خودا لێ ڕازیبێـت) بە أبو بکر(ﷺ) نەدە گەشت لە بەر سەر قاڵی بە کۆچی دوایی باوکی و هـۆگر بـووی بـە گۆشەی ماڵـەوە، کەچـی ڕاوی ئەمـەی بـە عـاجز بـوون لێکداوەتـەوە. پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (لايحل لِمُسلِم أنْ يهجُرَ أخاه فوق ثـلاثٍ)، واتە: (دوروست نیـە لـە سـێ ڕۆژان زیاتر قسە لەگەڵ یەکدی نەکەن) لە کاتێکدا فاتیمە لـە هـەموو کـەس زیـاتر شـارەزایی حـەڵاڵ و حـەڕام بـووە، دوور تـرین کـەس بـوو لـە سـەر پێـچی فەرمانـەکانی پێغەمبەر(ﷺ)نەکردوو، چۆن وانابێت کە پارچـەیەکە لـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)، کـە خاتوون و گەورەی هەموو ژنانی ئەهلی بەهەشتە[3].

---

١ ـ البخاري رقم: ٤٢٤، رقم: ١٧٥.

٢ ـ الإنتصار للصحب والأل، لا ٤٣٤.

٣ ـ المفهم (٧٣/١٢).

فاتیمه خەریکی حوزن هەڵکێشان بووه به له دەستدانی ڕێزدار ترین دروستکراوی خوا، ئەو ناخۆشیه کوشندەیەی که هەموو ناخۆشیەکان له بەرامبەری بچوك دەبنەوه، هەروەك فاتیمه سەرقاڵی نەخۆشیەکەی بوو له نێو پێخەفەکەی هەڵکوڕمأبوو که له هەموو کار و بارێکی دەرەوه بێ ئاگای کردبوو. هەتا له دیداری أبو بکریش بێ بەش بوو. ئەمیش خەلیفەی موسڵمانانه و هەموو چرکه ساتێك به مشوری ئومەت و جەنگی هەڵگەڕاوەکان و کار و باری ترەوه سەر قاڵه، هەروەك فاتیمه دەرکی به نزیکی و پەیوەستی کردبوو به پێغەمبەری خوا پێغەمبەریش هەواڵی ئەوەی پێدا بوو کەتۆ یەکەم کەسی له ئەهلی من به من دەگەی[1]، توخودا کەس بەوێنەیه هەواڵی پێدرابێ چۆن بیر له کاری دونیا دەکاتەوه، ئای چەنده جوانه ووتەی (ملهەب) که له عەینی گواستۆتەوەو دەڵێ: هیچ کەسێك ڕیوایەتی نەکردووه هەردووکیان به یەك گەیشتبن و سەلامیان لەیەکتر نەکردبێ، بەڵکو قسه ڕاست فاتیمەی هۆگری ماڵەوه بووه ڕاویش به توڕەبوون و ترازانی ڕاڤەکردووه[2] ئەوەی ئەم باسه ڕوون دەکاتەوه زیارەتی أبو بکره بۆ لای فاتیمه و دڵخۆشی ڕەزامەندی دەربڕینیەتی بۆی. وەك له پێشەوه ڕابورد.

## یازدەم: کۆچی دوایی خاتوو فاتیمه(ڕەزای خوای لێ بێت):

ئەوەی کەبەڵگەیه بۆ ئەو پەیوەندیه گەرم و گوڕ و تۆکمەیەی نێوان خاتوو فاتیمه و ئەبو بکری سدیق، ئەسمای کچی عومەیسیی هاوسەری أبو بکری سدیقه که دەبێته پەرستاری خاتوو فاتیمه له نەخۆشی گیانەلادا، هەر لەگەڵی دا ئەمێنێتەوه تا دوا هەناسه هەڵکێشانی و دواتر بەشداری شۆردن و بەخاك سپاردنی له دوا مەنزڵگه دەکات، علی خۆی چاودێری نەخۆشیەکەی فاتیمه دەکرد و هەر خۆشی ئەسمای به پەرستار دەست نیشان کرد، فاتیمه لەسەره مەرگ بۆ چۆنیەتی کفن و دفن و ناشتنی ئەسمای ڕاسپارد و ئەسماش به ئەرکی ڕاسپاردە هەستا.[3]

---

١ ـ مسلم رقم: ٢٤٥.

٢ ـ أبا طیل یجب ان تُمحی من التأریخ، لا ١٠٨

٣ ـ الشیعة و اهل البیت، لا ٧٧.

خاتوو فاتیمه به ئه‌سمای ووت: من پێم ناخۆشه که ئافره‌ت ده‌خرێته دوتویی پۆشاکێك و به‌مه‌ش ده‌پێچرێ ئه‌سما ووتی: ئه‌ی کچی پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) ئه‌ته‌وێت شتێکت نیشان بده‌م من له حه‌به‌شه بینیومه چه‌ند لقه دره‌ختێکی ته‌ڕ لار ده‌که‌نه‌وه پاشان به‌رگێکی به‌سه‌ردا دێنن، فاتیمه ووتی: ئای چه‌نده جوان و نه‌خشه سازه ئه‌وکاره، ژن و پیا و به‌م هۆیه لێك جیاده‌کرێته‌وه و ده‌ناسرێت.[١]

له إبن و عه‌بدولبه‌ره‌وه ده‌ڵێ: فاتیمه(ڕه‌زای خوای لێ بێت) یه‌که‌م که‌سبوو له ئیسلام به تأبووت داپۆشرا، پاشان زه‌ینه‌بی کچی جه‌حش. أبو بکریش هه‌میشه له په‌یوه‌ندی بوو له گه‌ڵ علی بۆ پرسینی نه‌خۆشیه‌که‌ی فاتیمه(ڕه‌زای خوای لێ بێت)، به پێچه‌وانه‌ی گومانی هه‌ندێ خه‌ڵك، دوای ئه‌وه‌ی فاتیمه نه‌خۆش که‌وت علی سه‌رقاڵی ئه‌نجامدانی نوێژه فه‌رزه‌کانی بوو له مزگه‌وت دوای ته‌واو بوون أبو بکر و عمر له باره‌ی نه‌خۆشیه‌که‌ی فاتیمه‌یان له علی(رضي الله عنه) پرسی، له لایه‌کی تر أبو بکر(رضي الله عنه) له ئه‌سمای هاوسه‌ری ده‌پرسی که‌پارێزگارو په‌رستاری حه‌قیقی فاتیمه بوو. ئه‌م ڕۆژه‌ی فاتیمه به‌خاك سپاردرا مه‌دینه پڕ بوو له شیوه‌ن و گریانی پیاو و ژن، خه‌ڵك هه‌مووی مه‌د هۆش مابوو، ئه‌تووت ڕۆژی ناشتنی پێغه‌مبه‌ره (ﷺ)، أبو بکر و عمر دڵنواییی عه‌لیان(رضي الله عنه) ئه‌دایه‌وه پێیان ده‌ووت: ئه‌ی باوکی حسن له پێش ئێمه نوێژ له‌سه‌ر کچه نازداره‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر مه‌که و به‌نوێژ پێشمان مه‌که‌وه.[٢]

وه‌فاتی فاتیمه له شه‌وی سێ شه‌ممه بوو که هاوکاتبوو له‌گه‌ڵ سێ یه‌م ڕۆژی ڕه‌مه‌زان ساڵی یازده‌می کۆچی، له مالیکی کوڕی جعفری کوڕی محمد له باوکی و ئه‌ویش له باپیری علی کوڕی حوسه‌ین ڕیوایه‌تیکردووه ده‌ڵێ: فاتیمه(ڕه‌زای خوای لێ بێت) له ماوه‌ی نێوان مه‌غریب و عیشا کۆچی دوایی کرد أبو بکرو عمر و عثمان و زوبه‌یر و عبدالرحمنی کوڕی عه‌وف ئاماده‌ی گیان سپاردنه‌که‌ی بوون ـ فاتیمه(ڕه‌زای خوای لێ بێت) ئاماده‌کرا بۆ نوێژ له‌سه‌ر کردن ـ علی(رضي الله عنه) ووتی: ئه‌ی أبو بکر فه‌رمووی پێش که‌وه أبو بکر فه‌رمووی تۆ

---

١ ـ الإستيعاب (٣٧٨/٤).

٢ ـ الشيعة و أهل البيت ص. ٧٧، كتاب: سليم بن قيس، لا ٢٥٥.

پێش کەوە ئەی باوکی حسن دواتر علی فەرمووی سوێند بەخوا ئەی أبو بکر غـەیری تـۆ کەس نوێژی لەسەر ناکات، بۆیە أبو بکر نوێژی لەسەر کرد و بەشەو بە خاکیان سپارد، لە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە أبـو بکـر نوێـژی لەسـەر فاتیمـە کـرد چـوار الله أکـبری (تەکبیرە)کرد[1]، لە ڕیوایەتی موسلیم هاتووە، کە علی نوێژی لە سـەر کـردووە ئەمـەش ڕیوایەتێکی ڕاست و ڕاجیحە.[2]

ئەوەش لە هەندێك پەڕاوی شیعەکان دا هاتووە گوایە فاتیمە وەسیەتی بە علی کرد کە هیچ کەسێ لەو کەسانەی ستەمیان لێ کردوە و مافیان پێشێل کردوە بە هـیچ شێوەیەك لە سەر گۆڕی ڕانەوەستن، چونکە ئەوانە دوژمنـی خـۆی و بـاوکین، ئەمـەش یەکێکـە لـە هەڵبەسـتراوە پوچـەڵەکان و، جێگـەی ڕاسـتی و متمانـە نـین، هـەروەك خاوەن کتێبـی ژیاننامەی حەسەنی کوڕی علی (حياة الإمام الحسن بن علي)باسی کردون.[3]

(محمد إقبال)یش کۆمەڵە هەڵبەستێکی شیرین و ناسکی لە سەر خـاتوو فاتیمـە(ڕەزای خوای لێ بێت) ووتوە:

| | |
|---|---|
| نسبُ المسيح بَنَى لمريـــــــــم سيرةً | بقيت على طول المدى ذكراهـــا |
| والمجد يشرف في ثلاث مطالـــــع | في مهد فاطمة فما أعلاهـــــا |
| هي بنت من هي زوج من هي أم من | من ذا يداني في الفخار أباهـــا |
| هي ومضة من نور عين المـــصطفى | هادي الشعوب إذا تروم هداهـــا |
| من أيقظ الفطر النيام بروحـــــه | وكانه بعد البلى أحياهــــــا |
| وأعاد تأريخ الحياة جديـــــــدة | مثل العرائس في جديد حلاهـــا |
| هي أسوة للأمهات وقـــــــدوة | يترسم القمر المنير خطاهــــــا |
| جعلت من الصبر الجميل غذاءهـا | ورأت رضا الزوج الكريم رضاها |

١ ـ المختصر من كتاب الموافقة، لا ٦٨ في سنده ضعف.

٢ ـ مسلم رقم: ١٧٥٩.

٣ ـ حياة الإمام الحسن بن علي، باقر القرشي (١٦٤/١).

واتە: ڕەچەڵەکی مەسیحی کوڕی مەریەم ژیاننامەیەکی دروست کرد بەدرێژایی سەردەمەکانی باسی هەبێت، شکۆی لە سێ شوێنەوە هەڵدێ، کە لە لانکەی فاتیمە دایە، کە کچی پێغەمبەر(ﷺ)و خێزانی علی(رضي الله عنه)و دایکی حسن و حوسەینی خاوەن شانازیین، دڵۆپێکی ڕوناکی چاوی پێغەمبەر(رضي الله عنه) ڕێنیشاندەری گەلان و هیدایەت دەرێتی، پێغەمبەری بەگیانی خۆی جیهانی لەخەو ڕاپەڕاند و لەدوای ماندوبوون و نزیکی لە نێو چوون زیندووی کردەوەو، مێژوویەکی نوێ ی بۆ ژیان هێنایەوە وەکو چۆن بوك لە مانگی هەنگوینی و شەوی تامەزرۆییدابێ، بەڕاستی فاتیمە پێشەوا و پێشەنگی دایکانەو مانگی ڕوناکیش هەنگاوەکانی دەکێشێ، فاتیمە ئارامگری و جوانی کردە خۆراك ڕەزامەندی مێردە بەڕێزەکەشی بەچاو بینی.

تا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| لولا وقوفي عند شرع المصطفى | وحدود شرعته ونحن فداهـــا |
| لمضيت للتطواف حول ضريحها | وغمرت بالقبلات طيب ثراهـا |

واتە: گەرسنوری شەرعی ئیسلام و پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) نەدەبوو کە خۆمانی لەپێناودا فیدا دەکەین، ئەوە بەدەوری گڵکۆکەیدا ئەسوڕێنەوەو لە ماچی خۆڵەکەیدا خۆمم نقوم دەکرد.

## باسی سێ یەم

## پلە و پایەی حسن لە لای باپیری خۆشەویستی مصطفی (ﷺ):

موژدە پێدانی پێغەمبەر(ﷺ)بەلە دایك بوونی حسن زۆر گەورە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لە باوەشی ئەکرد و یاری و گەمەی لەتەك ئەکرد، بانگی دەکرد بۆ ئەوەی بەسەر سینگی هەلژنێ و یاری لەگەڵ بکات، حسن لەماڵ و پێغەمبەر(ﷺ)گەشە و نمای کرد، لە ساتی بوونیەوە تا نێو جەوانی پێغەمبەر(ﷺ) چاودێری دەکرد، تایبەت حسن شێوەی پێغەمبەر(ﷺ)دەکرد لە ڕەنگ و ڕوخساری، حسن لەو پلەو پایە گەورە و ڕێز و نەوازشە بەرزەی باپیری (ﷺ) چێژی وەر دەگرت، ئەمە تەنیا لەبەر ئەوە نەبوو کەنەوەی

پێغەمبەر(ﷺ) بوو بەس، بەڵکو حسن کۆمەڵێ خەسڵەتی جوان و ئاکاری بەرز و ملکەچی و بەخشندەی تێدا هەڵکەوتبوو [1]، ئەمەی خوارەوەش هەندێك لە و فەرموودە و هەڵوێستانەن کە پلەو پایەی حسن لە لایەن باپیریەوە (ﷺ) دەردەکەوێ.

## یەکەم: خۆشەویستی و بەزەیی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حسن و گاڵتەکردن لە گەڵیدا:

١- ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووێ: ((مَنْ أحب الحسن والحسين فقد أحبني ومن أبغضها فقد أبضني))، واتە: (هەر کەسێك حسن و حسینی خۆشویستوە ئەوە منی خۆشویست، وە هەر کەسێ ڕقی لیان بۆوە، ئەوە ڕقی لەمن بۆتەوە). [2]

٢- عبدالله کوڕی مەسعود دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)نوێژی دەکرد، حسن و حسین لەسەر پشتی دانیشتبوون، خەڵك دووریان خستنەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وازیان لێ بێنن بە دایك و باوکەوە بە فیدایان بم، هەرکەسێ منی خۆشدەوێت با ئەو دوو منداڵەی خۆشبوێ). [3]

٣- ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بە حەسەنی فەرموو: ((اللهم إني أحبه، فاحبه وأحب من يحبه)) واتە: (ئەی پەروەردگارە من خۆشم دەوێت تۆش خۆشت بوێت، وە ئەو کەسەشتم خۆش ئەوێت کە خۆشی دەوێت) [4] ئەبو هورەیرە دەڵێت: هەرکاتێ دەمدیت چاوەکانم فرمێسکیان دەباراند. [5]

٤- لە بەڕائی کوڕی عازبەوە دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلیم بینی لەسەر شانی پێغەمبەر(ﷺ)، دەیفەرموو (خوایە من خۆشم دەوێت تۆش خۆشت بووێ). [6]

---

١ ـ الحسن بن علی سیرته دوره السیاسي والإداري، فتیخان کردی، لا ٤٥، الدوحة النبوية الشريفة٧٢.

٢ ـ سنن النسائي رقم: ٨١٦٨ قام الشيخ عثمان الخميسى بتخريج الحديث و حكم درجته بأنه حسن لذاته في رسالته أحاديث شأن السبطين لا ٣١٢.

٣ ـ أحاديث بشأن السبطين،ص ٢٩٣ عثمان الخميس، حديث حسن.

٤ ـ مسند أحمد (٢٤٩/٢، ٣٣١) سنده صحيح.

٥ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٧٤.

٦ ـ مسلم رقم: ٢٤٢٢.

٥- له علی(رضي الله عنه) ڕیوایەت کراوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حسن و حسینی لە نێو دەست گرتبوون دەیفەرموو: ((من أحبني وأحب هذين و أباهما وأمهما كان معي درجتي في يوم القيامة)) واتە: (هەر کەسێ من و ئەو دوو کوڕە و دایکی و باوکی ئەو دوو کوڕەی خۆشدەوێت ئەوە لە ڕۆژی قیامەت لە پلەی من دایە) ئەحمەد و ترمذی ئەم فەرموودەیان ڕیوایەتکردوە ووتی: (لەگەڵ منە لە بەهەشت) فەرموودەیەکی غەریبە.[1]

٦- یەعلای کوڕی مەڕە دەڵێت: حسن و حسین پێش برکێیان دەکرد بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یەکیان پێش ئەوی تر کەوت و، دەستی خستە گەردەن و بەزگییەوە گوشی، جارێك ئەوی ماچ دەکرد و جارێکی تر ئەویتر، پاشان فەرمووی: (من ئەو دوو ڕۆڵەم خۆشدەوێت دەی ئێوەش خۆشتان بووێ ـ، ئەی خەڵکینە: (منداڵ ترسنۆك و چاو چنۆکەرە)).[2]

٧- لە ئیسرائیلەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێت: لە پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو: هەر کەسێك حسن و حسینی خۆشبووێ ئەوە منی خۆش دەوێت، وە هەر کەسێ ڕقیان لێ دابگرێت ڕقی لەمن داگرتووە.[3]

٨- زووهێری کوڕی ئەقمەڕ دەڵێت: پیاوێکی (أزدس)ووتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم) بە حەسەنی دەفەرموو: (هەرکەسێ دەیەوێت منی خۆش بووێت با حەسەنی خۆش بووێ، ئەم قسەیە با(حاضر) بە (غائب)ی ڕابگەیێنێ) ئەگەر لەبەر شکۆی پێغەمبەر نەبوایە بۆم باس نەدەکردن.[4]

---

١ ـ مسند أحمد (١/٧٧) سنن الترمذى رقم: ٣٧٣٤، سير أعلام النبلاء(٣/ ٢٥٤)، پاشان ودەڵێ: ئیسنادەکەی (ضعيف)ە، مەتنەکەشی (منكر)ەو لە ميزان هیناویەتی(٣/١١٧).

٢ ـ مسند أحمد (٤/١٧٢) سنن إبن ماجة رقم: (٣٦٦٦) في الأدب، (البوصيري)یش لة (الزوائد)دا دەڵێ: ئیسنادەکەی(صحيح)ە، ڕاوییەکانیش(ثقات)ن، بڕوانە: سير أعلام النبلاء(٣/٢٥٥).

٣ ـ ذخائر العقب في مناقب ذوى القربى، لا ٢١٥المسند (٥/٢٨٨).

٤ ـ للمستدرك (٣/١٧٣ـ١٧٤)، سير أعلام النبلاء (٣/٢٥٣، ٢٥٤)، إسناده صحيح.

٩- ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) گرتمی لەسەر ڕانێکی خۆی دایناو و حەسەنیشی لەسەر ڕانەکەی تر دانا فەرمووی: ((اللهم أرحمهما فرحمهما)) واتە: (خوایە من بەزەیم بەهەردوکیان دێتەوە تۆش بەزییان پێبکە). [١]

١٠ ـ ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئەقرەعی کوڕی حابیس هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بینی حسن ماچ دەکات ووتی: ئەوە ماچی دەکەی، دەنا من دەمنداڵم هەیە هیچیشیانم ماچ نەکردوە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: (هەر کەسێ بەزەیی بە خەڵك دا نێتەوە بەزەیی پێناکرێت). [٢]

١١- معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) زمانی و لێوەکانی حەسەنی دەمژی، ئازار و سزا بەزمان و لێوانێك ناگەن، کە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵیمژیوون، [٣] ڕیوایەتی معاویە بۆ ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر خۆشویستنی حسن.

١٢- ئەبو هورەیرە: لە ڕێگاو بانەکانی مەدینە چەند جارێك بە حسن گەیشتووە پێی ووتووە زگت ڕوتکەوە ـ بەدایك و باوکەوە بە فیدات بم ـ تاکو ئەو شوێنە ماچ کەم کە پێغەمبەرم بینیوە ماچی کردوە. حەسەنیش زگی خۆی ڕوتدەکردەوە، ئەبو هورەیرەش ناوکی ماچ دەکرد. [٤]

١٣- عیکرمە لە ئیبن عباس ڕیوایەتی کردوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی کوڕی علی لەسەر شانی هەڵگرتبوو پیاوێك ووتی: باشترین سوارت هەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموو: (ئەویش باشترین سوارچاکە). [٥]

١٤- لە (أبی الزبیر)ەوە ئەویش لەجابرەوە دەڵێ: چووم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) بینیم لەسەر دەست و چۆکەکانی وەستابوو. حسن و حسین لەسەر پشتی خشکە خشکیان دەکرد پێغەمبەریش دەیفەرموو: (باشترین وشتر وشتری ئێوەیە باشترینساریش ئێوەیەن). [١]

---

١ ـ الإحسان في تقريب صحيح إبن حبان (١٥/٤١٥)، ذخائر العقب في مناقب ذوى القربى ص٢١٦.

٢ ـ مسلم رقم: ٢٣١٨.

٣ ـ مسند أحمد (٤/٩٣)، إسناده صحيح، سير أعلام النبلاء (٣/٢٥٩)

٤ ـ المستدرك (٣/١٦٣) و صححه الحاكم و وافقه الذهبي.

٥ ـ الشريعة للآجري (٥٢١٦٠) إسناده ضعيف.

١٥- ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژمان دەکرد، کاتێك کڕنووشی دەبرد حسن و حسین دەچونە سەر پشتی، کاتێك بەرز دەبۆوە لەسەر زەوی دای دەنان، کاتێك دەگەڕایەوە بۆ کڕنووش بەهەمان شێوە دەگەڕانەوە بۆسەر پشتی تاکو نوێژەکەی تەواو دەکرد.[2]

١٦- إبن بەریدە لەباوکی یەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێت: پێغەمبەر ووتاری دەدا لە پڕێك حسن و حسین دەرکەوتن دوو کراسی سۆریان پۆشی بوو، هەنسکیان دەبرد، پێغەمبەر لەسەر مینبەرەکەی دابەزی بەرزی کردنەوە بۆ لای خۆی، فەرمووی: خواگەورە دەفەرموێ: ﴿إنما أموالكم وَ أولادكم فتنة﴾[ التغابن: ١٥]، کاتێك تەماشەی ئەو دوو منداڵەم کرد دەڕۆن و هەڵدە بەزن ئارامم نەماوو قسەم بڕی و بۆلای خۆم هێنان.[3]

١٧- ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك دەرچووین قسەمان لەگەڵ یەکتردا نەکرد تاکو گەیشتینە بازاڕی – بەنو قەینیقاع لە وێشەوە بۆ ماڵی فاتیمە ووتی: (کوا منداڵە بچکۆلانەکە کوا منداڵە بچکۆلانەکە) واتە (حسن) وامزانی فاتیمە پەنهانی کردووە بۆ ئەوەی بیشواو ملوانکەکەی لەمل کات زۆری پێنەچوو بە غاردان هات و ئەو دوو دۆستە یەکتریان بەسۆزەوە گوشی.[4]

١٨- سلمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێت: جڵەوی ئێسترە گەورەکەی پێغەمبەرم(ﷺ) ڕائەکێشا تاکو ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) یەکیان لە پێش و ئەویتریش لە پشتەوە بوو.[5]

لەم ڕەوشتە جوانەوە باوك و دایك با فێری خۆشەویستی بن و سۆز و میهرەبانی بۆ ڕۆڵەکانیان دەبڕن، لە فەر موودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە خۆشەویستی حسن و بەزەیی پێداهاتنی گەمەو گاڵتە ئەنجام دان لەتەکی چەند شتێ:مان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

---

١ ـ الشريعة للآجري ـ (٥٢١٦٠) فەرموودەیەکی (ضعيف)،، إسناده ضعيف فيه مسروح أبو شهاب: تكلم فيه، قال العقيلي: لايتابع عليه ـ أي على هذا الحديث ـ وقال: إبن أبي حاتم: سألت أبي عن مسروح و عرضت عليه بعض حديثه فقال: يحتاج إلى التوبة من حديث باطل رواه عن الثوري. وقال إبن حبان: لايجوز الإحتجاج بخبره لمخالفته الإثبات في كل مايروي. المجروحين(٣/١٩)، الميزان(٤/٩٧).

٢ ـ الشريعة (٥/٢١٦١) إسناد ضعيف، سيد محمد بن عيسى إبن حيان المدائني قال: الدار المتروك قطني ضعيف.

٣ ـ الشريعة لِأجري (٥/٢١٦٢).

٤ ـ مسلم (٤/١٨٨٢ـ١٨٨٣).

٥ ـ مسلم رقم: (٢٤٢٣).

ئەمە ئاماژەیەکی ڕونیشە بە ڕێنوێنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ موسڵمانان لە چۆنیەتی دروستکردن و بنیادنانی دەرونی منداڵ. هەروەها وڵامدانەوەی پرسیارێکی گرنگیشە ئایە چۆن بنیادی سۆزی منداڵ بنێن؟ چۆن مافەکانی بۆ دەستەبەر کەین بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی خاوەن داهاتووە ؟ فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژە بە کۆمەڵێ بنچینەو بنەمایان کردوە کە لە ئەنجامی پیادە کردنیان لەسەر ڕۆشنایی و چاو ساغی ڕێگە دەگرین.

أ- یەکەم بنچینەی سۆزداری: ماچکرن و بەزەیی هاتنەوە بە منداڵ.

بێگومان ماچ کردن ڕۆڵێکی کارا دەبینێت لە جوڵاندنی هەستو سۆزی منداڵ، هەروەك ڕۆڵی باڵا دەبینێت لە دامرکانەوە و هێور کردنەوەی تەوژمی گریان، پەیوەندیەکی بەهێز و تۆکمەش دروست دەکات لە نێوان بچوك و گەورە، بەڵگەشە بۆ بەزەیی نواندنی دڵ و دەرون بۆ منداڵی تازە پێگەیشتوو، بێ فیزی گەورەش دەردەخات بۆ بچوك، ڕۆشناییێکی پرشنگ داریشە هەست و نەستی منداڵ جوان و قەشەنگ دەکات، دڵی خۆش دەکات و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەوروبەری زیاتر دەکات ئائەمەیە ڕێبازی چەسپاوی سەرەتاو کۆتایی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ منداڵاندا[1]، بەزەیی و میهرەبانی نواندن خەسڵەتێکی پێغەمبەرا یەتی محمدە(ﷺ)، دەروازەیەکیشە بۆ چوون بۆ بەهەشت و حەساوە بوون بە ڕەزامەندی خوا.

ب- بنچینەی دووەم: گاڵتە و یاری لەگەڵ منداڵ.

هەندێ فەرموودەمان ڕوون کردەوە بەڵگە بوون لەسەریاریکدنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ منداڵان، کۆمەڵە وانە و ئامۆژگاریەك لەم فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) وەردەگرین کەلەسەر گەمە و گەپ لەگەڵ منداڵاندا هاتوون، جارێك بە هەڵگرتن و جارێکی تر بە خەندە و پێکەنین لە گەڵیاندا... بۆیە هاوەڵان ڕێبازی پێغەمبەریان گرتبوو پێشبڕکیان دەکرد لەسەر گەمەو گاڵتە لەگەڵ منداڵەکانیان و دانانیان لە مەنزڵی خۆیان، هەڵزنین و خلیسکانیان پێ کردوون، عمر دەفەرمووێ: پێویستە پیاو لە نێو کەس و کاریدا وەك

---

١ ـ منهج التربية الإسلامية للطفل لا ١٧٩.

منداڵ بژێت، واتە: لە هۆگری و دڵخۆشی و ساکاری و یاری لەگەڵ منداڵەکانیدا. وەك ئاشکراشە پێغەمبەر گاڵتەی لەگەڵ حسن و حسین دا کردووە. بەم گەمە و گەپە پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسوکەوتی لە گەڵ منداڵاندا کردوە و بەو سۆزە ڕاست و پاکە گیان و دەروونی خۆراك داوون. دوور لە هەموو وشکی و دڵڕەقی و ماف پێشێل کردنێك.[1]

ج- بنچینە سێ یەم: دیاری و بەخشین

بەگشتی دیاری شوێنەوارێکی و بەهێز لە دڵی مرۆڤدا جێدەهێڵێ، لە دڵی منداڵاندا کاریگەری زیاتر دەکات. پێغەمبەر (ﷺ) کاریگەری ئەو پایە بە هێزەمان بۆ ڕووندەکاتەوە سەبارەت بە دروست کردنی سۆزی منداڵ و جوڵاندن و ئاراستەکردن و پاکردنەوەی لە هەموو ناتەواویەك. بەر لە ئێستا ئاماژەمان بەو کارەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، لەگەڵ کچە پوری حسندا کردی، دەکاتە ئەمامەی کچی عاص و زەینەب، عائیشە دەڵێ: نەجاشی خشڵێکی بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ)، گوستیلەیەکی زێڕی تێدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) وەری گرت و بە دیاری نارد بۆ ئەمامەی کچی زەینەب ئینجا فەرمووی: (ئەی کچەکەم بەمە خۆت بڕازێنەوە).[2]

ح- بنچینەی چوارەم: دەست هێنان بە سەری منداڵدا:

پێغەمبەر(ﷺ) بەدەست هێنان بەسەری منداڵدا هەست و سۆزی دەجوڵاندن، بەمەش هەستیان بە خۆشی ڕەحم و میهرەبانی و خۆشەویستی دەکرد و دەرکیان بە بوونی خۆیان دەکرد وە خۆشەویستی و گرنگی گەورەکانیشیان پەی پێدەبرد. موسعەبی کوڕی عبدالله دەڵێ: عبدالله کوڕی سەعلەبە چوار ساڵ پێش کۆچی لە دایك بوو هێنایان بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پیرۆزی هێنا بە سەر دەم و چاوی و لە فەتحی مەککەش دوعای بۆ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد ئەو چواردە ساڵانە بوو.[3]

---

١ ـ منهج التربية النبوية لا ١٨٤.

٢ ـ سنن إبن ماجه رقم: ٣٦٤٤، الدوحة النبوية الشريفة، لا ٤٣.

٣ ـ مستدرك الحاكم (٣/٣٧٩).

ج- بنچینەی پێنجەم: جوان پێشوازی کردنی منداڵ:

سازدانی لیقا لەگەڵ منداڵ پڕ بایەخە، بە تایبەت چرکە ساتەکانی لیقای یەکەم، ئەگەر لیقای جوان و بەهادار بوو، منداڵ هەوڵی قسە و وڵامت لە گەڵ دەدات، دڵی خۆی واڵا دەکات و هەستەکانی دەر دەخات، قەیران و تەنگەژەکانی دەخاتە ڕوو، خەون و خولیاکانی دەدرکێنێت، ئەمانەش بە دڵخۆشی پێشوازی کردنی منداڵ و دەربڕینی سۆزو شادمانی و یاری کردن لەگەڵی هەموو فەراهەم دێت،[1] عبداللە کوڕی جعفر دەڵێت: پێغەمبەر کاتێك لە سەفەر دەگەڕایەوە سەرەتا خۆی دەگەیاندە منداڵانی ئال و بەیت، جارێك لەسەفەر دەگەڕایەوە بەمن گەشت و لە نێو هەردوو دەستی گرتم، پاشان یەك لە کوڕەکانی فاتیمەی لە پشت خۆی سوار کرد، سێ کەس بە سواری یەك وڵاغ چووین بۆ نێو مەدینە.[2]

س- بنچینەی شەشەم: پرسیار کردن و بە سەرکردنەوەی منداڵ و پرسیار.

زۆر جار منداڵ لە کوچە و کۆڵانان وێڵ و سەر گەردان دەبێت، ئەگەر دایك و باوك گرنگی بە کاروباری منداڵ بدەن و هۆشیاری خێرا لە سەر نالەباریەکانی دەرکەن، ئەوە زوو بە زوو شوێن هەنگاوەکانی منداڵ هەڵدە گرین و بەدۆخی ئاگا دەبین ـ بەپێچەوانەش کاری سلبی لێ دەکەوێتەوە ـ ئەو خێرا بە دواداچوونە ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێ لەسەر دەروونی منداڵ، کەمتەرخەمیش مەینەت و ئازار و گریانەکانی خەست تر دەکات و سزا و نە خۆشیەکانی دەرونیش توند و بە هێز تر دەبن لە سەری، هەر لە بەر ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەست و بردی دەکرد لە مبارە و فەرمانیشی بە هاوەڵان دەکرد هاوکاری بکەن لە بەدواداچوون و گەڕان بە دوای حسن و حسین دا.[3]

(الطبري)لە سەلمان ڕیوایەتیکردوەو دەڵێت: ئێمە لە دەوری پێغەمبەر (ﷺ)گرد بووبووین لە پڕێك (أم أیمن) دەرکەوت و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا حسن و حسین وونبون

---

١ ـ منهج التربية النبوية للطفل، لا ١٨٥.

٢ ـ مسلم رقم: ٢٤٢٨، سير أعلام النبلاء (٣/٤٥٨).

٣ ـ منهج التربية النبوية للطفل، لا ١٨٦.

کاتی ئێوارە بوو پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ((هەستن بە دوای کوڕەکانم دا بگەڕێن)) هەر یەکەو ڕێگایەکی گرتە بەر منیش بەرەو پیری پێغەمبەر(ﷺ) چووم پێغەمبەر(ﷺ) هەر خەریکی گەڕان بوو تاکو گەیشت بە قەدباڵی کێوێك بینی حسن و حسین لەیکەوە ئاڵاون، لەم لاشەوە مارێك لەسەر کلکی وەستاوە پڕشکی ئاگر لە دەمیەوە دەردەچێت، پێغەمبەربە پەلە بۆ لای چوو و هەندێك بەردی تێگرت، قسەی لەگەڵ کردو مارەکەش پشتی هەڵکرد و ڕۆیی، پاشان چوو بۆ لای حسن و حسین و لە یەکتری کردنەوە ئینجا دەستی موبارەکی بەسەر دەم و چاویانداهێنا، فەرمووی (بە دایك و باوکەوە بە فیداتان بم) ئای ئێوە چەندە ڕێز دارن لای پەروەردگار ئەوسا یەکێکیانی خستە سەر شانی ڕاست و ئەویتریش سەر شانی چەپ، منیش ووتم: خۆشی بۆ خۆتان باشترین سواریتان هەیە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ((نعم الراكب هما، وأبوهما خير منهما))، واتە: (ئەوانیش باشترین سوار چاکن، باوکیشیان چاکترە لە وان)[1]، تۆ ئەم ترسە تێبینی بکە کەلە نێوان حسن و حسین دروست بوو بوو هەردووکیان بەیەکەوە لکأبون لەبەر ترسی مارەکە، تێبنی خێرایی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ لە لادانی ئەم ترسە و جیاکردنەوەیان لەیەکتری و - دەستهێنان بەسەر دەم و چاویاندا - پاشان دوعا بۆ کردن و ڕێز لێنانیان بە هەڵگرتنیان لەسەر شانەکانی و ستایش کردنیان بە فەرموودەی: (و نعم الراكبان هما) تەنیا لە خۆشەویستی زۆری پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حسن و حسین و لەگرنگی دان پێیان سەر چاوە دەگرێت.[2]

ش- بنچینەی حەوتەم: یاری کردنی گەورە لەگەڵ منداڵی بچوکدا.

پێغەمبەر(ﷺ) - پێشەوا و سەرکردەمان - یاری لەگەڵ حسن و حسین دا کردوە هەروەك باسمان کرد، ئەمەش تەنها بە مەبەستی پەروەردەکردنی دایك و باوك و گەورەکانە، هەروەها بۆ ئەوەی پابەند بن بە ڕێگا و خەتی ئەو لە گەمەو گاڵتە کردن لەگەڵ منداڵەکانیان دا. ڕیوات کراوە پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی دنە دەدا بەسەر حسین،

---

١ ـ معجم الطبراني (٦٥/٣) رقم: ٢٦٧٧، في مجمع(١٨٢/٢) وفيه أحمد بن راشد الهلالي وهو ضعيفٌ، ضعفه الذهبي في المغني.

٢ ـ منهج التربية النبوية للطفل، لا ١٨٧.

هەڵ دەشاخان لەلای پێغەمبەر ئەویش دەیفەرموو: (دەی ئەی حسن، بگرە ئەی حسین) عائیشە ووتی: گەورەکەت دەست نیشان کرد؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (جبریل دەڵێت: بگرە تۆ ئەی حسین)[1] لە ڕیوایەتێکی تر (چعیف)دا هاتووە، کە جعفری کوڕی محمد لە باوکیەوە ڕیوایەتیکردووەو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە شوێن جەنازەیەك دانیشتبوو، حسن و حسین بەیەکتر هەڵ شاخانەوە دەرکەوتن، پێغەمبەر فەرمووی: (دەی تۆ ئەی حسن) علی ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەسەر حسینیدا سەر دەخەی؟ فەرمووی (ئەوەتە جبڕیلیش دەڵێ: تۆ دەی حسین).[2]

تۆ بنوارە بۆ ئەو هەموو یاری هەمە چەشنەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ حسن و حسیندا، ئەمە تەنها ڕێنوێنی کردنی تۆیە بۆ ئەنجامدانی یاری هەمە جۆر لەگەڵ منداڵاندا، بەهەمان شێوە تێبینی وەسف و مەدحی پێغەمبەرت کرد کە لەکاتی یاری بۆ حسن و حسینی دەردەبڕی بۆ ئەوەی هێز و چالاکی دەرونیان زیاد بکات و ڕاگیراویشیان کات لەسەر یاری، تا خەم و نیگەرانیش دایانەگرێ و، بەدڵی پڕ لە سۆزەوە بە دوای یاری دا بڕۆن، تاکو لە یەك کاتدا ببێتە خۆراکی جەستەو ڕۆحیان.[3]

گەر لە گۆشەیەکی تر بڕوانین دەبینین یاری کردن لەگەڵ منداڵ کۆمەڵێ سود و بەهای گەورەی تێدایە وەك سودی: جەستەیی، پەروەردە، کۆمەڵایەتی، ڕەوشتی، خودێتی، چارەسەری...تاد.[4]

## دووەم: حسن هاوشێوەی پێغەمبەر بوو (ﷺ):

١- ئەبو خالید دەڵێت: بە(أبو جُحيفة)م ووت: ئایا پێغەمبەرت(ﷺ) بینیوە؟ ووتی: بەڵێ: لە هەموو کەسێ زیاتر بە حەسەنی کوڕی علی دەچوو.[5]

---

١ ـ سير أعلام النبلاء (٢٦٦/٣) إسناده حسن.

٢ ـ سير أعلام النبلاء فيه إنقطاع ضعيف جداً (٢٨٤/٣)، فەرموودەکە واتای هەڵنان و چاك و جوانکردنی تێدایەو (أصل)یش بۆ وازهێنانە، بڕوانە سير أعلام النبلاء(٢٨٤/٣).)

٣ ـ منهج التربية النبوية للطفل، لا ٢٠٩الی ٢١٦.

٤ ـ هەمان سەرچاوە. ٢١٦.

٥ ـ الطبقات الكبرى الطبقة الخامسة من الصحابة (٢٤٥/١)، أخرجه البخاري، رقم: ٣٥٤٤إسناده صحيح.

٢- عقبەی کوڕی حارس دەڵێ: من لەگەڵ أبو بکر بەلای حسن دا ڕۆیشتین، أبـو بکـر حەسەنی لەسەر سنگی دانا ئەوسا فەرمووی بە باوکـەوە بـە قوربانـت بم تـۆ هاوشـێوەی پێغەمبەر(ﷺ) نەك علی. علی(ﷺ) دەستی کرد بە پێکـەنین[1] . لـە ڕیوایـەتیکی تـردا عوقبەی کوڕی حارس، دەڵێت: لەگەڵ أبو بکر دوای نوێژی عەسر دەرچووین هاوکات چەند شەوێك بەسەر وەفـاتی پێغەمبـەر(ﷺ) تێپـەڕی کردبـوو ـ علـی بـە تەنیـشدا دەڕۆیـی حسینیش لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد، أبو بکریش خستیە سەر سنگ و گەردنی خـۆی و فەرمووی: بە باوکەوە بە قوربانت بم تۆ شێوەی پێغەمبەر دەکەی نـەك شـێوە علـی، بـەم قسە علی کەوتە پێکەنین.[2]

لێرەدا حقیقەتی خۆشەویستی وجۆش و خرۆشی نێوان أبو بکـر و علـی دەردەکـەوێت، هەروەك ئەم ڕیوایەتە صحیح و بەڕاشکاوی ئەمە پشت ڕاست دەکاتەوە، نەك وەك هەندێك خەڵك بانگە شەی بۆدەکەن.

٣- لەهانیئی کوڕی هانیئەوە ئەویش، لە علی(ﷺ)ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: حـسن لـە سینگەوە تاکو سەر شێوەی پێغەمبەری(ﷺ) دەکرد حسینیش لە سینگەوە بـەرەو خـوار لە پێغەمبەر(ﷺ)دەچوو.[3]

٤- عاصـمی کـوڕی کولـەیب، دەڵێـت: بـاوکم بـۆی باسـکردم کـە لـە أبـو هـوڕیرە بیستوویەتی ووتی: پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ((مَنْ رآني في النوم فقد رآني فـإن الـشيطان لا ينتحلُني))واتە: (هەر کەس منی لە خەو بینـی ئـەوە منـی بینیـوە، چـونکە شـەیتان ناچێتە سەر شێوەی من). باوکم ووتی: بە (إبن عباس)م ووت: من پێغەمبەرم لە خـەودا بینی، فەرمووی: پێغەمبەرت بینی؟ ووتی: بەڵێ سوێند بە خوا بینـیم، ووتـی: حەسـەنی کوڕی عەلی بیر کەوتەوە ؟ ووتم بەڵێ سوێند بەخوا تاکو شێوەی جولەی ڕاسـت و چـەپ و

---

١ ـ البخاري رقم: ٣٧٥٠

٢ ـ الطبقات، الطبقة الخامسة من الصحابة (١/٢٤٧) إسناده ضعيف.

٣ ـ الطبقات، الطبقة الخامسة (١/٢٤٧) إسناده ضعيف.

جۆری ڕۆیشتنەکەشم کەوتەوە یاد (ئیبن عەباری) فەرموی زۆر ڕاستە حسن هاوشێوەی پێغەمبەر بووی.[1]

٥- بەهی مەولای زوبێر دەڵێت: یادی هاوشێوەترین کەسمان دەکردەوە لەشێوەی پێغەمبەر(ﷺ)بێ. لەنێو خزم و خوێشاندا، عبدالله کوڕی زوبیر دەرکەوت و ووتی: من پێتان دەڵێم کێ لەهەموو کەس و کاری زیاتر شێوەی پێغەمبەری کردوە(ﷺ) خۆشەویسترین کەسیش بووە لای ئەو، ئەویش حەسەنی کوڕی علی یە، بەچاوی خۆم بینیم حسن هات پێغەمبەریش(ﷺ) کڕنوشی دەبرد خۆی خستە سەر شانی یاخود سەر پشتی پێغەمبەر(ﷺ)، نەهاتە خوار تاکو پێغەمبەر(ﷺ) خۆی هێنایە خوارەوە، سوێند بەخوا بەچاوی خۆم بینیم هاتو پێغەمبەریش لە ڕکوع دأبوو لە نێوان قاچەکانی بۆشاییی یەکی کردوە بۆئەوەی تێدا تێپەڕبێت.[2]

٦- عبدالرزاق دەڵێت: معمر ئەویش لە (الزهری)یەوە پێی ڕاگەیاندین کە ئەنەس ڕیوایەتکردوەو ووتی: هیچ کەسێ هەندەی حسن لە پێغەمبەر نەچووە[3] وە ووتی: حسن لەڕوی دەم و چاویەوە زۆرترە لەپێغەمبەر دەچوو.[4]

٧- فاتیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) حسن و حسینی هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) لە لەسەر مەرگدا بوو، فاتیمە ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمانە جوتە کوڕی تۆن بەشتێك بەهرەمەندیان بکە فەرمووی: حسن هەیبەت و شکۆمەندی منی وەرگرتوە، حسینیش بوێری و سەخاوەتی منی هەڵگرتووە.[5]

٨- أبو (ملیکە) ووتی: فاتیمە بە دوای حسندا دەگەڕا و دەیفەرموو کوڕەکەم شێوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەدات نەك شێوەی علی.[6]

---

١ ـ المصدر السابق (١/٢٤٨) إسناده حسن.

٢ ـ هەمان سەرچاوە. (١/٢٤٩) إسناده ضعیف.

٣ ـ الصحیح المسند من فضائل الصحابة للعدوی، لا ٢٦٣.

٤ ـ ذخائر ذوی القربی، لا ٢٢١.

٥ ـ الأحادیث الواردة بشأن السبطین.، لا ٢٨٧، شیخ عیمان الخمیس ووتی: لە ژێر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەی نیسنادی ئەم فەرموودەدا دەردەکەوێت کە زۆر لاوازە، ئەویش لەبەر بوونی محمد بن حمید و إبراهیم بن علی، لا ٢٨٩.

٦ ـ مجمع الزوائد (٩١٧٦) مرسل، وفیه زمعه بن صالح وهولین.

٩- ئەوانەی شێوەی پێغەمبەریان دەکرد: جعفری کوڕی ئەبو تاڵیب، حەسەنی کوڕی علی(ﷺ)، ئەبو سوفیانی کوڕی حارس، قُثَمی کوڕی عباس، سائیبی کوڕی عەبد، یزیدی کوڕی هاشم کوڕی عبدالمطلب.[١]

١٠- لە ئەبو ئیسحاقەوە کەلە (هبیرة)ی کوڕی (یەریم) ئەویش لە علی بیستووە و دەڵێت: هەرکەسێك حەزدەکات بۆ هاوشێوەترین کەسی پێغەمبەر(ﷺ) بڕوانێ لە نێوان گەردن و دەم و چاو و قژ بابۆ حەسەنی کوڕی بڕوانێ، وە هەر کەسێك هاوشێوەترین کەسی پێغەمبەری(ﷺ) دەوێت لە گەردنەوە بۆ ئەژنۆ لەڕووی پێکهاتەوە با بۆ حوسەینی کوڕی علی بڕوانێت.[٢]

سێ یەم: حسن و حسین گەورەی گەنجانی بەهەشت:

١- لە حوزەیفەوە ڕیوایەتکراوە ووتی: دایکم پێی ووتم لەکەیەوە پەیمانت بە پێغەمبەر(ﷺ) داوە؟ ووتم: لە وەتەی ئەوەندەی ئەوەندە. خۆی گەیاندمێ و جنێوی پێدام ووتم: دایە وازم لێبینە من دەڕۆم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و نوێژی مەغریبی لەگەڵ دەکەم، پاشان لێی جیانابمەوە تاکو داوای لێخۆشبون بۆ من و تۆ نەکات. ئەوسا دەڵێ چووم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)و نوێژی مەغریبم لەگەڵ ئەنجامدا، دوای ئەوەی نوێژی عیشاشی کرد دەرکەوت منیش بەدوای کەوتم لەڕێگادا کەسێکی هاتە پێش و ووت و وێژی لەگەڵ کرد، دوای ڕۆیی منیش هەر بەدوایەوە بووم دەنگی منی بیست: فەرمووی (ئەمە کێ یە؟) ووتم: حوزەیفەمە فەرمووی: (چیت دەوێت؟) منیش کارەکەم بۆ باس کرد، فەرمووی (خوای گەورە لە تۆ و دایکت خۆش بێ) ئینجا فەرمووی: (ئەی ئەو کەسەت بینی کەمێك بەر لەئێستا لەڕێگادا پەیدا بوو؟) ووتم بەڵێ: فەرمووی: ئەمە فریشتەیەك بوو دابەزی بوو کە جگەلەم شەوە نەهاتووە بۆ ڕووی زەمین. سڵاوی لەلای خودا بۆ هێنـأبووم.

---

١ ـ التبین فی أنساب القرشین، لا ١٠٢.

٢ ـ الشریعة للأجری (٢١٤٦/٥).

مژدەشی پێدام کەحسن و حسین گەورەی گەنجانی بەهەشتن. فاتیمەش گەورەی ژنانی بەهەشتە.[1]

٢- لە أبوو سەعیدی خودری یەوە فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (حسن و حسین گەورە گەنجانی بەهەشتن).[2]

٣- لە حەکەمی کوڕی عبدالرحمن لە باوکیەوە ئەویش لە أبو سعدی خودریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((الحسن والحسین سیدا شباب أهل الجنة إلا إبني الخالة عیسى و یحیى بن زکریا علیها السلام) واتە: (حسن وحسین گەورەی هەموو گەنجانی بەهەشتن تەنها هەردوو کوڕە پورەکە یەکتریَ نەبیَ عیساو یحیا کوڕی زەکەریا سەلامی خودایان لیَبیَ)[3] هەروەها شێخ عثمان الخەمیس هەستاوە بە توێژینەوەی ڕێگاکانی ئەم فەرموودە، ڕووی کردۆتەوە، کە بەوەی ئەم فەرموودە لە شازدە هاوەڵە ڕیوایەتکراوە[4]، دەڵیَ: سەبارەت بەم فەرموودە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پرسیار کراوە فەرموویەتی صحیحه و [5]، إبن کثیر لە (البدایةوالنهایة) باسی کردووە و دەڵیَ (سەنەدەکانی هەموو ضعیفن)[6]، ذهبی دەڵێت: لەچەند ڕوانگەیەکەوە گیڕدراوەتەوە کە یەکتر بەهێز دەکەن[7]، پاشان عثمان الخەمیس دەڵیَ: لەوەی بۆم دەرکەوت ئەشیَ ووتەی ئەم پێشەوایانە(جمع)کەین، هەروەك حافزی إبن کثیر: دەڵێت: لە هەموو سەنەدەکانی ئەم فەرموودە لاوازی هەیە. هەندێکیان(حسن)نن و هەندێکی تر (حسن لغیره)، کەواتە هێز

١ ـ مسند أحمد (٣٩١/٥)، ئەم فەرموودەیە (منهال بن عمرو)ی تێدایە و هەندیَ لە زانایانیش لەبارەیەوە شتیان ووتوە، بەڵام ب (صحیح) ئەم فەرموودەیە قبوڵەو پاشان لەلایەن عدی بن پابت و عاصمەوە هاتووە گەرچی قسەیان لەباروە هەیە، بەڵام دەکرێت یەکتر بەهێز بکەن.

٢ ـ(الأحادیث الواردة بشأن البسطین)،لا ١٧٦.

٣ ـ الشریعة للأجری (٢١٤٤/٥) إسناده حسن.

٤ ـ الأحادیث الوادرة بشأن السبطین، لا ٢١١.

٥ ـ السؤال رقم: ١٢٤المنتخب من العلل للخلال، لإبن المقدسي.

٦ ـ البدایة والنهایة(٢٠٨/٨)

٧ ـ سیر أعلام النبلاء (٢٨٣/٣)

بەیەکتر دەبەخشن حافیزی زەهەبیش هەروای ووتوە، ئیمام ئەحمەدیش هەر پێی صحیح بوو، بەڵام (حسن لغیره)[1]، (والله أعلم).

چوارەم: حسن و حسین دوو ڕێحانە بۆنخۆشەکەی پێغەمبەر لە دوونیادا:

أبوو نەعیم دەڵێت: گوێبیستی عبدالله کوڕی عمر بووم پرسیاریان لێ کرد لەبارەی ئەو کەسەی بەرگی إحرامی لەبەرە(شعبة)دەڵێ: پێم وایە لەسەر کوشتنی مێش بوو، عبدالله فەرمووی خەڵکی عێراق سەبارەت بە مێش پرسیاردەکەن لەکاتێکدا کوڕی کچەکەی پێغەمبەریان شەهید کردووە، پێغەمبەریش دەفەرمووێ: ((هما ریحانتانی من الدنیا)) واتە: (ئەمانە ڕێحانەی منن لە دوونیادا).[2]

أبو بکر دەڵێت: حسن و حسین لەسەر پشتی پێغەمبەر(ﷺ) یاری دەکرد لەکاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) لە نێو نوێژ بوو توند بەدەستەکانی دەیگرتن تاکو لەسەر زەوی ئارامی دەگرت ئەوسا وازی لێدەهێنان، دوای تەواوبوونی نوێژیش لەنێو کۆشی خۆی دای ئەنیشاندن. ئینجا دەستی بەسەر سەریاندا ئەهێنا پاشان دەیفەرموو: (ئەم دوو کوڕەی من ڕێحانەی منن لە دوونیا) ڕووی لەخەڵك دەکرد و، دەیفەرموو: (بەڕاستی کوڕەکەم گەورەیە، ئومێد دەخوازم ئاشتەوایی بخاتە نێوان دوو کۆمەڵی گەورە وە لەکۆتایی زەماندا)[3]، محمدی کوڕی حسینی ئاجری دەڵێ: مەبەستی حسن بووە[4]، لە(أبی بکرە) ڕیوایەت کراوە دەفەرمووێ: (پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی دەکرد کاتێك کڕنوشی دەبرد، حسن دەچووە سەر پشتی، کاتێك هەڵدەستاوە دەیگرت و بە هێواشی لەسەر زەوی دای دەنا، کاتێك کڕنوشی دەبردەوە هەمان شێوەی دووبارە دەکردوە، کە نوێژیشی ئەنجام دەدا لە ناو کۆشی خۆی دای دەناو ماچی ئەکرد پیاوێك ووتی: تۆ لەگەڵ ئەم منداڵە وادەکەی؟

---

١ ـ الأحاديث الواردة بشأن السبطين، لا ٢١٢.

٢ ـ البخاري رقم: ٣٧٥٣

٣ ـ صحيح إبن حبان رقم:٦٩٦٤.

٤ ـ الشريعة للأجرى، لا ٢١٥٧.

فەرمووی: (حسن و حسین جوتە ڕێحانەی منن، تکا خوازم لەخوای گەورە بەهۆی ئەمەوە ئاشتەوایی بخاتە نێوان دووکۆمەڵی مووسڵمانانەوە).[1]

## پێنجەم: گەورەیی و شکۆداریەی حسن لە دونیا و ئاخیرەتدا:

پێغەمبەر(ﷺ) بەڕاشکاوی باسی لەپلە و پایەی حسن کردووە و بەئاشکرا لەبەر چاو و گوێچکەی ئاپۆڕەی خەڵك ڕێزو مەنزڵی بەیانکردووە، ڕیوایەتەکان کۆ دەنگن لەسەر وتەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ (حسن) بەڕاستی کوڕەکەم شکۆدارە، (إبن عبدالبر)، دەڵێت: ڕیوایەتەکانی (صیحاح) کۆ دەنگن سەبارەت بەوەی پێغەمبەر بەحەسەنی کوڕی علی ووتووە: ((إن إبني هذا سيد و عسى الله أن يبقه حتى يصلح بين فيئتين عظيمتين من المسلمين))، واتە: (کوڕەکەم گەورە و شکۆدارە لەخوا دەخوازم بیهێڵێ تاکو ئاشتەوایی دەخاتە نێوان دوو دەستەی گەورەی موسڵمانانەوە)[2]، کۆمەڵێك لە هاوەڵان ڕیوایەتیان کردوە، لەفەرموودەی أبو بكره سەبارەت بە(أنه ريحانتي من الدنيا) واتە: (حسن ڕیحانەی منە لە دوونیا) هیچ گومان نیە کەپێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی بە گەورە ناوزەد کردووە.[3]

(أبو بکر) گێڕاویەتەوە دەڵێ: گوێبیستی پێغەمبەر بووم، کە لەسەر مینبەر، حسن لە تەنیشتیەوە بوو، جارێك بۆ خەڵکی دەڕوانی جارێکی تریش بۆ (حسن)و دەیفەرموو:(بەڕاستی ڕۆڵەکەم گەورە و شکۆدارە ئومێدە خوازم لە خوا بە هۆیەوە ئاشتی بخاتە نێوان دوو کۆمەڵی موسڵمانان)[4]، ئەم فەرموودەیە جوانی و جوامێرێکی گەورە بۆ حسن تۆمار دەکات. ئەمەش بەهەوڵدانی پێغەمبەر(ﷺ) بەگەورەیی ئەو (إبن الأثير) دەڵێ: ووتراوە (السيد) مەبەست پێی نەرم و نیانیە(الحليم) چون پێغەمبەر لە (تمامة) فەرمووی: (وإن الله يصلح به بين فئتين عظيمتين من المسلمين).[5]

---

١ ـ الشريعة للأجرى، لا ٢١٥٧ إسناده حسن.

٢ ـ مسند أحمد (٥١/٥) والبخاري بنحوه (٢٤٤/٣).

٣ ـ الأستيعاب (٤٣٧/١).

٤ ـ البخاري ـ فضائل الصحابة رقم: ٣٧٤٦.

٥ ـ النهاية في غريب الحديث (٤١٧/٣).

له (تحفة الأحوذي) دا هاتووه (السيادة) (گەورەیی تایبەت نیه بەباشترین کەس بەلکو بەمانای سەرکردی گەل دێت و کۆی (سادة) یە لەووشەی (السؤدد) ووتراوه (السواد) وەرگیراوه، چونکه مشور و دەسەلاتی خەلکێکی زۆر دەگرێتە دەست ئەم فەرموودەی (دەخوازم له خوا ئاشتەوایی بخاته نێوان دوو کۆمەلێ موسلمانان.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) به دوو کۆمەلی گەوره وەسفی کردووه هەروەك له ڕیوایەتی بوخاری هاتووه[2]، چونکه موسلمانان لەم کاتەدا بوونە دوو دەستە دەستەیەك لەگەلّ ئیمام (حسن) و دەستەیەکیش لەگەلّ (معاویة)، ئەمەش (معجزة)یەکی گەورەی پێغەمبەره(ﷺ) بەم شێوەی هەوالّی داوه واقیع بووه بنچینەی کێشەکه ئەوەیە علی کوڕی ئەبو تالیب لەو کاتەی عبدالرحمن کوڕی ملجم ی مرادی پێکای کە هاوکاتبوو لەگەلّ ڕۆژی هەینی و شەوی شەممە، و شەوی یەکشەممەش کۆچی دوایی کرد کەتەنها یازده ڕۆژ مابوو لەمانگی ڕەمەزانی سالّی چلی کۆچی، دوای ئەو لە مانگی ڕەمەزانی ئەم سالەدا پەیمانی خیلافەت درا بە حەسەنی کوڕی، حسن چەند ڕۆژێك هەر خەریکی بیر کردنەوه و مشوری دەسەلات بوو، پاشان هەستی بە ناکۆکی و خەلکی دووبەرەکی کرد کۆمەلێك لایەنگیری ئەون، کۆمەلێکیش لایەنگیری (معاویة)، بۆیە کارەکە بەڕاستی بەڕیوه نەدەچوو، دوای ئەوەی ڕوانی ئاشتەوایی لە نێوان خەلك و نەڕشتنی خوێنیان باشتره له مافی خۆی بۆیه له پێنجی رەبیع الاول له سالّی چل و یەکی کۆچی خیلافەتی تەسلیم به معاویە کردەوه، ووتراوه (ربیع الاول) بوو، ووتراوه لە نێو (جماد الأولى) بوو، خیلافەتەکەی(معاویه) له شەش مانگ چەند ڕۆژێك کەم بوو، ئەو سالە له(عام الجماعة) ناوزەد کرا، ئەوەیه پێغەمبەر(ﷺ) هەوالّی پێداوه و دەفەرمووێ: (له خوا دەخوازم حسن ئاشتەوایی بخاته نێوان دوو کۆمەلّی گەوره).[3]

ئەم فەرموودە نیشانەیەکی درەوشاوەیه لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، ڕێز و جومێرێکیشه بۆ حسن ـ که مولّك و دارایی واز لێهێنا و هۆکارەکەی لەبەر کەمی و

---

١ ـ تحفة الأحوذي (١/٢٧٧).

٢ ـ البخاري، فضائل الصحابة رقم: ٣٧٤٦.

٣ ـ فتح الباري (١٣/٦٦).

زەبوونی نەبووە، بەڵکو تەنها بۆ دڵسۆزی و تامەزرۆی ڕێگەی خودا بەری خوێن ڕشتنی موسڵمانانی گرت و... ڕەچاوی ڕەوشی ئاین و بەرژەوەندی ئومەتی کرد.

لە سعیدی کوڕی أبو سعید ڕوایەتکراوە دەفەرمووێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرە دانیشتبووین، حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) هات و سەلامی لێکردین، ئێمەش سلاممان وەرگرتوە، ئەبو هورەیرە ووتی: ئەوە حەسەنی کوڕی علی یە سەلامی لە ئێمە کرد، بە خێرایی خۆی گەیاندێ و فەرمووی ئەی گەورەم منیش ووتم: دەڵێت: گەورەم؟ فەرمووی من لە پێغەمبەرم بیست فەرمووی: ((إنَّه لَسيد)) واتە: (بەڕاستی حسن گەورەیە).[1]

جابر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی هەر کەس حەزدەکات بۆ گەورەی گەنجانی بەهەشت بڕوانی با تەماشای حەسەنی کوڕی علی بکات[2].گەورەیی حسن و حسین لەبەهەشت دا لە ڕێگای کۆمەڵە هاوەڵێکی زۆر بۆ ئێمە باسکراوە، ئەمەش ڕاگەیاندنی پێغەمبەر بووە(ﷺ) بۆ گەورەی حسن و حسین جار لە دوای جار، لە مزگەوت و شوێنە گشتیەکان ئەو هاوەڵانەی لێیان ڕیوایەتکراوە لەم بارەوە عبداللەی کوڕی عمر و عبداللە کوڕی مسعود، جابری کوڕی عبدالله، عمری کوڕی خەتتاب(ﷺ)، علی کوڕی ئەبو تالیب(ﷺ)، ئوسامەی کوڕی زەید، قرەی کوڕی ئیاس، مالك ی کوڕی حویریث و، براء ی کوڕی عازب، ئەبو هورەیر و چەندانی تر.[3]

## شەشەم: خۆم پەنا دەدەم بە هەموو وشە تۆکمە و تەواوەکانی خوا لە هەموو شەیتان و زیندەوەرێکی ژەهراوی و چاوێکی سەر زەنشتکار:

إبن عباس دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) حسن و حسینی پەنا دەدان و دەیفەرموو (باوکتان) واتە: ئیبراهیم بەم دوعایە پەنای ئیسماعیل و ئیسحاقی دە دا (أعوذُ بكَلمات الله التامة من كل شيطان وَ هامَة وَ مِنْ كل عين لامّة)، إبن عباس دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) پەنای حسن و حسینی دە دا دەیفەرموو (پەناتان دەدەم بە ووشە

---

١ ـ مستدرك الحاكم (٣/١٦٩) صحيح، وأقره الذهبى والطبراني رقم: ٢٥٩٦ وقال الهيثمي في المجمع(٩/ ١٧٨)رجاله ثقات.

٢ ـ صحيح إبن حبان (١٥/٤٢١، ٤٢٢) مناقب الحسن. وذكره إبن كثير في البداية و النهاية و ذكر إسناده وقال لابأس به.

٣ ـ روايات هذه الأحاديث في مجمع الزوائد (٩/١٨٣)، والمعجم الكبير(٣/٢٤) الدوحة النبوية الشريفة، لا ٨١.

تەواوەکانی خوا لە هەموو شەیتان و زیندەوەرێکی ژەهراوی وە لە هەموو چاوێکی خراپەکار)[1]، ئەوسا دەیفەرموو: (هەر بەم شێوە ئیبراهیم ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ ئیسحاق و ئیسماعیلی پەنا دەدا).

ئەمەش چارەسەرێکی ناوازە(دەگمەنە) لە دەرمانخانەی پێغەمبەر بۆ مندڵان، پایەیەکە لە پایە پارێزگارەکانی تەندروستی منداڵ لە لایەن پێغەمبەری خوا(ﷺ)ـ هەر بەم چەشنەش لەگەڵ حسن و حسین جوڵاوەتەوە.[2]

لەم فەرموودەیەدا بەهاییێکی گەورە بەرچاو دەکەوێت کە پێغەمبەری خوا گرنگی دوعا و پاڕانەوەی دایك و باوکی بۆ ڕۆڵەکانیان بەیان کردووە، وە لەم هەموو سوودە گەورانەی لە پاڕانەوە دا بەدیدەکرێت ـ لەوانە ـ دەستەبەرکردنی حەسانەوە و دڵنیایی، پاراستن و کەوتنەوەی فەڕ و بەرەکەت لە نێوان دایك و باوکان لە لایەك و لادانی شەڕ بەفەرمانی خوا لەسەریان لە چاوی ئیرەی بەرو (الحاسد) و شەیتانەکان و جانەوەرەکانی ژەهراوی لە سەر زەوی لە لایێکی تر. لەسەروو هەموو ئەمانەش دوعاو پاڕانەوە کرۆکی بەندایەتییە هەر وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((الدعاء مخ العبادة)) ئەمەش هەست کردنە بەبێ توانایی خۆمان بەرامبەر بە خوا و گەڕانەوەیە بۆ لای خوا، هەروەها ئەمە لە یەکێکە لەگرنگترین ئامانجەکانی إسلام.

## حەوتەم: ئەو فەرموودانەی حەسەنی کوڕی علی لە پێغەمبەر(ﷺ) ڕیوایەتی کردووە:

ئەوەی کە موسڵمانان لەسەری کۆکن، بنچینەکانی زانست و زانیاری کە مرۆڤ بە دەگەینێتە خوای مەزن، قورئانی پیرۆز و ڕەفتار و کردار و هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەرن(ﷺ) کەبە سونەتی پێغەمبەر ناسراون، بەهۆی نەوەو وەچەکانی ئاشنا لەگەڵدا دروست نابێت، تەنها بەهۆی (النقل) گواستنەوە وە (والرواية) گێڕانەوە (الأخبار) هەواڵدانە نەبێت، بۆیە ئەهلی زانست و زانیاری ڕێگای پاراستن و ڕێکخستنی ناوەکانی

---

١ ـ سنن الترمذی رقم: ٢٠٦٠ حدیث حسن صحیح.

٢ ـ منهج التربیة النبویة للطفل، لا ٢٤٨.

فەرموودەیان لێ گێڕاونەتەوە(الـرواة) گرتووەتە بەر، پاشان گەڕان بەداوی سـەر گوزشـتە و بارودۆخی ژیانیان، بۆ دڵنیأبوون لەم بوارە، بۆ دیـاری کـردن و سـەنگ و ڕێـزی ڕاوی دوو پێوەریان داناوە:

١- دادپـــەروەری (العدالـــة)، ســـەربردەیێکی ڕاســـت و ڕێـــك بـــارودۆخێکی گونجـــاو و دامەزراوییە، دەست هەڵگرتن لـە قەدەغـە کراوەکـان و هەسـتان بـە کـارە واجبیـەکان، خۆجوانکردن بە پیاوەتی و پۆشینی پۆشاکی مەردایەتی.

٢- ئەزبەرکردن (الضبط)و دڵنیا بوون، لە فەرموودەی ڕیوایەتکراو و دەقی گێـڕدراوە، هۆشیاری پێ هەبوون و توانا بەسەر داشکان چ لە ڕووی لەبـەرکردن بێـت یـاخود لـەڕووی نوسین یان هەردوو بەیەکەوە، ئەمەی ڕابورد حوکمێکی گشتی و یە بۆ هـەموو فـەرموودە گێڕوەکان (الرواية)و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)، جگە لـە هـاوەڵان نـەبێت، چـونکە ئـەوان هەڵگری پەیامی پڕشکۆی پێغەمبەر (ﷺ) بوون، بە چاوی خۆی پەروەردەی کـردوون، بـە چاودێری خۆی پارێزگاری کردن.

پێشەوایانی و ئەهل و بەیتی بـەڕێز (ڕەزای خوایـان لێبێـت) جێگـەی ڕێـز و شانازی زانایـانی فـەرموودە و ڕیوایـەتکارەکانن لـە وەر گرتنـی فـەرموودە لەوکەسـانەی لـە پێغەمبەریان ڕیوایەتکردووە، لـە کاتێکـدا لـە چڵە پۆپـەی داد و کامـڵ بووندا بـوون. پێشەوای موسڵمانان علی و کوڕەکانی حسن و حسین لە یاوەرە بەڕێز و شکۆدارەکان بـوون ئەوان لە سەروی هەموارکردن (التعديل) و پرسیار کـردن (الـسؤال) بـوون، لـە هاوەڵـە و گەورەکان بوون، باوکی حسن پێشەوای بڕواداران علی، (بقی کوڕی مخلدالأندلسي)کـە لـە ساڵی ٢٧٦هـ کۆچی دوایی کردووە لە (مسند)ە کەی فـەرموودەی لێ ڕیوایـەتکردووە کـە فـراوانترین موسـندە لـە ئیـسلام ـ پێـنج سـەت و هەشـتاو شـەش (٥٨٦) فـەرموودەی ڕیوایەتکردووە.[1]

١ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ١٣٩. مقدمة مسند بقي بن مخلد، لا ٨٠.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کەلە ساڵی(٨١٩)[1] ھ.ك وەفاتی کردووە فەرموودەی لێ ڕیوایەتکردووە لە (مسند)ە بە دانسقەکەی ژێر دەستمان کە ھەشسەت و نۆزدە (٨١٩) فەرموودەی بە دووبارە بوونەوەی ڕێچکەکان لەخۆ گرتووە[2]. خاوەن شەش پەرتووکەکە(أصحاب الکتب الستە)،کە توون لە: بخاری، مسلم، أبو داود، النسائی، ترمذی، إبن ماجة، ژمارەی فەرموودەکانی (٣٢٢)سێ سەد و بیست و دوو،[3] فەرموودەیە. بخاری و مسلم لەسەر بیست فەرموودە یەکیان گرتووە، بخاری نۆ فەرموودەی تەنیا و موسلیمیش پازدەی بە خودی خۆی ڕیوایەتکردووە، مانا و مەغزای ئەو فەرموودانە پەیوەستن بە ھەموو ھۆکارەکانی ژیان: بیر و باوەڕ و ڕێساکان و ڕاڤەی قورئان و... تاد.[4]

پێشەوای موسڵمانان علی (رضي الله عنه) لە خەلیفە ڕاشیدەکان و لە ھەموویان زۆرتر فەرموودەی لێ ڕیوایەتکراوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ درەنگ وەفات کردنی بە بەراورد لەگەڵ خەلیفەکانی تر، بۆیە ڕاویەکان زۆر فەرموودەیان لێ ڕیوایەتکردوە، قوتابیەکانی زۆریان و بەر چاو بوون لە شوێن کەوتوان (التابعین) بوون، زۆریان پرسیاردەکرد، چەند تەنگەژەو ڕوداوێك ڕوویان دەدا پێویستیان گەیاندن (البلاغ)و گێڕانەوە (الروایة) ھەبوو، ئەم زانستانەیان لە علی(رضي الله عنه) بەو پەڕی دەست پاکی و ئەمانەتەوە دەگواستەوە،[5] حەسەنی کوڕی علی سودێکی زۆری لە باوکی بینی، بەڵام بەھۆی بچوکیەوە نەیتوانی بەھرەمەند بێت لە پێغەمبەر باپیری(صلى الله عليه وسلم) حسن منداڵ بووە کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوای کردووە، ھەروەك ئاشکرایە ژیسری لە باپیریەوە(صلى الله عليه وسلم) وەرگرتووە، کۆمەڵێك فەرموودە ووتراوە بۆلای پێغەمبەر پاڵدراون، حسن ڕیوایەتی کردوون، ھەروەك ھاوەڵە بچوکەکانی تر، إبن عباس و محمود الربیع، حەسەنیش گوێی

---

١ ـ مسند أحمد (١٦٤/١).

٢ ـ مسند أحمد (١٦٤/١).

٣ ـ تحفة الإشراف بمعرفة الأطراف للمزي (٣٤٦/٧)

٤ ـ الدوحة النبویة الشریفة ص. (١٤٠).

٥ ـ ھەمان سەرچاوە.

گرتووه و له باپیر و دایك و باوكی لەبەری كردوون، كوڕەكەشی كـه ئـەویش نـاوی حـسن بووه باسی كردوون، هەروەها سویدی كوڕی غەفله و أبو (حـوراء) سـعدی و، شـەعبی و، هبیرەی كوڕی بریم، (أصبغ) كوڕی نوباتەو، موسیەبی كوڕی نجبه لێیان ڕیوایەتكردووه[1]، بقی كوڕی مخلدیش له موسنەدەكەی لـه پێغەمبـەری خـوا سیانزه(١٣) فـەرموودەی لیّ ڕیوایەتكردووه[2]، ئیمام ئەحمەدیش له (مسند)ەكەی دە(١٠) فەرموودەی لەو هێناوە لـه (سنن الأربعة)شەش فەرمودەی لیّ ڕیوایەتكراوه[3]، ئەمەش هەندێك له فەرموودەكانن:

١- له أبو حوراء ئەویش له حەسەنی كوڕی علی كەفەرمووێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چەند ووشەیەكی فێركردم له قنوتی ویتر بیان خوێنم (اللهم إهدني فـيمن هَدَيْت وَ عـافني فمن عـافيت، وتولني فيمن توليت و بارك لي فيما أعطيت و قني شر مـا قـضيت، فإنـك تقضي ولا يقضي عليك، إنه لايذل من واليت تباركت رَبنا وَ تعاليت[4]. لێـرەدا ڕائـەبینین چۆن پێغەمبەر(ﷺ)سەرداری مرۆڤایەتی - حەسـەنی هـەڵناوە بـۆ خۆشەویـستی خـوا و پەرستش بۆ كردن و دوعا و پاڕانەوە لیّ، پەیوەست بوون به خوای تـەنها بـەو كـە تـاك و تەنیا، ئائەوەش حەقیقەت و ناوەرۆكی یەكتا پەرستی بیّ گـەرد، (التوحيـد الخـالص) كـه پێویسته موسڵمان له ژیانی ڕۆژانـەی دا پـەیڕەوی بكـات و ڕۆڵـەكانی لەسـەر پـەروەردە بكات.

٢- له (هـبيرة)وە ووتی: حەسەنی كوڕی علی وتاری بـۆ دەدایـن و فـەرمووی: دوێنـێ ئێوارە پیاوێك ماڵئاوایی كرد، پێشینەكان نـەیان توانیـوە و لـه زانـست پێـشی بكـەون، پاشینەكانیش پێی ناگەن، پێغەمبەر(ﷺ) به ئالاوە نـاردی، جبرائیـل لـه لای ڕاسـتی و میكائیل لەلای چەپی بوو، وچانی نەدا تاكو سەركەوتنی بۆ بەدەست هێنا.[5]

---

١ ـ سير أعلام النبلاء(٢٤٦/٣).

٢ ـ تلقيح أهل الأثر فى عيون التأريخ والسير لإبن الجوزي ٣٦٩.

٣ ـ مسند أحمد (١٦٧/٣) تحقيق أحمد شاكر، مسند أهل البيت تحقيق عبدالله الليثي الأنصار ٢٥، الدوحة النبوية الشريفة١٤٢.

٤ ـ مسند أحمد (١٦٨/٣) قال أحمد شاكر: إسناده صحيح.

٥ ـ تلقيح اهل الأثر في عيون التأريخ و السير لِإبن الجوزي، لا ٣٦٩.

٣- عەمری کوڕی حەبەشی فەرمووی: دوای کوژرانی علی، حسن وتارێکی بۆ داین و فەرمووی: دوێنێ پیاوێك ماڵئاوایی لێکردن، نە پێشینەکان لە زانیاری کێبڕکێیان لەگەڵ ئەو دا پێکرا، نە پاشینەکانیش پێشی دەکەون، پێغەمبەر(ﷺ) هەناردی ئاڵاکەی دایە دەست، وچانی نەدا تاکو سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هیچ شتێکی دوای خۆی جێ نەهێشت تەنها حەفسەت درهەم نەبێت، کە هەڵیگرتبوو بۆ ڕۆژی تەنگانە بۆ ماڵ ومنداڵەکەی.[1]

٤- لە محمدی کوڕی علی ئەویش لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە: تەرمێکیان بەلای ئێمەدا تێپەڕاند خەڵك هەموو هەستا حسن هەڵنەستا، ووتی: ئەی خەڵکینە ئەوە چیتان کرد؟ پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر ئەوە هەڵسا ئازاری بە بۆنی جولەکە دەچەشت.[2]

٥- أبو حوراء سعدیەوە دەفەرمووێ: بەحەسنی کوڕی عەلیم ووت: چیت دێتەوە یاد لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ ئەویش ووتی: دێتەوە یادم ڕۆژێك دەنکە خورمایەکی سەدەقەم هەڵگرتەوە و خستمە دەمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هێنایەوە دەرەوە خستیە ناو خورماکان، پیاوێك ووتی: چی أبوو گەر ئەو خورمایەی خواردبا؟ فەرمووی: ((إنا لانأکل الصدقة)) واتە: (ئێمە خێرات ناخۆین) ئینجا ووتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (واز بێنە لە کاری دودڵی و گومان، بۆ کاری دڵنیایی بڕۆ، چونکە بێگومان ڕاستگۆیی دڵنیاییە، درۆش گومان و دوودڵیە)وە هەروەها ئەم دوعایەشی فێر دەکردین (اللهم إهدنی فیمن هَدَیْت و عافنی فیمن عافیت، و تولنی فیمن تولیت و بارك لی، فیما أعطیت، وَقنی شر ماقضیت إنه لایزل من والیت)، هەندەك جار دەیفەرموو: ((تبارکت ربنا وتعالیت)).[3]

لە دووتوێ فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆشن دەبێتەوە کە (آل و بیت) پێغەمبەر خێر و سەدەقەیان پێ ناشێ، سەدەقە دوو جۆری هەیە، سەدەقەی پێویست کە زەکاتە، وە سەدەقەی بەخشش، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿خُذْ من أموالهم صدقةً تطهرهم وَ تزکهم

---

١ ـ مسند أحمد (١٦٧/٣) إسناده صحیح.

٢ ـ مسند أحمد (١٦٨/٣ إسناده ضعیف لإنقطاعه.

٣ ـ مسلم رقم: ١٠٧٢

بها﴾ [التوبة: ١٠٣ ] ڕاڤەکارانی قورئـان دەڵـێن: مەبەسـت زەکاتـە، واتـە: (سـەدەقەی پێویستکراو، هیچ ناکۆکێك لە نێو زانایان نی یە، کە سەدەقە بـە هـەر دوو جۆرەکەیـەوە حەڕامە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)سەدەقەی (فرض) کراوە بە هەمان شێوەش حەڕامە لەسەر ئـاڵ و بەیتی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام لە حەڕامی سەدەقەی بەخشش(صدقة التطوع) جیـاوازی هەیە لە نێو زانایان، شافیعی دوو قسەی لەبارەوە هەیە، قسەی ڕاست و ڕەوانـی ئەوەیـە: حەڕامـە، هـۆی حـەڕامبوونی سـەدەقەو زەکـات لەسـەر ئـاڵ و بـەیتی فەرموودەکـەی پێغەمبەرە(ﷺ)کە لە فەرمایشتێکی درێژ بە جوانی ڕونـی کردوەتـەوە کـە هەنـدێك لـە فەرموودەکە وەردەگرین: ((إن الصدقة لا تنبغي لآل محمد، إنما هـي أوسـاخ النـاس))، [1] نەوەوی لە ڕاڤەی فەرموودەکە دەڵـێ: واتـای (أوسـاخ النـاس) پاککردنـەوەی مـاڵ و دڵ ودەروونیانە هەروەك خوای گەورە لە ئایەتی: ﴿خُذْ مـن أمـوالهم صـدقةً تطهـرهم وَ تـزكهم بها﴾ [التوبة: ١٠٣] ئاماژەی پێداوە، هەروەك شوشتنی چڵك وایە. ئەمەش پـاکی ئـەوان دەردەخات، پایە و گەورەییان نیشان دەدات، هێمایە بۆ پاکیان[2]، بۆیە ئاڵ و بـەیت هـیچ شتێکیان لە سەدەقە وەرنەدەگرت نە لە چەرخی پێغەمبەر دا، نە لە دوای ئەویش، تـەنها پێنجێکی خۆیان لە دەست کەوت وەردەگرت و خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿واعلمـوا انما غنمتم من شيءٍ فأنَ لله خمسهُ و للرسول و لذي القربى ﴾[الأنفال:٤١].

زانایانیش إختلافیان هەیە لەسەر زەکات دان بە بە ئاڵ و بەیت و دەستنیشان کردنیـان لە دوو قسەدایە:

أ- أبو حنيفه و مالك و أحمد لە ڕیوایەتێکدا پێیان وایە ئاڵ و بـەیت تـیرەی هاشمـە و بەس ئەوانیش بە ئالی علی و ئالی عباس، و ئالی جعفر و، ئالی عەقیل و، ئالی حارسـی کوڕی عبدلمتليب هەژمار دەکـرێن، أبـو لهـب ناکەوێتـە نێـو بازنەکـە، کەواتـە دروسـتە زەکاتیان پێ بدرێ بە منداڵەکەی (أبو لهب)، بەڵام حەڕام بوونی سەدەقە و خێر و خێـرات بۆ تیرەی هاشم ڕێز لێنانێکی خوایی یە بۆ ئەوان و ڕەچەڵەکیان، چـونکە ئـەوان هاوکـار و

---

١ ـ مسلم رقم: ١٠٧٢.

٢ ـ شرح النووي على صحيح مسلم (١٨٣/٧ ـ ١٨٧).

کۆمەکی پێغەمبەریان کرد بۆ سەرکەوتن لە سەردەمی نەفامی و موسڵمان بوونیان دا، بەڵام (أبو لهب) هەر سور بوو لەسەر ئازاردانی پێغەمبەر(ﷺ)بۆیە نەوەکانی شایەن بەم پایە یەنین.[1]

هێندێك لە زانایانی حەنبەلی دەڵێن: أبو لهبیش دەکەوێتە نێو بازنەکە، چونکە ئەوانیش لە زنجیرەی تیرەی هاشمن[2]چۆن ناکەونە نێو ئەو بازنەیە کەلە کوڕەکانی (أبو لهب) (عتبه) و (معتب)لە ڕۆژی (فتح)ی مەککە موسڵمان بوون، پێغەمبەریش(ﷺ) دڵخۆش بە بوونە موسڵمان بوونیان، هەردووکیان لەگەڵ پێغەمبەر بەژداری جەنگی (حنين) و (طائف) یان کرد و کوڕەکانی أبو لهب بەشێکیان هەیە لەلای ڕەچەك ناس.[3]

ب- إمامی شافیعی، وای بۆ دەچێ ئال و بەیت تیرەی هاشم و بەنو موتەڵیب بن:

بەڵگەش بەمەی خوارەوە دەهێنێتەوە: پێغەمبەر(ﷺ) لە پێنجێك(خمس) بەشی بۆ تیرەی هاشم و هۆزی موتەڵیب داناوە، جگە لەم دوو تیرەیە بە هیچ تیرەیەکی تری قوڕەیشی نەبەخشیوە، هەروەك بوخاری ڕیوایەتیکردووە لە فەرموودەی جوبیری کوڕی مطعم کە دەڵێ: من و عثمانی کوڕی عەففان بەرێ کەوتین بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پێنجێکی خەیبەر دەدەیت بە تیرەی عبدالمطلیب ئێمەش فەرامۆش دەکەی، لە کاتێکدا ئێمە و ئەوان لە یەك ئاستداین، پێغەمبە(ﷺ) فەرمووی: ((إنما بنو هاشم وبنو المطلب شي واحد))، واتە: (تیرەی هاشم و تیرەی موتەڵیب لە یەك ئاستدان)[4]، وا لەم فەرموودە دەفامرێتەوە تیرەی هاشم و موتەڵیب لە پشك و بەشدا بە ئال و بەیت حیساب دەکرێن، کەوابوو هۆز و تیرەی موتەڵیب بەهەمان شێوەی تیرەی هاشم بە ئال و بەیت دادەنرێن، هەروەها زەکات لەسەر ئەوان حەڕام دەکرێ، ئەم بەخششەش وەك قەرەبوویەکە بۆ ئەو بێبەشکردنەی ئەوان لەسەدەقە و زەکات. هەروەها ئەم ڕێسایەش (قەدەغە کردنی زەکات) پەیوەستە بە خزمە نزیکەکانی پێغەمبەر(ﷺ)،

---

١ ـ شرح فتح القدير لابن همام (٢/٢٧٢ـ٢٧٤).

٢ ـ الإنصاف للمرداوي(٣/٢٥٥ ـ ٢٥٦).

٣ ـ التبين في أنساب القرشيين، لا ١٤٣.

٤ ـ البخاري كتاب فرض الخمس رقم: ٣١٤٠.

بۆ شایەنی پێنجێك کەواتە: پێویستە هاشمی و موتەڵیبی لە یەك ئاستدابن ویەکسان بن[1]، ئیمام ئەحمەدیش لە بارەی بەنی موتەڵیب دوو ڕیوایەتی هەن:

یەکەم: زەکاتیان پێ ناشێت لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): (ئێمە و بەنی موتەڵیب لە نەفامی و ئیسلام دا لە یەکتر نەترازاوین و ئێمە یەك شتین)[2]، لە ووتەیەك شافعی کەلە (مسنده)کەیدا ڕیوایەتیکردووە ((بەنی هاشم و موتەڵیب یەك چەشنن)) پەنجەکانی بە یەکدا بژاند.[3]

دووەم: بە پێ مەزهەبی أبو حەنیفە و مالك بۆیان هەیە زەکات وەربگرن، چونکە دەچنە نێو مانای گشتی فەرموودەی خوا ﴿إنما الصدقات للفقراء وَ المساكين﴾[التوبة:١٦٠]، بەڵام بەنی هاشم لەم بازنەیە دەر چوینە لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)، (أن الصدقة لاتحل لمحمدٍ ولا لآل محمد)[4]، قەدەغەکە تایبەت کراوە بەوان[5]، هەر بۆیە دەڵێن: قیاسی بەنی موتەڵیب لەسەر تیرەی هاشم (صحيح) نی یە، چونکە بەنی هاشم لە پێنجیەك بەهۆی خزمایەتیەوە نیە و بەس، بەڵکو بە هۆی هاوکاری و کۆمەکیانە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کۆمەك و سەرخستنی پێغەمبەریش مانای قەدەغەی زەکات ناگەیەنێت[6].

زانایان باسی حوکمی زەکاتیان کردووە بۆ ئال و بەیت لە حاڵێکدا کە پێنجێکیان پێنەدرێ لەبەر خاڵی بوونی (بيت المال) لە هەموو سەرمایە و دەسکەوتێکی جەنگ یاخود لەبەر دەست بەسەر داگرتنی ستەمکاران و چەوساندنەوەی ئال و بەیت بەم چەشنە حاڵاڵە، هێندێك لە زانایانی پێشین و پاشین ڕەئیان وایە زەکاتیان کە پێ دەدرێ، لە ئیمام أبو حەنیفە ڕیوایەتکراوە کە درووستە زەکات بدرێ بە بەنی هاشم لە چەرخی خۆیاندا، چونکە پێنجێکیان پێ نەگەیووە، هەرکاتێکیش پێنجێکیان پێ نەگەیشت درووستە لە قەرەبوودا

---

١ ـ معالم السنن للخطابى (٧١/٢) الإمام للشافعى (٦٩/٢)، المجموع للنووي(٢٤٤/٦)العقيدة في أهل البيت، لا ١٨١.

٢ ـ سنن أبى داود الإمارة رقم: ٢٩٨٠.

٣ ـ سنن النسائى رقم: ٤١٣٧.

٤ ـ مسلم رقم: ١٠٧٢.

٥ ـ العقيدة في أهل البيت، لا ١٨١.

٦ ـ المغنى لإبن قدامة (١١١/٤ـ١١٢).

زەكات وەربگرن[١]، هەندێك لە مالیكیەكان دەڵێن: كاتێك بێ بەش كران لە دەست مایەی (البیت المال) دەبن بە هەژار و نەدار كەواتە دروستە زەكاتیان پێ بدرێت[٢]، هەر لەم سۆنگەیەوە أبو بكری ئەبهەری[٣]، دەڵێ: سەدەقە و خێراتی واجب و سونەتیان بۆ حەڵاڵە[٤]. (أبو سعید الأصطخري) كەلە سەر مەزهەبی شافیعیەكانە دەڵێ: كاتێك لە پێنجێك قەدەغەكران زەكاتیان بۆ درووستە، چونكە لە زەكات بێ بەش كراون، چونكە پێنجێكیان هەیەو كە پێنجێكیان نەما واجبە زەكاتیان پێ بدرێ[٥]، بۆیە لە فەرموودەدا هاتووە: ((إن لكم فی خمس الخمس مایكفیكم، أو یُغنیكم)) واتە: (ئێوە یەكتان بۆ هەیە ئەوەندە بەستانە، یان پێ دەوڵەمەند دەبن)،[٦] بۆیە بە پێنجێك پێویستیان بەزەكات نابێ، بەڵام ئەگەر ئەم سەرمایە نەما كە هەبوو بۆ پێویستیان و مەرج بوو بۆ وەرنەگرتنی زەكاتیان، كەوابوو مەرجەكە لادەچێت و قەدەغەیان لێ كرا، هەندێك لە زانایانی حەنبەلی دەڵێن: درووستە ئال و بەیت زەكات وەرگرن گەر لە پێنجێك قەدەغەكران، چونكە پێنجێك شوێنی پێویستی یە. [٧] إبن تەیمیەش ئەو ڕەئیەی هەڵبژاردووە[٨].

٦. (ربیعەی كوڕی شیبان) بۆمانی ڕیوایەتكردووە: دەڵێ: حەسەنی كوڕێ علی هیچت لە یادە لەبارەی پێغەمبەرە(ﷺ)؟ فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) منی بردە ژووری خێرات(الصدقة) منیش دەنكە خورمایەكم هەڵگرت و خستمە دەمم پێغەمبەر(ﷺ)پێ فەرمووم: ((ألقها فإنها لاتحل للرسول الله ولا لأحد من أهل بیتهِ))[٩]، واتە: ( ئەم دەنكە خورمایە فرێدا، چونكە نە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نە بۆ كەسی آل بیت حەڵاڵە.

---

١ ـ حاشیة إبن عابدین (٢/٩١).

٢ ـ بلغة السالك(١/٢٣٢)، حاشیة الدسوقي(٤٥٢، ٤٥٣).

٣ ـ محمدی كوڕی عبدالله كوڕی محمدی صالحی ئەبو بكری تەمیمیە شێخی مالیكیەكان بوو لە عێراق لە ٣٧٥ ك وەفاتی كرد. بڕوانە (شذرات الذهب)، (٣/٨٥ـ٨٦).

٤ ـ المنتقي للباجي(٢/١٥٣).

٥ ـ المجموع للنووي(٦/٢٤٤ـ ٢٤٦).

٦ ـ تفسیر إبن كثیر(٢/٣١٣) قال إبن كثیر حدیث حسن لإسناد.

٧ ـ الإنحاف للمرداوي (٣/٢٥٥) و كشاف القناع للبهوتی (٢/٢٩١).

٨ ـ الإختیارات (١٠٤) العقیدة في أهل البیت، لا (١٨٦).

٩ ـ مسند أحمد (٣/١٧٠) إسناده صحیح قاله أحمد شاكر.

٧.بُريده كورِیٚ أبو مريم له أبی حوراو بۆمان ڕیوایەتی ئەکا ئیمە لای حی کوڕی علـی بویین پرسیاری لیٚ کرا چیت لەیادە لـە بـارەی پیٚغەمبـەری خـوا(ﷺ)فـەرمووی: لەگـەلٚ پیٚاٚەمبەری خوا دەڕۆیـشتم بـەلای خورمایـەکی صـدقە تـیٚ پـەڕیم دەنکـە خورمایەکـەم هەلٚگرت، خستمە دەمم، پیٚغەمبەرلە دەمی دەرهیٚنا، هەندیٚ لەخەلٚکە ووتیان: چی دەبوو ئەگەر بیخواردبا؟ فەرمووی: ئیٚمەی ئال محمد (صدقة)مان بۆ حەلاٚلٚ نی یە، پیٚنج نویٚژەکەم لەیادە.[١]

٨. لە ئەیوبی کوڕی محمدەوە ڕیوایەتکراوە لـە حوسـەینی کـوڕیٚ علـی (إبـن عبـاس) جنازەیەکی بینی یەکیان هەلٚستاوە ئەوەی تریـان دانـیش، ئـەوەی هەسـتاوە ووتـی: ئایـا پیٚغەمبـەر(ﷺ)هەلٚنەسـتاوەتەوە؟ ئـەوی دانیـشتبوو ووتـی: بـەلیٚ پیٚغەمبـەر(ﷺ) دانیشتبوو.[٢]

ئەوە هەندیٚ لەو فەرموودانەیە حەسنی کوڕی علی لە باپیریەوە ڕیوایەتیکردووە حسن بەیەکیٚك لە زانایانی صحابە دائەنریٚ ئەوانەی کەفتوایان داوە، یان بۆ سـیٚ چـین سـیٚەمی صحابە بووە فەرموودەناسان زانایانی (صحابە)یان بۆ سیٚ چین دابەشـکردووە ئەمـەش بـە دەگەڕیٚتەوە بۆ کەمی و زۆری فتواکانیان(إبن القیم) هاوەلاٚنی دابەشکردووە بـۆ سـیٚ چـین هەندیٚکیان زۆریان فتوا داوە هەندیٚکیان کەم هەندیٚکیان مام ناوەندی.

أ- ئەو هاوەلاٚنەی فتوای زۆریان داوە:

ئەو هاوەلاٚنەی کە فەتواکانیان پاریزراوە لە هاوەلاٚنی پیٚغەمبەر(ﷺ) سەدوسی پیـاوو ژن زیاترن، بەتایبەت حەوت کەس لەوان زۆرتر فەتواویان داوە عمری کوڕی خەتاب: علـی کوڕی ئەبو تالیٚب، عبدالله کوڕی مـسعود، عایـشەی دایکـی بـڕواداران، زەیـدی کـوڕی سابت، عبدالله کوڕی عمر، عبدالله کوڕی عەبباس (ﷺ)، أبو محمد دەلیٚ: دەشیٚ فەتوای هەریەك لەمانە پەرتوکیٚکی قەبارە گەورە پیٚکبیٚنن. وەدەلیٚت: أبو بکر محمد کوڕی موسای کوڕی یەعقوب ی کوڕی پیٚشەوای موسلٚمانان مەئمون، فەتواکانی إبـن عباسـی لەبیـست

١ ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ هەمان سەرچاوە (١٧١/٣).

کتێب کۆکردوەتەوە، جێگەی باسە أبو بکری ناوبراو یەکێکە لە پێشەواکانی ئیسلام لە زانستی فەرموودە ناسیدا.

ب- مامناوەندی لە فەتوا دەرەکان: أبو محمد دەڵێت: مامناوەندەکان کە فتوایان لێ ڕیوایەتکراوە أبو بکری سدیق، أم سلمة ئەنسی کوڕی مالك، أبو سعیدی خدری، ئەبو هورەیرە، عثمانی کوڕی عەفان، عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص، عبدالله کوڕی زوبێر.....تاد.

ج- ئەو هاوەڵانەی فتوایان کەم داوە: ئەوانی تر، کە بەکەم فتوا دەر ناوزەد دەکرێن، کە تەنها باسێك یاخود دوو باس و کەمێك زیاتر لەمە لێیانەوە ڕیوایەتکراوە... ئەوانیش بریتین لە: ئەبو دەرداء، ئەبو الیەسیر، ئەبو سەلەمەی مەخزومی، ئەبو عوبیدەی کوڕی جەڕاح، (حَسن حُسین)ی جووتە کوڕانی علی کوڕی ئەبو تاڵیب، نەعمانی کوڕی بەشیر، ئوبەی کوڕی کعب، ئەبو ئەیوب، ئەبو تەلحە، أبو ذر، أم عەتییە، سەفیەو، دایکی ئیمانداران حەفسە، ئەم حەبیبە (ڕەزای خوایان لێ بێت).[1]

هەشتەم: خەسڵەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ)وەك حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) ڕیوایەتیکردووە:

١- لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە وە لە خاڵی حەسەنەوە هیندی کوڕی أبو هالە حسن(رضي الله عنه) ووتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام غەمبار بوو هەمیشە لەبیر کردنەوە دابوو، هیچ کات پشوی نەبوو، زۆر بێدەنگ دەبوو تەنها بەگوێرەی پێویست قسەی دەکرد، زمان و زاری خۆی تەواو بەکار دەهێنا بۆ قسە کردن، بە ووشەی کەم و پڕ مانا دەدوا، قسەکانی نێوانیان هەبوو، ووتەکانی نەدرێژوو نەکورت بوو، سروشتی ڕەق و توند نەبوو، مام ناوەند بوو لە جەستەدا نیعمەتەکانی بە گەورە دادەنا ئەگەر کەمیش بوایە، باسی هیچ شتێکی بە خراپ نەدەرکرد، ڕەخنەی لە هیچ خواردن خواردنەوەیك نەدەدا ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە، بەڵام پەیوەندیشی لەگەڵ نەبوو گەر ماف پێشێل بکرایە هیچ شتێك نەیدەتوانی

---

١ ـ إعلام الموقعين (١/١٢، ١٣)، سيرة عائشة سليمان الندوي، لا ٣٢٧.

له ڕێگای کینەی ڕاوەستێ تاکو سەری دەخست، لە پێناو خۆی تورە نەدەبوو، هیچ هەولیشی بۆ سەر خستنی نەفس نەئەدا، گەر ئاماژەی کردبایەبە لەپەی دەستی ئاماژەی کرد، کاتی سەرسوڕمان وەرشی دەگێڕا، لە قسەکردن دەستی دەقوچاند و دەستی ڕاستی دەخستە ژێر دەستی چەپ، ساتی تورەبوون پەلەی دەکرد بۆ پشت هەلکردن، لە دلخۆشیدا چاوەکانی ئەنوقاند، زۆربەی پێکەنینی خەندەبوو، ددانەکانی وەك دەنکە تەرزە دەردەکەوتن، گەورەبوو، لە چاو خەلکی دەدرەوشایەوە، دەموو چاوی وەك مانگی چواردە جوان بوو، پێیەکانی نەرم و لوس بوون ئاو لێیان دووردەکەوتەوە، لە ڕۆیشتن قاچەکانی لە یەکتر دوور دەخستەوەبەپێ پیویست دەڕۆیشت، بە ویقار و خێرا دەڕۆیی، کاتێ دەستی دەکرد بە ڕۆیشتن وەك بەرەو لێژ بڕاوت وأبوو، کاتی ئاوڕی دەدایەوە بەتەواوی خۆی دەسوڕاندەوە، چاوەکانی بۆ خوارەوە ڕائەمان، ڕوانینی بۆ زەوی زیاتر بوو لە ئاسمان، زۆربەی تێڕامانی سەرنجدان بوو، مشوری هاوەلانی دەخوارد، بەهەر کەسێ دەگەشت سلاوی لێدەکرد.[1]

٢- وەسفی پێغەمبەر(ﷺ) بەم شێوە لە دەمی حسن و حسینی کوڕانی علی بیستراوە: پێغەمبەر دەمشڕو جنێو دەر نەبووە، دەم بەهاوارو قیژە نەبوو لە کوچەو بازاڕدا، خراپەی بەخراپ پاداشت نەدەدایەوە، بەلکو لێبوردن و چاوپۆشی دەنواند. هەرگیز بەدەستەکانی لە هیچ کەسێ نەداوە تەنها گەر جیهادی پێکردبێ، ئازاری خادم و دەست و پێوەندی نەئەدا، ئەزیەتی ئافرەتی نەئەدا، هەرگیز نەمبینیوە یارمەتی دەری ستەمکاربێت، کاتێکیش مافی خوا پێشێل دەکرا لە هەموو کەس کینەی زیاتر هەلدەگرت، سەر پشك کرابا لە نێوان دووکار ئاسانەکەی هەلدەبژارد، کە دەچویە مالی دەبوو پۆشاکی خۆی بست بەبست پاك دەکردەوە، مەڕو بزنی خۆی دەدۆشی، خزمەتی خۆی دەکرد، زوبانی خۆی گۆشەگیری دەکرد، تەنها بۆ شتی پەیوەندی دار دەدوا، هاوەلانی هۆگردەکر، بە ترس و بیم دووری نەدەخستنەوە، ڕێزی لە سەرەور و سەرکردەی هەموو گەلێ دەگرت، مشوری کاری دەخواردن، بە وریایی‌و خۆپارێزی مامەلەی لەگەل خەلك

---

١ ـ مختارات من أدب العرب لإبي الحسن النووي، لا ١٣.

دەکرد، بێ ئەوەی ڕووی خۆی گرژ بکات و، ڕەفتاری خـۆی بگۆڕێـت هامـشۆی یـاوەرانی دەکرد، پرسیاری لە کاروباری خەڵك دەکـرد، جـوانی تـۆخ دەکـردەوە و بـەهێزی دەکـرد، دزێوی ناشیرن دەکرد و بەرەو لاوازی دەبرد، ڕاستە کار بوو، نەك ناکۆك و نالەبار، بێ ئاگا نەدەبوو نەبادا کەم تەرخەم و بێ تاقەت بێت. بۆ هەموو ڕەوشتێك ئامادە باشـی هـەبوو، درێغی لە حەقیقەت نـەدەکرد و، لێ تێپـەڕ نـەدەکرد، هەڵبـژاردەی خـەڵك دۆسـتایەتیان دەکرد باشترین خەڵك لای ئەو کەسێ بوو ئامۆژگاریەکانی بـۆ هـەبوو، مـەزنترینیان ئـەو کەسە بوو ئاشتیخواز و هاوکار بێت. بەدەمی بە زیکرو یادی خوا دادەنیـشت، مـەجلیس کام شوێن کۆتـایی بـوو لێیـەوە دادەنیـشت و فەرمانیـشی بەمـە دەکـرد. هەریـەك لـە ئەندامانی مەجلیس وایدەزانی ئەو لەوی تر بەڕێز ترە لای پێغەمبەر(ﷺ). هەر کەسـێك لەگەڵی دائەنیشت یـاخود داوای پێداویـستی لێ ئـەکرد لەگـەڵی بـەردەوام دەبـوو تـاکو کەسەکە وازی ئەهێنا. پێداویستی خەڵکی بەکەسی تر نەئەداوە مەگـەر جێگـەی متمانـە بوایە. باڵی میهرەبانی بۆ خەڵك ڕائەخست و وەك بـاوك مامەڵـەی لەگـەڵ دەکـردن. لـە مافدا هەموو وەك یەك بوون، مەجلیسی ئەو مەجلیسی شەرم و شکۆو زانـست و ئـارامی و سپاردە پارێزی بوو، دەنگی پێدا بەرز نەدەکراوە بۆختان و سەر زەنشتی تێـدا نـەدەکرا، نسکۆ و نەنگیەکان نەدەکرا، هەموو یان یەکسان بوون تـەنها بەتـەقوا لەیـەکتر گـەورەتر بوون. هەموویان متواضع و ملکەچ بوون، ڕێزی بەساڵاچـوو دەگـیرا بـەزەییان بـە بـچوك دادەهاتەوە، خەمخۆری کەسی خاوەن پێویستی بوون، پارێزگاریان لە کەسی نامۆ دەکرد.[١]

٣- لە حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) ئەویش لە حوسەینی کوڕی علی کوڕی علـی کـوڕێ أبی تالیب ڕیوایەتیکردوە پیویـسی بەچـاو پیاخـشاندن هەیـە، کەبـە بەشـێکە لـەکتابی (الشمائل) ڕەوشتە جوانەکانی ترمذي: پێغەمبەر(ﷺ)دەم بە مژدە بـووە، خـۆش ڕەفتـار بووە، نەرم و بەخشندە بووە، دڵڕەق و قسە ڕەق نەبووە، دەم شڕو عـەیب گرو چەتوون و ڕژد نەبووە، خۆی لە کارێك کە حەزی لێنەدەکرد خـۆی بێـدەنگ دەکـرد و وەڵامـی نەئـەداوە ئەمەش وەك ڕێزێك بۆ بەرامبەر، خۆی لە سـێ شـت دوورگرتـووە بـوو، دەمەقاڵـە، خـۆ

---

١ ـ مختارات من أدب العرب لإبي الحسن النووي لا ١٥.

هەڵکێشان، کارێك کە پەیوەندی بەو نەبێت. خەڵکی لە چوار شت قەدەغە دەکرد، پاشە ملە باس کردن، یەکتر عەیبدار نەکردن، بە دوای عەیب و ناتەواوی یەکتر نەگەڕان، تەنها بە ئومێدی پاداشت نەبوایە قسەی نەدەکرد کە قسەی دەکرد هەموویان بێدەنگ دەبوون واتدەزانی باڵندە لە سەرسەریان وەستاوە، لە بێدەنگ دەبوو هاوەڵان گفتو گۆیان دەکرد دەمە قاڵەیان نەدەکرد، لەگەڵ هاوەڵان پێدەکەنی و لەگەڵ ئەوان سەرسام دەبوو، لەسەر کاری ڕێبوار ئارامی دەگرت گوێی بۆ شل دەکرد، تاکو هاوەڵان گرنگی پێبدەن فەرامۆشی نەکەن و دەیفەرموو: هەر کاتێك کەسێکیان بینی بەدوای پێداویستی دەگەڕا هاوکاری بکەن، پێداهەڵدانی قەبوڵ نەدەکرد مەگەر پڕ بە خۆی نەبوایە، قسەی بە کەس نەدەبڕی، تاکو تەواو دەبوو، یان مەجلیس هەڵدەستا، سینەگوشادو حەق بێژ بوو، سروشت نەرم و نیان بوو، جوانترین هەڵسو کەوتی هەبوو، هەرکەسێ بەڕوکەش دەیبینی ترسی لێ ئەنیشت، بەڵام کاتێك لێی نزیك دەبۆوە یاخود تێکەڵ دەبوو لەگەڵی و خۆشی دەویست، دەیووت: خوازراوە هیچ کەسێکم وەك ئەو نەبینیوە نەپێشتر و نەپاشتر.[1]

نۆیەم: ئایەتی پاککردنەوە(التطهیر) و فەرموودەی پۆشاك:

ئایەتی پاککردنەوە فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ [الأحزاب: ٣٣]، بەڵام فەرموودەی پۆشاك، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت)ڕیوایەتیکردووە دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ)بەیانیەکی زوو دەرچوو عەبایەکی خوری بەسەریەوە بوو، علیو فاتیمەو حسنو حسینی خستە ژێریەوە. فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ لە ڕاستیدا ئەم ڕیوایەتەی عائیشە بۆ ئەم فەرموودە درۆی ئەو کەسەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە،کە دەڵێت: هاوەڵان گەرەیی علی یان(رضي الله عنه) شاردۆتەوە، عائیشە کەئەوان وەهای بانگەشە دەکەن کەڕقی لەعلی(رضي الله عنه) ئەبینین ئەوا عائیشەیە فەزڵی علی و فاتیمە و حسن و حسین ڕیوایەتدەکات.[2]

---

١ ـ مختارات من أدب العرب لأبي الحسن الندوي، لا ١٦ نقلاً عن الشمائل للترمذي.

٢ ـ حقبة من التأريخ، لا ١٨٧.

لەم چەند ئایەتەی خوارەوە دواندن و ئاڕاستە کردن بۆ خێزانانی پێغەمبەرە بەوان دەست پێدەکات و هەر بەوانیش کۆتایی دەهێنێت خوای مەزن دەفەرمووێت:﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا(٢٨)وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا(٢٩)يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا(٣٠)وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحًا نُّؤْتِهَا أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا(٣١)يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا(٣٢)وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا(٣٣)وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾[ الأحزاب: ٢٨ـ ٣٤].

دواندن هەمووی لەگەڵ خێزانانی پێغەمبەرە(ﷺ) لەگەڵ (أمر)و (نهی) لەگەڵ ئەوانە، دەڵێ: کاتێك ئەو سوودە گشتگیر دەبێت بۆ ئەوان و ئەوانی تر لە ئال وبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) لەم ساتە ڕاناو دەبێتە (مذکر)، چونکە (مذکر) و (مؤنث)کاتێك کۆبوو نەوە (مذکر) زاڵ دەبێ، چونکە هەموو ئال و بەیتی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرێتەوە علی و فاتیمە و حسن و حسینیش تایبەتترن، چونکە پێغەمبەر(ﷺ)لە دوعا کردن ئەوانی تایبەت دەکرد، هەروەك ئال وبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) علی و حسن و حسین و فاتیمەی جیاکردۆتەوە لە خەڵکانی تر هەروەك لە فەرموودەی زەیدی کوڕی ئەرقەم دا هاتووە، کاتێك پێی دەووترێ خێزانەکانی لە ئال و بەیتی؟ دەفەرمووێ خێزانەکانی، بەڵام ئال و بەیتی ئەوانەن سەدەقەیان لێ قەدەغەیە، کە بریتین لە ئال(علی و جعفر و عەقیل و عباس)[1]، هەندێك لە زانایانی شیعەی دوازدە (إثنی عشرية) ئایەتی پاککردنەوەی (التطهير) یان پچڕاندووە لە سیاقی قورئانی. کە خوای گەورە خێزانانی پێغەمبەر دەدوێنێت. ئەمەش بۆ بێئاگابوون لە ژنانی پێغەمبەر لە دواندنی قورئاندا. دوایی

---

١ ـ مسلم رقم: ١٠٧.

فەرموودەی پۆشاکێشیان بۆ ئەم مەبەستە پاڵداوە، کە مسلم لە صەحیحەکەی لـە دایکـی بڕواداران عائیشەی ڕیوایەتکردووە دەڵێت: پێغەمبەر بـەرە بـەیانێك دەرچـوو، بـەرگێکی نەخشداری لە تاڵە مووی ڕەشی بەسەرەوە بوو، حسن و حـسین و فاتیمـە و علـی هـاتن و خۆیان خستە ژێرەوە ئەوسا فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَـنكُمُ الـرِّجْسَ أَهْـلَ الْبَيْـتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ وە لە فەرموودەی دایکی بڕواداران (أم سلمة) دا هاتووە ئەو کاتەی ئـەم فەرمایشتە بۆ پێغەمبەر(ﷺ).. هات أم سلمة دەڵێت: من لەگەڵ ئەوانم ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((أنت على مكانك، وأنت على الخير)) واتە: (تۆ لە شوێنی خۆت بە، تـۆ لەسەر خێر و بێری)[1] نیازی شیعەکان لێرەدا چەسپاندنی ئەو مانایەیە کە ئایەتەکەیان بۆ بەڵگە هێنایەوە[2] وە بۆچونیان وایە ئایەتی (التطهير) پاککردنەوە بەڵگەیە لەسەر پـاکی و بێ گوناهی یاوەرانی پۆشاك (أصحاب الكساء) کە پێکهاتوون لە علی و فاتیمەو حسن و حسین لەهەموو هەڵەو گوناهێکی بچوك و گەورە بەڵکو لە هەڵەو لـەبیر چـوونی مـرۆیش دوورو پـارێزراون[3] بڕوایـان وایـە حەسـەنی کـوڕی علـی پێـشەوای دووەمـی بـێ گوناهە(معصوم)ە.

پاك و بێ گونـاهی پێـشەوایەتی (الإمامـة) لـە لای شـیعەی إمـامی مەرجێکـە لـە مەرجـەکانی پێـشەوایەتی(ئیمامـەت)وە یەکێکـە لـە بنـەما سـەرەتایەکانی قـەوارەی بیروباوەڕی کیانی عقائدیان، گرنگی و بایەخێکی بەهاداری هەیـە لای ئـەوان، شـیعەکان دوای ئەوەی بۆ پێشەواکانی خۆیان خەسڵەت و سەیفاتی توانا سازی و بەهرەی زانستی بێ سنوریان زیاد کرد بەو ئەنجامە گەیشتن کە پێشەوا بەرپرسیار نیە بەرامبەر بەخـەڵك هـیچ ئەگەر و بواری هەڵەش نیە لە کردارەکانی هەر کار و کردەوەیەك بکـات. لەگـەڵ ئـەوەش پێویستە بەڕاستگۆ دابندرێت، بڕواشمان وا هەبێت هەموو ئەو شتانەی ئەو ئەنجامی دەدات هەمووی خێر و خۆشی یەو هیچ زیان و ئاشوبێکی تێدا نیە، چونکە ئەو کایەێکی زانیاری هەیە کەس پەیی بەهۆشیاری زانـستی ئـەو نـەبردووە، دەڵـێن: پێـشەواکان بـێ گونـاهن

---

١ ـ سنن الترمذي، كتاب المناقب رقم: ٣٧٨٨.

٢ ـ ثم أبصرت الحقيقة، لا ١٧٦.

٣ ـ هەمان سەرچاوە ، لا ١٧٦.

لەهەموو ژیانیاندا و تاوانی گەورەو بچوکیان ئەنجام نەداوە دروست نیە هەڵـە سەهوشـیان بخرێتە پاڵ[1]، شـێخ مفیـد: یەکـدەنگی شـیعەکان لـەم بـارەوە بـاس دەکـات و دەڵێـت: پێشەواکان(الأئمة) لەجێگـەی پێغەمبـەران یاسـاکان پیادەدەکـەن، سـنورەکان ڕادەگـرن، پارێزگاری لەشەرع و ئەدەبی مرۆیـی دەکـەن، بـێ خـەوش و گونـاهن وەك پێغەمبـەران، گوناهی بچوك و گەورە لەوان نافامرێتەوە و، هیچ شتێك بـەخراپ لـەبارەی ئـاین نـاڵێن، هیچ شتیش لەیادناکەن لە ئەحکام و یاسادا، هەموو ئیمامەکان لەسەر ئەم ڕێڕەوەن تەنها کەمێك ڕێز پەر بوون، ئەم باسەی پەیوەست کردوە بەڕوکەشی چەند ڕیوایەتێك کە تـەئویل هەڵدەگرن، بە پێچەوانەی گومانی خراپی لەم باسەدا[2]، جۆرێـك بەدرێـژی لـەبارەی ئـەم بیروباوەڕەی لە کتێبەکەم(ژیانامەی پێشەوای موسڵمانان) علی کوڕی ئەبو تالێـب[3]، لـەم بارەیەوە شارەزایی زیاتر دەوێ بابگەڕێنەوە بۆ ئەم پەرتووکە.

بەڵگەی (الشِعةُ الإمَامِيةُ) لە بارەی ئایەتی پاککردنەوە هەڵوەشاندنەوەی لەچەند ڕوێکەوە:

أ- فەرموودەی (أم سلمەی)کە لە پێشەوە باسمان کرد بە چەند شێوازێك هاتووە:

ڕیوایەت کراوە لە أم سلمة فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ)لای من بوو، فاتیمەو علـی و حسن و حسینیش لەوێ ئامادە بوون، گۆشتاوێکم بۆ ئـادەکردن خواردیـان و پـاڵ کـەوتن پێغەمبـەر(ﷺ)پەشـتە مـاڵ یـاخود پۆشـاکێکی قەدیفـەی بەسـەر دا کێـشان، ئەوسـا فەرمووی: (ئەی خوای میهرەبان ئەمانە لە خانەوادەی منن، چڵك و پیسیان لێ داماڵـە و جوان پاکیان بکـەوە) لـە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە پێغەمبـەر(ﷺ)لەسـەر پۆشـاکێك داینیشاندن، پاشان هەرچوار لیچکی پۆشاکەکەی بەدەستی چەپ لەسەر سـەریانەوە تونـد کرد، بەدەستی ڕاستیش هێمای بۆ لای خوا کرد و فەرمووی: (ئەمانە لە خانەوادەی منن، پیسی و چڵکیان لێ ڕامالە و پاکیا بکەوە) هەردوو ڕیوایەتەکان متفقن لەگـەڵ ڕیوایـەتی

---

١ ـ درسات عن الفرق د.أحمد جلي ص٢٠٣.

٢ ـ أوائل المقالات للمفيد، لا ٣٥.

٣ ـ أسمى المطالب سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب( ٣٠٢/٢).

مسلم کەلە عایشە ڕیوایەتکراوە لە گرتنەوەی هەر پێنج کەسەکە لە و ئایەتەدا، بەڵام ئەمەش مانای وانیە ستەمە کەسی تر بگرێتەوە بەدەر لەوان. [1]

کۆمەڵێ ڕیوایەت لە (أم سلمه) ڕیوایەتکراون بە زیاد کراوەوە، ئاماژە بە هاوبەش نەبوونی (أم سلمه) دەکەن لە ئال و بەیت لە فەرموودەکانی پۆشاك. زۆربەی ئەم فەرموودانە لە (ضعیفی) خالّی نین، بەڵام لەهەموویان (صحیح)تر ئەم ڕیوایەتەی خوارەوەیە: کاتێك ئایەتی ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ بەسەر پێغەمبەردا دابەزی لە ماڵی (أم سلمه) بانگی فاتیمە و حسن و حسینی کردو بە پۆشاکێك داپیۆشین، عەلیش لە پشتیەوە بوو، ئەمیشی بە لیباسێك پۆشی ئینجا فەرمووی: (ئەی خوای گەورە ئەمانە ئالو بەیتی منن پیسی و چەپەڵیان لێ ڕامالە و بە جوانی پاکیان بکەوە) أم سلمه ووتی: منیش لەگەڵ ئەوانم ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (تۆ لەمەنزڵی خۆت، تۆ لەسەر خێر و بێریت). [2]

ڕیوایەتێکی تری زۆر گرنگ و بایەخ دار ڕیوایەتکراوە بەسەنەدی (حسن) ئاماژە بەوە دەکات کە (أم سلمه) چووەتە ژێر پەشتە ماڵەکە دوای دەرچوونی ئەوان لەژێر یەك پەشتەماڵ ئومێد وایە هۆکاری نەچوونە ژژێری (أم السلمه)بۆ ژێر پەشتەماڵەکە دروست نەبوونی بێ لەبەر علی(رضي الله عنه) [3]، هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەخاتە ژێرەوە دوای دەرچوونی ئەم کۆمەڵە، شهر دەڵێت: ووتی گویم لە(أم سلمه) بوو لە کاتی بانگهێشتنی خەڵك بۆ ناشتنی حوسەینی کوڕی علی نەفرەتی لە خەڵکی عێراق دەکرد و دەیووت: کوشتیان خوا بیانکوژێتەوە فرت و فێڵیان لەگەڵ کردوو زەبوونیان کرد، یاخوا بەر نەفرەتی خوا کەون، من پێغەمبەرم(ﷺ) بینی فاتیمە بۆ لای دەهات قاپێکی هەڵگرتبوو حەلوای تێدا بوو، لەبەردەم پێغەمبەری دانا، پێغەمبەر فەرمووی: (کوڕە مامەکەت لەکوێ یە؟) ووتی: لە ماڵەوەیە، (بڕۆ بانگی بکەو هەردوو کوڕەکەشی بێنە) فاتیمەش چوو کوڕەکانی هەر یەکەو بەدەستێکەوە گرت، عەلیش بەدوایاندا دەهات پێغەمبەر(ﷺ) حسن و

---

١ ـ ثم أبصرت الحقيقة، لا ١٧٧.

٢ ـ فضائل الصحابة (٢/٧٢٧) رقم: ١٩٩٤ إسناده فيه ضعف وله طرق قوية.

٣ ـ ثم أبصرت الحقيقة، لا ١٧٧.

حسینی خستنە نێو کۆشی خۆی عەلیش لەلای ڕاستی دانیشت و فاتیمەش لەلای چەپی، (أم سلمه) ووتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەرگێکی خەیبەری ڕاکێشا،کە بەرگی ئێمە بوە بۆ نوستن هەمووی خستنە ژێرەوە، بەدەستی چەپی گۆشەکانی بەرەکەی گرت و بەدەستی ڕاستیش دوعای لە خواکردوو فەرمووی (ئەی پەروەردگارە ئەمانە لە خانەوادەی منن پیسی و چەپەڵیان لێ دامالە و بەجوانی پاکیان بکەوە) منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا- ئەی منیش لە ئەهل و ئالو بەیتی تۆ نیم؟ فەرمووی (بەڵێ فەرموو تۆش وەرە نێویەوە) منیش چوومە نێویەوە دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دوعای بۆ علی و نەوەکانی و کچەکەی کرد[1]، پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی بۆ أم سەلمە کە ئالو بەیتی ئەوەو خستیشیە ژێر بەرەکەوە دوای ئەوەی دوعا بۆعلی(رضي الله عنه)و منداڵەکانی کرد.[2]

ب- ئەوە دلالە دەکات، کە ئەم ئایەتە بەڵگە نیە لە بێ گوناهی(عصمة) و پێشەوایەتی(ئیمامەت) ئاڕاستەی دواندنە لەم فەرمایشتانەی پەروەردگار بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)بەوان دەست پێ دەکات هەر بەوانیش کۆتایی دێت:

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا(٢٨)وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا(٢٩)يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا(٣٠)وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحًا نُّؤْتِهَا أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا(٣١)يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا(٣٢)وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا(٣٣)وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾[ الأحزاب: ٢٨ـ ٣٤].

---

١ ـ فضائل الصحابة (٨٥٢/٢) رقم: ١١٧ إسناده حسن.

٢ ـ ثم أبصرت الحقيقة لا. ١٧٨.

ئاڕاستەی گوتر(خطاب) هەموو بۆ ژنەکانی پێغەمبەرە و، (أمر)و (نهی)و بەڵێن و هەڕەشە لەگەڵ ئەوانە، بەڵام کاتێك دەرکەوت ئەم سودوو قازانجە گشتگیرە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر و خەڵکی تر جگە لە ئال و بەیتی پێغەمبەر(ﷺ)ڕاناوی ووشەی پاککی (تطهر) بە (مذکر) خۆی دەرخست ئاشکراشە ئەگەر (مؤنث)و (مذکر) لەگەڵ یەك کۆ بوونەوە (مذکر) زاڵ دەکرێت. لێرەدا هەموو ئەهلی بەیتێك دەگرێتەوە علی و فاتیمە و حسن و حسینیش تایبەترن لەوانی تر چوونکە پێغەمبەر(ﷺ) تایبەتی دەکردن لە دوعا کردن. کەواتە ژنی هەر پیاوێك لە ئال و بەیتی پیاوەیە، ئەمەش شتێکی بەر بڵاو دیارە لە نێو ئەهلی زمانەوانی، هەروەك کەسێك بە هاوڕێکەی دەڵێت: ئەهلت حاڵی چۆنە؟ واتە:خێزان و ماڵو منداڵەکانت. لە وڵامدا دەڵێت ئەوان باشن خوای گەورە دەفەرموێت ﴿قَالُواْ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ رَحْمَتُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ﴾ [هود:٧٣] دوێندراو لەم ئایەتە پیرۆزە بە کۆڕای زانایان سارای خێزانی ئیبراهیمە، ئەمەش بەڵگەیەکە خێزانی پیاو لە (آل و بیت)ی ئەم پیاوەیە.[1] خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِن جَانِبِ الطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ [القصص: ٢٩] دوێندراو لێرەدا خێزانی گەورەمان موسایە. خوای پەروەردگار دەفەر مووێ ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا(٥٤)وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِ مَرْضِيًّا﴾ [مريم: ٥٤-٥٥].

کێن ئەوانەی فەرمانیان پێدەکرێ بۆ ئەنجامدانی نوێژ ئایە ئالوبەیتی ئەو نین؟ لە شوێنێکی تر پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ [طه: ١٣٢] بێ گومان خدیجە و هەموو خێزانەکانی دەکەونە نێو بازنەی ئەهل ئەمەش بە گوێرەی ئەوەی ئەم سورەتە مەکیە[2]، لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿وَاسْتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَى الْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَاء مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوَءًا إِلاَّ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ [يوسف: ٢٥]دوێندراو لێرەدا عەزیزی مصرە، قسەی ئەو ژنەی:

---

١ ـ الإمامة و النص، فيصل نور، لا ٣٨٦.

٢ ـ هەمان سەرچاوە ، لا ٣٩١

ئایە پاداشتی لەو کەسە چی یە کەبەرامبەر ئەهلی تۆ بەد ڕەوشتی بنوێنێ؟ واتە: خێزانی تۆ، ئەمەش ڕوون و ئاشکرایە[1].

ج- لابردنی پیسی لە زاراوەی قورئاندا واتایی بێ گوناهی ناگەیەنێ، ڕاغیبی ئەسفەهانی لە (مفردات ألفاظ القران) لە باسی (الرجس) واتە: شتی پس و قێزەوەن، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ﴾ [المائدة: ٩٠] پیسی لێرە دا مەی و قومار کردنە لە ڕوانگەی شەرع.. . کافرەکان پیسن، شریك بۆ خوا پەیدا کردن بۆکەسی عاقلّ دزێوترین کارە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إلى رجسهم﴾[ التوبة: ١٢٥] خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ [یونس: ١٠٠] ووتراوە (الرجس) بۆ گەنی، ووتراوە: (العذاب)، کتومت لە نێو ئایەتی ﴿إنماالْمُشْرِكُونَ نَجَسَ﴾ دەردەکەوێت. یاخود دەفەرمووێ: گۆشتی بەراز پیسە، بەگشتی ووشەی(الرجس) بنچەکەی قێزەونی (القذر)ە مەبەست پێ هاوبەش بڕیار دانە هەروەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾ [الحج: ٣٠] هەندێك جار بۆ پیسیە حەرام کراوەکان بەکاردێت: وەك خواردن و خواردنەوەکان لە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا﴾ [الأنعام: ١٤٥] ﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ﴾ [المائدة:٩٠].

نە چەسپاوە لە بەکار هێنانی قورئانیدا ووشەی(الرجس) بە واتای گوناهی ڕەها، تاکو لەم لایەنە مانای بێ گوناهی وەرگرێت.[2]

د- پاکبونەوە لە پیسی بە مانای بێ گوناهی نایەێت بۆ هیچ کەس: هەروەك ووشەی (الرجس) واتای گوناهو هەڵەی ئینسان دەدا لە کۆشش(الإجتها)دا، بەڵکو مەبەست پێی قێزەونی و بۆ گەنی و پیسی ناوەکی و دەرەکیە، بەهەمان شێوە پاککی (التطهير) مانای

---

١ ـ هەمان سەرچاوە ، لا ٣٩٣.

٢ ـ ثم أبصرت الحقيقة، لا ١٨١.

بێ گونەهی ناگەیەنێ، لە ڕاستی دا خوای گەورە پاکبونەوەی هەموو موسڵمانێکی مەبەستە نەك تەنها ئال و بەیت بەتەنها. گەرچی ئال و بەیت لە هەموو خەڵك نزیکترن بۆ پاکبونەوە پێش هەموو کەسێکیش مافی ئەوانە، پەروەردگار: لە بارەی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ﴿وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ﴾[المائدة:٦] هەروەها دەفەرمووێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ [التوبة: ١٠٣] خوای گەورە چۆن هەواڵ دەدات بە پاکبونەوەی ئال و بەیت، بەهەمان شێوە هەواڵ بەسەرجەم موسڵمانان دەدات، گەر پاککردنەوە واتای عیصمەت و بێ گوناهی بدات، ئەمە بۆ هەموو هاوەڵان موسڵمانان فەراهەم دەبوو، کە کۆمەڵە دەقێکی قورئانی بۆ پاککبونەوەیان لەسەر خواستی پەروەردگار هاتووە خوای گەورە لەبارەی ئەویندارانی مزگەوتی (قباء)لە یاوەرنی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ [التوبة: ١٠٨].

بە کۆڕای زانایان ئەمانە بێ گوناه نەبوون، خوای گەورە سەبارەت بە ئەهلی بەدر کە ژمارەیان سێ سەت‌و سێزدە کەس بوون دەفەرمووێ: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ﴾[الأنفال: ١١].

لێرەدا هیچ بەڵگەیەك بۆ بێ گوناهی ئەوان نیە هاوکات هیچ جیاوازیش هەست پێ ناکرێت لە فەرموودەکانی خوای گەورە لەسەر ئال و بەیت: لە نێوان ئایەتی: ﴿لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ [الأحزاب:٣٣]، لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ﴾ (رجز) و (رجس) دوو ووشەی لێك نزیکن و (يطهركم) لە هەردوو ئایەتی ڕابردوو وەك یەك هاتوە، بەڵکو ئارەزوو بازی لە ئایەتی یەکەمی کردووەتە بەڵگە لەسەر بێ گوناهی و ئایەتی دووەمیشی ترازاندووە، سەر سوڕمانی لەوە دایە زانایانی شیعە پشت بەم ئایەتە دەبەستن و بۆ (أصحاب الكساء)ی پاڵ دەدەن، لە پاشان لەمانای پاککردنەوە(التطهر) لای ئەدەن بۆ چەسپاندنی بێ گوناهی (أصحاب الكساء)، هەمان کاتیش کۆمەڵە ئایەتێك لە بیر دەکەن لەسەر خواستی پەروەردگار بۆ پاککردنەوەی هاوەڵان. بەمەش ناوەستن تانەو تەشەرەیان لێ دەدەن، دەڵێن: بەرەو دواوە پاشگەز بوونەتەوە کەچی خوای پەروەردگار دەقی پێدا هێناوە لەسەر خواستی خۆی بۆ

پاكبوونەوەیان[1]، ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ [النور: ٤٠]، خواست (الإرادة) لەم ئایەتە خواستێكی شەرعیە، بە پێچەوانەی خواستی قەدەری. واتە: خوای گەورە حەز دەكات پیسی و چەپەڵیتان لێ داماڵێت، زانایانی (اهل السنة) لەسەر ئەم دوو خواستە دواون، خوستی شەرعی دینی، خواستی قەدەری گەردوونی دەڵێن:

- خواستی شەرعی دینی: واتای خۆشەویستی و خۆشنودی لە خۆ دەگرێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ [البقرة: ١٨٥] وە ئایەتی ﴿وَاللّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلاً عَظِيمًا(٢٧)يُرِيدُ اللّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا﴾ [النساء: ٢٧-٢٨].

- خواستی قەدەری گەردونی: واتە: خواستی گشتگیری پەروەردگار بۆ هەموو دروستكراوەكانی، وەك (إرادە) خواست لە فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلَكِنَّ اللّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ [البقرة: ٢٥٣] هەروەها ئایەتی: ﴿وَلاَ يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ﴾ [هود: ٣٤]، گوناهو تاوان خواستێكی گەردونی و قەدەری یە خوا حەزی پێناكات و پێیان ڕازی نابێت(النهی) لێ دەكات، وە توڕە دەبێت بە ئەنجامدانی. ئەمە قسەی براوەی پێشین و پێشەواكانە ئاماژەیان كردووە خواستی ئەو كە خۆشەویستی و ڕەزامەندی خوا لە خۆ دەگرێت، وە ئەو خواستەی سەبارەت بە قەدەری و گەردونیە كە ڕەزامەندی و خۆشەویستی تێدا دەرناكەوێت[2]، بێگومان پەروەردگار پیسی لە فاتیمەو حسن و حسین و علی خێزانەكانی پێغەمبەر(ﷺ) داماڵیوە، بەڵام خواستی خوا لێرەدا خواستێكی شەرعیە، هەر بۆیە لە فەرموودەكەدا هاتووە پێغەمبەر كاتێك بە عەبا داییۆشین فەرمووی: (اللهم هؤلاء اهل بيتي اللهم اذهب عنهم الرجس).[3]

---

١ ـ ثم أبصرت الحقيقة، لا ١٨٢.

٢ ـ وسطية أهل السنة بين الفرق، محمد بن عبدالله، لا ٣٨٧.

٣ ـ سنن الترمذي، كتاب: مناقب أهل البيت رقم: ٣٧٨٧.

هـ- دوعای پێغەمبەر(ﷺ) باسەکە بنبڕ دەکات:

ئەگەر ئایەتی پاککردنەوە (التطهیر) بەڵگە بوایە بۆ پاکبوونەوەی (أهل الکساء) پێغەمبەر بە عەبا داینە دەپۆشین و دوعاشی بۆ نەدەکردن بەم دوعایە: (اللهم إن هؤلاء اهل بیتي اللهم اذهب عنهم الرجس)[1]، ئەمە بەڵگەیەکی ڕون و ئاشکرایە بەوەی ئایەتی پەروەردگار سەبارەت بە خێزانەکانی پێغەمبەر دابەزیوە پێغەمبەر(ﷺ) حەزی کرد ئەم خەڵاتە خوای یە بە (أصحاب الکساء)ش بگەیێنێ کە پاکبو بوونەوەیە بۆیە گردیان دەکاتەوە و بە عەبا دایاندەپۆشێ و دوعای خێریان بۆ دەخوێنێ و، خوای گەورەش دوعایان بۆ قبوڵ دەکات[2]، خوای گەورە پاکیان دەکاتەوە هەروەك خێزانەکانی پێغەمبەری پاککردنەوە بە دەقی ئایەت[3].

و- بەر پەرچ دانەوەی ئەو بەڵگانەی لەسەر ئیمامەت و بێ گوناهی ئیمام:

بەگومانی ئەوان ئەوەی تایبەت کراوە بۆ پێشەوای موسڵمانان علی و حسن و حسین لە ئایەتی قورئاندا بە هەمان شێوە بۆ خاتوو فاتیمەش چەسپاوە، لە یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی پێشەوایەتی بۆ ئافرەت نابێ، گەر ئەم ئایەتە بەڵگە بێت، کەواتە هەر کەسێك ئایەتەکە وەسفی بکات شیاوی ئیمامەت و شایەنی بێ گوناهی و ئیمامەتیە، بەم جۆرە خەملاندنە فاتیمەش دەکەوێتە بازنەی ئیمامەت و بێ گوناهی، کەوابێت ئەم ئایەتە مەبەست پێ ئیمامەت و بێ گوناهی نیە، هەروەها نۆ لە پێشەواکانیش هەڵاوێر دەکرێت کە ئەوان بەبێ گوناهیان لە قەڵەم دەدەن چوونکە ئەم ئایەتە هەمە گیر نیە بۆ هەموو یان تەنها تایبەتە بەسێ کەس کەبریتین لە:[4]

- علی کوڕی أبوتاڵیب(رضي الله عنه).

---

١ ـ سنن الترمذي، کتاب: مناقب أهل البیت رقم: ٣٧٨٧ (صححه الألباني).

٢ ـ ثم أبصرت الحقیقة، لا (١٨٢).

٣ ـ أسمی المطالب في سیرة أمیر المؤمنین علی بن أبی طالب (٢/٣١٤).

٤ ـ الإمامة و النص. ٣٨٧.

ـ حەسەنی کوڕی علی(ﷺ).

ـ حسینی کوڕی علی(ﷺ).

دەیەم: ئایەتی نەفرەتکاری و وەفدی گاورەکانی نەجران.

وەفدێکی نەجران هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ووتیان: ئێمە موسڵمانین پێش ئێوە،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سێ شت ڕێگای ئیسلامەتیمان لێدەگرێت: (پەرستشتان بۆ خاچ، خواردنی گۆشتی بەراز، بڕیاردانی ڕۆڵە بۆ خوا)[1] دەمە قالێەکی زۆریان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا کرد، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، پڕو پوچەکانی ئەوانی بەر تیشکی بەڵگە دەدا، ئەوانیش قسەیان دەبزرکاند و دەیانگوت: چی یە بۆچی جنێو بە پێغەمبەرکەمان(ﷺ) دەدەیت؟ دەشڵێ ی بەندەی خودایە، فەرمووی بەڵێ: پێغەمبەرە (كلمة الله) یە خوای گەورە خستویەتیە نێو مەریەمی عەزرائی بە تول، ئەوانیش ڕق و قینەیان لێ داگرت و ووتیان: ئەرێ هەرگیز مرۆڤێکتان دیوە بێ باوك، گەر ڕاست دەکەی وێنەی ئەومان پیشاندە؟ خوای گەورە بۆ بەرپەچ دانەوە ئەم ئایەتەی هەنارد ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ(٥٩)الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُن مِّن الْمُمْتَرِينَ﴾ [آل عمران: ٥٩-٦٠].

ئەمە بەڵگەیەکی بە هێزە سەرنجی نامۆ بۆ شتێکی نامۆتر ڕادەکێشێ.[2] کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)زانی دەمە قاڵە بە حیکمەت و ئامۆژگاری کردن هیچ بەرهەمێکی نابێت بانگی کردن بۆ نەفرەتکاری بە پشت بەستن بە (آیة)ی پەروەردگار: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ وَنِسَاءنَا وَنِسَاءكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةُ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾ [آل عمران: ٦١].

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ حسن و حسین و فاتیمە( ڕەزای خوای لێ بێ) دەرچوو و فەرمووی: گەر من دوعام کرد بڵێن: ئامین،[3] ئەوان ڕاوێژیان لەنێوان خۆیان کرد،

---

١ ـ زاد المعاد (٦٣٣/٣) سنده فيه ضعيف.

٢ ـ زاد المعاد (٦٢٩/٣ ـ ٦٣٨).

٣ ـ هەمان سەرچاوە. (٥٤٧/٢).

مەترسی لە ناو چوونیان لیٚ نیشت، چونکە زانیاریان هەبوو، کە ئەمە بەهەق پیٚغەمبەرە(ﷺ)، هەر گەلیٚکیش پیٚغەمبەریان نەفرەتبار کردبیٚ بەشیان تەنها لە نیٚو چوون بووە، بۆیە جلەو گیریان کرد لە نەفرەتکردنی پیٚغەمبەر و ووتیان: حوکمان لەسەر بکە چۆن حەز دەکەیت. پیٚغەمبەریش ئاشتەوایی لەگەڵ کردن بە دانی دوو هەزاری زەمیلە خواردەمەنی هەزار لەمانگی ڕەجەب، هەزاریش لەمانگی سەفەر[1]، بەم چەشنە مەغزاو مانای ئەم ئایەتە ڕۆشەن دەبیٚتەوە بەهۆی دابەزینی، کەواتە نەدوور نەزیك پەیوەندی بە بانگەشەی شیعەکانەوە نیە بۆ پیٚشەوایەتی علی کوڕی ئەبو تالیب بە دەقی قورئانی بەر پەچی گومانەکانم داونەتەوە لە پەرتوکەکەم (أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب)[2] هەر کەسیٚك دەیەوێ لەم پەرتوکە شارەزایی هەبیٚ بابگەڕیٚتەوە بۆ ئەم پەرتوکە.

## یازدەهەم: شویٚنەواری پەروەردەی خیٚزانی لەسەر حەسەنی کوڕی علی:

حەسەنی کوڕی لە ماڵی پیٚغەمبەرایەتی گەورە بوو، لەسەر دەستی باپیرەو دایەو بابە علی و فاتیمە پەروەردەی کرا، لە باپیر و دایك و باوکی چەمکەکانی ئیسلام فیٚربوو، ئەم نەشئەتە، کاریگەری گەورەی دروست کرد لە بنیاتنانو ڕیٚکخستنی کەسایەتیٚکی بەهیٚز کە پابەند بیٚت ئیسلام و، پیٚغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ: مرۆڤەکان کانگان وەك کانگاکانی زیٚڕ و زیو، هەڵبژاردەتان لە نەفامی هەڵبژاردەتانە لە ئیسلام[3]، کانگەی حەسەنی کوڕی علی دەگمەنە، حسن لە نەفامیەوە لەدایك نەبوو، بەڵکو لە ماڵی پیٚغەمبەرایەتی لە دایك بوو، ئەمەش کردیە (سید) کە واتایەکی پڕ بایەخ دەدات، کۆمەڵیٚ خەسڵەت لە حسن کۆبونەتەوە وەك، ڕەسەنی ڕەچەڵەك و پەروەردەی خیٚزانی کەلە خەڵکانی تر ئەم جۆرە خەسڵەتانە نین.

---

١ ـ السيرة النبوية لأبى شيبه (٥٤٧/٢)

٢ ـ أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب (٢/ ٣٣٤ ـ ٣٣٦)

٣ ـ البخاري، رقم: ٣٣٨٣.

باپیری پێغەمبەر(ﷺ)بوو.

باوکی علی کوڕی أبوتالیبە(رضي الله عنه).

دایکی فاتیمە زەهرایە(ڕەزای خوای لێ بێت).

داپیری خدیجەی کچی خویلدە(ڕەزای خوای لێ بێت)، لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) علی مشوری پەروەردەی حسن و حسینی دەگرێتە دەست و بەشێوەیەکی ڕێك و پێك سەرپەرشتیان دەکات، جێگەی باسە کەسایەتی ئەمیری موسڵمانان مەرجەکانی باوکێکی پەروەردەکاری تێدا دەستەبەر بوون. بێگومان دەرکی وەرگرتنی مانای وشەی خوای پەروەردگار کرد بوو کەدەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ [التحريم: ٦٦].

هەندێ لەو مەرجانەی کە پیویستە لە باوکی پەروەردکار دا هەبێت:

١- دڵسۆزی و هەست کردن و بایەخ دان پێی:

پێشەوای موسڵمانان علی بایەخێکی تەواوی داوە بە پەروەردەو فێرکردنی زانیاری بۆ حسن و حسینی کوڕی و ئەوپەڕی کۆششی لەگەڵ نواندون، پەیمانی چاودێری و گرنگی پێدانی پێداون، ئامانجیش لەمەدا ڕەزامەندی و پاداشت و نزیك بوونەوە بووە لەخوا بەهۆی پەروەردەکردنیان لەسەر گوێڕایەڵی خوداو سونەتی پێغەمبەر(ﷺ).

٢- بەخشینی پێشەوایەتی و پێشەنگی چاکخوازی بەڕۆڵەکان:

پێشەوایەتی بەیەکێك لە گرنگترین هۆکاری پەروەردە دەژمێردرێت. ئەمەش لەبەر بوونی غەریزەیەکی سروشتی و خوازیار لە قەوارە و گیانی مرۆڤ دا کە هانی دەدات بۆ لاسایی کردنەوەو گێڕانەوەی قسە، بەتایبەت مندالی بچوك[1]، إبن خلدون دەڵێ: لاسایی کرنەوە لەتەمەنی پێنج ساڵە یا شەش ساڵە دەردەکەوێت هەربەردەوام دەبێت تا کۆتایی

---

١ - مسؤولية الاب، عدنان بن حارث، لا ٦٥.

منـدالّی[1]، پێـشەوای موسـڵمانان علـی(ﷺ) پێـشەنگێکی گـەورە بـوو بـۆ ڕۆڵەکـەی حسن(ﷺ)، لەگەورە هاوەڵـەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو، یـەکێك بـوو لـە خەلیفـەکانی ڕاشیدین، بۆیە حسن لاسایی دایك و باوکی دەکردەوە لە لە خۆشەویستیەکی قوڵەوە.

٣- علی کوڕی أبوتالێب:

پێشەوای موسڵمانان بەخشندەو نەرم و نیان بوو لە پەروەردەکردنی دا:

علی کوڕی أبوتالێب نەخشا بوو بە ڕەحمو ئارامی، نـەرمو نیـان بـوو لەگـەڵ حـسن و حسین لە پڕۆسەی پەروەردەکرنیاندا، ئاشنای پلەو گەورەی ئەوان بوو لای پێغەمبەر(ﷺ)و فاتیمە (خوا لێی ڕازی بێت).

٤- مامناوەندی لە هەڵس و کەوت و دادوەری لە نێوان ڕۆڵەکاندا:

ئەم ڕەفتارە بەتەواوی لەڕەوشـتی علـی لـەکاتی ڕاسپاردەکەی بـۆ حـسن و حـسین و ماڵئاوایی لە هاوەڵان و نۆشینی بادەی مردن ڕەنگی دابۆوە، پێشەوای موسـڵمانان شـوێن کەوتەی قورئان کەوتبوو لەو پەروەردەو فێر کـاریو ئاڕاسـتە کردنـی منداڵـەکانی وەکـو خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ(١٣)وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ [لقمان: ١٣، ١٤ ].

مەبەست ئەوەیە قورئانی پیرۆز بایەخێکی زۆری داوە یادکردنەوەی پێغەمبەران (علیهم لـصلاة والـسلام)لەپـەروەردەکردنی منداڵـەکانیان ژیـانی عـەلیش(ﷺ) پیـادەکردنی فەرمانەکانی خوداو دوور کەوتنەوەیە لە نەهیەکانی، ئەمانە هێنـدێك خەسـڵەتی گرنگـی کەسایەتی پێـشەوای موسـڵمانان علـی(ﷺ) بـوون کـە هاوکاریـان کـردووە گرتـووە لـە پەروەردەکردنی هەردوو ڕۆڵەکانی (حسن و حسین)ی کوڕی.

---

١ ـ مقدمة إبن خلدون نقلاً عن موسوعة تربية الأجيال المسلمة، النصر بن محمد العنقري، لا ٨٦.

### دوازدەهەم: شوێنەواری کۆمەڵایەتی لەپەروەردەی حسن (ﷺ):

بێگومـان ژینگـەی کۆمەڵایـەتی دەورو بـەری مـرۆڤ ڕۆڵێکـی کاریگـەر دەگێـڕن لـە دروستکردنی پیاوان و بنیاتنانی کەسایەتیان، حەسەنی کوڕی علی لـە زەمـەنێك دا ژیـا هاوەڵان پێشەنگ و سەردار بوون. لە کۆمەڵێ و یەکەم بوو کە پەروەردەیان لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەر گرتبوو، فەزیلەو خواناسی و چاکسازی بـاڵی خۆیـان کێـشأبوو بەسەر ئەم کۆمەڵگە دەگمەندا، خەڵك بەگرو جۆشەوە پێـشوازیان لـە زانـست دەکـرد، و کرداریان بە قورئان و سونەت دەکرد ئائەم ڕەوشە حەسـەنی کـوڕی علـی پاڵـدا بـۆ سـود وەرگــرتن و پابەنــد بــوون بــەم کۆمەڵگایــەی تێــدا دەژێــت، ژمــارەی هــاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)کە نیشتەجێی شاری مەدینـە بـوون ئـای چـەندە زۆر بـوون! ژمارەیـەکی زۆریان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هەر لە مەدینە بەردەوام بوون، ئەو کۆمەڵگایـەی پێغەمبەر تێدا ژیاوە و بەدەستی موبارەکی پەروەردەی کردوون، باشـترین ئومـەتن خـوای گەورە دەستە بەری کـردون، هـیچ کۆمەڵگەیـەك کـێ بڕکـێ ئـەوانی پـێ ناکرێـت، ئـەم کۆمەڵگایە هاو زەمەنی وەحی و خـاوەنی بانگـەوازی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوون، هـاوڕێ ی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، بێگومان ئەم هاودەمی و هاو ژیانیە شوێنەواری دەرونـی و مانـای ئیمانی و پەیوەست بوونە ڕۆحی جـێ دەهێڵێـت[1]، ئـەم کۆمەڵگایـە شـوێنگەی ڕاکـێش کردنی خەڵك و کاریگەر بوو بۆ سەر ڕەفتار و گوفتاریان، ئا ئەم کۆمەڵگایە کاریگەرێکی بەهێزی هەبوو لە دروست کردنی کەسایەتی حەسەنی کوڕی علی.

---

١ ـ الإمام الزهري، شرّاب، لا ٢٦.

# جیّ باسی چوارەم

## حەسەنی کوڕی علی لەسەردەمی خولەفای ڕاشیدین

### یەکەم: پلەو پایەی حەسەنی کوڕی علی لە سەردەمی أبوبکری سدیق

حسن و حسین پلەو پایەیەکی بەرچاویان هەبوو لەلایان أبو بکری سدیق و عمر و عثمان و علی(ﷺ)، خۆشیانیان دەویستن و بەشێوەیەکی تایبەت هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردن، أبوبکری سدیق و علی کوڕی أبوتالیب لە دوای نوێژی عەسر بەڕێکەوتن و أبوبکر بینی حسن یاری لەگەڵ منداڵان دەکات، أبوبکر(ﷺ) گرتی و خستیە سەرسینگی. ئەوسا فەرمووی:

بأبي شبيه النبي ليسَ شبيهاً بعلي

واتە: بە باوکەوە بەفیدات بم تۆ هاوشێوەی پێغەمبەری نەك هاوشێوەی علی (ﷺ).

علی خەندە گرتی[1]. حسن(ﷺ) کاریگەر بوو بە ژیانی أبوبکری سدیق هەر لەبەر ئەوەش بوو یەکێك لە کوڕەکانی ناونا أبوبکر، هیچ کەسێك لە خەڵکی ناوی کەسانێکی تر هەڵنابژێرێت تەنها ئەنجامی خۆشەویستی زانیارێکی زۆر نەبێت بەسەر گوزەشتەی ئەو کەسەی ناوەکەی بۆمنداڵی خۆی وەردەگرێ، حسن فێری زانیاری بوو لەسەردەمی أبوبکر چ لە ژیانیدا یاخود لە دوای ئەبو بکر فێری چەند وانەیەك بوو لەوانە:

١- کارەساتی جەرگبڕی کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) و هەڵوێستی أبوبکر لەم بارەوە:

إبن رجب دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد موسڵمانان تاسان، هەیان بوو مەدهۆش و سەرگەردان بوو، هەبوو پاڵکەوتبوو توانای هەستانی نەمابوو، زمانی پاراو قسە کەوتبوو، هەندێك نکوڵی مردنیان دەکرد[2]. إبن إسحاق دەڵێت: کاتێ

---

١ ـ نسب قريش (١/٢٣)، البخاري (٥/٩٣).

٢ ـ لطائف المعارف، لا ١١٤.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفـاتی کـرد کۆسـتی مـسولمانان بـە وەفاتەکـەی گـەورە بـوو، عائیشه( ڕەزای خوای لێ بێ) وەکو بۆی باسکردوین و دەڵێ: عەرەب پاشەکـشەیان کـردو جولەکەو گاورەکانیش بەرەو پێش هاتن، دوو ڕوویی پەرەی سەند، لەشـەوی دووەم بـە لـە دەستدانی پێغەمبەر(ﷺ) مسولمانان وەك ڕانەمەڕی یاخی یان لێ هات،[1] قازی أبـوبکر دەڵێ: ڕەوشەکە ئالۆز بوو... مردنی پێغەمبەر(ﷺ) پشت شکێن بـوو، بـەلای زەمـەن و تەمەن بوو، علی(رضي الله عنه) لە ماڵی فاتیمە خۆی حەشار دابوو، عثمان(رضي الله عنه) کـڕو کـپ بـوو، عمر(رضي الله عنه) تورە دای گرتبوو دەیووت: پێغەمبـەر(ﷺ) نـەمردووە، بـەڵکو خـوای گـەورە پەیمانی پێداوە هەروەك پەیمانی بە موسادابوو، بێگومان دەگەڕێتەوە، دەست و قاچـی بـەد ڕەفتاران دەبڕێت[2]، کاتێك أبوبکر ئەم هەواڵەی بیست، لەشوێنی نیشتەجێبوونی خۆی لە (السُّنح) بەسواری ئەسپێك بەڕێکەوت، کاتێ لە ئەسپەکەی دابەزی و چـوو بـۆ مزگـەوت قسەی لەگەڵ کەس نەکرد تاکو چوو بۆ لای عائیـشە، دەسـتی بەسـەر پێغەمبـەردا(ﷺ) هێنا کە بە عەبایێك داپۆشرابوو عەباکەی لەسەر دەم و چاوی ڕامالی و ماچی کرد، ئینجا دەستی کرد بەگریان و ووتی: بەدایك و باوکەوە بەفیدات بم، سوێند بەخوا پەروەردگار دوو مردنی لەسەر دانەناویت ئەو مردنەی کەپێویست بوو بیبینی ئـەوە بینیـت[3]، دواتـر أبـو بکر لە ژووری دەرچوو بینی عمر قسە بۆ خەڵك دەکات، ووتی: ئـەی عمـر(رضي الله عنه) دانیـشە عمر(رضي الله عنه) هەر بەردەوام بوو لە قسەکردن و تەوژمی توڕی ئەو دانەمرکاوە، أبوبکر هەڵسا بۆ ووتار، دوای سوپاس و ستایشی خودا ووتی: هەر کەسێك محمدی دەپەرست ئـەوە محمـد مرد، هەرکەسێکیش خوا دەپەرستی ئـەوە خـوا زینـدوەو هـەرگیز نامرێـت، پاشـان ئـەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ [آل عمران: ١٤٤]. هەموو خەڵك دایانە پرمەی گریان. بەم چەند ووتـە بـەنرخ و بەهایانە و پشت بەستنی بە قورئانی پیرۆز، خەڵکی لە پێچی سەرگەردانی و مەدهۆشی

---

١ ـ سيرة إبن هشام (٣٢٣/٤).

٢ ـ القواصم من العواصم، لا ٣٨.

٣ ـ البخاري، كتاب: المغازي ـ رقم: ٤٤٥٢.

دەر هێنا، بۆ تێگەیشتنی ڕاست و ڕەوانی و ساغی قورئانی گەڕاندنەوە، بە گوێدا چرپاندن تەنها خودایە نەمرە، هەر خۆشی شیاوی پەرستنە کردنە، بەرنامەی ئیسلام ڕەوڕەوەی هەر بەردەوام دەبێت[1]، هەروەك لە گێڕانەوەی ووتەی أبوبکری سدیق دا هاتەوە: دینی خوا هەر ڕاوەستاو دەبێت، ووتەکانی پەروەردگار کامڵ و تەواون، خوا سەر خەری کەسێکە کەسەرخەری دینە، کتابی خوا لە ژێر دەستمان دایە ڕۆشنایی بەخش و سارێژ کارە، خوای گەورە هەر بەم پەرتوکە پێغەمبەری(ﷺ) ڕێنما کردوە، تێدا(حەلاڵ و حەرام)ی ڕوون کردۆتەوە، سوێند بە خوا کەمتەرخەمی نانوێنین لە کەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر مەخلوقەکانی خوا، شمشێری خوا هەڵکێشراوە تا ئەبەد دای نانێن، خەبات دەکەین دژ بە بەرهەڵستکارانمان هەروەك لەگەڵ پێغەمبەر ئەنجاماندا، کەس بۆی نیە ستەم لە کەسێکی تر بکات.[2]

مردنی پێغەمبەر(ﷺ)کارەساتێکی گەورە و تاقیکردنەوەیەکی بەهێز بوو، لەم نێوەندو دوایەدا کەسایەتی أبوبکر(رضي الله عنه) دەردەکەوێت وەك سەرکردەیەکی ناواز کەوێنەی نیە[3]، دڵنیایی لە دڵیەوە هەڵدەقوڵێ، لە ڕاستیە ڕەگ کوتراوەکان دا دەدرەوشایەوە، تەواو ئاشنا بوو بە حقیقەتی بەندایەتی و، پێغەمبەرایەتی، مردن لەم کاتە دژوارەدا حیکمەتی ئەو دەرکەوت، کە خەڵك بانگ دەکات بۆ یەکتا پەرستی: ﴿مَنْ كَانَ يعبد الله فَإِنَّ الله حَيٌّ لا يَمُوتْ﴾ یاوەران بەبەردەوام ئەم یەکتاپەرستیەیەیان بە ناسکی لە دڵدا مایەوە تا گەڕانەوە بۆ حەق[4]، عائیشە دەفەرمووێ: سوێند بەخوا هەر دەڵێ خەڵك ئاگاداری دابەزینی ئەم ئایەتە نەبوون لە پێشتر تاکو أبوبکر خوێندیەوە و خەڵکیش لێیان وەرگرت، هەرکەس گوێبیستی بوایە دەیخوێندەوە[5]، بێگومان ئەم کارەساتە شوێنی سروشتی خۆی جێهێشت لە بیری حەسەنی کوڕی علی دا، ئەمەش کایەی مەعریفەو ڕوناکبیری ئەوی زیاد کرد،

---

١ ـ إستخلاف أبوبكر الصديق ـ جمال عبدالهادي، لا ١٦٠.

٢ ـ دلائل النبوة للبيهقي (٧/٢١٨).

٣ ـ دولة ـ مجدي حمدي، لا ٢٥، ٢٦.

٤ ـ إسخلاف أبوبكر الصديق، لا ١٦٠.

٥ ـ البخاري، رقم: ١٢٤١، ٢٤٢

تەمەنی حسن ئەو ساتەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد لە نێوان حەوت و هەشت ساڵی دابوو، لەم قۆناغەدا هەست و ئیدراکی منداڵ گەشە دەکات، بیری منداڵ وەك کامێرایەکی داندراو وایە، زۆربەی دیاردەو وێنەو ڕووداوەکان بۆ (ذاکرة) دەگوازێتەوە، حسن خۆی لە منداڵە زرنگ و زیرەکەکان بوو، ئامادەیی تەواوی هەبوو بۆ وەرگرتنی ئەم ڕووداو گەلەی گوزەریان دەکرد لەم چاخەدا لە مەبەستە ئامانجدارەکانیان دەگەیشت و لە کردارە گەورەکان کەڵکی وەردەگرت، هەروەها لە هەموو ئەو هەڵوێستە بەرچاوانەو ئاکارە بەرزانەی أبو بکر سودی وەردەگرت، ئەم کردار و هەڵوێستە گران بەهایانە کاریگەری دەرونیان جێهێشت لەسەر حسن، خۆشەویستی أبوبکر دڵی داگرت، هەر بۆیە کوڕێکی بەناوی ئەوی ناونا. گەورەترین وانە حسن لە کۆچی دوایی پێغەمبەر وەری گرتبێ، ئەوەیە کە هەمیشەیی بۆ بنەماکانە (المبادئ)ە نەك بۆ کەسەکان هەروەها گرنگی وابەستە بوون بە خوای تاك و تەنها و، کەسود و زیان لەدەستی ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بە توانایە.

٢- سقیفەی بەنی ساعیدە:

کاتێك هاوەڵان هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەریان زانی (الأنصار)یەکان لە هەمان ڕۆژ کە ئەکاتە ڕۆژی دووشەممەی دوازدەی ڕەبیع و لئەوەلی یازدی کۆچی کۆبونەوە، بیر و بۆچوونی خۆیان لەمەڕ هەڵبژاردنی خەلیفەیەکی نوێ ئاڵو گۆڕ کرد[1]، (أنصاریە)ەکان لە دەوری سەرکردەی خەزرەج سعدی کوڕی عوبادە گرد بووبوون کاتێك هەواڵی کۆبونەوی (أنصار) لە سەقیفەی بەنی ساعیدە بە کۆچەرەکان(موهاجیرین) گەیشت کە ئەوانیش لەگەڵ أبوبکر کۆبونەوە بۆ هەڵبژاردنی کەسێك بۆ خیلافەت[2]، هەندێك لە (موهاجیرین)ەکان بەهەندێکی تریان ووت: دەی با بەڕێکەوین بۆ لای برایانمان لە یاریدەدەران چوونکە ئەوان لەم باسەدا بەشیان هەیە[3]، ئێمەش ڕێگامان گرتە بەر تاکو پێیان گەیشتین لە سەقیفەی بەنی ساعیدە پیاوێکمان بینی داپۆشرابوو لە نێوانیاندا، منیش

١ ـ التاریخ الإسلامي (٢١/٩).

٢ ـ عصر الخلافة الراشدة للعمري، لا ٤٠.

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٤٠

ووتم: ئەم پیاوە کێ یە؟ ووتیان: سعدی کوڕی عوبادەیە، ووتم: چی یەتی: ووتیان شـەکەت و ماندووە، کەمێك دانیشتین وتار بێژەکەیان شـایەتومانی هێنـاو ستایـشی خـوای کـرد، ئەوسا فەرمووی: ئێمەین (أنصار)یانی دینی خـوا، ئێمـەین کـەرتی ئیـسلام، ئێـوە ئـەی (موهاجیرین)دەستەیەکی کەم بوون، ئێستاش لە کاروبـاری خیلافـەت دەمانخەنـە دەرەوە، دوای بێدەنگ بوون ویستم قسە بکەم ـ بابەتێکم ڕازاوە کردبوو خۆم پێیەوە سەرسام بـووم حەزم دەکرد پێشکەش بە أبوبکری بکەم ـ کاتێك ویستم دەسـت بـە قـسە بکـەم أبـوبکر ووتی: هێواش لەسەرخۆبە. منیش پێم نـاخۆش بـوو کینـەی لێ دابگـرم أبـوبکر دەسـتی بەقسە کرد، زۆر لەمن نەرمتر و بە ویقار تر بوو، سوێند بە خـوا هـەر قـسەیەك مـن لـە بابەتەکەم پێ سەرسام بووم ئەو وەك هی من دەیکرد یاخود جوانتر و گەورەتر دەیدرکانـد. پاش بێدەنگێك فەرمووی: ئەوان نێوەندی عەرەبن هـەم لـەڕووی ڕەچـەڵەك هـەم لـەڕوویماڵەکانیان، من خۆشحاڵیم خۆ بۆ ئەم دوو پیاوە دوو پاتدەکەمەوە ـ ئێـوەش کێتـان لـەم دوانە بەدڵە پەیمانیان لەگەڵ ببەستن ـ دەستی من و أبو عوبیدەی جەڕاحی گرت لەگـەڵمان دانیشتبوو، ئەگەر بەس ئەم کارە نەبوایە من پێم ناخۆش نەدەبوو، سوێن بەخوا گـەردەنی خۆم واڵابکەم بۆ شمشێر لێ بدەی لام خۆشترە لە نێو گەلێك فـەرمانم پـێ بکـەی ئـەمیری بکەم کەتۆ تێدابی. بەخوا مەگەر لەکاتی سەرە مەرگ نەفس بـۆم بڕازێنێتـەوە ئێـستامن خوازیاری نیم. یەکێك لە (أنصار)یەکان ووتی: من بە بۆچوونی خۆم ئەم کێبڕکەیە کۆتایی دەهێنم ئێمە پێشەوایەکمان هەیەو ئێوەش پێشەوایەك ئەی کۆمەڵەی قوڕەیش، ورتـە ورت پەیدابوو، دەنگ بەرز بۆوە تاکو وایلێهات ناکۆکی کەوتە نێوانیـان منـیش ووتم: دەسـتت درێژ بکەوە ئەی أبوبکر، ئەویش دەستەکانی درێژە کرد، من پەیمانم لەگەڵ بەست و ئـەوجا (موهاجیرینە)کان، ئەوسا (أنصاریە)کان[1]، لە گێڕانەوەیەکی ئیمام ئەحمـەد، أبـو بکـری سدیق(رضي الله عنه) دەستی کرد بە قسە کردن هەر شتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی (أنـصارە)کـان ووتبێتی ئەو باسی کرد ووتی: من زانیومە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر خەڵك بە دۆڵێ: دابڕۆن (أنصاریە)کان بە دۆڵێکی تـردا بـڕۆنم ئـەوا مـن بـەو دۆڵـە دا دەڕۆم، کـە

---

١ ـ البخاري، کتاب: الحدود ـ رقم: ٦٨٣٠.

(أنصاريه)كان پێدا دەڕۆن، هەروەها زانیوتە ئەی سعد،[1] پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: تۆش دانشتبووی: قورەیش مشور خۆری ئەم کارەن، ووتی: سعد پێی فەرموو ڕاست دەکەی ئێمە وەزیر و ئێوەش ئەمیر.[2]

أبوبکری سدیق(ﷺ) زاهید بوو لەباسی فەرمانڕەوایی ئەمەش لە ووتارەکەی دەرکەوت، کە بیانو پاساوی هێنایەوە بۆ وەرنەگرتنی خیلافەت کاتێك فەمووی: سوێند بە پەروەردگار هیچ کات تامەزرۆی فەمانڕەوایی نەبووم تەنانەت بۆ یەك ڕۆژ یاخود شەوێکیش، هەرگیز ئارەزوو مەندی نەبووم و داواشم بۆی لەخوا نەکردووە نە بەئاشکراو نەبەنهێنی، بەڵکو لە ئاشوب ئەترسم، دڵنیام لە فەرمانڕەوایی ئاسودە و پشو نیە، بەڵام خۆم خستە ژێر ئەم بارە گەورەوە هیچ توانایەکم لەسەر نیە مەگەر بە پشتیوانی هێزی خوا نەبێت، گەرچی حەز دەکەم بەهێزرین کەس لەشوێنی مندا بێت[3]، بەم هەڵوێستەی دڵی موسڵمانانی پاکت کردەوە لەهەرچی بەرهەڵستکاریەك هەبوو بۆ خیلافەتی وی. بۆ ئەم مەبەستەش سوێندیان دەدات و دەفەرمووێ: ئەی خەڵکینە یادی پەروەردگارتان بکەن، کێ لەئێوە لەسەر بیەعەتدان دان بەمن پەشیمانە. علی هەستاوە لەگەڵ شمشێرەکەی لە أبو بکر نزیك کەوتەوە، قاچێکی لەسەر کۆسپەی مینبەر دانا و قاچێکی تریش لە وردە بەرد ئێمە دەستت پی لەکار ناکێشینەوە و لە فەرمانڕەوایت ناخەین پێغەمبەر(ﷺ)بۆ ئەم کارەی پێشی خستوی، کێ پاشگەزت دەکاتەوە[4]، ئا ئەمەیە ئەم حەقیقەتانەی حەسەنی کوڕی علی لە ڕووداوی سەقیفە وەری گرتوون، نەك وەك ساختەکاری مێژوو بانگەشەی بۆ دەکەن، بێگومان أبوبکر تەنها لەکاری خیلافەت زاهید و خواناس نەبوو، بەڵکو ڕۆحی عەسر بوو - ئەکرێ بگەڕێتەوە بۆ ئەم دەقانەی بە فراوانی باس کراون لەپەرتوکەکەم "(الإنشراح و رفع الضيق بسيرة أبي البكر الصديق)[5]. دەشێ بووترێ: ئەو

---

١ ـ سعدی کوڕی عەبادەی خەزرەجی خوا لێی ڕازی بێت.

٢ ـ مسند أحمد (٥/١) صحيح لغيره.

٣ ـ المستدرك (٦٦/٣): حاکم دەڵێ: فەموودەیەکی صحیح و دروستە زەهەبیش دانی پێدا ناوە.

٤ ـ الأنصار في العصر الراشدي، لا ١٠٨، الرياض النضرة(٢١٦/١).

٥ ـ الإنشراح و رفع الضيق بسيرة أبي البكر الصديق، لا ١٣٦ إلى ١٨٧.

وتووێژەی لە سەقیفەی بەنی ساعیدە هاتە کایەوە ئاراستەی خۆی بەرنەدا، بەڵکو جەختی لەسەر هاندانی (أنصار) دەکردەوە بۆ داهاتووی بانگەوازی ئیسلامی، وە خۆ ئامادەکردنی هەمیشەیان بۆ قوربانی دان، هەر بۆیە دڵ ئارام نەبوون تاکو بەخێرایی وەڵامی أبوبکریان دایەوە بۆ بەیعەت، أبوبکریش لەبەر ئەم هۆکارانە قەبوڵی کرد، بەڵام ڕوانینی هاوەڵان جیابو لە ڕوئیای ئەوانەی دواتر هاتن و پێچەوانەی پرۆگرامی زانستی و لێکۆڵینەوەی بابەتی ـ وەستان، لێکۆڵینەوەی ئەوان هاودژبوو لەگەڵ ڕۆحی عسر و خواست و خولیاکانی هاوەڵانی پێغەمبەر لە (أنصارە)کان و ئەوانی تر. ئەگەر گوایە کۆبونەوی سەقیفەی بووە مایەی پەرتەوازەی نێوان (أنصارو موهاجیرین)ەکان هەروەك هێندێك کەس گومان دەبەن[1]، ئایە چۆن (أنصار)یەکان ئەم ئەنجامەیان قەبوڵ کرد کە ئەوان خاوەن ماڵ و ژمارە و ئەسلیحە بوون؟ ملکەچی خیلافەتی أبوبکر بوون و لەگەڵ هێزی خیلافەت بۆ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا چوو بوون بۆ چەسپاندنی پایەکانی خیلافەت؟ بۆچی هێندە گەرم و گوڕبوون بۆ سەر خستنی؟ ڕون دەبێتەوە لە سوربوونی ئەنصارەکانیش بۆ پیادەکردنی سیاسەتی خیلافەت و خۆساز دان بۆ بەرەنگار بوونەوەی هەڵگەڕاوەکان، تاقە کەسێکی (موهاجیرە)کانیش ناکۆك نەبوون بۆ پەیمان دان بە أبوبکری سدیق(ﷺ). نەخاسەمە موسڵمانانی تری جگە لە (أنصارەکان). برایەتی کۆچەر و(أنصارەکان) زۆر گەورە ترە لە خەیاڵ پلاوی ئەو کەسانەی ناکۆکیان دروست کردووە لە نێوان ئەنصارو موهاجیرەکان بەهۆی ڕیوایەتە کینە دارەکانیان[2]، هەروەها ئەو کەسانەی وای بۆ دەچن ڕووداوی سەقیفە شوێنەواری خۆی جێهێشت لەسەر دەروونی حەسەنی کوڕی علی کاتێك ئەو پلان و فرو فێلانەی بینین هەروەك خاوەنی کتێبی (حیاة الإمام الحسن بن علی) وای گومان بردوەوە[3] حەسەنی کوڕی علی ئاشنای ئەو حەقیقەتە بوو کە هیچ قەیرانێکی سادە و مەترسی داری دروست نەکرد وە هیچ دابەشبوون و پەرتەوازێکی نەخولقاند. بەڵکو بۆ هەر یەك موهاجیرو ئەنصاریەکان هەڵبژاردراوێك هەبوو بۆ خیلافەت نەك وەك هەندێك لە

---

١ ـ بروانە: الإسلام وَأصول الحكم، محمد عمارة ص. ١٧ بۆ ٧٤

٢ ـ الأنصار في العصر الراشدي.

٣ ـ بروانە: حياة الحسن بن علی، باقر شريف القرشي(١/١٢٣ـ١٣٩).

مێژوو نوسان پشتیان بە چەند ڕیوایەتێکی هەڵبەسترا و چەند پەرتوکێکی ئەدەبی درۆ گەلێکی مێژوویی بەستووە، لە کاتێك دا هیچ نەقلێکی صحیح نەچەسپاوە، کە هیچ پلان و گرفتێك کەوتبێتە نێون أبوبکر و عمرو أبوعوبیدە بە قۆرغکردنی حوکم لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)[1]، ئەوان زۆر خۆپارێز تر و لە خوا ترستربوون لەوەی ئەم کارە ئەنجام بدەن.

ئائەوەتە حسن(رضي الله عنه) بۆمان ڕیوایەت دەکات، هۆشیاری لەسەر پێنج نوێژەکان لە زەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرتووە، هاموشۆی مزگەوتی پێغەمبەری خوای (ﷺ)کردووە، بێگومان پێغەمبەریشی بینیوە لەجگە لەکاتی نەخۆشیەکەیدا أبو بکری(رضي الله عنه) پێش خەڵکانی تر خستووە، زانیاریشی لەسەر پەیمان بەستنی موسڵمانان بە أبوبکر لە دوای باپیری هەبووە، کەواتە بیرو باوەڕی حەسەنی کوڕی علی لەسەر خیلافەتی أبوبکر(رضي الله عنه) هەمان بیرو باوەڕی ئەهلی سونەو جەماعەتە کە دانیان ناوە بە دروستی و شەرعیەتی خیلافەتی أبوبکری سدیق لە دوای پێغەمبەر(ﷺ)بەهۆی گەورەیی و پێشکەوتویی لە ئیسلام دا و پێشخستنی پێغەمبەر(ﷺ)لە نوێژەکاندا بەسەر هەموو هاوەڵاندا، یاوەران جوان لە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ)گەیشتوون لە پێشخستنی أبوبکر(رضي الله عنه) بۆ نوێژ، بۆیە هەمووشیان کۆك بوون لەسەر پێشخستنی بۆ خیلافەت و شوێن کەوتنی، تاکە کەسێکیش ناڕەزایی دەرنەبڕی. خوای گەورەش ئەم کۆمەڵە لەسەر گومڕایی کۆناکاتەوە، بەیعەتیان پێداو فەرمان بەرداری بوون و بۆ فەرمانی خواو ملکەچ بوون تەنها کەسێکیش نەیاری پێشخستنی نەبوو[2]، کاتێك پرسیار لەسەعیدی کوڕی زەید کرا کەی بەیعەت بە أبوبکر درا؟ ووتی: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر(ﷺ)کۆچی دوایی کرد: هاوەڵان پێیان ناخۆش بوو نیمچە ڕۆژێکیش دوور لە کۆمەڵ بمێننەوە[3]، زانای باوەڕ پێکراو إجماعی صحابە تابعینیان نقل کردووە أبو بکر(رضي الله عنه) لەگشت کەسێ شایەنتربووە

---

١ ـ إستخلاف أبوبکر، جمال عبدالهادي، لا (٥٠، ٥١، ٥٣)

٢ ـ عقيدة أهل السنة في الصحابة (٢/٥٥٠).

٣ ـ تأريخ الطبري (٣/٢٠٧).

بـۆ خیلافـەت[1]، وەك: خـەتیبی بەغـدادی و[2]، ئەبوحەسـەنی ئەشـعەری،[3] عبـدالمیك جوەێنی[4]، أبـوبكری بـاقلانی[5]، حەسـەنی كـوڕی علـی(ﷺ) بنـچینەكانی خیلافـەتی ئیسلامی جوان لەبەر كرد بوو، كە دەبێت لەسەر ڕاوێژو، بەیعەت بەڕێوە بچێ، موسڵمانان هەموویان كۆكن لەسەر واجبونی خیلافەتوە دیاری كردنی خەلیفە قەرزە لەسەر موسڵمانان بۆ بەڕیوە بردنی كاروباری ئومەت بە ڕەچاوكردنی سـنورەكان (الحـدود) و كـار كـردن بـۆ بڵاوكرنەوەی بانگەوازی ئیسلامی و پارێزگاری لە ئاین و ئومەت بـەهۆی جیهـاد و پیـادە كردنی شەریعەت و بەرگری كردن لە مافی خەڵكی و لەبار بردنی جـەور و سـتەم و دەسـتە بەركردنی پێداویستیەگرنگیەكان بۆ هەموو تاكێك[6]، ئاشكراشە ئەهلی (حل و عقـد) لـە سەقیفەی بەنی ساعیدە بەیعـەتیان بـە أبـوبكری سـدیق دا — بـە تایبـەت دواتـر لـەنێو ئاپۆڕەی خەڵك لە ڕۆژی دووەم دایانە دەنگ دانەوە، ئەوسا ئومەت لە مزگـەوت بەیعـەتی گشتیان پێدا[7]. حەسەنی كوڕی علـی لـەوەی ڕووی دا لـە سـەقیفەی بـەنی سـاعیدە دا گوزەری كرد كۆمەڵێ بنەما فێربوو لەوانە: سەركردە دەبێ تەنها بە ئارەزومەنـدی دیـاری بكرێ، بەیعەتیش یەكێكە لـە بنـچینەكانی ئارەزوومەنـدی و شـەرعیەتدان بەسـەركردە، بەڕێوەبردنی خیلافەتیش تەنها بۆ كەسێكە لە ئایین بەهێز تر و لـە مـشور خـواردن شـیاو ترین بێت. دیاری كردنـی خەلیفـەش بـە گـوێرەی بنـەماكانی ئیـسلامی و كەسایەتی و ئەخلاقیەت دەبێت.. . ئەو گفتوگۆیەی لە سەقیفە ڕویدا لەسەر بنەمای ئارامی دەروونـی لەنێو موسڵمانان بەر پابوو بەشـێوەیەك هـیچ پاشـا گـەردانێك ڕوونـەدات و هـیچ درۆ و دەلەسەو پلان بۆ لەبەین بردنی نەدرێ، هیچ هەوڵێك هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێكەوتن نەدرا،

---

١ ـ عقيدة أهل السنة و الجماعة في الصحابة (٢/٥٥٠)

٢ ـ تأريخ بغداد (١٠/١٣٠ ـ ١٣١)

٣ ـ الإبانة عن أصول الديانة ص٦٦.

٤ ـ كتاب الإرشاد، لا ٣٦١.

٥ ـ الإنصاف فيما يجب إعتقاده ولايجوز الجهل به، لا ٦٥.

٦ ـ الخلافة والخلفاء الراشدون، لا ١٦٣.

٧ ـ الخلافة والخلفاء الراشدون، لا ٦٦، ٦٧.

بەڵام ملكەچی بۆ ئەو دەقانەی، كە حوكم دەكەن(مرجع)ن لە گفتو گۆدا بـۆ گەڕانـەوە بـۆ دەقە شەرعیەكان.[1]

٣-بەشێك لە شێوەكانی حوكومرانی لە زەمەنی أبوبكری سدیق:

حەسەنی كوری علی(ﷺ) تەواو سودی لە پێغەمبـەر(ﷺ)و خولـەفای ڕاشـیدینەكان وەرگرتبـوو, هەربۆیـە كاتێـك بـۆ معاویـە دەسـتەبەرداری خیلافـەت دەكـات مـەرجی پاپەندبونی بە قورئان و سونەتەكانی پێغەمبـەر(ﷺ)و پـەیڕەوی خولـەفای ڕاشـیدینەكان لەسەر دادەنێت, ئەمەش ئاشنایەتی حسن دەردەخات بەزەمەنی أبوبكری سدیقەوە.

وتـاری أبـوبكری سـدیق لـەكاتی گرتنەدەسـتی جڵـەوەی دەسـەڵات بەسەرچـاوەی وتارەئیسلامیەكان هەژماردەكرێ لـە ڕەوانبێـژی و پوختیـدا, تێیـدا بڕیـاری بنـەماكانی دادپەروەری و بەزەیی لەشێوازی هەڵـسو كـەوت لـەنێوان حـاكم و مەحكومـدا دەركـرد. جەختی لەوە كردەوە كە گوێڕایەڵی ئەمیر پەیوەستە بە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ). جیهادی بەكارێكی گرنگ لەقەڵەمدا بۆ شكۆداركردنی ئومەتی ئیسلامی, بـۆ ڕیـشەكێش كردنی بەدرەوشتی و پارێزگاری كـردن لـەداروخان و گەنـدەڵی كۆمـەڵگا[2]، لـە میانـەی وتارەكەی أبوبكر و ئەو ڕوداوگەلەی لەدوای كۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)دەبارین.

حەسەنی كوڕی علی كۆمەڵێ شێوەی سیستەمی حوكمڕانی. لەسەرەتای زەمەنی خیلافەتی ڕاشیدیندا فێر بوو گرنگترینیان ئەمانە بوو:

أ- قورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) سەرچاوەی هـەرەباڵبوون لەدەوڵـەتی أبـو بكری سدیق(ﷺ). أبوبكر لەوتارەكەیدا فەرمووی: گوێڕایەڵیم بكەن بـەو ئەنـدازەی، كـە گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبـەرم(ﷺ) كـردووە، ئەگـەر سەرپێـچی گوێڕایەڵیـەكانیانم كـرد سەرپێچیم, و مافی گوێڕایەڵیتان نی یە بۆم.[3]

---

١ ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، للشجاع، لا ٢٥٦.

٢ ـ التاريخ الإسلامي (٩/٢٨).

٣ ـ البداية والنهاية(٦/٣٠٦).

ب- مافی گەل لەچاودێری کردنــی حــاکم و لێپرسـینەوەیی: لەوتارەکەیـدا هـاتووە و, ئەگەر پێکام هاوکارم بن ئەگەر خراپم کرد ڕاستم بکەنەوە[1]

ت- دانان بە بنەماکانی داد پەروەری و یەکسانی لەنێوخـەڵك: دووبـارە لەوتارەکەیـدا هــاتووە: لاوازتــان بــەهێزە لای مــن تاکومــافی بۆدەســەنمەوە, بــەهێزتان لای مــن بــێ هێزەتامافی بۆلێ ئەسەنرێتەوە إنشالله.[2]

پ- ڕاستگۆیی بنچینەی هەڵسەکەوت کردنە لەنێوان حاکم و مەحکومدا:

لەوتارەکیدا هاتووە: ڕاستگۆیی سپاردەیە(أمانة) درۆش ناپاکی کردنــە[3]، ڕاسـتگۆیی لەنێوان حاکم و ئومەتتدا سەرچاوەی هەڵسوکەوتە لە سەردەمی ڕاشیدیندا.

ج- ئاشکرادنی پەیوەستی بەجیهاد و سازدانی ئومەت بۆی:

أبوبکر(ﷺ)دەفەرموێ: هەر گەلێ وازی لەجیهاد هێنابێ خوای گەورە ڕیـسواوزەبونی کــردوون.[4] ئابــەم شــێوەیە أبــوبکر لەفــەرموودەی پێغەمبــەر(ﷺ) تێگەیــشتبوو کەدەفەرمووێ: ئەگەر بەیعەتتان بەسەروەت وسامانی دونیادا, دەستان بە کلکی مانگــاوە گرت, ڕەزامەنـد بــوون بەکـشتوکاڵ و, پـشتتان لــەجیهادکرد, خــوای گــەورە ریـسوایتان بەسەردازاڵ دەکات, یەخەتان بەرنادە تاکو بۆ ئاینەکەتان نەگەڕێنەوە.[5]

ح- پاککردنەوەی کۆمەڵگەلە بەدرەوشتی:

أبوبکر(ﷺ) دەفەرمووێ: بەدرەوشتی لەهەرشوێنێك بلاّوبیبێتەوە خوای گەورە بەگشتی ئەیانخاتــە ژێــر تەنگەژەوقەیرانــەوە[6]، أبــوبکر لێــرەدا ئومــەتی ئەکەوێتــەوەیاد بــەم فەرمودەیەی پێغەمبەر: ((لم تظهر الفاحیشة في قوم قـط حتـى يُعلنـوا بهـا، إلافـشا فـیهم

١ ـ البداية والنهاية(٦/٣٠٦).

٢ ـ البداية والنهاية(٦/٣٠٦).

٣ ـ البداية والنهاية(٦/٣٠٥).

٤ ـالبداية والنهاية(٦/٣٠٥).

٥ ـ سنن ابی داود رقم: ٣٤٦٢صححه الالباني.

٦ ـ البدايتوالنهاية(٦/٣٠٥).

الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم الذين مضوا))، واتـه: (بەدرەوشـتی لـە هەرگەلێك دەركەوێت وئاشكرا بكرێت, پەتاودرم و برسیەتی لە نێویان بلاو دەبێتەوە, كـە هیچ كەسێ لەپێشینان نەیبینیوە)[1]، ئەمە هەنـدێك لـەم ئامانجـە گرنگانـە بـوون، كـە أبوبكر لەوتارەكەی دوای پەیمان بەستنی گشتی بەیانی كـرد, نەخشەی سیاسەتی دەوڵەتی كێشا,دەستنیشانی سنوری بەرپرسیاریەتی حاكمی كـرد لـەنێوان خـۆی وژێردەسـتەكانی, جگەلەمانـەش چـەند بنـچینە و بنەمایـەكی گرنگـی دارشـت بۆبنیـات نـانی دەوڵـەت وپەروەردەی گەلان.[2]

## ٤- پەیمان بەستنی باوكی حسن لەگەڵ أبوبكر(ﷺ):

لە چەند ڕیوایەتێكی صەحیح هاتووە، كە علـی وزوبـیر هـەر لەسـەرەتاوە بەیعـەتیان بەأبوبكر داوە, من بەدرێژی باسم كردوە لەكتێبەكەم(اسمی المطالـب فـی سـیرة امیرالمؤمنین علی بن أبي طالب)* بێگومان حسن باوكی خۆی بینیوە لەهەڵوێـستە كۆمـەكخوازەكانی بۆ أبوبكر، علی بۆ ساتێكیش لە ساتان لێی جیانـەدەبووەو بۆجـارێكیش لەكۆمـەل لێـی دانەبڕا, هەمیشە هاوبەشی بـوو لـە ڕاوێـژ كـردن ومـشورخواردنی موسـڵمانان, وەك زار بینێك بوو پڕ لە ئامۆژگاری بۆ بەرژەوەنـدی ئیـسلام وموسـڵمانان لەهـەموو شـتێك لـەو بەڵگە ڕۆشەنانەی دڵسۆزی علی دەردەخات بەرامبەر بە أبـوبكرو بـەرخودانی بـۆ ئیـسلام وسـوربوونی لەسـەر پارێزگـاری مانـەوەی خیلافـەت كۆكردنـەوەی موسـڵمانان. هەڵوێستەكەیەتی بۆ ئاڕاستەكردنی أبوبكر بـۆ خـوودی خـۆی, ورە بەرزكردنەوەیـەتی بـۆ بەگژداچونی هەڵگەڕاوەكان هەروەها خودی خـۆی سـەركردایەتی بزوتنـەوە سـەربازیەكانی دەكات لەدژی هەڵگەڕاوەكان, ئەمەش هیچ مەترسێكی بۆ كیانی ئیـسلام نـەبوو[3]، إبـن عمر دەڵێ: كاتێك أبوبكر بۆ(ذي القصة) دەركەوت, لەسەر ولاغەكەی وەستا, علی كـوڕی

---

١ ـ صحيح إبن ماجه للالباني رقم: ٤٠١٩ .

٢ ـ الإشراح ورفع الضيق في سيرة أبي بكرالصديق، لا ١٨٣.

* ـ أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب(١/ ١٨٧).

٣ ـ المرتضى للندوي، لا ٩٧.

أبوتاليب ووتی: من ئەم فەرمایشتەت بۆ دەگێڕمەوە، کە پێغەمبەر(ﷺ) لەڕۆژی(أحد) فەرمووی: ((لِمْ سيفك ولاتفجعنا بنفسك وإرجع الى المدينة, فوالله لئن فجعنابك لا يكون للإسلام نظام ابداً)) واتە: (شمشێرەکەت بخەرەوە کالان وبۆ مەدینە بگەرێوە بەهۆی خۆتەوە توشی ئازارمان مەکە. سوێند بەخوا گەر بەهۆی تۆ توشی کارەسات بین, ئیسلام قەت ڕژێم و دەسەلآت و ڕێکی بەخۆیەوە نابینێتەوە) ئەوسا گەڕاوە.[1]

ئەگەر علی(ﷺ) سنگی خۆی بۆ أبوبکر(ﷺ) والآ نەکردبا، پڕ بەدڵی خۆی بەیعەتی پێ نەدابایە, لێرەدا هەلێکی زێرین بۆ علی هەڵدەکەوێت, بۆ ئەوەی دژ بە أبوبکر بیقۆزێتەوە و وازی لێبێنێ, بەئومێدی ئەوەی کارەساتێکی بەسەربێت و علی تێدا ئاسودە بێت و، جڵەوی حوکمرانیشی بۆ بڕەخسێ، یاخود ئەگەر کیشەکە لەمە گەورترە - حاشالله- لەرقەبەرایەتی ولەنێوبردنیدا بۆی, ئەوە کەسێکی تەفرەدەدا بۆ تیرۆرکردنی هەروەك سیاسیەکان بەرامبەر بە بەر هەڵستکاران ودوژمنانیان ئەنجامی دەدەن[2]، علی جەنگا دژ بە هەڵگەڕاوەکان بینی کاتێك أبوبکر دەڵی: چی دەڵێ لەم بارەوە دەڵێ: ئەی باوکی حسن؟ علی ووتی: دەڵێم: تۆ ئەگەر واز لە شتێ بێنی کە بێغەمبەر(ﷺ)لەوانی وەرگرتووە, کەواتە پێچەوانەی سونەتی پێغەمبەر وەستاوی, أبوبکر ووتی مادەم ئەمە ڕەئی تۆیەلەگەڵیان دەجەنگێم دەکەم گەر لەسەر پەتێکیش ڕێگرم بن[3]، بێگومان حسن گوێ لە باوکی بووە لە وەسف و مەدحی أبوبکر وعمر کە دەڵێ: هەر کەس فەزڵم بەسەر أبوبکر وعمر دا بدا ئەوە بە حەدی بوختان چی جەڵدی لێدەدەم[4]، پێتان بڵێم کێ باشترین کەسە؟ دوای پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: أبوبکر و عمر[5]، یاخود فەرموویەتی: چاکترین مرۆڤ دوای پێغەمبەر(ﷺ)أبوبکر و عمرن, ئەمە ریوایەت کراوە لە علی لەکۆمەڵیك

---

١ البداية والنهاية(٦/٣١٤ ـ ٣١٥).

٢ ـ المرتظى للندوي، لا ٩٧.

٣ ـ المختصر من كتاب: الموافقة بين اهل البيت والصحابة للزمخشوی، لا ٤٨.

٤ ـ فضائل الصحابة (٨٣/١) فی سنده ضعف.

٥ ـ مسند احمد (١٠٨/١، ١١٠، ١٢٧) تحقيق احمد شاكر.

ڕێگـاوه ووتـراوه کـه دەگاتــه هەشـتا ڕێگـا[1]، لەصـیلەی کـوڕی زوفـەری عەبەسـی ڕیوایەتکراوه، کاتێك لای علی باسی أبوبکر دەکرا دەیفەرموو: سوێند بەو زاتـەی گیـانی منی بەدەسته هەر کاتێك کێبرکێمان کردبێ بۆ خێر هەردەم أبوبکر پێـشمان کـەوتووه[2]، علی فەرمانەکانی أبوبکری لەخۆیدا بەرجەسته دەکـرد, کاتێـك دەسـتەیەك لـەکافرەکانی هاتن بۆ مەدینه, شڵەژاو ی و بێهێزەیکیان له نێوموسـوڵمان بـەدیکردو لەبـەر سـەرقاڵ بونیـان بـه جیهـادکردن لـه چـەند ڕوانگەیەکـەوه بـۆ لـەڕەگ و ڕیـشاڵ هەڵکیـشانی هەڵگەڕاوەکان. أبوبکر هەسـتی بـەم ترسـه گەورەیـه کـرد بـۆ سـەر پایتـەختی ئیـسلام وموسولمانان, هەر بۆیه فەرمانیدا به پارێزگاری مەدینـه وه سـەربازی بـه هـەموو دەوردا بڵاوکردەوه. هەروەها فەرمانی دا به علی و زوبیر و طلحة و عبداللـەی کـوڕی مەسـعود مشوری ئەم سەربازو پارێزگارانه بکێشن, بەم شێوەیه بەردەوام بـوون تـاکو تـەواو لێیـان دڵنیابوون[3]، لەبەر بوونی هەڵسوکەوتی بەرجەستەکراوو سۆزو خۆشەویستی و ئاشـتەوایی گشتگیر لەنێوانیاندا علی(ﷺ) هەدیەو بەخشیشی وەردەگرت وەك نـەریتێکی شـیرین لـه نێوانیان. هائەوەته(صهباء)کەنیزه که له جەنگی(عین التمر) به دیـل دەگـیرێ بـه دیـاری وەردەگرێت, دواتر دوو منداڵی دەبێت به نێوی عمر و ڕوقیه[4]، هەروەها أبوبکری سـدیق خەولەی کچی جعفری کوڕی قیسی به علی بەخشی که یەکێك بوو له دیلـەکانی جـەنگی یەمامه, لەدوای حسن وحسین چاکترین منداڵی لێ دەبێت بەنێوی محمدی کـوڕی حەنیفـه، (خوله) دەست کەوتی هەڵگەڕاوەکان بوو, محمدی کوڕی حەنیفەش لەرەچەڵەکدا بۆ(خولـه) پاڵ ئەدرێ[5], جوەینی لەبارەی پەیمانی هاوەڵان به أبوبکر(ﷺ) دەڵێ: هەموو هاوەڵان لـه ژێر گوێڕایەڵی أبوبکردا(ﷺ) بوون، علـی(ﷺ) گوێڕایـەڵی فـەرمانی بـوو, پـەیمانی بـه أبوبکردا به بەرچاوی کۆمەڵێك خەڵك بەشداری, جـەنگی بـەنی حنیفەشـی کـرد لـه ژێـر

---

١ ـ منهاج السنة (١٦٢/٣).

٢ ـ الطبراني في الاوسط (٧/ ٢٠٧ ـ ٢٠٨) إسنادة ضعيف.

٣ ـ تاريخ الطبري (٦٤/٤)الشيعة وأهل البيت، لا ٧١.

٤ ـ الطبقات (٢٠/٣).

٥ ـ الطبقات (٢٠/٣).

چـاودێری ئـەودابوو[١]، ژمارەیـەك ڕیوایـەت هـاتووە لـەبارەی قـەبوڵ کردنـی علـی و منداڵەکانی بۆ دیاری و بەخشیشی دەست کەوتی جـەنگ لـە أبـوبکری سـدیق(ﷺ) وەك ئاشکرایە علی دابەشکەرو مشورخۆری دەست کەوتی جەنگ بووە وپێنجیەکی بەرکەوتووە لە سەردەمی أبوبکر, ئەم سامانە لە دەستی ئەو دابووە, دواتر دەکەوێتە دەسـتی حـسن, ئینجا حسین. ئەوسا حەسەنی کوڕی حسن دواتریش زەیدی کوڕی حسن[٢]، علی نوێژەکانی لەمزگەوت لەدوای أبوبکر دەکرد حـەزی بەئیمامـەتی ئـەو ڕازی بـوو, هـەما هـەنگی و ئاشتەوای خۆی لەگەڵ أبوبکر ڕایئەگەیاند بە خەڵك [٣]، حەسەنی کوڕی علی بەم پێوەندیە زۆر چاك ئاشنابوو جگە لەم پیوەندیەی بەهۆی ژنخوازی لـەنێوان أبـوبکرو ئـەهلی بیـت دا هەبوو, وە ناونانی هەندێك لە ئال و بەیتی پێغەمبەر(ﷺ) بە أبوبکر(ﷺ), ئەم وابەستە بوونەی أبوبکری سدیق(ﷺ) بە خانەوادەی پێغەمبـەر(ﷺ)، پەیوەسـتی خۆشەویـستی و ڕێزبووە، کە شیاوی خودی خۆی ئەوان بوون, ئو سۆزو متمانەش بەشـێوەی ئـاڵوگۆڕ بـووە لەنێوانیاندا بەڕەنگێك چاوەڕوانی پەرتەوازەیی و لە یـەکتر دوورکەوتنـەوەی هـەرگیز لـێ ناکرێت, هەرچەند ئەفسانە خوازو پوچگەراکان پلانی بۆ دادە ڕێـژن, عایـشەی ڕاسـتگۆی کچی ڕاستگۆی خێزانی باپیری حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) بوو, خۆشەویسترین کـەس بـوو لای, بابەمەش ئیرەیی بەرەکان بسوتێن و نەیارەکانیش ڕق و کینـە دەرهاوێـژن. ئەمـەش حەقیقەتێکی چەسپاوە عائیشە پاکژ و خاوێنە بەشایەتی قوڕئان, با ناکـەس بەچـەکانیش نکۆلی بکەن و کەللە پوتەکانیش لە دژی بوەستن, دوای ئەویش ئەسمای کچی عمـیس کـە خێزانی جعفری کوڕی أبی تاڵیب بووە, دوای مردنی أبـوبکری سـدیق مـارەی دەکاتـەوەو منداڵێکی لێ دەبێت بە ناوی محمد دەیکاتە والی مصر. دوای کۆچی دوای إمامی أبـوبکر علی مارەیی دەکا و منداڵێکی لێ دەبێت بەناوی یـەحیا[٤]، لەبـەر بـوونی خۆشەویـستی وسۆز لەنێوان أبوبکر و ئەهلی بەیت- کوڕپەکانی خۆیان ناو ئـەبرد بـە أبـوبکر، ئەمـەش

---

١ ـ الإرشادللجويني لا ٤٢٨، نقلاً عن أصول مذهب الشيعة للغفاري.

٢ ـ الشيعة وأهل البيت٧٢ .

٣ ـالشيعة وأهل البيت لا٧٢.

٤ خلافة علي بن أبي طالب: ترتيب و تهذيب، كتاب: البداية والنهاية للسلمي، لا ٢٢.

بەڵگەیە بۆ برایەتی و دانانی علی(رضي الله عنه) بۆ أبوبکری سدیق. شایەنی باسە دوای ئەوەی أبوبکر ڕکێفی دەسەڵات دەگرێتە دەست، علی کوڕێکی ناو ئەنێت أبوبکر, یاخود دوای کۆچی دوای أبوبکر هەروەك ڕون و ئاشکرایە. علی کوڕەکەی خۆی ناوبردووە بە أبوبکر تەنها لەبەر فەرو بەرەکەت و دەرخستنی خۆشەویستی و وەفا بۆ ئەو بوو, پێش علی(رضي الله عنه) پیاوێك دەست ناکەوێت لەبەنی هاشم کوڕەکەی بەم ناوە نابێت, علی بەم خۆشەویستی هاوڕێیەتیەش نەوەستا کە بۆ أبوبکری دەریدەبڕی، بەڵکو موو بە موو هەنگاوەکانی ئەوی هەڵگرت و پەیڕەوی ڕێبازەکەی کرد, هەریەك لە حسن و حسینیش یەك لە کوڕەکانی خۆیان ناونا أبوبکر, (یعقوبی)و(مسعودی)ش کە لە مێژو نووسەکانی شیعەنە ئەمەیان باس کردوە [1]، ئالوبەیتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەر بەردەوام بوون لەناونانی کۆرپەکانیان بە أبوبکر(رضي الله عنه), بێ گومان ئەم پەیوەندیە بە هێزو تۆکمەیە لە نێوان أبوبکرو علی(رضي الله عنه) بەدی دەکرا, شوێنەوارێکی کاریگەری بەجێ هێشت لەدڵ و دەرونی حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) دا, بۆ ڕێزو نەوازش نواندن بۆ أبوبکر و ئاشنا بوون بەگەورەیی پلەو پایەکەی ئەو لە ئیسلامدا.

### ٥- ئامادەکردنی جەیشی ئوسامە لەلایەن أبوبکری سدیقەوە(رضي الله عنه):

یەکێك لە ڕووداوە بە ناوبانگەکان کە لە سەردەمی أبوبکر ڕوویدا و کاریگەری تایبەتی لە سەر ڕۆشنبیری حسن و نەوەکانی جێهێشت. ئامادەکردنی جەیشی ئوسامە بوولە دوای کۆچی دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وە سوربوونی بوو لەسەر پیادەکردنی ڕاسپاردەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)هەندێ لە هاوەڵان پێشنیاریان بۆ أبوبکر کرد جەیش لە شوێنی خۆی بوەستی: ووتیان: ئەمانە زۆرینەی موسڵمانانن, هەر وەك چاوەڕوان دەکرێ بە هۆی تۆوە پەرتەوازە بن و پێویست ناکات کۆمەڵی مووسڵمانان لە تۆوە جیا ببنەوە [2], لەولاشەوە ئوسامە هەندێك سەربازەکانی لە قەد پاڵی عمری ڕەوانەی لای أبوبکر کرد بۆ ئەوەی مۆڵەتی گەڕانەوەی ئەم سەربازانەی لێوەر بگرن، ووتی: زۆرینەی مووسڵمانان لەگەڵ من دان, خەلیفەی مووسڵمانانیش ئاسایشی بۆ ئامادە نەکراوە, یاساغ و نارەواشە هاوبەش

---

١ تأريخ اليعقوبي (٢/٢٢٨).

٢ ـ البداية والنهاية(٦/٣٠٨).

پەیداکەران پێغەمبەر و مووسڵمانان بڕفێنن[1]، دوای گفتوگۆ و دەمەقاڵەیەکی زۆر أبوبکر کۆتایی بە دانیشتنی یەکەم هێنا داوای دانیشتن و کۆبونەوەیەکی تری کرد بۆ ساڵی داهاتوو لەمزگەوت, لەم کۆبوونەوە داوای لەیاوەران کرد واز لە جێبەجێنەکردنی پڕۆژەیەك بێنن کە پێغەمبەر(ﷺ) بە خودی خۆی دایڕشتووە, پێ ڕاگەیاندن کە ئەم پڕۆژەیە پیادە دەکات ئەگەر ببێتە هۆی داگیر کردنی مەدینەش لەلایەن عەرەبە هەڵگەڕاوەکانەوە. دەستی کرد بە وتاردان و دواندنی یاوەران[2] ووتی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە, ئەگەر وا گومان ببەم دڕندەیەك دەمڕفێنی ناردنی ئوسامە پیادە دەکەم هەر وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی داوە, خۆ ئەگەر جگە لە منیش کەس نەمێنێت بە دڵنیاییەوە هەر جێبەجێ دەکەم.[3]

(الانصاریە)کان داوایان لەپیاوێکی بەتەمەنتر کرد لە ئوسامە بۆ ئەوەی مشوری جەیش بخوا بۆ ئەم مەبەستە عمری کوڕی خەتتابیان هەنارد بۆ لای أبوبکر سەبارەت بەمە قسە لەگەڵ أبوبکر بکات عمر دەفەرمووی: (الانصار) داوای پیاوێکی بەتەمەنتر لەئوسامە دەکەن. أبوبکر لە دانیشتنەکەی ڕاست بووە ڕیشی عمری گرت و ووتی: دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات ئەی کوڕی خەتاب: پێغەمبەر(ﷺ)دیاری کردوە فەرمانم پێ دەکەی لەم کارە لای دەم[4]، پاشان أبوبکر(رضي الله عنه) دەرچوو بۆ لایان و دیاری کردن و کۆمەکیاریان بوو, أبو بکر(رضي الله عنه) بە پیادەڕۆی و عبدالرحمانی کوڕی عەوفیش جڵەوی ووڵاغەکەی ڕادەکێشا، ئوسامە پێ ووت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوێند بە خوا یان سواری ووڵاغ دەبیت یاخود دا دەبەزم. أبوبکر(رضي الله عنه) ووتی: سوێند بەخوا دانابەزیت و منیش سواری ووڵاغ نابم چی یە؟ ئەگەر قاچەکانی من لە پێناو خوا غوبار بگرن[5]، ئەسا ڕوی لە سەربازگە کردوفەمووی: ئەی خەڵکینە بوەستن غەدر لەکەس مەکەن و سنور مەشکێنن و دیمەنی شتەکان مەشێوێنن, درەختی بەردار مەبڕن , مانگا و مەڕو بزن و وشتر مەکوژن تەنها بۆ خواردن نەبێت, بەلای هەندێك لە گەلان تێپەڕدەبن کاتی خۆیان لەنێو

---

١ ـ الكامل لإبن الأثير (٢/٢٢٦).

٢ ـ الشورى بين الإصالة والمعاصرة، لا ٨٣.

٣ ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥).

٤ ـ تأريخ الطبري (٤/٤٦).

٥ ـ هەمان سەرچاوە.

پەرستگاکان(الصوامع) بەسەر دەبەن بانگەوازی ڕێگای حەقیان بکەن, بەگەلێك گوزەر دەکەن قاپێکی ڕازاوە بەجۆرەها خواردنتان بۆ دێنن, ئەگەر شتێکتان لەم خواردنە خوارد ناوی خوای لەسەر بکەن, بەگەلانێك دەگەن ناوەندی سەری خۆیان تاشیوەو دەورو بەریشیان هێشتووەتەوە ئێوە بە هێزی ملیان پێ کەچ کەن. بەناوی خودا ناویان بەرن. [1]

ئامۆژگاری ئوسامەشی کرد ئەو کارە ئەنجامبدات کە پێغەمبەر(ﷺ) فرمانی پێ کردوە لە(قضاعة) دەست پێ بکە ئینجا لە(آبل)[2]، هیچ خاوی و کەم تەرخەمی مەکە لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) وە پەلەش مەکە بە پاساوی ئەوەی لەسەردەمی ئەودا دواکەوتووی. [3] ئوسامە بەردەوام بوو لەگەڵ جەیشەکەی بۆ ناردنی سوارچاك لە تیرەکانی(قضاعة)و هێرش کردن بۆ سەر(أبل) تاکو خۆیان دا بەدەستەو بەو شێوەی پێغەمبەر(ﷺ) فرمانی بە ئوسامە دابوو کاروانی جەیشی هەر سازو ئامادە باش بوو تا چل ڕۆژی تەواو. [4]

هەواڵی کۆچی دوای پێغەمبەر(ﷺ) لە لایەك و هێرشی. ئوسامە بۆ سەر بەشێك لە نیشتیمانی لەلایەکی ترەوە بە(هیرقل) گەیشتن, ڕۆمەکان ووتیان: چیە ئەمانە خاوەنەکەیان دەمرێ و هێرش بۆ سەر زەوی ئێمە دێنن[5], عەرەب ووتیان: گەر هێزیان نەبێت ئەم هێرشەیان نەئەهاورد[6]، بەسە لەم بارە کەزۆرینەی ئەوان ئەیانەویت شەڕ بەرپابکەن. [7]

هەندێك لە شیعەکان فەرموودەیەکیان هەڵبەستووەو پاڵیان داوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)کە هیچ أصلێکی نیە لە پەرتووکەکانی سونەدا. دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی کردوە لەو کەسانەی لە جیشی ئوسامە دواکەوتن, جێگەی باسە ئەم فەرموودە ناپەسەندەو هیچ بنەمایێکی نیە. شیعەکانیش بەڵگە بەم فەرموودە دەهێننەوە تەنها بۆ

---

١ ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ أبل: ناوچەیەکە لە باشوری ئوردنی ئێستا.

٣ ـ تأريخ الطبرى (٤٧/٤).

٤ ـ تأريخ الطبرى (٣٧/٤) تأريخ خليفة بن خياط، لا ١٠١.

٥ ـ عهد الخلفاء الراشدين للذهبى لا ٢٠.

٦ ـ قصة بعث أبى بكر جيش أسامة د. فضل إلهى لا ١٤.

٧ ـ الكامل لإبن الأثير (٢٢٧/٢).

ئەوەی کە أبوبکر و عمر بخەنە ژێـر یەکـەم نـەفرەتلێکراوان. دەڵـێین: أبـوبکر و عمـر لـە جەیشی ئوسامە دواکەوتن, کەچی هیچ سـەنەدێك بـۆ ئـەم فـەرمووده دەسـت ناکـەوێت مەگەر لە ڕێگای ناپەسەندو نادیار نەبێت لەلای شیعەکان و سونەکان, بێگومان حەسـەنی کوڕی علی و گەنجەکانی ئەونەوەیە سودو وانەیەکی زۆر لە سەر گوزەشـتەی ئامـادەکردنی جەیشی ئوسامە وەردەگرن. لەم وانە و ئامۆژگاریانە:

أ- باردۆخەکان ئاڵوگۆڕدەبن, بەڵام بە تەنگەژەکان بڕوا داران لە ئـاین بـێ ئاگـا نـابن: أبوبکر(ﷺ) ئۆمەتی فێری خۆڕاگری و ئارامی دەکات، لەکاتی تەنگەژەو ناخۆشـیەکاندا, چونکە ئاشکرایە سەرکەوتن لەگەڵ خۆگری و ئارامی دایە, فێریان دەکات هیوا بڕ نەبن لە بەزەی خوا: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ [الاعـراف: ٥٦] پێویـسته مـسوڵمان هەمیشه بیر لەوه بکاتەوه، بەڵام هەر چەندە گەورە بێت, تاقی کردنەوه هەرچەند بـەتین و گەورە بێت, ئەوه ڕێڕەوی چەسپاوی پەروەردگارە: ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا(٥) إِنَّ مَـعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴾[الشرع: ٥-٦] سەیرە کاروباری موسڵمان لـە دونیـادا هـەموو لـە خێـر سەرچـاوە دەگرێ, ئەوەتە پێغەمبەر(ﷺ) جـوانتر ڕوونـی دەکاتـەوە و دەفـەرمووێ: ((عَجَبـاً لأمْـرِ المؤمِنينَ إنْ كانَ أمرهُ كُلُهُ خَيراً، ولَيس ذلِكَ لأحدٍ إلاّ لِلمُؤمِنِ، إنْ أصابتهُ سراء شَكَرَ، فَكانَ خـيراً لَـهُ، وإنْ أصـابته ضَـراءَ صَـبرَ فَكـانَ خـيراً لَـهُ))[1] واتـە:(سـەیرە بـڕوادار هـەموو کاروبارەکانی خێرە, ئەمەش تەنها بۆ بڕوادارەو بەس ئەگەر خۆشی هاتە ڕێگـای سـوپاس گوزار دەبێت و دەبێتە خێر بۆی, ئەگەر دووچاری ناخۆشیش بـوو ئـارام دەگـرێ, ئەمـەش دەبێتە خێر بۆی) ئاشوب و تەنگ و چەڵەمە گەر بەتین سەختیش بن موسڵمان لە ئاین بێ ئاگاناکەن, کۆچی دوای پێغەمبەر(ﷺ) أبوبکری سدیقی لە کاروباری ئاین دانەبڕانـد هـا ئەوەتـە فـەرمان بـەناردنی ئوسـامە دەدات لـەم ڕەوشـە ئـاڵۆزو تێکهەڵگـژاوە لـەنێو موسڵماناندا، چونکە ئەوەی أبـوبکر فێربـووە لـە پێغەمبـەری خـوا کـە گرنگـی دان بـە کاروباری ئاین پێش هەموو شتێکە. هەر لەسەر ئەم شێوازەش بەردەوام بوو تاکو لـەدونیا

---

١ ـ مسلم (٢٢٩٥/٤).

ماڵئاوای کرد[1]، حەسەنی کوڕی علی ئەم وانەیەی جوان وەرگرت و لەگەڵ ژیانی خۆی تێکهەڵکێشی کرد.

ب- ڕێڕەوی بانگەوازخوازی پەیوەست نیە بە هیچ کەسێك و شوین کەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) واجبی سەر شانمانە, حەسەنی کوڕی علی لە چیرۆکی ئامادەکردنی جەیشی ئوسامە فێری بوو, تێگەیشت ڕێڕەوی بانگەوازی خوا هەرگیز لەنگەر ناگرێت و بە مردنی هیچ کەسێکی کپ نابێت بائەو کەسە سەرداری مرۆڤایەتیش بێت(ﷺ)و پێشڕەوی پێغەمبەران و پێشەنگی موسڵمانان بێت. أبوبکر پێشتر لە وتارەکەی کە لە کاتی بەیعەت دان پێشکەشی کردبوو, جەختی لەسەر عەزمی خۆی کردبۆوە بۆ بەردەوامبوون لەسەر ئەو ئاینەو بەخشینی وزەو توانا بۆ خزمەتی ئەم ئاینە[2]، لە ڕیوایەتێکدا هاتووە فەرموویەتی: لە خوا بترسن ئەی خەڵکینە, دەست بەئاینتان بگرن, دینی خودا بەرقەرارە وتەی پەروەردگار تەواو و کامڵە. خوای گەورە سەرخەری کەسێکە سەرخەری بێت, شکۆدەری دینی بێت, گوێ نادەین بە کەسێك سەر کێشی بکا لە سەرمانەوە بۆ مەخلوقەکانی خوا, شمشێرەکانی خوا هەڵکێشراون بۆ ئەبەد دایاننانێین. خەبات و جیهاد لەگەڵ کەسێك دەکەین بەرهەڵستیان بکا هەروەك چۆن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)خەباتمان کرد, هیچ کەس بۆی نیە یاخی بکات تەنها بۆ سەر خۆی نەبێت[3]، یەکێکی تر لەو وانانەی حەسەنی کوڕی علی وەری گرت لە ئامادەکردنی جەیشی ئوسامە ئەوەیە دەبێت موسڵمان هەمیشە ڕێڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) بگرێت لە خۆشی وناخۆشیدا، أبوبکر بەیانی کرد کە بە هێزو تۆکمە دەست بە فەرمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرێت و یەك لەدوای یەك پیادەیان دەکات, با هەر چەند گەردەلولی ترس دنیا تەنگ و تاریك بکات, یەکێك لە وتە نەمرەکانی أبوبکری سدیق کە لەو ڕوداوە فەرمووی:(سوێند بەو زاتەی گیانی أبوبکری بە دەستە ئەگەر بزانم دڕندەیەك دەمڕفێنێ و لە ناوم دەبات, ئەوە جەیشی ئوسامە هەر ئامادە دەکەم, هەر وەك پێغەمبەر(ﷺ)

---

١ ـ قصة بعث أبي بكر جيش أسامة، لا ٢٤.

٢ ـ قصة بعث أبي بكر جيش أسامة، لا. ٢٧.

٣ ـ البداية والنهاية (٥/ ٢١٣، ٢١٤).

فەرمانی داوە, خۆ ئەگەر من بەتەنیاش بمێنمەوە ئەم کارە دەبێ هەر ئەنجام بدەم)[1]، بە هەڵوێستی جوامێرانەی وێنەیەکی پراکتیکی پێشکەش کرد, هەر وەك پەروەردگار دەفەرمووێ﴿وَماكان لمومنٍ وَلامومنةٍ إذاقضى اللهُ وَرسولُه, أمراً أن يكون لهم الخيرةُ من أمرهم وَمن يَعْص اللهَ ورسولَهُ فقد ضَلَ ضللاً مُبيناً﴾ [الاحزاب:٣٦] خودای گەورە موسڵمانان فێردەکات, کە شکۆداری و سەر کەوتنی ئومەت بە شوین کەوتنی پێغەمبەرەوەیە(ﷺ) هەر کەسێك گویڕایەڵی بکات سەر کەوتن و چەسپاوی بۆخۆی مسۆگەر کردووە, ئەو کەسەی سەر پێچی کرد ڕیسواو زەلیل دەبێت, أبوبکر ژیانی ئومەتی بە گویڕایەڵی و خواو پەیڕەوکردنی سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)کردوە.[2]

ج- کەوتنەوەی ناکۆکی لە نێو بڕواداران و گەڕاندنەوەی بۆ قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)یەکێکی تر لەو وانانەی حەسەنی کوڕی علی لەم چیرۆکەی جەیشی ئوسامە وەری گرت, کەوتنەوەی دوبەرەکی و ڕاڕای بوو لەنێو موسڵمانە ڕاستگۆکان سەبارەت بە هەندێك کاروبار, وەك ڕاجیای لەئامادە بوونی جەیشی ئوسامە لەو ساتە تەنگ و دژوارەدا, قسەو باس زۆر ئاڵوگۆر کرا لەبارەی فەرمانی أبوبکر بۆ ئەم کارە, بەڵام هیچیشیان نکۆڵیان نەکرد دوای ئەوەی چەوتی ڕەئی خۆیان بۆ دەرکەوت, کاتێك أبوبکر ناکۆکیەکەی گێڕایەوە، کە پێغەمبەر(ﷺ)بۆ هەناردنی ئوسامە داویەتی, ئەوان تێگەیشتن نابێت شلگیری بکرێ لە کارێك پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی پێداوە, ڕەئی زۆرینەش هیچ سەنگێکی نابێت، ئەگەر پێچەوانەی دەق بێت ڕەئی گشتی هاوەڵان وابوو, جەیشی ئوسامە بوەستی, بە أبوبکریان دەووت: عەرەب دڵڕەقیت بەرامبەر دەنوێنن بە پەرتەوازەی خەڵك هیچت بۆ ئامادە ناکرێت[3]، ئەم هاوەڵانە وەك عەوامی خەڵك نەبوون, بەڵکو چاکترین کەس بوونە لەسەر ئەرز، دوای پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام). لەگەڵ ئەوەش أبوبکر(ﷺ) ڕەئیان قەبوڵ ناکات بۆ ئەوەی پێان بڵێت: فەرمانی

---

١ ـ تاريخ الطبري (٤/٤٥).

٢ ـ الإنشراح ورفع الضيق بسيرة أبي بكر الصديق للصلابي، لا ٢٢٧، قصة جيش أسامة، لا ٢٢٧.

٣ ـ تاريخ خليفة بن خياط، لا ٢٢٧.

پێغەمبەر(ﷺ) لەهی ئێوە جوانتر و ڕێزدارتر وپێوسترە[1]، حافزی إبن حجر لەبارەی ڕەئی زۆرینە لە سەدەی کۆچی دوای پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووی: ئەوەی لێرەدا دەفامرێتەوە، هەندێك جار ژمارەیەکی کەم لە(الإجتهاد) دەپێکن و ژمارێکی زۆریش هەڵە دەکات، کەواتە: ڕاستر وبەهێزتر(الترجیح) بەرەئی زۆرینە دەست نیشان ناکرێت[2]،پوختەی قسان: ئەوەی دەبێتە مایەی سود وەرگرتن لە چیرۆکی بەگەڕ خستنی أبوبکر بۆ جەیشی ئوسامە، پاڵپشتی زۆرینە بۆ ڕەئێك بەڵگە نیە لە سەر ڕاستی و دروستی ئەم ڕەئیە.[3] دانەیەکی تر لە سودەکان کە لەم چیرۆکە وەردەگیرێت، ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانی موسڵمانە بۆ حق، کاتێك بۆیان ڕوون دەبێتەوە کاتێك أبوبکر بیریان ئەخاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی داوە بە بەگەڕخستنی جەیشی ئوسامە و خودی خۆی ئوسامەی بەئەمیری جەیش دیاری کردوە، ئەم کەڵەپیاوە چاکە خوازانە ملی خۆیان کەچ کرد بۆ فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ).[4]

س- بانگەواز پەیوەستیە کردارە: حەسەنی کوڕی علی لەسەر بردەی جەیشی ئوسامە گرنگی بەستنەوەی بانگەواز بکردار فێربوو حسن زانی أبوبکر نەك هیچ درێغیەکی نەکردووە لەفرمانکردنە ئوسامە بەڵکو بکردەوەش دانی بە فەرمانڕەوایەتی ئەودا هێناوە، ئەمەش لە دووکاردا دەدرەوشێتەوە:

١- بەپیادە ڕۆیشتنی أبوبکر لەگەڵ ئوسامە کە سواری وڵاغ بووە و، لە تەمەنی بیست ساڵی دایە، کەچی أبوبکر هەر سورە لەگەڵ ئەودا بەری ڕێگا بگری، هەر سوریشە ئەو بەسواری بمێنیتەوە، خۆشی بەپیادە بڕوا کاتێکیش ئوسامە داوای لێدەکات یا سواری وڵاغ بێت یاخود مۆڵەتی دابەزینی بدات، أبوبکر ڕازی نەبوو لە دابەزینی ئوسامەو سوار بونی خۆی، وەك بڵێت: أبوبکر بەم جۆرە ڕەفتارە جەیش دەدوێنێ و دەڵێت: ئەی

---

١ ـ قصة بعث أبی بکر جیش أسامة، لا ٤٤.
٢ ـ فتح الباری (١٤٦/٨).
٣ ـ قصة بعث أبی بکر جیش أسامة٤٦ .
٤ ـ قصة بعث أبی بکر جیش أسامة٥٢.

موسڵمانەکان بڕوانن من أبوبکرم سەرباری ئەوەی خەلیفەی پێغەمبەری خوام(ﷺ) کەچی من بە پیادە دەڕۆم ئەویش بەسواری وەك دانان و ڕێزێك بۆ فەرمانڕەوایەتیەکەی.

٢- أبوبکرسدیق حەزی دەکرد عمری کوڕی خەتتاب لە شار بمێنێتەوە ئەمەش لەبەر پێویستی، بەڵام فەرمانی پێنەکرد، بەڵکو مۆڵەت لە ئوسامە وەردەگرێ بۆمانەوەی لە شاری مەدینە. بەمەرجێك ئەو ئەم کارەی پێ شیاو بێت, أبوبکر(ﷺ) بەمە نمونەیەکی عەمەلی تر بە و ڕێزو ئیحترامی خۆی پێشکەش بەفەرمانڕەوای ئوسامە دەکات. بێگومان ئەمە بانگەوازێکی بە هێزە بۆ دانهێنان مل کەچی بۆ فەرمانڕەوای ئوسامە. ئائەوەیە گرنگی دانی أبوبکر(ﷺ) بەبانگەوازو بەستنەوەی بە کردارەوە، هەرئەوەشە ئیسلام فەرمانی پێدەدات. خوای گەورە سەر زەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە فەرمان بە چاکە لە خەڵکی دەکەن و خۆشیان لە بیر دەکەن[1].خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾[البقرة:٤٤].

ش- پلە و پایەی گەنج لە ئیسلامدا:

ئەوەی لەم چیرۆکە دەدرەوشێتەوە پلەو پایەی گەنجە گەورەکانە بۆ خزمەتکردنی ئیسلام. هائەوەتە پێغەمبەر(ﷺ) ئوسامەی لە هەرەتی لاوی دیاری دەکات بە ئەمیری جەنگی دژوار دژبە ڕۆمەکان ـ هێزو وزەی گەورە بە بڕوای خەڵك لەو کاتەدا یەـ هاو کات تەمەنی ئوسامە لەوکاتەدا بیست ساڵە, یاخود هەژدە ساڵە, أبوبکری سدیق بڕیاری دا ئوسامە لە سەر پلەی خۆی بمێنێتەوە سەرباری ئەو هەموو ڕەخنەی لەلایەن خەڵکەوە ئاڕاستەی کرا. ئەمیری گەنج لەو ئەرکەی پێسپاردرأبوو بە ساغ و سەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە, لەمەدا ئاڕاستە بۆ گەنجان دەبینرێت بۆ ئاشنابونیان بە پلە و پایەی خۆیان بۆ خزمەتکردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام[2]، لەسەر بانگەواز خوازو سەرپەرشتکاران پێویستە. گرنگێکی زۆر بەو لایەنەبدەن, بوار بڕەخسێنن لە بەردەم وزەو توانستی گەنجاندا, تاکو داهێنان و نوێخوازی بکەن بۆ خزمەتی ئیسلام, بێگومان ئەم ڕێبازەی پێغەمبەر(ﷺ) چالاکی و زیندوویەتی لە ئومەتی ئیسلام تازە دەکاتەوە و بەشداری دەکات لە تەقاندنەوە

---

١ ـ قصة بعث أبی بکر جیش أسامة، لا ٦٦.

٢ ـ قصة بعث أبی بکر جیش أسامة، لا ٧٠.

وزە لەبن نەهاتووەکانی گەنجان, هەڵدەستێت بە ڕۆڵی شارستانیێکی جۆشدارو ئامادەکراو موسڵمانان.

ل- چەند وێنەیەکی پڕشنگدار لە ئادابەکانی جیهاد لە ئیسلامدا:

حەسەنی کوڕی علی لە چیڕۆکی ڕەوانەکردنی جەیشی ئوسامە لەلایەن أبوبکرەوە وێنەیەکی بەخشندە لە جیهادی ئیسلامی فێربوو، ئەم وینە لەوەسیەتەکانی أبوبکر بۆ جەیشی ئوسامە لەکاتی ماڵئاواییاندا بۆ جەنگ دەدرەوشێتەوە, أبوبکر لەکاتی وەسیەتەکەیدا تەنها پشتی بەڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) بەست, چونکە پێغەمبەریش(ﷺ) لەکاتی ماڵئاوای بۆ جەنگ ئامۆژگاری ئەمیرەکان و جەیشەکەی دەکرد[1]، لە ئەنجامی پشکنینی ئەم وەسیەتە. مەبەستی جەنگەکانی موسڵمانان بۆ بانگەوازی ئیسلام دەردەکەوێت, سەربازو جەیشی هەر گەلێك پابەندی ئەم وەسیەتانە بێت هیچ شتێکی بە دەست نامێنێت تەنها هاتنێەتی بۆ نێو ئەم دینە بە گوێڕایەڵی و ئارەزومەندانەی خۆی.[2]

ی- کاریگەری جەیشی ئوسامە لەسەر شکۆمەندی دەوڵەتی ئیسلامی:

جەیشی ئوسامە کاتێك بە سەرکەوتویی گەڕایەوە ڕۆمەکانیشیان تۆقاند. هرقل دوای ئەوە لە (حمص) هۆزەکانی کۆکردەوەو پێ ووتن: لەمە بوومن ترسم پێ ئەدان, ئێوەش ئەم ترسەتان لە من قبوڵ نەدەکرد !! عەرەب وای لێهات لەیەك مانگە ڕێوە بێن و ئێوە بشلەژێنن لە هەمان کاتیش بگەڕێتەوە دوچاری هیچ پێکانێکیش نەبن تیرەوهۆزە عەرەبەکانی تریش لە باکور ترس و بیمیان لە زاڵبونی دەوڵەتێکی ئیسلامیان لێ نیشت, لەڕاستیدا ئەم هێرشەی ئوسامە کاریگەریەکی گەورەی دروست کرد لە ژیان موسڵمانەکان و ئەو عەرەبانەی بیریان لە هەڵگیرسانی شۆڕش دەکردەوە دژبە موسڵمانان, هەروەها کاریگەری هەبووە بۆ سەر ژیانی ڕۆمەکان کە سنوری وڵاتیان دریژ دەبۆوە بۆ سەر سنوری موسڵمانەکان[3]، ئەم جەیشە بەهۆی ناوبانگیەوە کارێکی کرد کە هەرگیز بە هۆی هیزو ژمارەوە ئەم کارەی بۆ ئەنجام نەدەدرا, قەبارەیان لە هەڵگەڕاوەکان پێشترکەوت ئەوان

---

١ ـ قصة بعث أبی بکر جیش أسامة لا ٨٠.

٢ ـ تأریخ الدعوة الی الإسلام.، لا ٢٦٩.

٣ ـ الصدیق هیکل باشا، لا ١٠٧.

پەرۆش و بلاْوبوون, ئاشتەوایی و برایەتی کەوتە نێو موسڵمانان, سام و هەیبەتی کاری خۆیان بەدەرخست، پێش ئەوەی کەڵە پیاوەکان کاری خۆیان بکە و چەك بەزمی خۆی دروست بکەن[1]، لەڕاستیدا بەرێکردنەی ئەم جەیشە نازو نیعمەتێکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان. وایلێهات کۆمەڵی هەڵگەڕاوەکان لەباکور بۆوە لاوازترین کۆمەڵ, واپێئەچێ لەشوینەواری ئەم شکانە بێت لەکاتی فەتح تێشکانی ئەم کۆمەڵە سوك و ساناترە لە نسکۆ هێنانیان لە عێراق, ئەم کۆمەڵە شتە هەموو پێکەوە جەخت دەکاتەوە کە أبوبکر لە کاتی قەیران و تەنگەژەدا لە نێو هەموو توێژە چارەسەر کەرەکاندا بیر تیژ ترە, تێگەیشتنی قوڵترە[2]، ڕوداوەکانیش سەلماندیان حەسەنی کوڕی علی لەژێر کاریگەری خەلیفە ڕاشیدەکان دایە لە بەڕێوەبردنی کار لەکاتی کەوتنەوەی قەیران، بۆیە لە حوکمی خیلافەتەکەیدا لە هەموو خەڵك تێگەیشتنی قوڵتر بوو, دووربین تر بوو, لە هەمووشیان سورتر بوو بۆ یەکیەتی موسڵمانان.

٧- جەنگی هەڵگەڕاوەکان (حروب الردە):

بۆچوونی أبوبکری سدیق(ﷺ) لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان بۆچوونێکی شیاوو لە جێ بوو, ئەو بۆچونەی سروشتی زەمینەیەکی لەبار دەڕەخسێنی بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و مسوڵمان, هەر هەڵوێستێك پێچەوانەی ئەم بۆچونە تێشکان و داڕمان و گەڕانەوە بۆ نەفامی دروست دەکات. خواو، پاشان پەروەردگار بڕیارە یەکلاکەرەوەکەی أبوبکر نەبوایە لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان ئەوە ڕوخساری مێژوو دەگۆڕا و، ڕێڕەوی وەردەچەرخا زەمەن بۆ دواوە دەگەڕایەوە نەفامیەت جارێکی تر بۆ سەر زەمین شەپۆلی گەندەڵی دەبەست[3]، بڕوانە چەندەجوان لەم وتەیەی بیری و وردو هێزی و ورەی دەدرەوشێتەوە کە لەبارەی ئاین دەڵێت: سروش(وحی) پچڕاو ئاین تەواو بوو، ئایا دەکرێت ئاین نقص ببێنێ و منیش زیندووبم؟[4] أبوبکر گوێی لە ڕای هاوەڵان گرت بۆ جەنگان دژ بە دوودڵی هەڵگەڕاوەکان.

---

١ ـ عبقرية الصديق للعقاد، لا ١٠٧

٢ ـ حركة الردة د. على العتوم، لا ١٦٨.

٣ ـ الشورى بين الأصالة وَالْمُعَاصَرَة، لا ٨٦.

٤ ـ المرتضى أبي حسن الندوي ٧٠، مشكاة المصابيع ٦٠٣٤.

عەزمی تێوەگلانی شەڕی نەبوو, دەڵێ: بڕیارەکانی ئەو ڕاشکاو بنبڕبوون, بۆ تەنیا چرکەیەکیش نەدەبوو دوای ئەوەی ڕاستی بۆ دەردەکەوت, نەبوونی دوودڵی و دڕدۆنگی نیشانەیەکی هەرە ئاشکرأبوو لە أبوبکردا لە هەموو ژیانیدا ڕەنگی دابۆوە.[1] موسڵمانان هەموو دڵنیا بوون لە ساغ و دروستی بۆچوونەکەی دوای گەڕانەوەیان بۆ ڕەئیەکەی خێریان پێکا, وتەکەی ئەویش هاتەدی دەیفەرموو: سوێند بە خوا لەسەر پەتە وشترێکیش قەدەغەم بکەن, کە پێشتر دەیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمرۆ لەگەڵیان دەجەنگم لەسەر نەدانیان[2]، ئەمە لەم وتە زیندوانە یە مێژوو پاراستویەتی, شەوگار فەرامۆشی نەکردوە بەربەستەکانی زەمەن بەریان پێ نەگرتووە,بازنەی سەدەکان نەیان فەوتاندوە. أبویکر بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان عەقڵێکی سیاسی و ڕوئیایێکی ستراتیژی ڕۆشنی بەکارهێنا کە خۆی لەم فرە چەشنیە بەر جەستە دەکات, لەوانە, دەرونی و بانگەوازی زانیاری و ڕاگەیاندن, زانستی بەرامبەر بە هێزە سەرکەوتوەکەی کە ئەرکی خۆیان ئەنجامدا دژ بە بزوتنەوەی هەڵگەڕاوەکان لە دوورگەی عەرەب, بەم شێوەیە حسن فێری فیقهی أبوبکر بوو لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان, هەروەها هەندێك لە فیقهی(تمکین)ی دەست کەوت لە جەنگانی دژ بە هەڵگەڕاوەکان. لە گرنگترین کارەکانی ئەم (معالم) مەشخەڵە ئەمانەی خوارەوەیە:-

- سەقامگیری سیستەمی ئابووری لەدوورگەدا.[3]

بێگومان هەڵگیرسانی جەنگی هەڵگەڕاوەکان و هۆکارەکانی, تێگەیشتی أبوبکری سدیق بوو بۆ بنبڕکردنی ئەم کارە, وای کرد حەسەنی کوڕی علی پوختە و ناوەڕۆکی ڕوداوەکان و وەربگرێت و بیکاتە بەشێك لە فەرهەنگی خۆی, چ لەڕوی بیستنەوە بێت یاخود لە ڕوانگەی بینینەوە بێت.

---

١ ـ الشوری بین الأصالة والمعاصرة،لا ٨٧

٢ ـ البخاري رقم: ٦٩٢٤.

٣ ـ الإنشراح ورفع الضيق في سيرة أبوبكر الصديق، لا ٣٢٩ الى ٣٦٥.

- هەروەك هێماكانی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی أبوبكری سدیق زۆر ڕون و ئاشكرایە لە هەست كردن بە نەوەی ئەو توێژە هەستیارە، كە یەكێك لە هەڵكەوتوانی حسەنی كوڕی علی یە, خیلافەتی أبوبكری سدیق كۆمەڵێك ئامانجی چەسپاند بۆ سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلامی گرینگترینیان: -

- بڵاو بوونەوەی سام و هەیبەتی دەوڵەت لە دڵ و دەرونی نەتەوەكانی تر.

- دادپەروەری لە نێوان نەتەوە كراوەكاندا و نەرم و میهرەبانی لەگەڵ ئەهلەكەی.

- هەڵگرتنی زۆر لێكردن لەسەر نەتەوە ڕزگاركراوەكان.

- گەیاندنی پەیامی جیهاد كە خوا لە قورئان فەرمانی پێداوە.

- هەروەها هێماكانی نەخشەی جەنگ لای أبوبكر بەشێكە لە فەرهەنگ و ئەدەبیاتی نەوەی ئەو سەردەمە, بەتایبەت بۆ پێشەنگی گەنجان بۆ سەركردایەتی لە سەرو هەمووشیان حەسەنی كوڕی علی, أبوبكر لەگەڵ ڕاویژكارەكانی لە هاوەڵان كۆمەڵێك هێڵی سەرەكی بۆ نەخشەی جەنگ دا دەڕشت. ئەم نەخشە تۆكمە و پتەوە یەكێك بوو لە هۆكارەكانی دابەزینی سەركەوتن و چەسپاوی لەلایەن خوداوەندەوە بۆ موسڵمانان بەشێك لەم هێڵانە:

- هەڵپەنەكردن بۆ سەر وڵاتی دوژمنان بۆ ئەوەی پەیتا پەیتا بێن بۆ نێو موسڵمانان.

- ڕێكخستنی یارمەتی دانی سەربازان

- مشور خواردنی كردەی كۆمەك و هاوكاری بۆ سەربازەكان.

- دەست نیشان كردنی ئامانج لە جەنگدا.

- بەخشینی چاكترین پلە بەكەسانەی باترین كرا ئەنجام دەدەن.

- گواستنەوەی گۆڕەپانی جەنگ و ڕمبازی.

- پەرەدان بە شێوازی جەنگان.

- ساغ و بێگەردی هەنگاوەكانی پەیوەندی لەگەڵ سەركردە.

- زیرەكی و هۆشیاری خەلیفە.[1]

هێڵە جەنگیەكانی ئیسلامی هەر لە سەرەتای فتوحاتەوە بەهۆی عەقڵی كارگێڕەوە ئیمتیازاتی وەرگرت. خاوەنی هۆشەو زیرەكی و فیراسە أبوبكری سدیقە. ئەم هۆگر بوونەی أبوبكر بە پێغەمبەر (ﷺ)یارمەتی زۆر دا بۆ نەخشەیەكی فراوانی جەنگ بێگومان أبوبكر لەسەر ڕێڕەوی زانیاری و ئاڕاستەكانی پێغەمبەر(ﷺ)بووە. أبوبكر(رضي الله عنه) كۆمەڵێ زانستی فرەڕەنگی بە دەست هێنا, چەندەها ئەزموونی هەمە چەشنی دەست كەوت, لە دوای كۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بەباشترین شێوە هەستا بەكاری خیلافەت بەرچاوڕونی لێوالێو لە هۆشیاری ختستە ئەستۆی خۆی, تیشوی جەیشی دا بە ئامۆژگاریە بەرزو بڵندەكانی و كۆمەك و هاوكاری هەنارد بۆ موجاهیدەكان لە كاتی هەڵكەنران و پێویستی دا هەوڵ و كۆششی فراوان دەكردن بەهۆی ورە و عەزیمەتی ڕابردوویان[2]، حەسەنی كوڕی عەلیش لەسەر دەستی قورئان پەروەردە بوو.

دووەم: - لەسەردەمی عمری كوڕی خەتاب:

عمر زۆر ڕێزی ئال و بەیتی دەگرت لەم باسەدا هەڵوێستە زۆرە لەوانە:

١.تۆ شیاوتری بە مۆڵەتدان لە عبدالله كوڕی عمر:

حەسەنی كوڕی علی ڕیوایەتی كردوە: عمری كوڕی خەتاب ڕۆژێك پیّ ووتم: ئەی كوڕی شێرنم بۆچی ڕۆژێك ناهێت و ڕومان تێناكەیت؟ منیش ڕۆژێك چووم لەگەڵ معاویە وابوو عبدالله لە دەرگا مۆڵەتی پێنەدرا منیش گەڕامەوە, دوای عمر پێم گەیی ووتی: ها بۆ چی نەمبینی بێت ؟ ووتم: هاتم تۆ لەگەڵ معاویە بویت, عبداللەم بینی گەڕایەوە منیش گەڕامەوە, ووتی: تۆ شیاوتری بە مۆڵەتدان لە عبدالله كوڕی عمر.[3]

٢.سوێند بە خوا دڵخۆش نیم بە پۆشینی پۆشاكتان:

---

١ ـ الإنشراح ورفع الضيق فی سيرة أبوبكر الصديق، لا ٤٤٥ ـ ٤٥٤.

٢ ـ تأريخ الدعوة الإسلامية، لا ٣٣٦

٣ ـ المرتضي، لا ١١. كنز العمال (١٠٥/٧) الإصابة (١٣٣/١).

(إبن سعد)له جعفری کوڕی محمد باقر له علی کوڕی حەسەنی ڕیوایەتی کردووه دەڵێ:
عمرهەندێك خشڵ و بەرگی لەیەمەن بۆ هات خەڵکی بە خشڵ پۆشاکە خۆیان پۆشتە کردەوە، عمر(رضي الله عنه)له نێوان گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ)و مینبەرەکەی دانیشتبوو، سڵاویان لێ دەکرد و، دوعای خێریان بۆ دەکرد, حسن و حسین له ماڵی هاتنە دەرەوە خەڵك شوێن هەنگاوەکانی ئەوانی هەڵگرتبوو، ئەوانیش هیچ لەم خشڵ و بەرگەیان پێ نەبڕدەبوو عمر(رضي الله عنه) گرژێکی کەوتە نێو چاوان و ووتی: واللەی من خۆشحاڵ نیم بە پۆشاك پۆشینتان, ووتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران ژێر دەستەکانی خۆت پۆشتە کردو کاریکی جوانت کرد, ووتی: له پێناو ئەم دوومنداڵە خەڵك بەڕێ دەکەون, کەچی ئەوان هیچیان لەو خەڵاتە بەرنەکەوت, ئەم پۆشاکە بۆ ئەوان گەورەو مەزنە بۆ خەڵك بچوکە، پاشان نامەیەکی نارد بۆ والی یەمەن کە خێرا دوو بەرگی بۆ بنێری, ئەویش بۆی نارد و حسن و حسینی پێ پۆشتە کردن.[١]

٣.پێش خستنی حسن و حسین و بەنی هاشم له بەخشش و دیاری دا.

له أبوجعفر ڕیوایەتی کراوە, کاتێك عمر سەر کەوتنی بە دەست هێنا ویستی بشك و بەش بۆ خەڵك دیاری بکات, هاوەڵانی پێغەمبەری کۆ کردەوە, عبدالرحمن کوڕی عەوف ووتی: لەخۆتەوە دەست پێ بکە, فەرمووی نانەخێر لەو کەسەوە دەست پێدەکەم، کە لە پێغەمبەر(ﷺ)و بەنی هاشمەوە نزیکترە, پاشان بەشی بۆ عباس دیاری کرد، پاشان علی. تاکو لەنێو پێنج هۆز دابەشی کرد بەهۆزی عودەی کوڕی کەعبی کۆتای هێنا سەرەتا بۆ ئەو کەسانەی ئامادەی جەنگی بەدر بوون لەبەنی هاشم ئینجا ئەو کەسانەی ئامادەی جەنگی بەدر بوون لەبەنی ئومەییە لەنەوەی عبدالشمس. لەنزیکترەوە بۆنزیك بەش و بەخشیشی بەسەر دابەشکردن[٢]، حسن و حسینیش ئەم خەڵاتەی باوکیان دیان گرێتەوە وەك ئەهلی بەدر ئەمەش لەبەر نزیکیان له پێغەمبەر(ﷺ) بە هەریەکەیان پێنج هەزار درهەم خەڵات دەکرێت[٣]، لەم چیرۆکەدا خۆشەویستی حەقیقی عمر بۆ ئال و بەیت و بە

---

١ ـ المرتضي، لا ١١. كنز العمال (٧/ ١٠٥).

٢ ـ الخراج لأبي يوسف، لا ٢٤, ٢٥المرتضى، لا ١١٨.

٣ ـ تأريخ دمشق الكبير (٤/ ٦١).

گشتی و بۆ حسن و حسین بەتایبەتی دەردەکەوێت بەڕەنگێك لەگەڵ گەورە هاوەڵانی چینی یەکەم لە خەڵاتکردن هەژماریان دەکات, ئەمە تەنها خۆشەویستێکی بێگەردە بۆ حسن و حسین و ڕێزنانە لەو پلەو پایەی لەلای پێغەمبەر(ﷺ) هەیان بوو.

٤. هەڵسوکەوتی عمری کوڕی خەتاب لەگەڵ فاتیمەی دایکی حسن دوای کۆچی دوای پێغەمبەر(ﷺ): لە ئەسلەمەی عەدوی ڕیوایەتکراوە دەڵێ: دوای کۆچی دوای پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك بەیعەت بە أبوبکر دەدرا علي و زوبێری کوڕی عەوام دەچوون بۆ لای فاتیمە بۆ ئەوەی ڕاوێژی پێ بکەن عمر ئەو هەواڵەی پێگەیشت و هات بۆ لای فاتیمە و ووتی: ئەی کچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچ کەس لە مەخلوقاتی خوا لە دڵی ئێمە لە پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستر نیە, دوای ئەویش تۆ لە هەمووکەس خۆشەویستری لامان, لەم قسانەدا علي و زوبێر بەژورکەوتن فاتیمە ڕاستەوخۆ پێ ووتن بڕۆن بۆ بەیعەت دان, ڕۆیشتن و نەگەڕانەوە تاکو بەیعەتیان[1]، ئەم فەرموودە صحیحە لەگەڵ ئەوەشدا تێکهەڵکێشە لەگەڵ ڕۆحی نەوەی ئەوسەردەمە. لەم بارەوە شیعە ڕیوایەتی زیادی کردوە و کۆمەڵێك بوختان و درۆیان هەڵبەستوە, دەڵێن: عمر دەڵێ: هەر کاتێك ئەم کەسانە لای تۆ کۆبونەوە ئەم خانوەیان بەسەر دادەسوتێنم, چۆن ئەوان ئارەزو دەکەن موسڵمانان پەرتەوازە بن بە هۆی خۆ دواخستنیان لە بەیعەت دان, دوای ئەوەی عمر دەرچوو زۆری پێ نەچوو ئەوان هاتن بۆ لای فاتیمە، پێ ووتن: ئەرێ زانیوتانە عمر پێ ووتوم: سوێند بەخوا گەر ئەوانە بگەرێنەوە بۆ لات دەبێ خانویان بەسەردا بسوتێنم قەسەم بەخوا ئەو لە سوێند خواردنەکەی ڕاستگۆیە, بڕۆن لەلام, ئەم کارەبکەن, نەهاتنەوە بۆ لای تاکو بەیعەتیان دا[2]، ئەم چیرۆکە پروپوچە نەچەسپاوە لە عمر(رضي الله عنه)بانگەشەی عمر بۆسوتاندنیماڵی فاتیمە یەکێکی ترە لە درۆیە شاخ دارەکان. شیعە هێناویانە لەگەڵ چەند درۆیەکی تر لە پەرتوکەکەی طبري الطبرسی (دلائل الإمامه)[3]، کەلەجابری جەعفی ڕیوایەتکراون بە کۆ دەنگی پێشەواکانی فەرموودەناسیش جابری جەعفی درۆزنە هەروەك لەکتابی (المیزان

---

١ ـ إبن أبي شيبة: المصنف (٥٦٧/١٤) إسنادة صحيح.

٢ ـ عقائد الثلاثة والسبعين فرقة لأبي محمد اليمنى (١٤٠/١)

٣ ـ دلائل الإمامة، لا ٢٦ نقلاً عن عقائد الثلاثة والسبعين (١٤٠/١).

الذهبی).[١] وەکتێبی تهذیب تـذهیب.[٢] باسکراوە هەندێك لە شیعەکان گومانیـان بـردوە عمر لە فاتیمەی داوە و منداڵێکی بە ناوی محسن لەبار بـردوە. ئەمانـە هـەموو درۆیـە و هیچ بنەمایێکی ڕاستیان نیە. ئەم نەزانانە هێنـدێك جـار تانـەو تەشـەر لـە علـی دەدەن، چونکە بێدەنگ بووە لە ئاست عمر, کە دلێرتـرین هـاوەڵی پێغەمبـەرە(ﷺ)[٣]، دەڵـێ: ژمارەیەك لە هۆشمەندە شیعەکان نکۆڵی ئەم درۆ و گاڵتە جاڕیەیان کردوە[٤]، زانـراوە کـە (محسن) لە ژیانی پێغەمبەردا لە دایك بووە, هەروەك ئەمـە بـە ڕیوایـەتێکی صـحیح لـە سندی ئیمام أحمد چەسپاوە وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

### ٥. هاوسەرگیری ئیمام عمر لەگەڵ (أم کلپوم) ی کچی علی کوڕی أبوتالیب:

عمر خۆشەویستێکی تایبەتی لە دڵ دابو بۆ ئەهلی بـەیت, ئەمـەش بـە هـۆی بـوونی خزمایەتی و نزیکایەتی لیانەوە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) وەسیەتی لـە أبـوبکر کـرد ڕێـزی ئەهل و بەیت بگرێ و چاوەدێری مافەکانیان بکات, ئەمە بۆ عمر پاڵنەر بوو بۆ خوازبێنی (کلثوم)ی کچی علی و فاتیمە سۆزی دەجوڵێ و دەڵێـت: سـوێند بـەخوا لـە سـەر زەوی کەسێك نیە بە خۆش مەشرەبی عەودالْ بێت وەك من دواتـر عمـر ڕوی لـە موهاجیرەکـان کرد و بەوپەری خۆشحاڵیەوە ووتی: وەرن پیرۆزبایم لێ بکەن, دواتر هۆی هاوسـەر گـیری لە أم کلثوم خستە ڕوو ووتی لـە پێغەمبـەرم بیـستوتە دەیفـەرموو: هـەموو ڕەچـەڵەك و ڕەگەزیك لە یەکتر دەپچڕێ تەنها ئەو کەسانەی لە هۆزو ڕەچەڵەکی منن نێوانیان ناپچڕێ, بۆیە حەزم کرد لە نێـوان مـن و پێغەمبـەری خـوادا پەیوەندیـەك هـەبێت[٥]، مامۆسـتا أبومعازی إسمـاعیلی لـە باسـی هاوسـەرگیری عمـری کـوڕی خـەتاب لـە أم کلثـوم ئـەم هاوسەرگیریەی بەکاریکی ڕاست و دروست داناوە, بەدوری زانیوە ئەمـە هەڵبەسـتراوبێت, ئەنجامگیری ئەمەش بە گەڕان بـەدوای سەرچـاوەکانی شـیعەو سـونە کـە پەیوەسـتن بـەم

---

١ ـ المیزان الذهبی (٢٧٩/١).

٢ ـ تهذیب التهذیب (٤٧/٢).

٣ ـ حقبة من التاریخ، لا ٢٢٤.

٤ ـ مختصر التحفة الأثنی عشریة، لا ٢٥٢.

٥ ـ إسناده حسن أخرجة الحاكم في المستدرك (١٤٢/٣).

هاوسەرگیریە پیرۆزە دەست کەوتووە, منیش هەندێك لە ژیان و هەڵوێستەکانی أم کەلسومم باسکردوە لە سەردەمی عمری کوڕی خەتاب(رضي الله عنه) دا لە کتابەکەم بەناوی (فصل الخطاب فی سیرة أمیرة المؤمنین عمر بن الخطاب, شخصیته وعصره).

٦.دەسکەوتەکانی مەدائین:

کاتێك مەدائین ئازادکرا[١], لەساڵی ١٦کۆچی, دەست مایەیان هێنایەوە ,عمر هەزار درهەمی بەهەریەك لەحسن و حسین بەخشی پێنج سەت درهەمیشی بە عبدللەی کوڕی بەخشی,[٢] ئەم ڕوداوە خۆشەویستی عمر بۆ حسن و حسین دوپات دەکاتەوە.

١-ئەو قسەیەی علی دوای شەهیدکردنی عمر ووتی:

إبن عباس هەروەکو لە (صحیح البخاري) دا هاتووە ووتوویەتی: عمر کەوتە جێگەو خەڵك سەردانیان ئەکردو دوعایان بۆ ئەکرد پێش ئەوەی وەفات بکات، پیاوێك باڵی عمری گرت تەماشای کرد علی کوڕی أبوتالێب بوو، بەزەیی بە عمر دا هاتەوەو فەرموی: هیچ کەسێ نەماوە وەکو تۆ حەزبکەم بەو کارو کردەوەیەی تۆ بەخوا بگەم، تۆ لەگەڵ دوو هاوەڵە کەتدای و زۆر جار ئەتبیست پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو: (ذهبت أنا وأبوبکر وعمر، ودخلت أنا و أبوبکر و عمر، وخرجت آنا و أبوبکر وعمر)[٣] واتە: (من و أبوبکرو عمر بۆ فلانە شوێن ڕۆیشتین، من و أبوبکر و عمر هاتین، من و أبوبکر و عمر ڕۆیشتین).

١.عمری کوڕی خەتاب حەزی لە دابەزینی نەکردووە و منیش بۆیە حەزی پێ ناکەم:

کاتێك علی(رضي الله عنه) لە ڕوودانی (جمل) بۆوە چووە بەسرەوە و عائیشەی دایکی ئیمانداران(ڕەزای خوای لێ بێ) بەڕێکرد کاتێ وویستی بگەڕێتەوە مەککە، لە بەسرەوە بۆ کوفە بەڕێکەوت و ڕۆژی دووشەممە.چووە کوفە، دوانزە شەوی مانگی ڕەجەبی ساڵی

---

١ ـ مەدائین شارێکە لە بەغدا شەش فەرسەخ دورە ولەسەر دەستی سعدی کوڕی وەقاس(رضي الله عنه) ئازاد کرا.

٢ ـ مقامات العلماءللغزالي، لا ١٦١.

٣ ـ البخاري رقم: ٣٦٨٥.

سی و شەش تێپەڕ بوو بوو، پێ ی ووترا لە کۆشکی سپی(القصرالابیض)دابەزێ، ئەویش ووتی: نەخێر، چونکە عمری کوڕی خەتاب حەزی بە دابەزینی ئەو شوێنە نەکردووە و منیش حەز بەو شوێنە ناکەم تیایدا دابەزم، بۆیە لە (الرحبة) دابەزی و لە (الجامع الاعظم) دوو ڕکعات نوێژی کرد.[1]

●خۆشویستنی ئالوبەیت بۆ عمر (ﷺ):

بێگومان لەبەڵگەکانی خۆشویستنی ئالوبەیت بۆ عمر (ﷺ) ناونانی منداڵەکانیانە بەناوی عمرەوە، ئەوەش لەبەر خۆشویستن و سەرسوڕمان بەکەسێتی عمر و ڕێزگرتن لەو کارە پیرۆز و ڕەوشتە مەزن و ئەو خزمەتە گەورانەی پێشکەش بەئیسلامی کردووەو، ئەو پەیوەندیە ڕێزدار و خۆشەویستەی کە پەیوەستی کردووە بەکەس وکاری بنەماڵەی پێغەمبەرایەتی و ئەو ژن و ژن خوازیەی لە نێوان خۆی و دەنوانندا بووە، بۆیە یەکەمین کەسێك بەناوی عمرەوە ناوی کوڕی خۆی نابێ ئەمیری ئیمانداران علی کوڕی ئەبی تاڵیب بووە کە ئەو کوڕەی لە أم حەبیبی کچی (ڕەبیعە الکبریة)ەی بەناوی عمرەوە ناو ناوە.[2]

لە کتێبی (صاحب الفصول)دا، لە ژێر ناوبردنی کوڕانی علی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە(ﷺ) هاتووە: عمریش(ﷺ) لە(التغلبیة)ەیەکە (صهیاء کچی ڕەبیعە)و لەو سەبایانە بووە، کە خالیدی کوڕی وەلید(ﷺ) لە(عین التمر)دا هەڵیکوتایە بەسەریان، ئەو عمرەش تا هەشتاو پێنج ساڵ تەمەنی کردووە تاوەکو نیوەی میراتی علی(ﷺ) بەدەست خستووە، چونکە گشت خوشك و براکانی، کە عبدالله و جعفر و عثمان بوون هەموویان لە پێش خۆی لەگەڵ حسیندا(ﷺ)کوژران) واتە: ئەو لەگەڵیاندا نەکوژرا- بۆیە میراتی ئەوانیشی وەرگرت[3]، بەو جۆرەش حسن لە خۆشویستنی بۆ عمری کوڕی خەتاب شوێن پێ ی باوکی هەڵگرت و یەکێك لە کوڕەکانی بەناوی عمرەوە ناونا [4]، هەروەها حوسەینی کوڕی عەلیش عمری ناوناوەو دوای حوسەینیش کوڕەکەی کە علی نازناوی (زین العابدین) هەبووە یەکێك لە

---

١ ـ تأريخ الخلافة الراشدة، محمد كنعان، لا ٣٢٣.

٢ ـ تأريخ اليعقوبي (٢/٢١٣) الشيعة وأهل البيت، لا: ١٣٣.

٣ ـ الفصول المهمة، لا: ١٤٣، الشيعة وأهل البيت، لا: ١٣٣.

٤ ـ الشيعة وأهل البيت، لا: ١٣٣.

کوڕەکانی بەناوی عمرەوە ناو ناوە[1]، هەروەها موسای کوڕی صادق هەڵگری ناز ناوی کازم (موسی الکاظم) یەکێك لە کوڕانی بەناوی عمرەوە ناو ناوە[2]، بۆیە ئەو زاناو پێشەوایانەی ئالی بەیت ئەوانەی بەڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێڕەوی ئەهلی سوننەو جەماعەیان کرد بە ڕێبازی خۆیان ئەو خۆشەویستیەیان بۆ عمری فاروق دەرخستووە لەدوای کۆچی دواییدا، بێگومان ناوی عمر (رضي الله عنه)و هەروەها ناوی أبوبکر(رضي الله عنه)و عثمانیش(رضي الله عنه)لە نەوەکانی ئالو بەیتدا هاتووە لەوانەی ڕێبازی ڕاستیان کارپێکردبوو، کە بەرنامەی ئەهلی سوننەو جەماعە یە تا ئەمڕۆ، هەروەها ناوی هاوەڵان و دایکانی ئیماندارانیش لەو ماڵە هاشمیانە دەبینین، کە پابەند بوونە بە قورئان و فەرمودەوە، بێگومان بە ناوەکانی طلحة و عبدالرحمن و عائیشە و ئومو سەلەمەوە نەوەکانی خۆیانیان ناو ناوە، ئێمەش شیعەی ئەمڕۆ بانگەواز دەکەین، کە پابەند بن بە علی و حسن و حسین و گشت ئیمامەکانی ئال و بەیتەوە، چونکە بەوە أنسارییانی ئاینی خوا و هاوەڵانی پێغەمبەری خوایان خۆش دەوێت و بەو هۆیەشەوە هەندێ لە کوڕان و کچانیان بە ناوی خەلیفەکانی ڕاشیدەین و دایکانی ئیماندارانەوە ناو دەنێن.[3]

●ووتەی عبداللە کوڕی حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تالیب لە بارەی عمرەوە لە حەفسی کوڕی قەیسەوە، دەڵێ: لە بارەی مەسح کردن لەسەر(خف).[4] لە عبداللە کوڕی حسنم پرسی، ئەویش وتی: مەسح بکە، چونکە عمری کوڕی خەتاب(رضي الله عنه) مەسحی کردووە، ووتم: من ئەپرسم کە تۆ مەسح ئەکەی؟ وتی: تۆ بە عمر ناڕەحەتی، من لە بارەی عمرەوە هەواڵت پێ ئەدەم و لە بۆچوونی خۆم ئەپرسی، بێگومان عمر لە من و هەرچی لەسەر زەویدایە باشترە، منیش وتم: ئەی باوکی محمد، خەڵکانێك وای دادەنێن ئەمە خۆپارێزی بێت لە ئێوە، ئەویش پێی ووتم: لە نێوان گۆڕی پێغەمبەر و مینبەر دا بووین: خوایە گیان ئەمە قسەی منە لە ئاشکرا و نهێنیدا و لە دوای منیش قسەی کەسێکی تر

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا: ١٣٤.

٢ ـ هەمان سەرچاوە لا: ١٣٥

٣ ـ إذهبوا أنتم الرافضة، عبدالعزیز الزبیدي، لا: ٢٣٠.

٤ ـ خف: لە زمانی کوردی پێ دەڵێن: کارك

لەسەرم مەبیستە، پاشان فەرمووی: کێیە وا گومان دەبات علی (ﷺ) ئازار دراو بووە و پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمانێکی پێکردووە و ئەویش جێ بەجێی نەکردووە، بەسە ئەو درۆیە لە دژی علی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانێکی پێکردبێت و ئەویش بەجێی نەهێنابێت. (1)

## سێیەم: لە سەردەمی عثمانی کوڕی عفاندا(ﷺ):

(ذوالنورین) عثمان لە ساڵە یەکەمەکانی بانگەوازی ئیسلامیەوە پەیوەندی توند و تۆڵی بە بانگەوازی ئیسلامیەوە هەبوو، هەواڵە تایبەتیەکانی پێغەمبەریێتی و گشتیەکانی لە دەست دەرنەچووە لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) و، هیچ هەواڵ و باسێکی خیلافەتی هەردوو بەرێزەکەشی (أبوبکر و عمری) لەدەست دەرنەچوو، بەدەربڕینێکی تر هیچ شتێکی لەدەست نەچوو لەوەی ئەمڕۆ بەکارە بناغەییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ناو دەنێن.

ئەو بەرنامە پەروەردەیەی قورئانی پیرۆزی خوا بوو کە عثمانی کوڕی عفان(ﷺ)و گشت هاوەڵانی لەسەری پەروەردە بوون، هەروەها ئەو پشتگیرو چاوگە بەهێزەی کاریگەری کرد، کەسێتی عثمانی کوڕی عفان و بەهرەکەی سەرجۆر و ووزەکانی دەرخست و دەرونی پوخت کردەوە هاوڕێیەتی کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خوێندکاربونی بوو لە قوتابخانەی پێغەمبەرایەتی دا، چونکە عثمان (ﷺ) لە مەککە و دوای موسڵمان بونی هاوەڵێتی پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) هەروەکو دوای هیجرەتیش لە مەدینە لەگەڵ پێغەمبەر دا بووە (ﷺ)، بێگومان عثمان دەرونی خۆی ڕێکخستبوو، سوور بوو لەوەی لە ئەڵقەکانی قوتابخانەی پێغەمبەرایەتیدا و لەسەر دەستی مامۆستاو ڕێنیشاندەری مرۆڤایەتی لقە جۆر بەوجۆرەکانی زانست و زانیاریەکان بخوێنێ و فێربێ، ئەو مامۆستایەی پەروەردگاری بەجوانترین شێوە پەروەردەی کرد، عثمانی کوڕی عفان(ﷺ) لەو کەسانە نەبوو لەبەر تەمبەڵی یان هەڵهاتنێك لەبەدەر دواکەوێ، هەروەکو هەندێ ئارەزووباز لەئامادە نەبونی لە خەیبەردا ئەو تانەیەی لێ ئەدەن، عثمان مەبەستی پێچەوانە کردنی پێغەمبەری خوا نەبووە (ﷺ)، چونکە ئەو گەورەیی و فەزڵەی، کە

---

١ النهي عن سب الأصحاب وما فيه من الإثم والعقاب لمحمد عبدالواحد المقدسي، لا: ٥٧.

خەڵکی بەدەر لە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وەدەستیان هێنا، عثمانیان لەگەڵدا بوو بۆ بەدەر دەرچوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێغەمبەر فرمانی گەڕانەوەو چاودێریکردنی ڕوقیەی کچی پێدا کەنەخۆش بوو بەو نەخۆشیەش مرد، عثمان(ﷺ) لەو پەڕی گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)بوو، لە دەسکەوتەکانی بەدر بەشی جیاکردەوەو پاداشتی داو بەهۆی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەوە لە دەسکەوت و گەورەی و پاداشت بەشدار بوو، لە حودەیبەشدا(الطبري) لە چەند شتێکدا تایبەتمەندی عثمان(ﷺ) باس دەکات: بەوەی پێغەمبەر دەستی خستە دەستی خۆی لەجیاتی دەستی عثمان و بەیعەتی کرد و عثمانیش لەوێ نەبوو کاتێ هاوەڵانی بەیعەتیاندا، تایبەتبونی لە گەیاندنی ناوی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خەڵکی مەککە و شایەتی پێغەمبەری باسکردووە، لەبارەی عثمان(ﷺ)، کە بۆ ناردنی ئەو پەیامەی نارد(طواف)ی بەجێ هێشت[1]، لە فەتحی مەککەشدا پێغەمبەری خوا شەفاعەتی عثمانی کوڕی عەفانی لەبەرامبەر عبداللە کوڕی ئەبو سەرحی قبوڵ کرد.[2]

لە ژیانی کۆمەڵایەتی عثمانیش لە مەدینەدا، هاوسەرگیریکردنی بوو بە أم کلثومی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدوای مردنی ڕوقیەی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و مردنی عبداللە کوڕی عثمان و پاشان مردنی (أم کلثوم)(ڕەزای خوای لێ بێت)، لەبەشداریە ئابوریەکانیشی لە بونیاتنانی دەوڵەتدا، کڕینی بیری (روقە) بە بیست هەزار درهەم و لەپێناو خوادا تایبەتیکردە دەوڵەمەندو هەژاران و فراوانکردنی مزگەوتی پێغەمبەر و بەخشینە گەورەکەی بەسوپای (العسرة)، باسی زۆریش هاتووە لەبارەی گەورەیی عثمان لەگەڵ کەسانی تردا، لەوانە: ئەوەی لەبارەی گەورەی و فەزڵی خۆیەوە هاتووە.

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە لەبارەی ئەو فیتنەیەی کە عثمانی تیادا شەهید، عثمان یەکێك لە هاوەڵان و ئەهلی شورا بووە ئەوانەی لە ڕوداوە گەورەکانی سەردەمی أبو بکری

---

١ ـ المناقب النضرة في المناقب العشرة، لا ٤٩٠ ـ ٤٩١.

٢ ـ أضواء البيان في تاريخ القرآن، لصابر أبو سليمان، لا ٧٩.

صدیق(ﷺ) بۆچـونیان وەردەگـیردا، عثمـانی لـەدوو کەسـە نزیکەکـە لای أبـو بکـری صدیق(ﷺ)، عمری کوڕی خطاب لەکاتی ناخۆشی، عثمانی کوڕی عفان لە کاتی ئـارامی و خۆشی عمر(ﷺ) ەزیری خیلافەتی أبو بکری صدیق کاتبی گەورەی خیلافەتی أبـوبکری صدیق بوو، عثمـان(ﷺ) شوێنی بەرزی لای عمر هەبوو، گەر بیانویستایە پرسـیاریان لـە عمر بکردایە لە بارەی شتێکەوە ئەوە ئەیانخـستە سـەردەم عثمـان و عبـدالرحمنی کـوڕی عوف، عثمانی بەجێگر ئەناسرا.

حەسەنی کوڕی عەلیش (ﷺ) لە سەردەمی عثماندا لە هەرەتی گەنجیەتیـدا بـوو، لـە تەمەنێکدا بوو دەیتوانی ڕووداوەکانی دەوروبەر و سیاسەتی خەلیفـەی ڕاشـیدو هـاوەڵانی پێغەمبەری(ﷺ) دەوروبەری تێبگات، لەگرنگترین ئەو پەندو وانانەش کە حەسەنی کـوڕی علی وەریگرت و فێر بوو ئەمانە بوو:

۱-عمر(ﷺ) لە کاروباری خیلافەتدا:

عمری فاروق (ﷺ) تا کۆتا ساتەکانی ژیانی بەردەوام بـوو لـە گرنگیـدان بەیـەکبونی ئومەت و داهاتوەکەی، سەرباری ئەو ئازارە زۆرەی لە برینی سـەختی لاشـەیدا دەیـچێژا، بێگومان سات گەلێك نەمرە، کەباوەڕی پتەوی فاروق و دڵسۆزی و خـۆ گریەکـەی تیایـدا دەبینرێ دەکات.[1]

بێگومان عمری فاروق لەو ساتە ناسـکەدا ڕێگەیـەکی نـوێ لـەدیاریکردنی خەلیفـەی تازەدا دإبنیٚ کە پێشتر نەبووە، ئەوەش بەڵگەیەکی ئاشکرا بوو لە تێگەیـشتنی خـۆی لـە سیاسەتی دەوڵەتی ئیسلامیدا، پێغەمبەر (ﷺ) پێشتر دونیای بەجیٚ هێشت و بـەدەقێکی ڕاشکاوانە جێنشینی دانەنا، أبو بکری سدیقیش وەفاتی کرد و دوای ڕاوێژکردنی هاوەڵانی عمریان(ﷺ)کردە جیٚ نشین، کاتێکیش لە عمر(ﷺ) داواکرا کە لـە سـەرە مەرگـدا بـوو بەوەی خەلیفەی دیاری بکات، بە وریاییەوە بیری کـردەوە و ڕێگەیـەکی هەڵبـژارد کـەس پێشی نەکەوتبوو، تاوەکو بۆ کات و شوێنەکە بگـونجیٚ، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) خـەڵکی بەجیٚ هێشت و خـەڵکیش دانیـان بـە لـە پێـشتر بـوونی أبـوبکر(ﷺ) دانـا، بەتایبـەت

---

۱ ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني، لا: ۱٦۱.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە قسە و کردار و ئاراستەی ئوممەتی کرد، کە أبـوبکر(رضي الله عنه) دوای ئەو خەلیفەو أبو بکریش، کە عمری(رضي الله عنه) کردە خەلیفە دەیزانی! کـە متمانـەی گـەورە و بەهێز لای هەموو هاوەڵان هەیە کە عمر بەهێزترو باشترە تاوەکو دوای ئەو بەرپرسیارێتیە هەڵبگرێت، لە دوای ڕاوێژکردن بەگەورە هاوەڵانی عمری کردە خەلیفەی دوای خۆی، هـیچ یەکێك لەو هاوەڵانەش دژی بۆچونەکەیان نەکردو بەوەش یەك دەنگی (اجماع) ی بەیعـەتی عمر هاتە دی[1]، بەڵام شێوەی هەڵبژاردنی خەلیفـەی نـوێ و، شـوری لەچـەند کەسـێکی سنوردار دەکات لە شەش هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کورت دەکاتەوە کـە هـەمووبان شیاوی وەرگرتنی دەسەڵات بوون، گەر چی پلـەو لێهاتوویـشیان جیـاواز بێـت و شـێواز و ماوەی هەڵبژاردن و ئەو دەنگانەشی بۆ دیـاریکردن کـە بـەس بـۆ هەڵبـژاردنی خەلیفـە و بڕیـاری ئـەو ئەنجومەنـەو بارسـەنگی یەکـسانی دەنگەکانیـشی دیـاریکردوو، فرمـانی بەکۆمەڵێك لە سەربازانی خوایـدا کـە چـاودێری ڕۆیـشتنە ڕێـوەی هەڵبژاردنـەکانی ئـەو ئەنجومەنە بکەن و سزای ئەو کەسانەش بدەن پێچەوانەی فرمانی جەماعە بێـت و ڕێگـری پەشێوی بکەن بەجۆرێ ڕێگە نەدەن کەسێ بچێتە لایـان یـان گوێبیـستی بـاس و بڕیـاری ئەنجومەنی (أهل الحل والعقد) بێ.[2]

أ ـ ژمارەو ناوی ئەو کەسانەی عمر(رضي الله عنه)یان بۆ شورا دیاریکرد:

کەسەکان شەش بوون: علی کوڕی ئەبو تالێـب، عثمـانی کـوڕی عـەفان، عبـدالرحمنی کوڕی عەوف، سعدی کوڕ ئەبو وەقاص، زوبیری کوڕی عەوام، تەڵحـەی کـوڕی عوبەیـدڵڵا (رضی الله عنهم)، سعدی کوڕی زەیدیش کەیەکێك بوو لەو دەکەسەی موژدەی بەهەشتیان پێدرأبوو لە خۆ پاڵاوتن دوورخستەوە، چونکە لە هۆزی (بنی سعدی) بـوو.[3] عمـر (رضي الله عنه) سوور بوو لەسەر ئەوەی نزیکەکانی خۆی لە دەسەڵات دووربخاتەوە، گەر چی کەسی شیاوی ئەو پلەیەشی تێدابێ، بۆیە سەعیدی کوڕی زەید کەکەس و خزمی خـۆی بـوو لـە لیـستی خۆپاڵێوەرەوانی خیلافەت دوور خستەوە.[4]

---

١ ـ أولويات الفاروق للقرشي، لا: ١٢٢.

٢ ـ أولويات الفاروق للقرشي، لا: ١٢٣.

٣ ـ البداية والنهاية (١٤٢/٧).

٤ ـ الخلفاء الراشدون للخالدي، لا ٩٨.

### أـ شێوازی هەڵبژاردنی خەلیفە:

عمر (رضي الله عنه) فرمانی بەو شەش کەسە کرد لەماڵی یەکێکیاندا کۆببینەوە و ڕاوێژ بکەن و تیایدا عبدالله کوڕی عمریش تەنیا بۆ ڕاوێژ پێکردن ئامادەبێت و مافی خۆ پاڵاوتنی نیە، (صهیب)ی ڕۆمیش پێش نوێژی خەڵکی بکات و پێ ی ووت: بۆ سێ ڕۆژ ئەمیری پێش نوێژ کردنی خەڵکیت. تاوەکو لەو شەش کەسە پێشنوێژی خەڵکی نەکەن، کە کردی ئەوە لەلایەن عمرەوە بۆ خیلافەت پاڵێوراوە.[1] و فرمانی بە (میقداد بن الاسود) و (أبا طلحة الانصاری) کرد چاودێری ڕۆیشتنە ڕێوەی هەڵبژاردنەکان بن.[2]

### ب ـ ماوەی هەڵبژاردنەکان یان ڕاوێژ کردنەکە:

عمر(رضي الله عنه) بەسێ ڕۆژ ماوەکەی دیاریکردووە، کە ماوەیەکی تەواوە، گەر لەو سێ ڕۆژە زیاتری کرد ئەوە تەنگەژەی جیاوازی و ڕکەبەری فراوان ئەبێتەوە بۆیە پێیانی ووت! نابێ چوارەم ڕۆژ بێت و ئەمیرتان نەبێت.[3]

### ج ـ ژمارەی ئەو دەنگانەی بەسن بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە:

إبن سعد بە(إسناد)ێك تەحزیجی کردووە کە کەسەکانی متمانە پێکراون: عمر (رضي الله عنه) بەسوهەیبی ووت: سێ ڕۆژ نوێژ بۆ خەڵکی ئەنجامبدە و ئەو چەند کەسەش با لەماڵێکدا بن، گەر لە هەڵبژاردنی کەسێك یەکدەنگ بوون ئەوە هەر کەسێ دژ بوو لەملی بدەن.[4] عمر(رضي الله عنه) فرمانی کوشتنی هەرکەسێکی دا پێچەوانەی ئەو کەسانە بکات کە بۆ دیاریکردنی خەلیفە کۆبونەتەوە و پەرتەوازەیی بخەنە نێوان موسڵمانانەوە ئەوەش بەدەقی فەرمودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): ((من أتاکم وأوکم جمیع علی رجل منکم یرید أن شیق عصاکم، أو یفرق جماعتکم فاقتلوه)).[5] ئەوە لەکتێبەکانی مێژوو داهاتووە کە عمر(رضي الله عنه) فرمانی کۆبونەوەو ڕاوێژی پێداون و سنوری بۆ دیاریکردوون گەر پێنج کەسیان

---

١ ـ الخلفاء الراشدون للبهنساوي، لا ٢١٣.

٢ ـ أشهر مشاهير الاسلام في الحرب والسياسة، لا ٦٤٨.

٣ ـ الطبقات لإبن سعد (٣/٣٦٤).

٤ ـ هەمان سەرچاوە (٣/٣٦٤).

٥ ـ مسلم (٣/١٤٨٠).

لە سەر یەکێکیان کۆبونەوە و کەسێکیان دژ وەستا ئەوە بەشمشێر سەری بپەڕێنن، گەر چواریان یەکدەنگ و دوانیان دژ بوون ئەوە لەسەری دوو کەسەکە بدەن و بیانکوژن.[1] ئەو ڕیوایەتانەیە کە سەنەدێکی (صحیح)یان نی یە و لەو باسە نامۆیانەیە (الغرائب)کە ئەبو موخنەفی (ڕافزی شیعە) پێچەوانەی دەقە ڕاستەکان و ئەوەی لە ژیاننامەی هاوەڵاندایە (ڕەزای خوایان لێ بێ) دایهێناوە، ئەوە أبو مخنف باسی دەکات کە قسەی عمر بێ بەسوهەیبی ووتبێ: لەسەر سەری ئەهلی شورا بوەستە گەر پێنجیان ڕێك و دانەیەکیان دژ بوو ئەوە سەری بپەڕێنە، گەر چواریان یەکدەنگ بوون و دوانیان دژ بوو ئەوە سەری هەردووکیان بپەڕێنە.[2] قسەیەکی نارێکە (منکر) چۆن عمر (ﷺ) قسەی وەها دەڵێت لە کاتێکدا ئەزانێ: ئەوانە هەڵبژاردەیەکی هاوەڵانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) کە لەزانستی بەفەزڵ و ڕێزیان بۆ ئەو کارە هەڵیان بژاردووە.[3] لە إبن سعدەوە ڕیوایەتکراوە: عمر بە ئەنصاری ووتووە: (بۆ سێ ڕۆژ بیانکەنە ماڵێکەوە، گەر ڕێك هاتن باشە، گەر نا بچنە سەریان و لە گەردنیان بدەن).[4] ئەم ڕیوایەتە پچڕاوە (منقطعة) و لە ئیسنادەکەشیدا (سماك بن حرب)ە کە لاوازە و جێ ی متمانە نیە.[5]

ح ـ بڕیاردان لە کاتی جیاوازیدا:

عمر(ﷺ)وەسێتی کردووە کە عبداللە کوڕی عمر ئامادەی ئەنجومەنەکە بێ و نابێ دەسەڵاتی پێ بدرێت، بەڵام پێ ی ووتوون: گەر سێ کەس ڕازی بوون، سێ پیاوەکەی تریش پێچەوانە، ئەوە عبداللە کوڕی عمر دابنێن بڕیارتان لەسەر بدات، هەر لایەك بڕیاری بۆ بدات ئەوە با پیاوێکیان لێ هەڵبژێرن، گەر بە بڕیاری عبداللە کوڕی عمریش(ﷺ) ڕەزامەند نەبون ئەوا با لەگەڵ ئەو کەسانە بن، کە عبدالرحمانی کوڕی عوفیان تێدایە، وەسفی عبدالرحمانی کوڕی عوفی کردووە، بەوەی یەکلاکەرەوەیەکی پێگەیشتووە و، لە

---

١ ـ تاریخ الطبري (٥/٢٢٦).

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ مرویات أبي مخنف في تاریخ الطبري، د. یحیی، لا: ١٧٥.

٤ ـ الطبقات لإبن سعد (٣/٣٤٢).

٥ ـ مرویات أبي مخنف في تاریخ الطبري، د. یحیی، لا: ١٧٦.

بارەیەوە وتوویەتی: بۆچونی عبدالرحمنی کوڕی عەوف باشترین بۆ چوونی و یەکلا کەرەوە یە و، بۆیە لیٚ ڕابگرن.[1]

خ- کۆمەڵێك سەربازی خوا چاودێری هەڵبژاردن و ڕێگری لە پەشێوی دەکەن:

عمر(ﷺ)داوای لە (أبوطلحة الانصاری) کرد و پێی ووت: ئەی ئەبا تەلحە خوای گەورە بەئێوەوە ئیسلامی سەربەرز کرد، بۆیە پەنجا پیاوی ئەنصاری هەڵبژێرەو هانەدەری ئەو چەند پیاوانە بن تاوەکو لە خۆیان پیاوێك هەڵدەبژێرن.[2] بە میقدادی کوڕی ئەسوەدیشی ووت: گەر منتان خستە گۆڕەکەمەوە ئەو با ئەو چەند کەسە لە و ماڵە دا کۆببنەوە تاوەکو یەکیٚ لە خۆیان هەڵدەبژێرن.[3]

ش- ڕێگە دانی گرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن کەسی باش لەگەڵ بوونی کەسی باشتر!

هەندیٚ لە سودەکانی شورا ئەمانەیە: ڕێگەدانی دەسەڵاتگرتنی باش سەرباری بوونی باشتر، لە بەر ئەوەی عمر شورای خستە نێوان ئەو شەش کەسە سەرباری زانیاریەکەی بەوەی هەندێکیان لە یەکتر باشترن، ئەوەش لە ژیاننامەی عمردا بەرامبەر ئەو ئەمیرانەی دەردەکەوێت، کە لە ولاٚتدا فرمانی پیٚ ئەکردن کە تەنیا گەورەی ئایینی ڕەچاو نەدەکرد، بەڵکو زانیاری زۆری سیاسەتیشی ئەخستە پاڵ لەگەڵ دورکەوتنەوە لەوەی چی پێچەوانەی شەرعە، بۆیە معاویە و موغیرەی کوڕی شعبە و عەمری کوڕی عاصی کردە والی سەرباری بوونی کەسانی باشتر لەوان لە بوارەکانی ئاین و زانستدا وەکو (أبی الدّرداء) لەشام و (إبن مەسعود) لە کوفە.[4]

ك- کۆکردنەوەی عمر لە نێوان دیاریکردن و دیارینەکردنیدا:

---

١ ـ تاريخ الطبري (٣٢٥/٥).

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

٤ ـ المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدي (٩٧/٢).

عمر ئەیزانی کە شوری تەنیا لە نێوان شەش کەسدا نابێت، بەڵکو لە وەرگرتنی بۆچونی خەڵکی مەدینەدا دەبێتە خەلیفە، کە سێ ڕۆژی بۆ دیاریکردووە، چونکە ئەتوانن بەڕاوێژو ووتوێژ بکەن ڕێکەوتی زۆربەی ئامادە بووان کێ دوای ئەو ئەبێتە خەلیفەو بەرپرسیارێتێکە هەڵدەگرێت لەو شارەی کە (دار الهجرە) یە و زۆربەی هاوەڵانی تێدایە و، هەموو دانیشتوانی شارانی تریش سەر بەوانە، لەوەی هاوەڵان لە سەری ڕێك بێت، چونکە مەدینە تا ساڵی ٢٣ك کۆمەڵگەی هاوەڵان بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی گەورە هاوەڵانی تیادا بوو عمر لەپاڵ خۆیدا هێشتبوویانیەوە و مولکی کۆچکردنی بۆ هەرێمە ئازاد کراوەکانی پێ نەدان.[1]

ل- ئەهلی شورا باڵاترین دەزگایەکی سیاسیە:

عمر(ﷺ) ئەهلی شورای ڕاسپارد، کە لە نێو خۆیاندا خەلیفە هەڵبژێرن، گرنگیشە ئاماژە بکەینە ئەوەی هیچ یەکێك لە ئەهلی شورا بەرهەڵستکاری ئەو بڕیارەی نەکرد، کە عمر(ﷺ)گرتیە بەر، هەر وەکو هیچ هاوەڵێکی تریش هیچ بەرهەڵستکاریەکیان نەکردووە، ئەوەش ئەو بەڵگانەی بەر دەستماندایە بەڵگەن لەسەر ئەو ڕاستیە، ئێمەش نازانین: کە پێشنیارێکی تر لەلایەکی کەسێکەوە لەو سەردەمەدا کراوە، یان لە ساتە کۆتاییەکانی عمر یان لەدوای مردنیدا بەرهەڵستکاریەك لە دژی فرمانی عمردا ڕوویدابێ، بەڵکو خەڵکی لەو ڕێوشوێنە ڕەزامەند بوون و بەرژەوەندی موسڵمانیان لێ بینیبوو، لە توانای ئێمەشدا هەیە بڵێین: کە عمر دەزگایەکی سیاسی باڵای دامەزراند کە کارە گرنگەکەی هەڵبژاردنی سەرۆکی دەوڵەت یان خەلیفەیە، ئەو ڕێکخستنە دەستورە نوێیەش کە تواناداریەکەی عمر(ﷺ) دایهێنا لەگەڵ ئەو بنەمایانە دژنیە کە ئیسلام بڕیاری داوە، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە شوراوە.

لەوەشدا ئەو پرسیارە بەبیری کەسدا نایەت ئایا کێ ئەو مافەی بە عمر داوە؟ پاڵپشتی عمر لەو ڕێو شوێنەدا چیە؟ بەسە بۆ ئەوەش بزانین کە کۆمەڵێك لە موسڵمانان ئەو ڕێوشوێنەیان بڕیارداوە و پێ ی ڕازیبوون و دەنگی ناڕەزایش لە دژدا نابیستین تا دوپاتی

---

١ ـ هەمان سەرچاوە.

بکەینەوە: کۆ دەنگی(الإجماع)- سەرچاوەیەکە لەسەر چاوەکانی (تەشریع) لەسەر ئەوە هاتە دی، [1]نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە عمر خەلیفەیەکی ڕاشیدیەو پێویستە دڵنیابین: کە ئەهلی شورا باڵاترین دەزگایەکی سیاسیەو سیستەمی دەسەڵات لە ئیسلامدا لە سەردەمی ڕاشیدیدا بڕیاری داوە، کە ئەو دەزگایەی، کە عمر(ﷺ) ناویناوە، کۆمەڵە تایبەتمەندیەکی هەیە بەجۆرێك هیچ دەزگایەکی تری موسڵمانان ئەو تایبەتمەندیەیان نەبووە، ئەو تایبەتمەندیەش لای خوا بۆی بەخشراوەو پێغەمبەریش گەیاندوویەتی، بۆیە ناکرێت هیچ موسڵمانێك لەڕووی تەقواو دەستپاکیەوە بە پلەی ئەو دەکەسە بگەن.

بەو شێوەیە عمر(ﷺ) ژیانی کۆتایی پێ هێنا، ئەو کۆست و کارەساتەش کەبەسەریدا هات لەبەرامبەر کاروباری موسڵمانانەوە بێ ئاگایی و لەبیری نەکرد، سیستەمێکی شیاوی بۆ شورا دامەزراند کە هیچ کەسێکی تر لەوەدا پێشی نەکەوتبوو، گومانیش ناکرێت کەشورا لەقورئانی پیرۆز و سوننەتدا (بەقسەو کردار) بڕیاری لەسەر دراوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) و أبوبکریش کاریان پێ کردووە، لەبەرامبەر ئەو بنچینەشدا (الأصل) عمر داهێنکار نەبووە، بەڵام ئەو کارەی ئەو دیاریکردنی ئەو ڕێگەیە بوو کە خەلیفەی پێ هەڵدەبژێردرێت و ژمارەیەکی لێ دیاریکردن و ئەوەشە کە پێغەمبەر (ﷺ) و أبوبکری صدیق (ﷺ) نەیانکرد بوو، بەڵکو عمر یەکەمین کەسێك بوو ئەوەی ئەنجامدا، جوانترین کارێکیشی کرد، بەڕاستی باشترین ڕێگەیەکی گونجاوی حاڵی هاوەڵان بوو لەوکاتەدا.[2]

بێگومان ئەو پەرەسەندنە جوان و ڕێکەی فیقی خیلافەو ئەو ووشیاریە سیاسی و ئەو قۆناغەش کە پێویستی بەکۆمەڵە ئیجتیهادێکی کرداری بەشداریکرد لە ڕوناکبیرکردن و فێرکردنی حەسەنی کوڕی علی (ﷺ)و بەخشینی تێگەیشتنێکی فراوان و ڕوانینێکی تۆکمە. ئەوەش وەها لێکرد شێوازێکی نوێ بگرێتە بەر کە کەسی تر لەوەدا پێشی نەکەوتبوو، بەشدار بوو لە یەکخستنی ئوممەت لە دوای پەرتەوازەیی، بۆیە کەسێتیە

---

١ ـ نظام الحكم في الشريعة والتاريخ للقاسمي (١/٢٢٧، ٢٢٨).

٢ ـ أولويات الفاروق، لا: ١٢٧.

بەهێزو داهێنکارەکان لە بۆشی و بەتاڵی دا دروست نابێ، بەڵکو دەسـهاتی شـارەزاییەکی فراوان و سودێکی گەورەی توانا گەلێکی پێشوویەتی لە بونیاتنـانی ژیـانی شارسـتانیەتی ڕاشدیدا.

٢ـ بەرنامەی عبدالرحمن کوڕی عوف لە بەڕێوە بردنی شورادا:

ئەوەی حەسەنی کوڕی علی لە بەیعەتی عثمانـدا بینی بەرنامـەی عـبدالرحمنی کـوڕی عوف بوو لەبەڕێوەبردنی شورا، کە لەم هەنگاوانەی خوارەوە خۆی دەبینێتەوە:

أـ کۆبونەوەی ئەو چەند کەسە بۆ ڕوێژکردن:

کاتێك خەڵکی لە ناشتنی عمری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) ببنەوە تـا ئـەو ئەنجومەنـە بـۆ ڕاوێژکردن لەماڵی عائیشەی دایکـی ئیماندارانـدا (رضي الله عنها) کۆبونـەوە، وترایـشە: لـەماڵی (فاطمەی کچی قەیس الفهرية)ەی خوشکی (ضحاك بن قيس)کۆبونەوە، تاوەکو گەورەترین دۆزو کێشەیەك چارەسەر بکەن کە خراوەتە بەردەم ژیانی موسڵمانانەوە- لە دوای مردنـی عمر- کۆبونەوەو بۆچونەکانیان خستە ڕوو، خوای گەورەش بۆیەك بۆچوون یارمـەتی دان و هەموو موسڵمانانی پێی ڕازیبوون.[1]

ب ـ عبدالرحمنی داوای دەست هەڵگرتن ئەکات:

کاتێك ئەهلی شورا کۆبونەوە عبدالرحمنی کوڕی عوف پـێ ی ووتـن: کاروهەڵبـژاردنی خۆتان بدەنە سێ کەس، زوبەیر ووتی: من کاری خۆم ئەدەمە علی، طلحة ووتـی: منـیش کاری خۆم دەدەمە عثمان(رضي الله عنه)، سعدیش ووتی: مافی خۆم دەدەمـە عـبدالرحمنی کـوڕی عوف. بەوەش پاڵێوراوان بوونە سێ کەس، عبدالرحمن ووتی: کێ لەئێوە لەم کـارە دەست هەڵدەگرن و ئەرکی خواو ئیسلامی لەسەر بـێ تـا باشـترینیان بڕواننـە خۆیـان، هـەردوو (عثمان و عەلیش) بێدەنگ بوون، عدبدالرحمنی کـوڕی عـوف ووتـی: ئـەم کـارە دەدەنـە

---

١ ـ عثمان بن عفان للصادق العرجون، لا ٦٢، ٦٣.

دەستی من تاکەسێکتان دیاری بکەم و خوا شایەد بێت کە لەباشترینتان لائەدەم؟ هەردووکیان ووتیان: بەڵێ.[1]

ج - ڕاپەڕاندنی بەڕێوە بردنی کاری شورا لەلایەن عبدالرحمنی کوڕێ عوف:

عبدالرحمنی کوڕی عوف (رضي الله عنه) یەکسەر لە کۆتایهاتنی کۆبونەوەی شەش پاڵێوراوەکە لە بەیانی ڕۆژی یەك شەممەدا پەیوەندی و ڕاوێژەکانی دەست پێکرد وبۆ سێ ڕۆژی تەواویش بەردەوام بوو تا بەیانی ڕۆژی چوار شەممەی چواری مەحەرەمدا کە کاتی تەواوبوونی ئەو ماوەیە بوو کە عمر بۆیانی دیاریکردبوو.

عبدالرحمن بە علی کوڕی ئەبو تاڵیب دەستی پێکردوو پێ ی ووت: گەر بەیعەتت پێ نەدەم هیچم لەسەر وەردەگری، کێ بۆ خیلافەت ئەپاڵێوری؟ عثمان ووتی: علی کوڕی ئەبو تاڵیب....... دواتر عبدالرحمنی کوڕی عوف ڕۆیشت بۆ لای هاوەڵانی دیکە و ڕاوێژی پێ کرد و بەهەر کەسێکیش گەیشت لەمەدینەدا ڕاوێژی پێکردن لەگەورە هاوەڵان و ئەمیرەکانی سوپا و ڕاوێژی ئافرەتانیش کرد لە پشتی پەردەوە و ئەوانیش بۆچونی خۆیانیان دەربڕی و بۆچونی گەنج و کۆیلەکلنی مەدینە و موسڵمانانیشی کرد و کەئەوانیش ئاماژەیان ئەکردە عثمانی کوڕی عوف و هەندێکیشیان علی کوڕی ئەبو تاڵیبیان(رضي الله عنه) هەڵبژارد، لەنیوە شەوی چوارشەممەدا عبدالرحمنی کوڕی عوف ڕۆیشتن بۆماڵی (مسعود بن مخرمە)ەی خوشکەزای و لە دەرگای دا تا خەبەری بۆوە تەماشای کرد خەوتووە، ووتی: چیە خەوتووی، سوێند بەخوا ئەم شەوە بە خەوێکی قورس خۆی نەڕازاندۆتەوە و چاوی نەڕشتووە، بڕۆ زوبێرو سعد بانگ بکە، بانگی کردو ڕاوێژی پێکردن، پاشان داوای لێ کردم ووتی: عەلیم بۆ بانگ بکە، علیم بۆ بانگکرد، قسەی بۆ کرد تانیوەی شەو و، پاشان علی ڕۆیشت، پاشان ووتی عثمانم بۆ بانگ بکە، بانگیان بۆ کرد و قسەی بۆ کرد تا بانگی بەیانی لەیەکی کردن.[2]

---

١ ـ البخاري، كتاب: فضائل أصحاب النبى رقم: ٢٧٠٠.

٢ ـ البخاري، كتاب: الأحكام رقم: ٧٢٠٧.

رێکەوتنی لەسەر بەیعەت پێدانن بە عثمان (رضي الله عنه):

دواى نوێــــژى بــــەيانى ڕۆژى بەيعەتـــــدان، كۆتــــا ڕۆژى مــــانگى (ذوى الحجه/٢٣ك/٦نۆڤەمبەرى ٦٤٤ز) و صوهەيبى ڕۆمى ئيمام بوو، عبدالرحمنى كوڕى عوف هات و پياوانى شوراش لاى مينبردا كۆبونەوە و ناردى بەشوێن ئەو موهاجير و ئەنـصار و ئەميرانەى ئامادە بوون لەمەدينە وەكو: معاويەى ئەميرى شام و عومەيرى كـوڕى سـعدى ئەميرى (حمص) و عەمرى كوڕى عاص ئەميرى مصر، كە لەگەڵ عمردا حەجيان كرد و بۆ مەدينە هاوڕێتيان كرد.[1] لەڕيوايەتێكى بخاريشدا هاتووە: كاتێك نوێژى بەيانى بۆ خـەڵك كرد و ئەهلى شورا (حەوت كەسەكە) لاى مينبەر كۆبونەوە، ناردى بەشوێن ئەو موهـاجير و ئەنصارو ئەميرانەى ئامادە بوون كە لەگەڵ عمردا حەجيان كردبـوو، كاتێـك كۆبوونـەوە عەبدولڕەحمان شايوتمانى هێنا و پاشان ووتى: ئەى علـى بێگومــان ڕوانيمـە كـارو قـسەى خەڵكى و بينيم عثمانيان ئەوێ بۆيە ڕێگەيەك بۆخۆت مەهێڵە، ئينجـا بـەعثمـانى ووت: لەسەر سوننەتى خواو پێغەمبەر و هەردوو خەليفەكەى دواترى بەيعەتت پێ ئەكەم، ئينجا خەڵكى بەيعەتيان پێ دا: موهاجيرو ئەنصارو ئەميرەكان و موسڵمانانيش. بەيعـەتيان پـێ دا.[2] لەڕيوايەتێكى دانەرى (التمهيد ولبيان) داهاتووە:

علي كوڕى ئەبو تالـب يەكـەمين كەسـێك بـووە دواى عەبـدولڕەحمانى كـوڕى عـەوف بەيعەتى داوە.[3]

س- حيكمەتى عەبدولڕەحمانى كوڕى عەوف لەجێ بەجێكردنى پلانى شورادا:

عبدالرحمنى كوڕى عوف پلانى شوراى جێ بەجێكرد ئەوەى ڕێگـەى گـەورەيى ژيـرى و دەرون بەرزى و لەخۆگرى بـوو لـەپێناو بەرژەوەنـدى گشت موسـڵمانان و جـێ هێـشتنى بەرژەوەندى سوودى تايبەتى خۆى كەمرۆڤ لەدونيادا تـەماحى بـۆ هەيـە، ئـەوەش لەبـەر يەكخستنى دەنگى موسڵمانان، يەكەمين ديمەنێكى ئەو شورا تۆكمەو ڕێكخراوەشـى وەدى

---

١ ـ شهيد الدار، لا: ٣٧ لەوێشدا جياوازيەك لە ديارى كردنى مێژووى ئەو بەيعەتەدا هەيە.

٢ ـ البخاري، كتاب: الأحكام رقم: ٧٢٠٧.

٣ ـ التمهيد والبيان، لا: ٢٦.

هێنا لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی لە عەرشی خیلافەت دادەنیشێ و کاروباری موسڵمانان بەڕێوە ئەبات، عبدالرحمن بوو، ئارامگری و تۆکمە کردنی دروستکرد و جوان ڕێوشوێن گرتنەبەر ئەوەش مایەی سەرکەوتنی بوو لە کارەگرنگ و گەورەکەیدا و ئەو هەنگاو پلانانەش گرتیە بەر ئەمانەی خوارەوە بوو:

* فراوانی و ئاسانی بەرنامەکەی لە یەکەمین دانیشتنێکدا ئەنجومەنی شورا گرێیدا لە بازنەی ئەو ماوەیەی کە عمر بۆیانی دیاریکردبو، بەوەش توانی هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی شورا وەها لێ بکات بۆچونی خۆیان دەرببڕن، بەوەش بۆچونی هەموویانی زانی و بەڕوونیەوە هەنگاوی هەڵگرت.

* لەوەرگرتنی خیلافەت دەستی هەڵگرت تاوەکو گومانەکان نەهێڵێ و متمانەی تەواو وەربگرێ.

* ئەنجامی بۆچونی ئەندامانی ئەنجومەنی شورا وەرگرت و بۆچونی خۆی لەگەڵیاندا ئاڵوگۆڕ نەکرد تا ئەنجامی ئەنجومەنەکە بەشێوەی هەڵبژاردنێکی (جزئی گەیشتن) و تیایدا عثمانی کوڕی عفان(ﷺ) دەنگی سعدی کوڕی ئەبو وەقاص و زوبێری کوڕی عەوامی بەدەست هێنا و زۆرینەی ئەندامانی ئامادەبوش هەڵیانبژارد.

* هەوڵی ناسینی هەریەك لەو دوو پێشەوایەی دا عثمان و علی لەبەرامبەر یەکترو کێشیان لەلایەن ئەو ئەندامانەی تر کەعمر پاڵاوتبوونی، لە هەریەکەیاندا زانی لەکۆتاییدا لە یەکتر دەست هەڵناگرن و بەیەکتری دەسپێرن.

* - بۆچونی ئەوانیتری جگە لە ئەنجومەنی شورا وەرگرت لەکەسە تایبەتەکانی ئوممەتە و پاشان گشت و لاوازەکانیش، گەیشتن بەوەی کە زۆربەی خەڵکی عثمانیان ئەوێت، بۆیە بەیعەتی بە عثماندا و خەڵکیش بەگشتی بەیعەتیان پێ دا.[1]

---

١ ـ عثمان بن عفان (ﷺ)للصادق عرجونص: (٧١،٧٠).

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بەوریایی و ئەمینی و دامەزراوی و خۆ لە بیرکردنی بوو وازهێنانی لەخیلافەت و کەمگرتنی گەورەترین پلەی دەوڵەت ئەو کۆست و مەینەتباریە تێپەڕێنی و، بەلێزانیەوە سەرۆکایەتی ئەو شورایە بکات.[1]

(الذهبی)یش ئەڵێ: لەباشترین کارەکانی عەبدولڕەحمان خۆکشانەوەی بوو لەبوون بە خەلیفە لەکاتی ئەو شورایەدا و هەڵبژاردنەکانی بۆ ئومەت لەوەی ئەهلی حەل و عەقد بڕیارو ئاماژەیان پێدا و ئەممەتی لەسەر هەڵبژاردنی عثمانی ڕاپەڕاند.گەر خۆی حەزی بەخیلافەت بکردایە ئەوە دەنگدانی بۆخۆی وەردەگرت، یان دەیدایە ئامۆزاکەی و نزیکترین کەس بۆی کە سعدی کوڕی ئەبو وەقاص بوو.[2]

بەوەش وێنەیەکی تری وێنەکانی شورای سەردەمی خەلیفە ڕاشیدیەکان هاتەدی کەبریتی بوو! لە خەلیفە لەڕێگەی ئەنجومەنی شوراوە تاوەکو دوای وەرگرتنی ڕاوێژی گشتی یەکێکیان بۆ خەلیفایەتی دیاری بکەن و، پاشان بەیعەتی گشتی.[3]، ئەوەیە کەلە کارو پڕۆسەی شوراو ئەو ڕوداوانەی حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) بینیویێتی ڕویداوە و هاتۆتە بوون و تەماشای ئەو گێڕانەوەی ڕافیزیە پوچانەش ناکرێت کەهاتۆتە نێو چیرۆك و باسی شورا و مێژووی ئیسلامی شێواندوە، کە ڕۆژ هەڵاتناسەکانیش پێچاویانەتەوە و فراوانتر بڵاویان کردۆتەوە ، زۆرێك مێژوو نوس و بیرمەندەکان پێ ی کاریگەر بوونە و گێڕانەوەکانیان پوخت و پاڵفتە نەکردووە و سەنەد و مەتنیشیان لێکۆڵینەوە نەکردووە و، لەناو موسڵمانانیشدا بڵاوەیان پێکردوو، بێگومان مێژوو نوسە شیعە ڕافیزیەکان گرنگیان بە چیرۆکی ئەو شوراکردن و دیاریکردنی عثمانیان بەخەلیفایەتی داوەو درۆو قسەی پوچیان زۆر تێ خستوە، هەندێکیشیان کتێبی تایبەتیان لەو بارەوە نوسیوەتەوە، أبومخنف کتێبی (الشوری)ی نوسیوە، هەروەها (إبن عقده)و (إبن بأبویه).[4] (إبن سعد)یش لە ڕێگەی (الواقدی) یەوە لەباسکردنی ئەو شورایە و بەیعەتی عثمان و مێژووی بوون

---

١ ـ مجلة البحوث الاسلامية، العدد (١٠)، لا ٢٥٥.

٢ ـ سير أعلام النبلاء (٨٦/١).

٣ ـ دراسات في عهد النبوي والخلافة الراشدة، لا ٢٧٨.

٤ ـ الذريعة الى تصانيف الشيعة (٢٤٦/١٤).

بەخەلیفە نۆ ڕیوایەتی گواستۆتەوە[١]، ڕیوایەتێکیش لە لایەن عبیداللە کوڕی موساوە باسی کوژرانی عمری لە خۆگرتووە و کورتکردنەوەی شورا لەو شەش کەسە و وەسێتکردنی بۆ هەریەك علی و عثمان گەر یەکێکیان خیلافەتی گرتە دەست و هەروەها وەسێتکردنی بە صوهەیب لەو کارەدا.[٢]

(البلاذری) باسی ئەو شورایەو بەیعەتی عثمانی لەأبو مخنف، [٣]و لەهیشامی کەلبیەوە گێڕاوەتەوە و، هەندێکی لە (أبو مخنف)یەوە.[٤](إبن أبی الحدید)یش هەندێ باسی ئەو شورایەی لەڕێگەی ئەحمەدی کوڕی عەبدولعەزیزی جەوهەری گواستۆتەوەو، [٥] ئاماژەشی کردۆتە ئەوەی لە کتێبی (الشوری)ی واقیدیدا گواستویەتیەوە[٦]، ئەو ڕیوایەتە شیعیانەش چەند کارێکی ناشرینکردن و پیلانی پێوەیە و بەڵگەی ڕاستیا نیە، لەوانە:

*- تۆمەتبارکردنی هاوەڵان لەحەزکردن لەبەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان:

ڕیوایەتە شیعەکان هاوەڵانیان بەحەزکردن لە وەرگرتن و حەزکردنە کاروباری موسڵمانان تاوانبارکردووەو، هەروەها ڕازی نەبوونی علی بەوەی عەبدولڕەحمانی کوڕی عوف خەلیفە هەڵبژێرێت، لە ئەبو موخنەف و هیشامی کەلبی لە ڕێگەی باوکی و ئەحمەدی جەوهەریەوە هاتووە، عمر دایناوە گەر هەردوولای تەرازوو یەکسان بوون ئەوەبا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بارسەنگی لایەکیان بێت، عەلیش هەستی کردووە بەوەی خیلافەت لەدەستی دەرچووە، چونکە عبدالرحمن بەهۆی ئەو ژن و ژنخوازی و خزمایەتیەی لەنێوان خۆیی و عثماندایە ئەوە عثمان بۆ خیلافەت وەرگرتن دیاری دەکات[٧]، (إبن تەیمیە)ش بوونی هەرخزمایەتیەکی نزیکی لەنێوان عەبدولڕەحمانی کوڕی عوف و عثمانی ڕەتکردۆتەوە و، وتویەتی: عبدالرحمن برای عثمان و ئامۆزا و هەر لەهۆزەکەشی نیە،

---

١ ـ الطبقات الکبری (٦٣/٣)، (٦٧/٣).

٢ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو (٣٤٠/٣).

٣ ـ أنساب الاشراف (١٨/٥، ١٩).

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

٥ ـ شرح نهج البلاغة (٤٩/٩، ٥٠، ٥٨).

٦ ـ شرح نهج البلاغة (١٥/٩) عثمان بن عفان للصلابي، لا ٧٣.

٧ ـ أثر التشیع علی الروایات التأریخیة، لا: ٣٢٢.

بەڵكو عبدالرحمن لە هۆزی (زهرە) یەو عثمانیش لە (بنی أمیە)، نەوەكانی زوهرە لە بەنی هاشمەوە زۆر نزیكتر تاوەكو بەنی ئومەیە، چونكە بەنو زوهرە خاڵوانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) و، عبدالرحمنی كوڕی عوف و سعدی كوڕی ئەبو وەقاصیان تێدایە كە پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی ووتووە: (هذاخالي فليرني امرؤ خاله)[1] ئەمە خاڵۆی منە، بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی نێوان موهاجیرو موهاجیری نەكردووە، نێوان ئەنصاری و ئەنصاری نەكردووە، بەڵكو برایەتی نێوان موهاجیرو ئەنصاری كردووە، عبدالرحمنی كوڕی عوف و سعدی كوڕی ڕەبیعی ئەنصاری كردۆتە برا، [2]باسی ئەوەش لە(الصحاح) و ئەوانی تردا بەناو بانگ و سەلماوەو زانستخوازانیش ئەوە دەزانن.[3]

ڕیوایەتە شیعەكان حەزكردنی عبدالرحمن بەوەرگرتنی خیلافەت بۆ عثمان بەو خزمایەتیە دامەزراندووە كە لەنێوانیاندایە، لەبیریان چووە هێزی ڕەچەڵەك لە ژن وژنخوازی بەهێزترە لەڕوویەك و لەرویەكی ترەوە سروشتی پەیوەندی نێوان ئیماندارانی نەوەی یەكەمیان لەبیر چووە كەلە سەر ڕەچەڵەك و خزمایەتی و ژن و ژنخوازی دانەمەزراوە، چۆنێتی ئەو ژن و ژن خوازیەی كە لەنێوان عەبدولڕەحمان و عثماندایە ئەوەیە: عبدالرحمن (أم كلثوم)ی كچی عوقبەی كوڕی ئەبو موعیتی خوشكی وەلیدی خواستووە.[4]

* كۆمەڵەی ئەمەوی و، كۆمەڵەی هاشمی:

لە ڕیوایەتێكی أبو موخنەف ئاماژە دەكاتە ڕوودانی بەشێوەیەكی سەخت لەنێوان نەوەی هاشم وبەنی ئومەیە لەكاتی ئەو بەیعەتەدا، ئەوەش ڕاست نیە، ئەو ڕووداوەش بەڕیوایەتێكی (صحیح) یان لاوازیش نەهاتووە، [5]هەندێ مێژوونوسیش لە پشت گێڕانەوە شیعەكانەوە خۆیان خزاندووەو لە سەر ئەو ڕیوایەتانە لێكۆڵینەوە هەڵەكانی خۆیان بنیاتناوە ڕاوێژكردنی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) لەدیاریكردنی خەلیفەی نوێدا

---

١ ـ صحيح سنن الترمذي (٣/٢٢٠) رقم: ٤٠١٨.

٢ ـ البخاري، كتاب: مناقب الانصار، رقم: ٣٧١٨.

٣ ـ منهاج السنة النبوية (٦/٢٧١، ٢٧٢).

٤ ـ الطبقات الكبرى (٣/١٢٧).

٥ ـ مرويات أبي مخنف في تأريخ الطبري، د. يحيى، لا ١٧٧، ١٧٨.

وێنەی ململانێ ی و مشتومڕێکی عەشایەری کێشاوەو خەڵکی بۆ دووکۆمەڵ دابەشبونە! کۆمەڵ ئەمەوی وکۆمەڵی هاشمیی و، وێنە کردنی خەیاڵی و هەڵهێنجانێکی ڕەتکراوەو بێ ڕێگەیە و سەرچاوەگرتووی ئەو کەش و ژینگەیە نیە کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تیایدا ژیاون کاتێك موهاجیریەك لەگەڵ ئەنصاریەکدا دژ بەبراو باوك و ئامۆزاو نەوەی عەشیرەتەکەی وەستاوەتەوە، سەرچاوەگرتووی تێڕوانینی ئەو هاوەڵانە نیە، کە بە هەموو شتەکانی دونیا قوربانیان داوە لە پێناو ئەوەی ئاینەکەیان بۆ سەلامەت بێ و، تێگەیشتنی ڕاستی ئەو هەڵبژاردەیەی موژدە پێدراوانی بەهەشت نیە، ئەو ڕوداوانەش زۆرن کە لەبارەی ئەو هاوەڵانەوە هاتووە کە: ئەوان زۆر لەوە گەورەتر بوونە، کە لەو گۆشە بەر تەسکەوە بڕۆنە سەر چارەسەرکردنی کاروبارەکانیان، ئەو دۆزەش دۆزێکی بنەماڵەیی یان عەشایەری نیە، ئەوان بەهۆی شوێنیانەوە لەئیسلامدا ئەهلی شوران.[1]

* ووتە گەلێك بەدرۆو بوختانەوە خراوەتە پاڵ باوکی حسن (رضي الله عنه):

إبن کثیر ئەڵێ: ئەوەی کەزۆرێك لە مێژوو نوسانی وەکو (إبن جریرد) کەسانی ترەوە باسی دەکرێن نازانن: کە علی(رضي الله عنه) بە عبدالرحمن کوڕی عوف(رضي الله عنه) وتوویەتی: فێڵت لێکردم، کۆکردن بەخەلیفە لە بەرئەوەی ژن و ژنخوازتن و هەموو ڕۆژێك لەکاروباریدا ڕاوێژت پێ بکات و بە عبدالرحمن ووتووە: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾[الفتح: ١٠]، تا زۆرێك لەو هەواڵە دژانەی کە پێچەوانەی لە (صحاح) داهاتووە بە سەر خاوەن و گوازەرەوەیدا ڕەتکراوەیە، خواش ئەزانێ، ئەوەی لە هاوەڵاندا بووە پێچەوانەی ئەوەیە، زۆرێك شیعەو ئەو گێلە چیرۆك نوسانە گومانی دەکەن، کە هەواڵی ڕاست و درۆ و لاواز و بەهێز لەیەك جیا ناکەنەوە، خوای گەورەش بۆ دۆزینەوەی ڕاست ڕێنیشاندەرە.[2]

---

١ ـ الخلفاء الراشدون، أمين القضاة، لا ٧٨، ٧٩.

٢ ـ البداية والنهاية (١٥٢/٧).

هەندێ لەوانە گرنگانەش کە لە خوێندنەوەم بۆ قۆناغی ژیاننامــەی پێغەمبەرایــەتی و خیلافەی ڕاشیدیدا سوودم وەرگرتوە، ئەوەیە لەپاڵ ئـەو ڕیوایەتـە صـحیحانەی حەقیقـەتی وێنەی پڕشنگداری هاوەڵان دەردەخات لە ئـاین و پـوختی و خۆشەویـستیان بـۆ یـەکتر و وێنەیـەکی تـری دژ هەیـە کـە دوژمنـانی ئیـسلام ئـەو درۆزنانـە سـوور بوونـە لەسـەر بلاوکردنەوەی لەدژی ئیـسلام و ڕقایـەتی کـردن و ڕۆژهـەلاتناس و کلـك و گوێکانـشیان برەویان پێداوە و زۆرێکیش لە نەزانیدا تێوە گلاون و ئـەوەش بەسروشـتی حـاڵ بەشـداری لاوازخستنی ئوممەت و لەدەستدانی پشت بەستنە بەسەلەفی سـالحیش لەلایـەن نـەوەکانی داهاتوو، بریە پێویستی سەرشانی لێکۆلەرە شەرەف مەندەکانی ئەم ئوممەتە ئەو پڕوپوچـی یە دەربخەن و ورياييش لەو کتێبانە بدەن کەبرەوی پێ ئەدرێت و بلاو دەکرێتەوە و ڕیوایەتە سەحیەکانیش ڕوونبکرێنەوە و، برەوی ئەو کتێبانەش بدرێت کە ڕاستەقینەییەکان دەخەنـە ڕوو لەبەر بەرگریکردن لە هاوەڵە بەڕێزەکان و لەبەر ڕوزامەندی خوای گەورە.

**٣ـ هەلوێستی باوکی حەسەنی کوڕی علی و هاوەلانی لە فیتنەی کوژرانی عثماندا(رضي الله عنه):**

لێردا چەند هۆکارێکی هەمەچەشن و تیکەلاوهـەن کـە بەشـداری بـوون لـە کـوژرانی عثماندا (رەزای خوای لێ بێت) وەك خۆشگوزانی و کارێگەری لـە کۆمەلگـە و سروشـتی گۆڕانی کۆمەلاتی و هاتنی عثمـان لە دوای عمر(رضي الله عنه) و دەرچوونی گەورەها هاوەلانی لـە مەدینە و دەمارگێری نەزانی و جاهیلی و پیلانگێڕی کینە لە دڵان و پلانسازی بە هێز بـۆ ئاماژە دان بە هەنگاو نان دژ بە عثمان و بەکارهێنانی ئامرازی وا، کە خـەڵك بـشلەژێنی و کاریگەری سلبیانە لە ڕووداوەکانی فیتەکەدا. منیش بە دوورودرێژی باسـی و شـیکاری ئەو هۆکارانـەم لـە کتیبەکەمـدا کـردووە (تیـسیر الکـریم المنـای فـی عثمـان بـن عفـان) شخصیته وعصره.

لە ڕاستیدا دوژمنانی عثمان لە فیتنەی کوژرانی عثمانـدا ئامراز و هۆکاری وایـان بـە کارهێنا کە خەڵکیان هەژاند و شلەژاند. بە بلاوکردنەی ناڕاستی و درۆ بە جۆری ئەو پـرۆ پاگەندەو درۆیانەی زۆر دووبارە دەکرانەوە و لەبەردەم خەڵکەندا دەکردەوە هاندان و مـشت و مڕو دا نوستان لەگەڵ خەلیفەدا و لەپێش خەڵکدا دەدا ساختەی کاریـان لـە نووسـیندا

دەكردو دەيانبەست بە دەم هاوەڵانەوە (ﷺ) وەك عائيشە و علي و تەلحەی و زوبەير. بانگەشەی ئەوەیان دەكرد، كە علي كوڕی ئەبو تالب (ﷺ) شياوە ترە بە خيلافەت و ئەو وەسيەت پێ كراو لە دوای پيغەمبەری خوا(ﷺ), هەروەها لە هەريەك لە بەسرەو كوفەو و ميسر دا كۆمەڵيان ڕێكدەخست، لە هەر شارێك لەوانەدا چوار دەستەيان پێكدەهێنا. ئەمەش بەڵگەيە لەسەر پیلانگێڕی پێشتر. واشيان خستە ئەنديشەی خەڵكەوەكە تەنها بەبانگەوازی هاوەڵان هاتون و ڕووداوەكانيان دەبردەسەر ئەو باركە گەيشتە كوشتن،[1] لە پاڵ ئەو هۆكارانەدا كۆمەڵی دروشميان بەكاردەهێنا، لەوانە وتنی (الله أكبر)و دەيانوت كە ئەو جيهادەيان دژ بە ستەمكارانە، بانگەشەيەكی تريش ئەوە بوو، كە ئەوان تەنها فرمان بە چاكە و ڕيگری بە خراپە دەكەن، يان ئەوان داوای گۆڕين و لابردن واليەكان دەكەن، پاشان داواكاريەكە گەشەی سەند بۆ لابردنی عثمان. تا ئەوەی وێرايان و كەوتنە داوا. وە هەنگاويان بۆ كوشتنی خەليفە. بە تايبەتی كاتێ هەواڵيان پێگەيشت كە خەڵكی ناوەچەكان دێن بۆ سەرخستنی خەليفە. ئەوە ورە و گوڕ و تينی زياد كردن، تا پەتەكەكە لە ملی خەليفە توند تر بكەن و بە هەر هۆكارێك بێت بيكوژن[2]. ڕێكخستنی سەبەئی بەرسەركردايەتی عبدالله كوڕی سەبەئی جولەكە لە پشت ئەو ڕووداوانەوەو ڕووداوەكانی دوای ئەويش بوو، وەك ڕووداوی جەمەل و صفين و...هتد. لە كتێبەكەشمدا(عثمان بن عفان) و كتێبی (أسمى المطالب في سيرة علي أبي طالب) (ڕەزای خوای لە هەردووكيان) باسی ڕاستی عبدالله كوڕی سەبەئی كردووە، جا هەركەس زانياری زياتر دەوێت بابگەڕێتەوە بۆ ئەو دوو كتێبە، لە كتێبەكەمدا (عثمان بن عفان) ئەو گومانانەم خستۆتە ڕوو كە لكێنراوە بە ژيانی عثمانەوە (ﷺ) و درۆو ناڕاستی و پووچەڵی ئەو گومانانەم بەبەڵگە پتەو و يەكلاكەرەوە ڕوونكردۆتەوە، جا لە ڕاستيدا عثمان (ﷺ) ئەو خەليفەی ستەم لێكراوە يە، كە نەيارە يەكەمەكانی درۆيان بۆ هەڵبەستووە ئەوانی دواتربێت لە ڕوويدا ئينسافيان بەكار نەهێناوە.

---

١ ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، لا (٤٠١).

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا (٤٠٢).

## هەلوێستی علی (رضي الله عنه) لە سەرەتای فیتنەکەدا:

علی (رضي الله عنه) لەو ڕیگەیدا کە بە لێنی بە خەلیفەکان دأبوو کە گوێڕایەلی و گویگری و ڕاوێژکاری و ئامۆژگاری بوو. ئەوی خۆی ماوە گوێڕایەڵی بۆ خەلیفەی عثمان و پابەند بوون بوو بە فرمانی ئەو ئەگەریش سەخت بێ دەخاتە ڕوو و دەڵێت: ئەگەر عثمان بەسەر سەرماو سۆڵەدا. ڕێم پێ بکەن ئەوا گوێگرو گوێڕایەڵی دەبم[١]. کاتێ هەڵگەڕاوەکان لەپێش کوژرانی عثمانی بەنزیکەی مانگ و نیوێك پێشتر لە (ذي المروة)دابەزین. عثمان علی و پیاوێکی تری بۆ ناردن کە گێرانەوەکان ناوی ئەو پیاوەیان نەهێناوە. علی (رضي الله عنه) پییان گەیشت و پێ ووتن: کتێبی خوا دەدەن بە دەستەوەو لەسەر هەموو تووڕەیی لاساریەکانتان سەرکۆنە دەکرێن. ئەوانیش بەڕازیبوون.[٢] لە گێڕانەوەیەکدا هاتووەکە جارێ دووجار بەگژ یەکدا چوونە، دواتر ئەوان ووتویانە: ئامۆزای پێغەمبەری خوانێردراوی ئەمیری ئیمانداران کتێبی خۆتان بۆدەخاتە ڕوو ئەوکات ڕازی بوون[٣] لەسەر پێنج بنەما ڕێککەوتن: ئەوەی دوورخراوەتەوە بگێڕێتەوە، ئەوەی بێبەشکراوە پشکی بەرکەوێ و غەنیمەش بێتە دەست و لەدابەشکردن داد پەروەری بەکاربێت و کەسی ئەمانەت پارێزو بەهێزکار بێت ئەمەیش بەنوسین نوسی، تا إبن عامر بگەڕێنرێتەوە بۆ بەسرە ئەبو موسا لە کوفە بمێنێتەوە[٤]، بەو جۆرە عثمان(رضي الله عنه)لەگەڵ هەرفەرموودەیەك لەسەر سنور ڕێکەوتن دواتر وەفدەکان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان[٥]، پاش ئەو ڕێکەوتنە گەڕانەوەی هەمووخەڵکی ناوچەکان بەڕەزامەندیەوە. بۆ ئاژاوە هەڵگیرسێنەرەوان ڕوون بووە کە پیلانەکەیان سەری نەگرت و ئامانجە ڕیسواکانیان نەهاتنەدی. بۆیە پیلانیکی تریان دانا کە فیتنەکەی بە هێز دەکردو زیندووی دەکردەوە پلانی وێرانکردنی ڕێکەوتنی نێوان خەڵکی ناوچەکان و عثمان(رضي الله عنه)دەگرتە خۆی ئەمیش بەم جۆرە دەرکەوت: لەکاتی

---

١ ـ مصنف إبن أبي شيبة (١٥/ ٢٢٥) سنده صحيح.

٢ ـ تأريخ دمشق ترجمة عثمان، لا(٣٢٨)، تأريخ خليفة، لا(١٦٩)

٣ ـ فتنة مقتل عثمان (١٢٩/١).

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

٥ ـ هەمان سەرچاوە.

گەڕانەوەی خەڵکی مصردا. بینیان سوارێ لەڕێگەیاندا وەستاوە لێکیان جودا دەکاتەوە وەك ئەوەی بلێ بمگرن. ئەوانیش گرتیان پێیان وت چیە؟ ووتی: من نێردراوی ئەمیری ئیماندارانم بۆ کار بەدەستەکەی ئەوانیش نامەکەیان کردەوە، دیتیان فەرمان بەوەدەکات کەلەخاچیان بدات یان بیانکوژێت یان دەست و پێیان ببڕێت، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ مەدینە تاگەیشتنە مەدینە، [1] عثمان(رضي الله عنه)بەپەرچی ئەوەی دایەوە کە ئەوەنوسینی ئەو بێت و پێ ووتن: یەکێ لەو دووشتە چارەیە: یان دووکەس لە موسڵمانان بکەنە پێوەر بیان هێنن، یان سوێند بەخوایەك کە هیچ خوایەکی تر جگە لەو نیە کەمن ئەم نامەم نەنوسیوەو ئاگام لێ نەبووە، هەندێ جار نووسەر لەسەرزمانی کەسێ شتی دەنوسێ مۆریشی بۆ دەتاشی. ئەوان باوەڕییان پێ نەکرد، [2] کەچی ئەو بەرامبەردەرونیان ڕاستگۆوو چاکە خواز بوو. ئەو نوسینەی کە ئەو هەڵگەڕاوە یاخیە لادەرەکان بانگەشەیان دەکرد، کە هی عثمانەو مۆری ئەوە یەکی لەکارمەندەکانی بەسواری وولاخی هەڵگرتتوە بۆ کاربەدەستەکە لەمصر کە إبن ئەبو سەرحە لە مصر فەرمان دەکات بەکوشتنی ئەو دەرچوانە، ئەو کتێبێکی سەختەکاری درۆزنانەیە لەسەر زاری عثمان هەڵبەستراوە، ئەمەش چەند بەڵگەیەکن، [3] چۆن عیراقیەکان بەبارەکەیان زانیو چوون بەرەو وولاتیان لەمصریەکان جیا بوونەوە، ئەو میسریانەی تا ئاستێکی فراوان دەستیان گرتبوو بەکتابە بانگەشە بۆکراوەکەیانەوە. جا عیراقیەکان لەڕۆژهەلات و میسریەکان لەڕۆرژئاوا. وەك ئەوەی بەڵێنێکی دیاری کراویان هەبێت؟ کەس ئەم بەرێزانە دانانێت مەگەر ئەوانەی کتابەکەیان ساختەکردوە و سوارێکی تریان بکرێ گرتووە و چووە بۆلای عیراقیەکان تا هەولایان پێ بدات مسیرەیەکان نامەیەکیان دۆزیتەوە، کە عثمان(رضي الله عنه) ناردویەتی تیدا فەرمانی کردووە تا لادەرە میسریەکان بکوژن ئەمەیش ئەوشتیە کە علی کوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه) بەبەڵگەی دێنێتەوە دەڵێت: ئەی خەڵکی کوفە، ئەی خەڵکی بەسرە، ئێوە چۆن زانیتان خەڵکی مصر توشی ئەوە بوون لەکاتێکدا چەندین ڕێتان بڕیوە دواتر بەرەو ئێمە بارگەو بنەتان

---

١ ـ تأريخ الطبري(٥/٣٧٩).

٢ ـ فتنة مقتل عثمان (٥/ ١٣٢)، البداية والنهاية(٧/١٩١).

٣ ـ سيرة عثمان بن عفان، للصلابي(٤١٠).

پێچایەوە[1]، بەڵکو علی (رضي الله عنه)سور بوو لەسەر ئەوەی سوێند بخوا ئەوە پیلانێکەو بۆ مەدینە داڕێژراوە ئەو نامە ڕەشتاڵەیە یەکەم نامەنیە کە ئەو تاوانبارانە ساختەی بکەن، بەڵکو ئەوان نامەیان لەسەر زمانی دایکی ئیماندران و علی و طلحە و زوبیر ساختە کرد عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) تۆمەتباردەکرێ بەوەی نامەی بۆ خەڵك نوسیوە و فەرمانی پێ کردوون لەدەسەڵاتی عثمان دەربچن، ئەویش بەرپەرچی دایەوەو دەیووت: نا سوێند بەوکەسەی ئیمانداران باوەڕیان پێ هێناوە، بێ باوەڕان بڕوایان پێ نەهێناوە قەڵەمم نەخستۆتە سەر لاپەرە، تا هاتومەتە ئەم شوێنە[2]، ئەعمەش بەدوییدا دەڵێت: ئەوان پێیان وابوو لەسەر زمانی عائیشە نوسراوە[3] هەردوو وەفد علی(رضي الله عنه) بەوە تۆمەتبار دەکەن کە نامەی بۆ نوسیوون تا بێن بۆ لای بۆ مەدینە ئەویش بەرپەرچی ئەوەی دایەو سوێندی دەخوارد سوێند بەخوا هیچ نامەیەکم بۆ نەنوسیوون[4]، هەروەك نامە درایە پاڵ هاوەڵان و دەنیردرایە بۆ خەڵکی ناوچەکان و فەرمانی پێدەکردن تا بێن بۆلای بۆ ئەوێ، چونکە ئاینی محمد خراپ و گەندەڵ بووە پشتگوێ خراوەو جیهاد لە مەدینە دا خێری لەسەنگەر گیری سنوورە دوورەکان زیاترە.[5] إبن كثير قسە لەسەر ئەو هەواڵە دەکات و دەڵێت: ئەمە درۆیە بەدەم هاوەڵانەوە کۆمەڵێك قسەی ساختەیان بۆ داتاشراوە، لە لایەن علی طلحة و زوبیرەوە(رضي الله عنهم) چەند نوسینێکی ساختە بەناوی ئەوانەوە نێردراوە بۆ خەواریج ـ بکوژانی عثمان(رضي الله عنه) ـ ئەوان خۆیان بەرپەرچی نامەکەیان دەدایەوە، هەروەها ئەو نامەیەش بەدەم عثمانەوە ساختە کراوە، چونکە ئەو نەفەرمانی پێکردووە و نەپێی زانیوە.[6] ئەوەی طبری (خليفة بن خياط)لە بارەی بەر پەرچدانەوەی گەورە هاوەڵانی علی و عائیشەو زوبیرەوە دژ بەو نوسینانە دەیگێڕنەوە بەڕاسترین گێڕانەوە جەخت لەسەر قسەی (إبن كثير)دەکەنەوە.[7]

---

١ ـ تاريخ طبري (٥/٣٥٩).

٢ ـ تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٤).

٣ ـ تأريخ الخليفة إبن خياط، لا ١٦٩.

٤ ـ تحقيق مواقف الصحابة(١/ ٣٣٥)، البداية النهاية (٧/١٩١).

٥ ـ تحقيق مواقف الصحابة(١/ ٣٣٥)، البداية النهاية (١/١٧٥).

٦ ـ البداية النهاية (١/١٧٥).

٧ ـ تحقيق مواقف الصحابة(١/ ٣٣٥).

ئەودەستە تاوانبارانەی نامەی درۆزنەکانیان لەسەر زمانی ئەو هاوەڵانە ساختە کرد، هەر ئەوانە بووە کە لەسەرەتاو کۆتاوە ئاگری ئاژاوەکانیان هەڵگیرساند و ئەو گەندەڵی خراپەدیارە یان بەدوا داهات وکەوتنە ساختەو نرخ و ڕەواج پێدانی ئەو پڕو پوچی و ناڕاستیانە بەدەم عثمانەوە بەردەوام ئەوکارەیان دەکردوو بەخەڵکیان دەوت تا وەریان گرت، پاشان لەسەر زمانی عثمانی ئەو نامەیان ساختە کردوو تا عثمان بەشەهیدی و بەختەوەری بوە قوربانی ڕێگای پەروەردگاری، عثمانی شەهید لەو پیلانە سەبەئیە جولەکانەدا بەتەنها قوربانی نەبوو، بەڵکو پێش ئەو خودی ئیسلام قوربانی بوو پاشان مێژوی شێواوی ئەو جیلە ئیسلامیانەی بەشێواوی پێشکەش دەکران ئەمیش کارێك بوو کە پیسی جوولەکەو یاریدەدەرەکانی چاو چنۆك و ئارەزوو پەرست و قین لەدڵەکان بەرپایان دەکرد، بەڵام ئیستا پێویستە موسڵمانان مێژووە ڕاستیەکە و ژیانی گەورە پیاوانیان بزانن؟ بەڵکو ئایا کاتی ئەوەنەهاتووە ئەو کەسەی لە مسوڵمانان لەم سەردەمە دا دەنووسێ لەخوانترسێ و لەسەروبنکردنی کەسانی بەدوور لەتاوان و نەترسێ پێش ئەوەی یەکلاو ڕوون بێتەوە هەتا ئەویش وەك کەسانی تر شکست نەخوات و تینە کەوێت.[1]

* هەڵویستی حەسەنی کوڕی علی و باوکی لەکاتی گەمارۆدانەکەدا:

گەمارۆ دانی عثمان(ﷺ) هێندە توند کرایەوە کە ڕێگریێ لێکرا ئامادەی نوێژی مزگەوت بێت ئەویش وەك: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردبوو، لەسەر ئەو ناخۆشی و ناڕەحەتیەی توشی ببوو، خۆڕاگر بوو لەگەڵ ئەوەی باوەڕی پتەوی بە قەزاو قەدەر هەبوو، هەوڵی دەدا چارەسەرێك بۆیە ئەو چەرمەسەریە بدۆزێتەوە دەبینی ماوەیەك ووتاری حەڕامی خوێنی مسوڵمانی بۆ باس دەکردن، کە دورست نیە بەبێ مافی خۆی خوێنی مسوڵمان بڕێژێت، جارێکیش لەناو خەڵکدا قسەی دەکرد باسی فەزڵ و خزمەت گوزاریە گەورەکانی خۆی لە ئیسلامدا دەکرد و شایەتی بە کەسەکانی تری موژدە پێدراوەکان دەدات(رضی الله عنهم).[2] کەسێك ئەوە زانست و گەورەیی بێت ئایا دەکرێت چاو ببڕێتە

---

١ ـ عثمان بن عفان الخليفة الشاكر الصابر، لا (٢٢٨ ـ ٢٢٩).

٢ ـ خلافة علي بن أبي طالب، عبد الحميد علي لا٨٥.

دونیاو فەزاڵی بدات بەسەر ڕۆژی دوایی؟ ئایا عەقڵ قەبوڵی ئەوە دەکا ئەو کەسە خیانەت لە ئەمانەتو ماڵ و سامان و خوێن بەفیڕۆ ببات؟ لەکاتێکدا دەرئەنجامەکانی ئەوە لای خوای گەورە دەزانێت ئەو لەبەر چاوی پێغەمبەر (ﷺ)دا پەروەردەبووە و پێغەمبەر شایەتی بۆ داوەو ڕایهێناوە. بەهەمان شێوە گەورە هاوەڵانیش شاهیدیان بۆ داوە، لەدوای ئەوەی حەفتا ساڵی تێپەڕندووە ونزیکی هەشتا ساڵی بوەتەوە، ئایا ئەوە هەڵسوکەوتی دەبێت؟ دەستڕۆیی هەڵگەڕاوەکان بەسەرمەدینەدا تەواو زیادی کرد تا ئەوەی زۆربەی کات شەوان نوێژیان بۆ خەڵك دەکرد[1]، ئەوکات هاوەڵان زانیان کە باسو خواسە بەو جۆرە نیە، کە ئەوان بیریان لێکردبۆوە و ترسی ئەوەیان هەبێ شتێ ڕووبدات کە هەرگیز لەیاد نەچێت. ئەوان هەواڵیان پێگەیشت کە ئەوانە دەیانەوێت عثمان بکوژن. بۆیە داوایان لە عثمان کرد تابەرگری لێبکەن و پشێوی ژاوەژاو لەمەدینەدا ببەنەدەرەوە، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو بەهۆی ئەوەوە خوێن بڕژرێت.[2] گەورە هاوەڵان بەبێ ڕاوێژ پێ کردنی عثمان(رضي الله عنه) منداڵەکانی خۆیان نارد. لەوانیش حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) عبدالله کوڕی زوبیر بوون. عثمان حەسەنی خۆشدەویست و ڕێزی لێ دەگرت. جاکاتێ فیتنەکە ڕویداو گەمارۆی عثمان (رضي الله عنه) درا سوێندی حەسەنی دا تا بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی ئەویش لەترسی ئەوەی حسن توشی ناخۆشی و ناڕەحەتیەك نەبێ.[3] عثمان بەحەسەنی ووت: برازای ئازیزم بگەڕێوە هەتا فەرمانی خوا دێتە جێ.[4] گێڕانەوە گەلێکی دروست هەرکە حسن لەو ڕۆژەدا لەماڵەوە بریندار بووە،[5] هەروەك جگە لەحەسەنیش عبدالله کوڕی زوبیرو محمدی کوڕی حاطب و مەڕوانی کوڕی حەکەمیش برینداربوون هەروەك حوسەینی کوڕی علی و إبن و عمریشیان لەگەڵدا بوو،[6] علی لەهەمووان زیاتر پاڵپشتی لە عثمان دەکات بۆ

---

١ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٥١٥).

٢ ـ فتنة مقتل عثمان(١/١٦٧)" المسند(١/٣٩٦).أحمد شاكر.

٣ ـ تأريخ المدينة لإبن الشيبة (٤/١٢٠٨).

٤ ـ الرياض النظرة، وةرطيراوة لة الحسن بن علي ودروه السياسي، لا ٤٦.

٥ ـ الطبقات لإبن سعد (٨/٢٢٨)، سنده صحيح.

٦ ـ تأريخ خليفة، لا(١٧٤).

ئەمەش مەڕوانی کوڕی حەکەم شایەتی بۆ دەدات.[1] هـەروەك (إبـن عـساكر) لـەجابری کوڕی عبدالله وە(ﷺ) ڕیوایەتیکردوە، کە علی بۆ عثمانی ناردوو ووتی: من پێـنج سـەد زری پۆشم لەگەڵدایە، دەی ڕێگام پێ بدە تا ڕێگری ئەو هەڵگەڕاوانەت لێ بکـەم، چـونکە تۆ شتێکت نەکردووە کە خوێنـت حـەڵاڵ بکـات عثمـانیش ووتـی: پاداشـتت خێـر بێـت حەزناکەم بەهۆی منەوە خوێن بڕژێ.[2] چەندین ڕیوایەتیش هاتووە کە بەڵگـەی وەسـتانی علی لەگەڵ عثماندا لەکاتی گەمارۆ دانەکـە نیـشاندەدەن لەوانـە ڕاپـەڕیوانی ئاویـان لـە عثمـان قەدەغەکرد تا ئەوەی خەریك بوو خێزانەکـەی لـە توێنیەتیـدا بمرێـت، علـی سـێ دەفەری پڕ لە ئاوی بۆ ناردن خەرێك بوو پێ دەگەیشت بەو هۆیەشـەوە چـەند مەوالیـەکی بەنی هاشم و بەنی ئومەییە بریندار بوون هەتا ئاوەکە گەیشت[3]، ڕووداوەکان بەپەلە بوون پشێویەکە تەنگی بە عثمان هەڵچنی عثمانیان شەهید کرد، هەواڵەکە گەیـشتە هـاوەڵان، هاوەڵان ئەوکات زۆربەیان لە مزگەوتدا بوون تەواو باریان تێکچوو، علی بەکوڕەکانی خۆی و برازاکەی خۆی ووت: چـۆن عثمـان شـەهید کـراوە ئێـوە لەبـەردەرگا بـوون، زلەیـەکی لەحـسندا ئەمـە لەکاتێکـدا بـوو حەسـەنیش برینـدار بـوو.[4] دای بەسـەر سـینگی حوسەینیشداو قسەی بە إبن و زوبیرو طلحـە ووت و بە تـوڕەیی چـووەوە بۆمـاڵی خـۆی و دەیووت: هەمیشە قوڕبەسەر دەست شکاو بن خوایە من لە خوێنی عثمان بەدەر بـووم نـە بەژداربووم نەڕازی بەکوشتنی نەبووم.[5] ئەوە هەڵوێستی علی بـوو، ئامۆژگـاری و شـورا گویگرتن و گوێڕایەڵی و لەکاتی فێتنەکەیشدا بە توندی و بەهێزی وەستان لەگەڵیـدا و لـە هەموان زیاتر بەرگری لێ دەکرد و هەرگیز بە خراپە باسی نەکردووە. هـەوڵی چاکـسازی و ڕیگری کرد، کە لە نیوان خەلیفە و لە قسە دەرچـوانی خەلیفـەی داوە، بـەڵام بارەکـە لـە سەروو تواناو لە دەرەوەی ویستی ئەودا بوو. ئەوەیش خواستی خوای گەورە بوو تا ئەمیری

---

١ ـ تأريخ الإسلام الذهبي(٤٦٠ ـ ٤٦١)، إسناده القوي.

٢ ـ تاريخ دمشق، لا ٤٠٣.

٣ ـ أنساب الأشراف، البلاذري (٧٦/٥).

٤ ـ إبن أبي عاصم الآحاد والثماني(١٢٥/١) وەرگیراوە لە خیلافەتی علی، (٨٧).

٥ ـ مصنف إبن أبي شيبة (٢٠٩/١٥) إسناده صحيح.

ڕسواکانی هۆزە باشقەڵەکان بون. [1] هەڵویستی ئەوانەیش لە کاتێ گـەمارۆ دانەکـەدا بـۆ کوشتنی خەلیفە عثمـان بە ستەم و دوژمنکاری شایەتی ئەو وەسـفاننە دەدات، جـا چۆن دەبێ نان و ئاوی لێ قەدەغە بکرێت لە کاتێکدا ئەو لە پارەی خۆی بە خۆڕایی سەرچاوەی ئاوەی بۆ موسڵمانان دەکڕی. [2] کاتێ خەڵکی تووشی برسێتی یان ناڕەحەتیەك دەبوون. بـە ماڵ وسامان زۆر بەشداری دەکرد، کاتێ خەڵکی تووشی بەر تەنگی یان سەختیەك دەبـوون ئەو هەمیشە دەیبەخشی. [3] هەتا علی (ﷺ)، کە خەیاری گەمارۆدەران بوو وەسفی ئـەو حاڵەدەکات و دەڵێت: خەڵکینە ئەوەی ئیوە دەیکەن نە لە کاری موسڵمانان و نەلـە کـاری بێ باوەبران ناچێت. دەی نان و ئاو لەو بیاوە قەدەغە مەکەن، چونکە ڕۆم و فارس بە دیـل دەگرن و نان و ئاو دەدەنە دیلەکان. [4] لە ڕاستیدا ڕوداوەکانی مێژوو جـەخت لەسـەر ئـەە دەکەنەوە، کە هاوەڵان دوور بونە لە هاندانی نەیارانی عثمان یان بەشـدار یکردنیـان لـە و ئاشوبە دژبە عثمان. [5] ئەوەشی زیاتر بزانی با بگەڕێتـەوە بـۆ کتێبەکـەم بـەناوی(تیسرا الکریم المنان في سیرة عثمان بن عفان). [6]

## چوارەم: حەسەنی کوڕی علی لەسەردەمی باوکیدا(ﷺ)

لەڕێگەی دەستنیشانکردنەوە بەیعـەتی خیلافـەت بـەعلی(ﷺ) درا ئەمـەش لـەدوای ئـەوەی خەلیفـەی راشـیدین عثمـانی کـوڕی عفـان (ﷺ) لـە سەردەسـتی خەواریجـەکان شەهیدکرا، جا لـەدوای ئـەوەی بەسـتەمەو درۆ ودوژمنایـەتی لـەڕۆژی هـەینی ١٨ی ذی الحجةی ساڵی ٣٥ی کۆچی شەهید کـرا(ﷺ). [7] چـی هـاوەڵی پێغەمبـەر(ﷺ)، کـە لـە مەدینە دا مابوونەوە بەیعەتی خیلافەتیان بـەعلی دا (ﷺ)، چـونکە کەسـێ نـەبوو لـەو کاتەدا کە هیچ جۆرێ لەو خـاوەنی فـەزڵ و گـەورەتر بێـت لـەدوای عثمـان (ﷺ) کـەس

---

١ ـ تحقیق مواقف الصحابة (١/ ٤٨٢): شذرات الذهب (١/ ٤٠).

٢ ـ الصلابي: سیرة عثمان، لا(٤٥٠).

٣ ـ التمهید و البیان، لا(٤٢٤).

٤ ـ تأریخ الطبري(٥/٤٠٠).

٥ ـ تحقیق مواقف الصحابة (١٨/٢).

٦ ـ سیرة عثمان بن عفان للصلابی، لا(٤٥١ بۆ ٤٦٦).

٧ ـ الطبقات إبن سعد (٣١/٣).

بانگەشەی پێشەوایەتی بۆ خۆی نەکرد، ئەگـەر بهاتبـاو (أبـو الـسبطين) (ﷺ) لەسـەری سوور نەبوایە، واتە(عـەلیش (ﷺ)لەسەری سورنەبوو) بۆیە لەدوای تکـاو داوایـەکی زۆری ئەو هاوەڵانەی کە لە مەدینەدا مابوونەوە و لەترسی زیاد بوون و بڵاوبوونـەوەی فیتنـەکان ئینجا قەبوڵی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا دەستی ڕەخنەی هەندێ نەزان ڕزگاری نەبوو، ئـەمیش لەئەنجامی ئەو ئاژاوانەدا وەك ڕوداوی (جمل) و(صفين) ئاگرەکەی کردەوە وکینەی لـەدڵانی ئیسلامەتی وەك ئیبن سبەء و شوین کەوتوانی، کە لە دوایەوە هاتن هەڵیانگیرساند و لـەر فاسقی خۆیان ولەبەر ئەوەی دڵیان ڕەنگـی دژ بەحـەق و ڕێنمـوێنی گرتبـوو، هەنـدێ لـە ئـەهلی زانـست چـۆنیەتی هەڵبـژاردنی علـی(ﷺ) بـۆ خیلافـەت گێراوەتـەوە.[1] لـە کتێبەکەمدا: (أسمى الطالب فی سيرة أمير المؤمين علـى بـن طالـب (ﷺ)) بەدرێـژی ئـەو ڕیوایەتانەم هێناوە یەکدەنگی ئەهلی سونە و جەماعەت لەسەر ئەوەیە، کـە علـی (ﷺ) لەدوای عثمان (ﷺ) بۆ خیلافەت دەستنیشانکراوە تا موهاجیران و ئەنـصارانی بەیعـەتی پێدەن، چونکە دەیانبینی کەفەزڵی بەسەر هاوەڵەکانی تـردا هـەبوو و لـەپێش هـەموویان موسڵمان بووە لەهەمویان زانستی زیاترە لەڕوی ڕەگەزەوە لەهەموویان لەپێغەمبـەر(ﷺ) نزیکترە لە دەروندا لە هەمویان دلێرترە لـەلای خـواو پێغەمبـەری خـوا خۆشەویـسترە و، پایەو فەزڵی پێشینەی لە هەمویان زیاترە، پلەی بەرزترە، پاییەی گەوترەو باڵاترە لـە ڕوی ڕوخساری ڕەمزیشەوە لە هەموویان زیاتر لەپێغەمبـەر(ﷺ) کـە لەمەدینـەدا مابوونـەوە بەیعەتی خیلافەتیان بە یەك دەنگی پێدا، ئەوکات ئەو پێشەوای حەق بوو لەسەر خەڵك بو و گوێرایەڵی بن، لێدەرچون ولادانی حەرامبوو زۆرێ لە ئەهلی زانست وتەی یەك دەنگیـان هەیە لەسەر خیلافەتی علی هێنـاوە لەوانـە: إبـن سـعد[2]، إبـن قدامـە[3]، أبـو حـسن الأشعري [4]، أبو نعيم الأصبهاني [5]، أبو منصوری بغدادی[6]، الزوهـري [1]، عبـد الملـك

---

١ ـ عقيدة أهل السنة فی الصحابة الكرام، لا(٣٦٠/٣٦١)

٢ ـ الطبقات الكبرى (٣١/٣).

٣ ـ منهاج القاصيدين في فصل الخلفاء الراشيدين ل(٧٧ـ ٧٨) وەرگیراوە لە عقيده أهل سونه والجماعه (٢/ ٦٩٨).

٤ ـ الإبانة عن الأصول الديانة، ص(٧٨)، مقالات الإسلامية (٣٤٦/١).

٥ ـ كتاب الإمامة والرد على الرافضة، لا(٣٦٠ ـ ٣٦١).

٦ ـ كتاب أصول الدين لا(٢٨٦ ـ ٢٨٧).

الجوينى [٢]، ئەبو عبدالله کوڕی بطـە[٣]، غزالی [٤]، أبو بکری عربـی [٥]، إبـن تیمیـە[٦]، إبن حجر [٧]، ئەوی لەم نەقلانەی پێشەوە وەردەگیرێ ئەوەیە، کـە خیلافـەتی علـی(رضي الله عنه) بەحەقتر و دروستر لەکاتی خۆی و لـە دوای شـەهیدکردنی عثمـان (رضي الله عنه) بەقـەدەری خـوا لەکات و شوێنی خۆیدا هات.[٨]

## ١ــ دەرچوونی ئەمیری ئیمانداران علی (رضي الله عنه) بۆ کوفە:

هەندێ لە هاوەڵان پاڵپشتی ئـەویان نـەدەکرد، کـە ئـەمیری ئیمانـداران علـی کـوڕی تالیب(رضي الله عنه) لەمەدینە بچێتە دەرەوە، ئەمەیش کاتێ ڕون بوویەوە علی بڕیاریدا بچێت بـۆ شام تا سەردانی خەڵکەکەی بکات و بزانێ ڕای معاویە لەبارەی ئـەو ڕوداوانـەوە چـیە[٩]، علی وای دەبینی کە مەدینە خاوەنی ئەو بنەڕەتیانەیە، کە هەندێ ناوچە لـەو قۆناغـەدا هەیان بووە و دەیووت: پیاو ماڵ و سامان لەعیراق داییە [١٠] کاتێ ئەبو أیوبی ئەنصاری بۆ خواسـتەی زانـی بەخەلیفیـەی ووت: ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران، بـەڵکو لـەم شـارەدا بمێنیتەوە، چونکە ئێرە قەڵغانی پتەو وبەهێزە و شوێنی کۆچی پێغەمبەری خوایـە(صلى الله عليه وسلم) و لەوێ بووە گۆڕو مینبەرەکەی پێغەمبـە(صلى الله عليه وسلم) ومـادەی ئیـسلام لەمەدینەدایـە جائەگـەر عـەرەب لەگـەڵت ڕاوەسـتن بـەو جـۆرەی کـەدەبێت ئەگـەر کەسـانێ چـاویان تێبرێـت بەدوژمنەکانیان لێیان دەدەیت، ئەگـەریش ئـەوکات ناچـار بەڕۆیـشتن بێـت بـڕۆ بیـانوت بەدەستە خەلیفە ئەو ڕاوێژەی دەبـوو أیـوبی وەرگـرت و بڕیارێـدا لەمەدینـە بمێنێتـەوە و

---

١ ـ الإتقاد لا ١٩٣.

٢ ـ الإرشاد إلى القواطع الأدلة في أصول الإعتقاد (٣٦٢ ـ ٣٦٣).

٣ ـ لوامع أنوار البهية للسفاريتي (٢/ ٢٤٦)، عقيدة أهل السنة(٢/ ٦٩٢).

٤ ـ الأقتصاد في الأتقاد،(١٥٤).

٥ ـ العواصيم من القواصيم(١٤٢).

٦ ـ الوصية الكبرى، لا (٢٣).

٧ ـ فتح الباري لا(٧/ ٧٢)؟

٨ ـ عقيدةأهل السنة في الصحابة الكرام(٢/ ٦٩٣).

٩ ـ الثقات لإبن حبان(٢/٢٨٣)، الأنصاري في عصر الراشيدين ١٦١.

١٠ ـ هەمان سەرچاوە.

کاربەدەستەکانی نارد بۆ ناوچەکان[١]، بەڵام هەندێ باری نائاسایی سیاسی هاتنەکایە، کە خەلیفەیان ناچارکرد تا مەدینە بەجێبهێڵێت و بڕیاریدا بچێت بەرەو کوفە، چونکەکوفە لەخەڵکی شام نزیکە[٢]، لەکاتی خۆ ئامادەکردنی بۆ چونە دەرەوە هەواڵی دەرچونی عائیشة وطلحة و زوبەیری بۆ بصرە پێگەیشت، بۆیە داوای لەخەڵکی مەدینە کرد، تا هەموو بێن بانگی کرد تاسەری بخەن ولای هەندێ لەخەڵی مەدینە بێزاری وبار قورسیەك بەهۆی بونی پشێوی نێو سوپای عەلیەو و چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیاندا ڕویدا، زۆربەی خەڵکی مەدینە پێیان وادەبوو هێستا فیتنەکە بەردەوامە بۆیە دەبێ جارێ لەکەنارەوە بڕوانین تا بارو دۆخەکان زیاتر دەربکەون، ئەوان دەیان وت: ناسوێد بەخوا نازانین چی بکەین، چونکە ئێمە ئەم باروو دۆخەمان لا ڕون نیەو دەمینێنەوە تا بارەکەمان لێ ڕوون وڕۆشن دەبێتەوە، طبری ریوایەت دەکات کە علی لەو ئامادە سازییەی کەبۆشامی ئامادەکردبوو لەگەڵ چالاکەکانی کوفە وبەصرە بەشاراوەی بەحەوت سەد کەسەوە چویە دەرێ[٣]، بەڵگەی بار قورسی زۆربەی خەڵکی مەدینەش لەبەدەمەوە چونی بانگەوازی ئەمیری ئیمانداران بۆچونە دەرەوە لەوتارەی خەلیفەدا دەردەکەوێت کەسکاڵای ئەو بارقوسیەی لێکردن.[٤]

## ٢ــ ئامۆژگاری حەسەنی کوڕی علی بۆ باوکی:

ئەمیری باوڕداران لەمەدینە چوویە دەرەوە لەکاتێ گەیشتە (الربذة)[٥]، لەوێ لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون سەنگەری گرت و ژمارەیەك لەموسڵمانان کە دەگەیشتنە دوو سەد کەس هاتن بۆلای[٦]، لە (الربذة) حسن چوو بۆ لای بابی دەگریا و دڵگرانی وکاریگەری خۆی بەو دابەشبوون وجیاوازیەی توشی موسڵمانان بوو نیشاندا، حسن بەباوکی ووت:

---

١ ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ إستشهاد عثمان و وقعة جمل لا(١٨٣).

٣ ـ ـ هەمان سەرچاوە (٤٨١/٥).

٤ ـ الأنصار في العصر الراشدي لا(١٦٣)، الطبقات(٢٧٣/٢).

٥ ـ لەدووری ٢٤٠ کم لە ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینەی منەورە یە.

٦ ـ أنساب الإشراف (٤٥/٢)، خلافة علی بن أبی طالب لا(١٤٣)

فەرمانت پێکردم و لەقسەت لامدا سبەینێ جەنگێکی لەناو چون دەکەیت هەرگیز سەرت ناخات علی(رضي الله عنه) ووتی: من چ فەرمانێکم پێکردویت تۆ لاتداوە، وتی: ئەو ڕۆژەی گەمارۆی عثمان(رضي الله عنه)درا فرمانم پێکردیت لەمەدینە بچیتە دەرەوە ئەگەرکوژرایت بالەمەدینە نەبیت، پاشان لەو ڕۆژی کوژراندا فرمانم پێکردیت تابەیعەت وەرنەگریت هەتا وەفدی خەڵی ناوچەکان و عەرەب و بەیعەتی هەموو مصر بێت، پاشان فرمانم پێکردیت کاتێ ئەو دووپیاوە بەئێوەیان دەکرد تۆ لەماڵی خۆتدا دابنیشیت تا ڕیکدەکەون و پەیوەندیان چاك دەکەن، جا ئەگەر خراپ بوو لەسەر دەستی تۆ نابێت، تۆ لە هەموو ئەمانەدا لەقسەی من لاتدا، ووتی: ئەی کوڕی شیرینم دەی گوێ بگرە ئەگەر لەو کاتی گەمارۆدانی عثمان لەمەدینە بچومایە دەرەوە سوێند بەخوا چۆن گەمارۆی ئەدرا گەمارۆی ئێمەش ئەدرا ئەوەی دەڵێت: بەیعەتت وەرنەگرتبا تا بەیعەتی ناوچەکان بهاتبا مەسەلەکە لەدەست خەڵکی مەدینەد دەبوو ئێمەش حەزمان نەکرد تەشەنە بکات، ئەویش لەکاتێ طلحة و زوبەیر چوونە دەرێ، ئەوە ترسنۆکی دەبوو لەسەر ئەهلی ئیسلام، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی ئەوپەیامەم وەرگرت، ناڕازیبووم و حەزم نەدەکرد کەم و ناساز وهیچ بنەڕەتێکی ئەوە نەبوو، کە شیاوی بێت، ئەوەشی دەڵێت: لەماڵەوە دابنیشتابای دەی بەمن چی ئەوەی وابەتەمایان منی دەوێت؟ ئەتەوێ وەك ئەو کەمتیارەبم کە گەمارۆی دەدرێت و دەڵێت: دباب باب[1]، لێرەدا هیچ نەبێ تا هەمووی تەواو دەبێ ئینجا بچێتە دەرێ، جا ئەگەر من نەڕوانم بزانم چی بکەم ودەبێ چی بێت دەی کێ بڕوانێت ڕۆڵەی شیرینم ئیدی بەسە.

لەم ڕوداوە تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەمیری بڕواداران علی کوڕی خۆی جوان پەروەدەکردووە، چۆن دەرفەتی پێدەدات تا بەبێ فشار چی لە دەرونیدایە بیلێت، پاشان ئەمیری بڕواداران بەرپەرچی ڕەخنەکان دەداتەوە، هەروەك ئارەزوی حەسەنی تازە پێگەیشتو بۆ ئاشتی و دوور کەوتنەوە لە بەکارهێنانی هێز بەدی دەکەین بەهەر ئەنجامێکیش هەبێت، ئەمیری بڕواداران علی(رضي الله عنه) سوربوو ـ حەقیش بووـ کە ئەو

١ ـ ئەوەی کەمتیارەکان یەکتری پێ بانگ دەکەن.

کێشەی لەگەڵ یەکلا بکاتەوە و ڕونەو کەسیش ناتوانێت لـەوبڕیارەی ڕەخنـە بگرێـت ئـەو دەیویست تۆڵەی خوێنی عثمانی کـوڕی عفـان(ﷺ) لـە بکـوژانی بکاتـەوە، دەیویـست چاوەڕوان بێت تا دەرفەتی بۆ بگونجێ وبارەکەی بکەوێتە دەست، ئینجـا بڕوانێتـە بـاس و خواسی شەهید کردنی عثمان، جا کاتێ زوبەیر وطلحـة وئەوانەی لەگەڵیـدا بـوون داوایـان لێکرد تا بکـوژانی عثمـان بکوژێتـەوە، عـوزری ئـەوەی هێنایـەوە کـە بکـوژانی زۆرن و هێزێکی وانین کە گاڵتەیان پێ بکرێت، داوایشی لێکرد خۆیان ڕابگرن هەتا باروو دۆخەکان سەقامگیر دەبن و مەسەلەکان هێور دەبنەوە، ئـەوکات مافـەکان دەسـەنرێنەوە، چـونکە بارودۆخەکان لەگەڵ بەرژەوندیەکاندا نایانکرێت، ئەمیری بڕواداران زۆر جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە لەدو خراپەدا کامیان خراپـەی کەمتـەرە ئـەوە هەڵبـژێر درێـت، ئـەو ووتـی: ئەوەیە ئێمە لەبارەی بڕیاری شەهیدکردنی عثمانەوە- ئێوەی بانگکردەین کـە لـە خراپـەی پاشتر ـــ جەنگ دابەشبوو- ئەمیری بڕواداران وای دەبینـی، کـە بەرژەونـدی وادەخوازێـت تۆڵـە سـەندنەوە دوابخرێـت نـەوەك پـشتگوێ بخرێـت لـەوپێناو ئەمـەدا تۆڵەسـەتدنەوەی دواخست، ئەو چاوەڕێی بوو ئارامیش بیچتەکایەوە ویەکدەنگی دروست بێت وداوای خاوەن خوێنەکان بەرزبکرێتەوە، ئەوکات ئەوەی داوای خوێنەکە دەکات وئەوەی داوای خوێنەکەی لێ دەکرێت ئامادەبکرێن وداواو وەڵام بـە بەڵگـەوە ڕونکردنـەوە دادوەری لـە ئەنجومـەنی حوکمدا ئەنجام بدرێت [1]، لەناو ئومەتدا ناکۆکی لەوەنیە کـە بۆپێـشەوا دروسـتە تۆڵـەی خۆێن دوابخات ئەگەر زانی ئەوە دەبێتە مایەی ئـاژاوەگێڕی وتێکـدادنی یـەك دەنگـی [2] ئەوش کەباسدەکرێت بکوژانی عثمـان لەسوپایی بڕوادان علی(ﷺ)دابو، جاچۆن ئـەو ڕازی دەبێت ئەوکەسانە لەسوپاکەی دابن، جا طحاوی بـەو جـۆرە وەڵامـی ئـەوە دەداتـەوە لـە سـەربازگەی (ﷺ) کەسـانێ لـەو خەواریجانـەی هـەبوون عثمانیـان شـەهید کـرد بەچـاو نەدەناسرانەوە، یان هەبوو هۆزەکەی پشگیری دەکرد یان هـەبوو بەڵگـەی تـەواوی لەسـەر نەبوو، یان کەسانێ جۆرە نیفاقێك لەدڵیاندا بوو نەیانـدەتوانی هـەمووی نیـشان بـدەن [3]،

---

١ ـ تحقيق مواقف الصحابة(٢/ ١٥٦).

٢ ـ أحكام القرآن لإبن العربي (٢/ ١٧١٨).

٣ـ شرح الطحاوية لا(٥٤٦).

هەرجۆرێ بێت هەڵوێستی ئەو لە ڕوی ئەوانەدا ئەوبوو تەنگیان پێهەڵچنێن و لەکارەکەیان دوورەپەرێزبوو ئەوحەزیدەکرد لێیان بێ منەت بێت، بەڵکو تۆڵەیان لێبکاتەوە، ئەگەر ڕێگەیەکی بۆ ئەوکارە بەدیبکرادایە، ئەمیشم بەدورو دێژی لەکتێبەکەمدا(أسمى المطالب في سيرة أميرالمؤ مينين علي بن أبي طالب)باسم کردوە.

## ٣ـ کاریگەری حەسەنی کوڕی علی لە ڕێکخستنی خەڵکی کوفە:

ئەمیری ئیمانداران علی(ﷺ) وەك خەلیفەیەك هەڵسوکەوتی بەدەستەکانی خۆی دەکرد، سوربوون و یەکلایبونی هەبوو کەس نەیدەتوانی بڕیاری پاشگەزی بکاتەوە علی(ﷺ)، لە (الربذة) نوێنەری بۆکوفە نارد داوای لێکردن دەربچن وبێن بۆ سەرخستنی، ئەو دوو نوێنەرەش محمدی کوڕی أبوبکری صديق ومحمدی کوڕی جعفر(ﷺ) بوون، بەڵام ئەو دوانە لەئەرکە کەیاندا سەرکەوتوو نەبوون، چونکە أبو موسى أشعري والی کوفە لەپێش علی گەیشتە خەڵك و، ڕێگری لێکردن کە بچنە دەرێ و لەوفتنیەدا ئەوەی گێڕانەوەی لە پێغەمبەرەوە بیستبێ کەوا خۆیان بپارێزن لەو فیتنەیە[1] لەدوای ئەوە علی (ﷺ) هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی أبی وقاصی نارد، ئەویش لەئەرکەکیدا سەر کەوتو نەبوو، چونکە أبو موسى کاریگەری لەسەرخەڵکەکە هەبوو[2]، ئینجا عبداللەی کوڕی عباسی نارد، بەڵام تەمبەڵیان لەڕوو نواند، دواتر بەدوایدا عماری کوڕی یاسر وحەسنی کوڕی علی نارد و أبو موسى أشعري لابردو لەجیاتیدا (قرظة)ی کوڕی کەعبی دانا[3]، قەعقاعی کوڕی عمرو لە ڕازیکردنی خەڵکی کوفەدا ڕۆڵێکی گەورەی بینی پێی وتن: من وامۆژگاریتان دەکەم ودڵم بۆتان دەسوتێت، حەزدەکەم ڕاست بڕۆن وتێبگەن، قسەیەکیشتان پێ دەڵێم حەقە، ئەو قسیەش ئەوەیە، کە هەردەبێت ئیمارەتێك هەبێت خەڵك ڕێکبخات و، ستەمکاران لاببات و ستەم لێکراو سەربخات، ئەوپێش علی کوڕی أبي طالب ئەو کارەی گرتۆتە دەست وبەئینسافەوە دوعای کردووە و بانگەواز بۆچاکسازی و ڕێککەوتن وصوڵح دەکات، دەی بەرێبکەون و گوێگر بینەری ئەم مەسەلەیە بن[4]،

---

١ ـ تأريخ الطبري(٥/ ٥١٤) مصنف إبن أبي شيبة(١٥/ ١٢) إسناده حسن.

٢ ـ خلافة علي بن أبي طالب لا(٤٤).

٣ ـ سير أعلام النبلاء (٣/ ٤٨٦).

٤ ـ تأريخ الطبري (٥/ ٥١٦).

حەسەنی کوڕی عەلی کاریگەریەکی ڕونی هەبوو، ئەوهەستا و لەناو خەڵکدا وتارێکی پێشکەشکرد ووتی: خەڵکینە بچن بەدەم بانگەوازی ئەمیرەکەتانەو بچن بۆلای براکانتان، چونکە ئەم کارە کەسی دەوێت کەبۆی دەرچێت و بەشدار بێت، سوێند بەخوا ئەگەر ئەهلی نەهی ودوورە پەرێزی بیگرنە دەست (کەسانی ژیر) وەك پێشتر وایە بۆ داهاتوش باشترە دەی وەرن بەدەم داواکەمانەوە وەلە بارەی، کە ئێوە یارمەتی دەرمان بن لەوەی کە ئێمەو ئێوەش توشی بوین[1]، زۆرێك لەخەڵکی کوفە بە وەفد هاتن چون بەدەم داواکەیەوە لەگەڵ عمار و حسندا چون بۆ لای علی ژمارەیان لە نێوان شەش بۆ حەوت هەزار کەس دەبوو، پاشان دوو هەزارکەس لە عبدالقیس لە بصر پەیوەندیان بوو، پاشان هۆزەکان بەوەفد هاتن تائەوەی لەکاتی ڕودانی جەنگەکەدا سوپاکەی گەیشتە نزیکی (١٢) هەزار کەس[2]، کاتێ خەڵکی کوفە لە(ذیقار) گەیشتن بە ئەمیری ئیمانداران علی پێی وتن: ئەی خەڵکی کوفە ئێوەشان وشکۆی عەجەم و پاشاکانی عەجەمتان گرتە دەست و ڕیز وکۆمەڵەکانی ئەوانتان تێکەڵوەشاند هەتا میراتگریتان، ئینجا یارمەتی دەورو بەرو بازنەی خۆتان داوە خەڵکیش ئەمەیان بەسود وەرگرت منیش بانگم کردون هەتا لەگەڵماندا برایانی ئەهلی بصرە، ئەگەر بگەرێنەوە ئێمەش ئەوەمان دەوێت، ئەگەر سووربون لەسەرکاری خۆیان بەنەرمن چارەیان دەکەین ونەرمیان بۆ دەنوێنن پشت بەخوا کەهیچ هێزێ بەهێزی خوانیە، هەگیز دەستبەرداری کارێ نابین کەچاکەوبەرژەوەندی یەکی تێدابێت، ئەگەر ئەوان ئەوەی خراپەی لێبکەوێتەوە[3].

## ٤ـ هەوڵەکانی ئاشتەوایی:

علی(ﷺ) سوربوو لەسەر ئەوەی بەهۆکاری ئاشتی بەسەر ئەو دابەشبون وفیتنەیەدا زاڵبێت وموسڵمانان لەخراپەی جەنگ وپێکدادانی چەکداری بەهەموو هێزو هەوڵێك دوور بخاتەوە، هەروەها طلحة وزوبیر یش هەر ئەوهایان دەویست، ژمارەیەك لە هاوڵان وگەورە تابیعیەکان لەهەوڵەکانی ڕێکەوتندا بەشداریان کرد لەهەموویان بەناوبانگتر هەوڵەکەی

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥١٦).

٢ ـ مصنف عبدالرزاق (٥/ ٤٥٦٤٥٧)بسند لصحيح إلى الزهري.

٣ ـ تاريخ الطبري(٥/٥١٩).

قعقاعی کوڕی عمرو بوو لەگەڵ طلحة و زوبـیر خـاتوو عائیـشەدا وتوویـژی کـرد، ئـەوان بەپێشنیارەکەی ئـەو کاریگـەربوون و خـاتوو عائیـشە پرسـیاری لـەقعقاع کـرد کـە ڕای بەرامبەر بەشـەهیدکردنی عثمـان چـیە؟ ئـەویش وتـی: ئـەوە ڕوداوێکـە چارەسـەرەکەی سەقامگیر بون و سوکنایەتیە و هەردەبێ ژیرانە تۆڵە لەبکوژانی عثمان(ﷺ) بسەنرێتەوە، ئەگەریش ئێوەبەیعەت بـە علـی بـدەن[1]، لەگەڵیـدا ڕێـك بکـەون ئـەوە ئامـاژەی خێـر ونیشانەی ڕەحمەتە و توانای تۆڵە سەندنەوەی عثمانـە، ئەگەریش وانەکەن وسوربن لـە سـەر ڕای خۆتان وجەنگ ئەوەیش نیشانەی خراپەو شەڕو نەمانی ئـەو دەسـەڵاتەیە دەی دەسـت بەرداربن بەخێر دەبێت، ببنە کیلیلی خێر وەك چۆن یەکـەم جـار وابـون وتوشـی بـەڵامان مەکەن، چونکە خۆشتان تووش دەبن و خوای گەورە ئێمە ئێوەش سـزا دەدات بـۆ خـاتری خوا ئەمە دەڵێم وبانگتان دەم بۆ ئەم کارە من دەترسم سەر نەگرێت، تائەوەی خوای گەورە بەڵگەی خۆی لەسەر ئەم ئومەتە کەم دەستەوە هەڵگرێت وئـەوەی هەیـە توشـی دەکـات، ئـەوەیش تووشـی بـووە شـتێکی گەورەیـە وەك ئەوەنیـە کەسـێ کەسـێکی بکوژێـت یـا دەستەیەك کەسێك بکوژێ یان هۆزێك هۆزێك بکوژێ، بەوە بەقسەی قعقـاعی ڕازیکـەری ڕاستگۆی دڵسۆز ڕازی بوون، چۆن بەدەم داوای ڕێکەوتنەکەوە پێ یان ووت: باشـت ووت و ڕاستت پێکا دەی بگەڕێنەوە ئەگەر گەیشتیتە علی(ﷺ) و ئەویش وەك تۆڕای ڕێکـەوتنی هەبێ پشت بەخوا وادەبێ، قعقاع گەڕایەوە ئەویش بۆلای علی لـە(ذیقـار) ولـە کارەکـەی سەرکەوتو بوو هەواڵی ڕووداوەکەی بۆ علـی(ﷺ) گێڕایـەوە ئـەویش پێـی سەرسـامبوو، خـەریك بـوو کەهـەموان بـە ڕێککـەوتن ڕازیـبن، تائـەوەی هەنـدێ پێیـان نـاخۆش بـوو وهەندێکیش پێی ڕازیبون.[2]

## ٥ــ ڕۆڵی سەبئیە لەهەڵگیرساندنی جەنگ لەشەڕی جەمەلدا:

کاتێ قعقاع گەڕایەوە هەواڵی بەئەمیری بڕوادان علی(ﷺ)دا کەچی کردوە، علی(ﷺ) دوو نێردراوی نارد[3]، بۆ لای عائیشە و زوبەیر وئەوەی کەجێی متمانە بوو لی قـسەکانی

---

١ ـ مەبەست ملکەچی و ڕازیبونی تەواوە بەسیاسەتی ئەمیری بڕواداران علی سەبارەت بەهەڵسو کەوت کردن لەگەڵ بکوژانی عثمان.

٢ ـ البداية والنهاية(٧/ ٧٣٩)، تاريخ الطبري (٥/ ٥١٢).

٣ ـ تاريخ الطبري(٥/ ٥٢٥).

قعقاع کوڕی عمرودا، ئەوانیش هاتنە لای علی ووتیان: ئیمە لەسەر ئەو باوەڕین کەقعقاع بەجێی هێشتن، دەی وەرەو هەنگاوبنێ، عەلیش کەوتەڕێ ولەو نزیکاندا دابەزی، هۆزەکانیش لای هۆزەکانیان دابەزین، (مظر)یە لای (مظر)یەو ڕەبیعیەکان لای ڕەبیعیەو یەمەن لای یەمەن ئەوان هیچ سکالایەکیان لە ڕێکەوتنەبوو، هەریەکەو لەپاڵ ئەوەی ترو بەجیا بەجیابون، هەندێکشیان دەرچون بۆلای هەندێکی دی قسە و باسیان تەنها ڕێکەوتن بوو[1]، ئەمیری ئیمانداران علی (رضي الله عنه)کاتێ ویستی بچێت بڕیاری مەترسیداری خۆی ڕاگەیاند: بزانن بەیانی من دەچم، دەی ئێوەش بەڕێکەون، مەبەستی بصرە بوو وریابن هیچ کەس کە بەشتێ دژبە عثمان یاریدەین کاروباری خەڵکی دابێت بابەیانی نەیەت[2]، لەسەربازگەکەی عەلیدا (رضي الله عنه) هەندێ لەو یاخی بوە خەواریجانە هەبوون کە عثمانیان شەهید کرد، ئەوانە بەچاو نەدەناسرانەوە، هەیان بوو هۆزەکەی سەری دەخست و هەیانبوو بەڵگەی لەسەر بەرپانەبوو بو هەیانبوو نیفاقێك لەدڵیدا کەڵەکەی کردبوو نەیدەتوانی نیشانی بدات[3]، شوێن کەوتوانی(إبن سبء)لەسەر ئەوە سوربوون کەفیتنکە هەڵگیرسێنن و کڵپە بەئاگرەی بدات تا دەرفەتی تۆڵە سەندنەوە نەمێنێت[4]، کاتێ خەڵکی لەشوێنەکانی خۆیان دابەزین ئارامیان گرت، علی و طلحة و زوبیر هاتن و ڕێکەوتن و لەوەیدا ناکۆکیان نەبوو ڕێکەوتن و گفتو گۆیان لەو نکۆڵیە دەکرد و هیچ شتێکیان لە ڕێکەوتن و وازهێنان لەجەنگ بەباشتر نەزانی، کاتێ بینیان خەریکە لەت و پەتبون ڕودەدات بۆیە بەودیدو ڕێکەتنەوە یەکتریان بەجێهێشت و علی و طلحة و زوبیر هەریەکەو گەڕانەوە بۆ سەربازگەی خۆیان وطلحة و زوبیر هەواڵیان بۆگەورە هاوەڵانی خۆیان نارد عەلیش هەواڵی بۆ گەورە هاوەڵانی خۆی نارد، بەڵام بەوانەی ووت: کە گەمارۆی عثمانیان (رضي الله عنه) دابوو، ئیدی هەموان لەسەر نیازی ڕێکەوتن و جەنگ نەکردن سەریان نایەوە و هیچ کام سکالایان بەدەست ڕێکەوتنەوە نەبوو، هەریەکەو لەپاڵ هەندێکی ترد دەبوون و دەچون

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥٣٩).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥٢٦).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥٢٧).

٤ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥٢٧) تحقيق مواقف الصحابة(٢/ ١٢٠).

بۆلای یەکتر وتەنها باسیان لەڕێکەوتن دەکرد، ئەوانەی فیتنەیان هەڵگیرساندبوو خراپترین شەویان بردەسەر بەجۆرێ شەوی واناخۆشیان بەخۆیانەوە نەدیبوو، چونکە بەرەو نەمان دەچون، هەموویان ئەو شەوە پێکەوە ڕاوێژیان دەکرد، وتە بێژیان ووتی: بۆطلحة و زوبیر دەیانناسن دەزانین چیان دەوێت بۆ عەلیش نەمان دەزانی نیازی چیە تا ئەمرۆ کاتێ داوای لەخەڵك کرد بۆ بەیانی بکەونە ڕێ ئەوەی دژ بە عثمان بەژدار بووە بانەیەت سوێند بەخوا هەموویان یەك قسەیان لەڕوماندا هەیە ــ کە لەگەڵ علی ڕێك کەوتن لەسەرخوێنی ئێمە ڕێك کەوتون[1]، إبن سەوداء(عبداللە کوڕی سبەء)، کە لەوێ هەندێ قسەی کردو ڕاوێژ پێ کراویش بوو ووتی: عیزەت وسەرکەوتنی ئێوە لە تێکەڵکردنی خەڵکیدایە دەی تێکەڵیان بن، ئەگەر سبەینێ ئەو خەڵکە بەیەکگەیشتن، ئێوە جەنگ بەرپاکەن و دەرفەتیان مەدەنێ هیچ بڕوانن و وردببنەوە ئەگەر یەکێکیشتان هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەدەستگرتنەوە خوا علی و طلحة و زوبیر و هاوڕاکانی ئەوانی بەشتێکی دژ بەخواستی ئێوە سەرقاڵ کرد دەی ڕای خۆتان نیشان بدەن و بەبێ ئەوەی خەڵك بزانێت لێی جیاببنەوە[2]، بەمە بەنهێنی لەسەر ئەو ڕایە ڕێکەوتن کەجەنگ هەڵبگیرسێت، بەیانی بدەم چاوی گرژو تورەیی و جۆرە خۆ داپۆشینێك هەستان و دراوسێکانیان هەستیان پێنەکردن (مظر)یەکان چونەناو (مظر)یەکان و ڕەبیعیەکان بۆ ناوڕەبیعیەکان و یەمانیەکان چونە ناو یەمانیەکان وشمشێریان لەڕودا هەڵکێشان و جەنگیان بەرپاکرد بەمە خەڵکی بصرە وهەردەستەوە لەڕوی ئەوانەی لێیان یاخی بوون ڕاپەڕین وکلپە دایگرتن زوبیر و طلحة چونە ناوخەڵك و جەنگ بەرپابوو.[3] بە درێژی لەکتێبەکەمدا(أسمى المطالب في سيرة أمير المؤ مينين على بن أبى طالب) باسی ڕوداوەکانی جەنگی جەمەلم کردوە، جاکاریگەری سەبەئیەکان لەجەنگی جەمەلدا خەریکە یەك دەنگی زانایانی لەسەرە، ئیدی بەخراپەکاران ناویان ببەن یان بەپاشقەلانی هەردووکیان هەندێ بەبکوژان ناویان دەبەن یان

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥٢٦).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥٢٧).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(٥/ ٥٤١).

بەگەمژە وگێل یان بەئاژاوەچی و پشێوی سازان ناویان بێنن یان بەڕاشکاوانە ناوی سبأیان لێبنێن.[1] ئەمەیش کۆمەڵێ دەقن کەجەخت لەوە دەکەنەوە:

أـ لە(أخبارالبصرە عمر إبن شیبە)دا هاتوەکە: ئەوانەی کوشتنی عثمانیان درابویە پاڵ، ترسان هەردوولا لە کوشتنی ئەوان ڕێکەوتن، بۆیە جەنگیان لەنێواندا هەڵگیرساند تائەوە بوو کە ڕویدا.[2]

ب ـ تەحاوی دەڵێت: فیتنەی جەمەل بەبێ خواست وهەڵبژاردنی علی و طلحة و زوبێرو ڕویدا، بەڵکوو خراپەکارەکان بێ ویستی پێشینەکان هەڵیانگیرساند.

ت ـ باقلانی دەڵێت: ڕێکەوتن وبەرەزامەندی یەکتریان بەجێهێشت بکوژانی عثمان ترسان لێیان بدەن و چواردەورەیان بگیرێت، بۆیە کۆبونەوە ڕاوێژیان کردو ڕایی جیاوازیان هەبوو دواتر لەسەر ئەو ڕایە یەکدەنگ بوون کەبێن بەدوو دەستەوە و لەبەرەبەیاندالەهەردوو سەربازگەکەدا تێکەڵبێن و جەنگەکە دەست پێبکەن ئەودەستەی لەسەربازگەی عەلیدایە هاواربکات طلحة وزوبێرناپاکی یان نواند، ئەوەیش طلحة وزوبێر هاواربکەن: علی ناپاکی نواند، ئەوەی پیلانیان بۆدانأبو ئەنجامیداو جەنگ هەڵگیرسا جاهەردەستەیەکیان لەبەر نارەحەتیەکی دەروونی بەرگری دەکرد، دەویست خوێنی نەڕژێت، ئەگەر ئەوە ڕویدا بەڕاستی هەردوو لا دەبوو گوێڕایەڵی خوایش دەبوو، ڕێگە لێگرتنیشیان بەهەمان شێوە دەبوو ئەوە ڕاست بڵاوە وئێمەش باوەڕمان بەم تێڕوانینەیە وا دەڵێین.[3]

١) إبن حەزم دەڵێ: بەڵگەی ئەوەش کە ئەوان کۆبوونەوە وجەنگ و کوشتاریان نەکرد ئەوەیە، کە شەو هات بکوژانی عثمان لە هەڵکوتانە سەردا شارەزابوون و خۆیان گەیاندە سەربازگەی طلحة و زوبەیر و شمشێریان لێ کێشان وئە کشانەوە و بەرگریان لە خۆکرد تاوەکو تێکەڵ بەسەر بازگەی علی بوون، بۆیە هەرکەسێ بەرگری لە خۆ ئەکرد و هەموو لایەك وەهای گومان دەبرد کە کۆمەڵەکەی تر کوشتاری دەست پێکردبێت، بۆیە کاروبار

---

١ ـ عبدالله بن سبأ وأثره فی أحداث الفتنة فی صدرالإسلام لا(١٩٤).

٢ ـ فتح الباري (١٣/ ٥٦٧).

٣ ـ شرح العقیدة الطحاویة.

زۆر تێکەڵ بوو کەس نەیدەتوانی بەرگری لە خۆی زیاتر بکات، ئەو خراپەکارانەی بکوژانی عثمان بوون لە هەڵگیرساندنی شەڕدا ئارام نەدەبوون، هەردوو کۆمەڵیش لە بەرگری کردن لە خۆدا بەرگری و ئامانجی خۆیانیان پێکابوو، زوبێر پاشگەز بوویەوە و ئەو جێگەی بەجێهێشت، تەلحەش ڕاوەستابوو باری ڕاستەقینەی ئەو تێکەڵبوون و تێڕژانەی نە دەزانی تیرێك هات و بەر قاچی کەوت تێیدا ڕۆچوو، هەر ئەو قاچەی لە ڕۆژی بەدردا لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ)بریندار بوو، لەوێدا مرد(ﷺ) زوبێریش دوای کشانەوەی لەو جەنگە بەلای کەمەوە دوای ڕۆژێك لە بەسرەدا لەدۆڵی (وادی السباح) کوژرا، بۆیە ڕووداوەکان بەو جۆرە بوون. دەسەڵاتی ئەوانی تێدا نەبوو.[١]

ج – (الذهبی) دەڵێ: ڕووداوی (الجمل) گێل و نەزانەکانی هەردوو لا دروستیان کرد[٢]، هەردوولا ڕێکهاتن و نە علی(ﷺ)و نە طلحة(ﷺ) جەنگیان مەبەست نەبوو، بەڵکو مەبەستیان گفتوگۆ بوو لەپێناو ڕێکخستنی ڕیز و یەکبوونی موسوڵماناندا، بۆیە هەڵەشەکانی هەردوولا جەنگەکەیان دروست کرد و ئاگری جەنگ بڵێسەی دا و دەروونەکانیش هەڵچوون.[٣] لە (دول الاسلام) دا هاتووە ئەو جەنگە بە دەنگە دەنگ و مشتومڕ هەڵگیرسا و جڵەوی کاروباریش لە دەستی علی و تەلحەو زوبەیر دانەما.[٤]

د.سولەیمان بن حمد العودەش ئەڵێ: لە دوای ئەوە دەتوانین بڵێین: ڕێگر چی یە؟ لەوەی گێڕانەوەی تەبەری ڕاشکاوانە باس لەڕۆڵی سەبەئیەت دەکات لە (جمل)دا کە ئەم گشتگیریە شی بکاتەوە و ئەوانەش دیاری بکات لە گواستنەوەی ئەو زانایانەدا هاتووە؟ تەنانەت گەر ئەو کۆمەڵە گێرە شێوێنیانەش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە سەبەئییەتەوە نەبێ و، ئامانجیان وەکو ئامانجی ئەوان نەبێت، ئاخۆ چی ڕێگری ئەم قسەیە دەکات، کە ئەو کۆمەڵ و کاروبارانەی ئەو زەمینەی سازاند کە ئیبن و سەبەئیەت و پشتیوانەکانی لە کاریان برد، هەروەکو نەریتی هەندێ لە بزوتنەوە گێرە شێوێنانەی و هەڵچووانەی کە

---

١ ـ الفصل في الملل والنحل (٤ / ١٥٧، ١٥٨).

٢ ـ العبر (١ / ٣٧)، عبدالله بن سبأ للعودة، لا ١٩٥.

٣ ـ تاريخ الاسلام (١ / ١٥)، عبدالله بن سبأ للعودة، لا ١٩٥.

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

خراپەکاران بەکاریان ئەبەن[1]، حەسەنیش لە ڕۆژی جەمەلدا لای ڕاستی سووپاوە بوو، وتراویشە لای چەپییەوە بوو ڕقی لەو کۆشتار بووە و بۆ ئەوەش داوای لە باوکی کردووە، کە ئەو جەنگە بە جێ بهێلێت.[2]

## ٦- ژمارەی کوژراوانی جەمەل:

ئەو جەنگە لە بەرامبەر کوژراوەکانیدا بەدخویەکی خولقاند کە گێڕانەوەکان لە ئەندازە کردنیدا جیاواز بوونە. مەسعودی باس لەوە دەکات کە ئەو جیاوازیە ئەندازەکاریە سەرچاوەکەی بۆ هەواو ئارەزووی ڕاویەکان[3]، خەلیفە بن خەیاتیش ناوی هەندێ لە کوژراوەکانی جەمەلی هێناوە تەوە کە لەبەرکراون و نزیکەی سەد کەس بوونە[4]، ئەگەر هاتوو گریمانەشمان کرد کە دووسەد کەس بوون نەك سەد کەس، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کوژراوەکانی(جمل) دوو سەدکەس تێ ناپەڕێنێ. ئەوەش ئەو ژمارەیە پارسەنگە لای دکتۆر خالد بن محمد الغیث لە نامەکەیدا (استشهاد عثمان ووقعه لجمل فی مرویات سیف بن عمر فی تاریخ الطبري دراسه نقدیه. [5] لێکولێنەوەیەکی ڕەخنە نییە، ئەوەش کە أبو مغنف باسی کردووە لەوەی ژمارەی کوژراوەکان بە بیست هەزار گەیشتووە.[6] ئەوەش ژمارەیەکە زیادەڕۆی تیاداکراوە، خراپی کردووە ئەو درۆزنە لەوەی گومانی بردووە چاکی کردبێ، چونکە باسیکردووە کە ئەو بیست هەزارە خەڵکی بەسرە بوونە.[7]

سەبارەت بە (سیف) یش باسی کردووە، کە بیست هەزا کەس بووە نە نیوە لەگەڵ علی(ﷺ)و نیوەکەی دیکەی لەگەڵ عائیشە بووە (ڕەزای خوای لێ بێت)، لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە: وتراوە پانزە هەزار کوژراو بووە، پێنج هەزاری خەڵکی کوفە و دە هەزاری خەڵکی بەصرە بوونە، نیوەیان لە جەنگی سەرەتا کوژراون و نیوەکەی دیکەیشی لە دووەم

---

١ ـ تاریخ الدول،لا ١٩٦ .

٢ ـ الوافي بالوفيات للصدفي (١٢/ ١٠٩).

٣ ـ مروج الذهب(٣/ ٣٦٧).

٤ ـ تاریخ الخليفة، لا ١٨٧ ـ ١٩٠.

٥ ـ استشهاد عثمان ووقعة الجمل، ٢١٥.

٦ ـ تاریخ الخليفة، لا ٨٦ بسند مرسل.

٧ ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٨٦.

جاردا بووه[1]، هەردوو ئەو گێڕانەوەیەش لەبەر ئەوەی ئەو دووڕاویەی (انقطاق)ی تێدایە (ضعیف)ن و زیادە ڕۆیشیان تیادایە و (عمربن شبه)باس دەکات، کە زیاتر لە شەش هەزار بوونە، بەڵام ئەم ڕیوایەتەش لە ڕووی (سند)ەوە ضعیفە.[2] یەعقوبیش گشت ئەو کەسانەی تێپەڕاندووە و ژمارەی کوژراوەکانی بەسی هەزار و ئەوەندەی داناوە [3]، ئەو ژمارەیانەش زۆر زیادە ڕەویان تیاداکراوە و منیش لە کتێبەکەمدا (اسمى المطالب في سيرة امير المؤمنين علي بن ابي طالب) هۆکارەکانی ئەو زیادە ڕەویەم باسکردووە.

### ٧- بانگەوازی ئەمیری موسوڵمانان لە دوای ئەو جەنگە:

کە جەنگ بڵێسەی لە دامرکاندنەوەدا بوو، بانگەوازی علی بانگی دا: بریندار مەکوژن و شوێنی هیچ کەس مەکەون و نەچنە هیچ ماڵێکەوە و هەرکەسێ شمشێری دانا پارێزراوە هەر کەسێ دەرگاکەی داخست پارێزراوە، بۆ سوپاکەشی هیچ دەسکەوتێ نییە تەنها ئەو چەکانە نەبێت کە بەجێ ماون، جگە لەوە هیچ شتیکی دیکەیان بۆ نییە. بانگەوازکاری ئەمیری موسوڵمانان بانگی خەڵکی بەصرەی کرد، کە جەنگی ئەوانیان کرد بە هەرکەس شتێکی لای سەربازگەکانی علی دۆزییەوە. ئەوە دەتوانێت وەری بگرێتەوە.[4]

### ٨- گەڕانی بەسەر کوژراوەکان و بەزەیی پێداهاتنەوە پێیان:

دوای کۆتایی هاتنی ئەو جەنگە علی ئەمیری موسوڵمانان (ﷺ) بە نێو هەندێ لە هاوەڵە کورژراەوکانیدا گەڕاو محمدی کوڕی تەلحە السجادی بینی فەرمووی (إنا لله وإنا إليه راجعون) سوێند بە خوا گەنجێکی صاڵح بوو، پاشان بە خەفەتەوە دانیشت و داوای لێخۆشبوونی بۆ کوژراوەکان کرد و، بەزەیی پێداهاتنەوە و بە چاکەو خێر بە هەندێکیانی هەڵدا.[5]

---

١ ـ تاريخ الطبري (٥/ ٥٤٢ـ ٥٥٥).

٢ ـ تاريخ خليفة بن خياط، لا ١٨٦ أسنادة منقطع وهو حسن إلا قتادة.

٣ ـ مصنف إبن أبي شيبه (٧ / ٥٤٦) فتح الباري (١٣ / ٦٢).

٤ ـ إستشهاد عثمان ووقعة الجمل، لا ٢٠٢.

٥ ـ مصنف إبن أبي شيبه (١٥ / ٢٦) المستدرك (٣ / ١٠٣ ـ ١٠٤) و نيسناده(حسن لغيره) يه، خلافة علي بن أبي طالب، لا ١٠٩.

## ٩- كاریگەر بوون بە کوژرانی طلحة(رضي الله عنه).

علی(رضي الله عنه) کاتێ بە نێو کوژراوەکاندا گەڕا طلحة ی بە کوژراوی بینی و خۆڵی سەردەم و چاوی سڕی[١]، پاشان ووتی: خۆشەویستی لام ماوە ئەی باوکی محمد، کە بە کوژراوی لەسەر زەوی لە نێو خوێندا بیت، پاشان فەرمووی: ئەو نهێنی و خەم و خەفەتەی لە دڵمدا شەپۆل دەدات شیکایەتیان بۆ لای خوای گەورە ئەبەم. بەزەییی پێدا هاتنەوە فەرمووی. خۆزگە (٢٠)ساڵ پێش بینینی ئەم کارەساتە دەمردم.[٢]

## ١٠ ـ هەڵوێستی بەرامبەر ئەو کەسەی زوبەیری کوشت:

کاتێك عەمری کوڕی جورمز ناپاکی بە زووبەیر کرد و کۆشتی سەری لێك کردەوە و بردی بۆ لای علی و لەوەدا وەهای گومانکرد کە لەو کارەیدا لای علی دەستکەوت و نزیکایەتی دەبێت !! مۆڵەتی لێوەرگرت علی وتی مژدە بە بکوژی إبن صیفه بدەن کە دۆزەخ جێگەیەتی، پاشان فەرمووی بیستم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (لکل نبی حوای و حواری الزبیر).[٣] واتە: (هەموو پێغەمبەرێك حەواری خۆیان هەیە حەواریەکەی منیش زوبەیرە)، کە علی(رضي الله عنه)شمشێرەکەی زوبەیری بینی فەرمووی: ئەمە ئەم شمشێرەیە خۆشی و نارەحەتی لە ڕووی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لابرد.[٤] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە ئەمیری ئیمانداران نەیهێشتووە إبن جرموز بچێتە ژوورەوەبۆ لای و بەو کەسەشی ووتووە، کە مۆڵەتی داوە مژدەی دۆزەخ بە بکوژانی إبن صیفه بدەن.[٥]

هەروەها ئەوترێت، کە عەمری کوڕی جورموز لە سەردەمی عەلیدا(رضي الله عنه)خۆی کوشتووە، وتراویشە بەڵکو ژیاوەکە موسعەبی کوڕی زوبەیر کراوەتە والی عێراق بۆیە ئەویش خۆی شاردووەتەوە وەبە مُسعب وتراوە ئەتەوێ بە دوایدا بگەڕێت؟ ئەویش

---

١ ـ البداية والنهاية (٧ / ٢٥٨).

٢ ـ تاريخ الاسلام، عهد الخلفاء راشدين، لا ٥٢٨.

٣ ـ فضائل الصحابة (٢ / ٩٢٠).

٤ ـ البداية والنهاية (٧ / ٢٦١) .

٥ ـ الطبقات (٣ / ١٠٥) إسناده حسن، خلافة علی، لا ١٦٤ عبدالحميد.

ووتوویەتی: پێی بڵێن با دەرچێت و پارێزراوە سوێند بە خوا نەم ویستوە بیگرم، کە تۆڵەی زوبەیری لێ وەربگرم، إبن جورموز سوکترە لەوەی، کە وەکو زوبیری حیساب بکەم.[1]

ئەمیری ئیمانداران لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەی (جمل)دا دیلەکانی لە شوێنی تایبەتدا، کە نوێژی بەیانی کرد داوای موسای کوڕی طلحة ی کوڕی عبدالله کردو لەخۆی نزیك خستەوە بەخێرهاتنی کرد و لە تەنیشتی خۆی داینیشاند و پرسیاری حاڵ و باری خۆی و براکانی لێکرد و، پاشان فەرمووی: مەبەستمان بەوەی لێرەدا دامانناون ئەوەیە خەڵکی تاڵانتان نەکەن و شتەکانی بۆ گەڕاندەوە و لەگەڵ براکەی براکەیشی، کە عیمرانی کوڕی طلحة بوو هەمان مامەڵەی کرد، بۆیە ئەوانیش بەیعەتیان پێدا، دیلەکان ئەو بەیعەتەیان بینی چوونە لای علی (ﷺ) بەیعەتیان پێدا و ئەوانی تریش بەیعەتیان دا.[2]

هەروەها لە بارەی مەروانی کوڕی حەکەمەوە پرسیویەتی و دەڵێ: سۆزێکی زۆرم بۆی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا گەنجێکی قورەیشیە، مەروان بۆ حسن و حوسەین و و إبن عباس هەواڵی نارد تاوەکو لای علی شتێکی بۆ بکەن، علی ووتی: پارێزراوە گەر ڕووبکاتە هەر شوێنێك، بەڵام مەروان لە بارەی ئەو بەخشندەیەدا دڵسۆز نەبوو، بەڵام مەروان لەبەرامبەر ئەو بەخشندەییەدا، خۆی یەکلای نەکرەوە تاوەکو بڕوات بەیعەتبدا[3]، هەروەها مەروانی بە کارە زۆرەکانی علی(ﷺ) ئەمیری ئیمانداران هەوڵداوە و بە حەسەنی کوڕی علی وتووە، لە باوکت بە بەخشندەتر و بە بەزەیی ترم نەبینیوە، لە ڕۆژی جەمەلدا بانگخوازێك بانگی کرد، کە شوێنی کەسی هەڵهاتوو مەکەون و بریندارن مەکوژن.[4]

## ١١- علی ئەمیری موسوڵمانان بە ڕێزەوە عائیشە بەڕێ خست.

علی ئەمیری ئیمانداران عائیشەی ئامادەکرد و بە هەموو ئەو شتانەی پێویستی بێ لە وڵاخ و توێشوو و ئەوکەسانەشی لەگەڵ نارد کە ڕزگاریان بو و تەنیا ئەو کەسانە نەبێت خۆیان حەزیان دەکرد لە وێدا بمێننەوە، چل ئافرەتی ناسراوی خەڵکی بەسرەش بۆ ئەو

---

١ ـ البداية والنهاية (٧ / ٢٦١).

٢ ـ الطباقات (٣٠ / ٢٢٣) بسند حسن، المستدرك (٣ / ٣٧٦ ـ ٣٧٧).

٣ ـ سنن سعيد إبن منصور (٢ / ٣٣٧) بسند حسن.

٤ ـ كتاب أهل البغي من الحاوي للماوردي، لا ١١١.

گەشتە ی هەڵبژارد و فەرمووی، ئەی محمد ئبنو الحنیفه ئاماده به و پێی ڕاگەیەنە، ئەو ڕۆژەش هات کەتێیدا به ڕێکەوێ عائیشەی هێناو خۆی و خەڵکی ئامادەبوون و خوا حافیزیان لێکرد، ئەویش خوا حافیزی لێکرد و ووتی کوڕی شیرینم یەکتریمان ماندوو کرد و، هیچ کەس لە تۆ لەسەر هیچ شتێك ستەمی لە کەس نەکردووە، سوێند بە خوا لە کۆنیشدا هیچ شتێك لە نیوان من و علی دا نەبووە، تەنیا نێوان ئافرەت و خەزورانیدا نەبێ و ئەو لای من لە پیاوە باشەکانە، علی ووتی: ئەی خەڵکینە سوێند بە خوا ڕاست دەکات و هەر ئەوە لە نێوانماندایە و دووژمنایەتیمان نییە، بۆیە عائیشە لە ڕۆژی شەممەی سەرەتای ڕەجەبی ساڵی سی و شەش دەرچوو علی میلێك لەگەڵی ڕۆیشت و خوا حافیزی لێکرد و بۆ ڕۆژێکیش هەردوو کوڕەکەی لەگەڵدا نارد.[1]

## ١٢- پەشیمانی کێشانیان لەوەی لییان ڕوویدا:

إبن تەیمیە: ئەڵێ: بەو شێوەیە گشت خەڵکانی پەشیمان بوونەوە لە وەی چوونەتە جەنگەوە، تەڵحە و زووبەیر و علی و و خەڵکانی تریش پەشیمانیان کێشاوە، لە ڕۆژی (جمل)دا ئەو کەسانە شەڕیان مەبەست نەبووە، بەبێ نیاز و هەڵبژاردنی ئەوان کۆشتار ڕوویداوە.[2]

أ. ئەوە ئەمیری ئیماندارانە لەبارەیەوە هاتووە، کە بینیویەتی شمشێر لە یەك کێشراوە فەرموویەتی: خۆزگە بیست ساڵ پێش ئەم ڕووداوە ئەمردم.[3]

ب. نعیم بن حماد بەسەنەدی خۆی بۆ لای حەسەنی کوڕی علی ڕیوایەتکردووە، کە بە سولەیمانی کوڕی صردی ووتووە، کاتێك شەڕ سەخت و قورس بوویەوە عەلیم بینی پەنای بۆ هێنام ئەی ووت: ئەی حسن حەزم دەکرد بیست ساڵ پێش ئەم کارەساتە بمردمایە.[4]

---

١ ـ تاريخ الطبري (٥/٥٨١).

٢ ـ المنتقي من منها ج الاعتدال، لا ٢٢٢.

٣ ـ الفتن نعيم بن حامد (١ /٨٠).

٤ ـ هەمان سەرچاوە (١ /٨٠).

ت. حەسەنی کوڕی علی ووتوویەتی: علی ئەمیری ئیمانداران کارێکی مەبەست بووە، بە دوای کاروبارەکاندائەگەڕاو دەروازەیەکی نەبینیەوە. [1]

پ. لە سولەیمانی کوڕی صردەوە، ئەویش لە حەسەنی کوڕی عەلییەوە گوێ لە علی بوو دەیوت: علی ڕوا نییە شمشێری ئەو خەڵکە، کە لە یەکتریان کێشاوە بە حەسەنی ووت: ئەی حسن گشت ئەمانەمان تیادایە؟ خۆزگە یش بیست ساڵ یان چل ساڵ بەر لەم کارەساتە دەمردم. [2]

ج. إبن تیمیه دەڵێ: عائیشە شەڕی نەکرد و بۆ شەڕیش دەرنەچووە، بەڵکو بە مەبەستی بەرژەوەندی ئاشتەوایی نێو موسوڵمانان دەرچووە، گومانی برد، کە دەرچوونی بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدایە، پاشان دواتر بۆی ڕوونبوویەوە دەرچوون لە پێشترە، لە و جەنگەش گریا تاوەکو سەرپۆش (عمامە)کەی تەڕبووە، بەو جۆرە هەموو ئەوانەی پێشوو لەوەی تێکەڵ بەو جەنگە بوون پەشیمانیان کێشایەوە، طلحة و زوبیر و علی و ئەوانی تریش پەشیمان بوونەوە، ئەو کەسانەی لە ڕۆژی جەمەلدا، کە حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) ئامادەی بووە مەبەستیان شەڕ نەبووە، بەڵام کە شەڕ بوو بەبێ ویستی ئەوان بوو. [3]

ح. ذهبی دەڵێ: بێگومان عائیشە (ڕزای خوای لێ بی)پەشیمان بوو لەڕۆیشتنی بۆ بەصرەو ئامادەبوونی لە ڕۆژی جەمل ئەو وای گومان نەدەبرد کە کارە دەگا بەوەی کە ڕویدا[4] هەرکەس ئارەزووی زانیاری زیاتر دەکا بابڕوانینە کتێبەکەم(أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب).

خ. پێش ئەوەی ئەو ڕووداوە جەرگ بڕو ئازاراویانە بەجێ بهێڵین، بەلای وانەیەکی گرنگەوە ڕائەوەستین و ئەوەی لێ پوخت دەکەینەوە، ئێمە پێویستە لە بەرژەوەندی فرۆفێڵی دووژمناندا کاربکەین لە پێناو شکست پێهێنانی هەر هەوڵێکی دڵسۆزانە لە یەکخستنی ڕیزیان زیانی بەرژەوەندیانی تێدا بێت، بۆیە لە نموونەی ئەم حاڵەتەدا کە ئێمە

---

١ ـ الفتن (١ / ٨١) نعيم بن حماد.

٢ ـ أحداث وأحاديث فتنة، الهرج، لا ٢١٧.

٣ ـ المنتقي من منهاج الاعتدال، لا ٢٢٢، ٢٢٣.

٤ ـ سير أعلام النبلاء (٢، ١٧٧).

لەسەر ئەو فیکرە گشتیانە ڕێك هاتبێتین، کە پلانەکان بکێشن و هەمووو ئەو ڕێ و شوێنانە بگرنە بەر لە جێ بەجێ کردنی ئەوەی لەسەری ڕێك کەوتوون و، بواری شکست پێهێنانی بەدووژمنان بدەین و واز لەو خۆشیە بهێنین، کە بەیەکدەنگی دێتە دی ومەترسی دووژمنمان لە بیردەباتەوە و ناتوانێ زیان بە ئیسلام و موسوڵمانان بگەیەنێ، بۆیە حسن لەو پەند و وانەیە سوودی لێ وەرگرت و لە و پرۆژە چاکسازیەی، کە بە پشتیوانی خوا باسی دەکەین.

## جەنگی صفین:

لەو ڕووداوە گەورانەی حەسەنی کوڕی علی لەسەردەمی باوکیدا بـینی جـەنگی صـفین بوو.

هەروەك چۆن شارەزاییەکی قوڵی هەبوو لەبارەی پەیوەندی نێوان ئەمیری ئیمانداران علی ومعاویە (ﷺ)، معاویە (ﷺ) لەسەردەمی عمر و عثماندا (ﷺ)والی شام بوو، کاتێ عەلی(ﷺ)هاتە سەر خیلافەت و ویستی لای ببات وعبداللە کوڕی عمر دابنێت، بەڵام عبداللە کوڕی عمر ڕازی نەبوو والی بوونی شام قبووڵ بکات ولەو بارەیەوە پۆزشی هێنایەوە وباسی ئەونزیکی وخزمایەتییەی بۆکردکە لەنێوانیاندا هەبوو[1]، ئەمیری ئیمانداران علی (ﷺ)عبداللە ی ناچار نەکردو داواکەی لێوەرگرت، کە نەچێت بۆ شام، ئەو گێڕانەوانەش، کەبانگەشەی ئەوە دەکەن علی هێرشی کردۆتە سەرعبداللە کوڕی عمر ئەوا لاڕێبوون ودرۆ لەو هەواڵەدا هەیە.[2] کۆتا پلەی ئەو ڕووداوەی باس وخواسی عبداللە کوڕی عمرو والیەتی شام (الذهبی) لەڕێگەی سوفیانی کوڕی عەینەوە لە عمری کوڕی نافع لە باوکیەوە لە عبداللە کوڕی عمرەوە ڕیوایەتیکردووە دەڵێ: علی کەسێکی نارد بۆ لام ووتی: ئەی أبو عبدالرحمن تۆ پیاوێکی، کە خەڵکی شام گوێڕایەڵیت دەکەن دەی بەڕێکەوە واتۆم کردە کاربەدەست لەسەریان، منیش ووتم: برۆ زیکری خوا بکەو باسی نزیکی من لە پیغەمبەر(ﷺ)و هاودەمیم بکە بۆی، بەڵکو ئەو ئەرکەم لەسەر شان

---

١ المصنف لإبن ابي شيبة (٤٧٢/٧)اسناده صحيح.

٢ ـ استشهاد عثمان و وقعة الجمل، خالد الخيث، لا ١٦٠.

لاببەیت، بەڵام علی ڕازی نەبوو بۆیە داوای یارمەتیم لە حەفصە کرد ئەویش ئامادە نەبوو، بۆیە شەو دەرچوو بۆمەککە[1]، ئەمەش بەڵگەیەکی یەك لاکەرەوەیە لەسەر بەیعەتدانی عبداللە کوڕی عمرو گوێڕایەڵ بوونی، چونکە چۆن علی دەیکات بە والی ئەگەر بەیعەتی نەدابێت پاش ئەوەی عبداللە کوڕی عمر عوزری هێنایەوە بۆ وەرنەگرتنی والیەتی شام. ئەمیری ئیمانداران علی لەجیاتی ئەو سەهلی کوڕی حنیفی نارد، بەڵام هەر کە گەیشتە نزیکی دەوروبەری شام سوارەکانی معاویە گرتیان وپێیان ووت: ئەگەر عثمان(ﷺ) تۆی ناردووە فەرموو، ئەگەریش کەسی تر تۆی ناردووە بگەڕێرەوە[2]، وڵاتی شام لەتاو تووڕەی بەستەم ودوژمنانەی عثمان کڵپی دەدا، چونکە کراسەکەی عثمانیان پێ گەیشتبوو، کە ئاڵاوی خوێنی بوو لەگەڵ پەنجەکانی خێزانەکەی کەلەکاتی بەرگریکردن لە عثمان پەنجەکانی قرتا بوون.

چیرۆکی شەهیدبوونیشی زۆر بەئازارو شەرمەزارانە بوو، هەست و دەروونەکانی دەهەژاندن ودڵەکان پێی کاریگەر دەبوون وفرمێسکەکان پێی دەڕژان هەروەك هەواڵی مەدینە و ئەو ئاڵۆزی وژاوە ژاوەیان بیست کەزاڵ بووە بەسەر شارەکەدا و، چۆن بەنی ئومەییە هەڵهاتون بۆمەککە، هەموو ئەمانە و چەند هۆکارێکی تر کاریگەریان هەبوو لەسەر خەڵکی شام ولەسەرووی هەموویانەوە معاویە(ﷺ) ئەو پێی وابوو ئەرکی سەرخستنی عثمان ولێدانی بکوژەکانی لەسەرەو ئەو بەرپرسی خوێنەکەیەتی، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُورًا﴾[إسراء: ٣٣] .

بۆیە معاویە خەڵکی کۆکردەوە ووتارێکی پێشکەش کردن لەبارەی عثمانەوە کە بەستەم ودوژمنایەتی وە لەسەر دەستی چەند گێلو گەمژەیەکی دوو ڕوو کوژراوە، کە ڕێزی خوێنی حەڕامیان نەگرتووە لەمانگی حەڕام و لە شارێکدا کوشتویانە، کە کوشتنی تێدا حەڕامە، خەڵکەکە ڕاپەڕین و کەوتنە یاد و زیکرو دەنگیان بەرز بۆوە، ژمارەیەك

---

١ ـ سير اعلام النبلاء (٣/٢٢٤) رجاله ثقات.

٢ ـ تهذيب تاريخ دمشق(٤/٣٩) خلافة علي بن ابي طالب، عبدالحميد، (١١٠).

لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)یش لەناویاندا بوون یەکێکیان، کەناوی مروەی کوڕی کعب بوو ووتی: ئەگەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) نەبوایە قسەم نەدەکرد، ئینجا باسی ئەو فیتنەیەی کردو، ئەوە ئەو ڕۆژە لەسەر ڕێی ڕێنومابییە، منیش چووم بۆ لای ئەو پیاوە دیتم عثمانی کوڕی عەفانە، ئینجا ڕووم تێکردو ووتم ئەوە؟ فەرمووی بەڵێ[1]،

لێرەدا فەرمودەیەکی تریش هەبوو، کە معاویەی هاندا تا تۆڵە لەبکوژانی عثمان بکاتەوە و چالاك و بەرگریکارێکی بەهێز بێت بۆ بڕیاری بەدیهێنانی ئامانجەکەی، ئەو فەرمودەیەش ئەوە بوو، کە نعمانی کوڕی بەشیرەوە لەعائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)هاتووە، کە عائیشە فەرمووی: پێغەمبەرم(ﷺ)ناردو کۆتا ووتەی ئەوە بوو، کە دای بەسەر شانی عثمانداو فەرمووی: ((یا عثمان ان الله عس ان یلبسك قمصا فإن ارادك المنافقون علی خلعه فلا تخلعه حتی تلقاني ثلاث)) نعمان دەڵێ ووتم: ئەی دایکی ئیمانداران ئەمەت لەکوێ بوو؟ ئەویش ووتی: سوێند بەخوا لەبیرم چووەتەوەو لەبیرم نەماوە دەڵێ: ئەو فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ معاویەی کوڕی أبوسوفیان، بەڵام معاویەڕازی نەبوو تا ئەوەی نامەیەکی نوسی بۆدایکی ئیمانداران وپێی ووت: کە ئەو فەرموودەیەم بۆبنوسەوە ئەویش لەنوسینێکدا بۆی نوسی[2]، جا گوڕ و تینی توندی جێبەجێکردنی فەرمانی خوا بەسەر بوکوژەکاندا هۆکارێکی سەرەکی بوو، ئەهلی شام بە سەرکردایەتی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕازی نەبن بەیعەت بە خیلافەتی علی کوڕی ئەبو تالیب بدەن لەبەر ئەوە نەبوو، کە معاویە ویستی بە خەلیفە هەیە بۆ والی یەتی شام یان ئەوەی داوای شتێ بکات کە حەق نەبێت، چونکە ئەو بەتەواوەتی دەیزانی ئەو کارە بۆشەش کەسەکەی ئەهلی شورا دەبێت و علی لەو بەرزو بەڕێزترە شیاوترە.[3] بەڵگەی ئەمەش ئەوگێڕانەوەیە، کە یەحیای کوڕی سولەیمانی جەعفی بەسەنەدی جەید لە ئەبو موسلمی فەولانی یەوە هێناویەتی، کە بە معاویەی وتووە: تۆ هاوشانی علی یا وەك ئەویت؟ معاویەش ووتی: نە بە خوا من دەزانم علی لە من زاناتر و شیاوترە بەو کارە، بەڵام ئایا

---

١ ـ صحیح سنن إبن ماجه (٢٤/١).

٢ ـ مسند احمد باقي مسند الانصار، رقم: ٤٥، ٢٤ حدیث صحیح.

٣ ـ خلافة علي بن ابي طالب، عبد الحمید، (١١٢).

ئێوە نازانن، کە عثمان بەستەم لێکراوی کوژراوە؟ منیش ئامۆزاو داواکاری خوێنی عثمانم. دەی بچین بۆلای وپێی بڵێن: با بکوژانی عثمانم بداتە دەست و بکەونە دەستم و منیش دانیشم ئەوانیش چوون بۆ لای علی قسەیان لەگەڵدا کرد، ئەویش بکوژەکانی نەدایە دەستی معاویە[1]، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە چوونە لای و قسەیان لەگەڵدا کردو، ئەویش ووتی: بابەیعەت بدات ودادگاییان بداتە دەست خۆم، بەڵام معاویە ئامادە نەبوو.[2]

## ١. ئایەمعاویە کەلە فرمانی علی (ﷺ) دەر چوو لە بەرتەماعی دونیایی بوو؟

ئەو گێڕانەوانەی پێیان وایە معاویە بەهۆی خواستی تایبەت ودونیاییەوە لە گوێڕایەڵی علی دەرچووە بەهۆی ململانێ و دوژمنایەتی نەزانینی کۆنی نێوان بەنی هاشم وبەنی ئومەییە و چەندین قسەی تری وای بوختان وهەڵبەست و تانە دان لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)کە هەندێ لە نوسەرانی هاوچەرخ پشتیان پێ دەبەستن وەك: عەققاد لە کتێبی (عبقرية علی)، عبدالعزیز دوری لە پێشەکییەکەیدا بۆکتێبی (تأريخ صدر الإسلام)، کە لەسەر ئەو گێڕانەوانە شیکاری بۆ چوونی خۆیان دەکەن ئەوانە چەند گێڕانەوەیەکی پشتگوێ خراون بەڕێگەی (عدل وضبط)[3]، ڕەخنە لە گێڕاوەکانیان گیراوە بەوەی لە کۆن و نوێدا لەنێو خەڵکیدا وابلاوە، کە ناکۆکی نێوان علی و معاویە (ڕەزای خوا لە هەردووکیان بێت) هۆکارەکەی ئەوەبووە، کە معاویە چاوی لەخیلافەت بووە، ئەو کۆتا لادانەشی لە علی و بەیعەت پێ نەدانی بەهۆی ئەوەوە بووە، کە علی لە والیەتی شام لای بردووە، ئەمانە مێژوو نووسانی شیعەیان (الإمامة والسياسة)، کە بە درۆوە هەڵبەستراوەتە پاڵ ئیبن قوتەیبەی دەینەوەری باسیان کردووە، ئەو کتێبەهی ئیبن قوتەیبە نی یە ئەم کۆمەڵە بەڵگانەش بە درۆو ناپاکی دراوەتە پاڵ پێشەوا إبن قوتەیبە لەو بەڵگانەش بریتین لە:

---

١ ـ فتح الباري (٩٢/١٣) البداية والنهاية (١٢٩/٨).

٢ ـ فتح البري (١٣/ ٩٢) استشهاد عثمان، لا (١٦٠).

٣ ـ خلافة علي بن ابي طالب، عبد الحميد لا(١١٢).

- ئەوانەی ژیانی ئیبن قوتەیبەیان نوسیوە کەسیان باسی ئەوەیان نەکردوە، کە لە مێژوودا کتێبێکی نوسیبێ نە ناوی (الإمامة والسیاسة)، لە نوسینە مێژوویەکانیشدا تەنها کتێبی (المعارف) بەدی دەکەین.

- ئەوەی چاو بۆ کتێبەدا بخشێنێت هەست دەکات، کە إبن قوتەیبە لە دیمەشق و مەغریب نیشتە جێ بووە، لە کاتێکد، ا کە ئەو لە بەغداد نەچووەتە دەرەوە تەنها بۆ دەینەوەر نەبێت.

- ئەو بەرنامەو شێوازەی، کە نوسەری (الامامة والسیاسة) گرتویەتیە بەر تەواو جیاوازە لە بەرنامەو شێوازی ئیبن قوتەیبە لەو کتێبانەی کە لەبەردەستماندان، إبن قوتەیبە بەرنامەی وایە پێشەکی درێژ دەنوسێت بۆ نوسینەکانی وتیایدا بەرنامەو مەبەستی نوسینەکەی ڕوون دەکاتەوە، کەچی نوسەری (الامامة والسیاسة) بە پێچەوانەی ئەوەوە دەچێت و پێشەکییەکەی تەواو کورتە و لە سێ دێر زیاتر تێپەڕ ناکات، ئەمە جگە لەوەی لە شێوەو ئوسلوبدا لێك جیاوازن ئەو شێوەو ئوسلوبەیشمان لە هیچ نوسینێکی إبن قوتەیبەدا بەدی نەکردووە.

- نوسەر گێڕانەوەی لە ئەبو لەیلاوە هێناوە بە جۆرێ، کە یەکتریان بینیبێ، ئەو إبن لەیلایەش محمدی کوڕی عبدالرحمنی کوڕی ئەبو لەیلای فەقیهی قاضي کوفەیە کە لە ساڵی (١٤٨)کۆچیدا کۆچی دوای کردووە، شتێکی زانراوە إبن قوتەیبە لە ساڵی (٢١٣)کۆچیدا لە دایك بووە، واتە: شەست و پێنج ساڵ لە دوای مردنی ئەبو لەیلا.

- بەشێکی زۆری ڕیوایەتەکانی بەشێوەی (تمریض) هاتوون، زۆر جار تیایدا هاتووە: دەگێڕنەوە هەندێ لە مصریەکان لە محمدی کوڕی سولەیمانەوە ڕیوایەتیان کردووە لە هەندێ زانای مصر و لەهەندێ لەزاناکانی مەغریبمان بیستووە، ڕیوایەتیان کردووە لە هەندێ زاناکان بیستومانە لە هەندێ لەوانە ئەو جۆرە ڕێزگرتنانە تەواو دوورن لە شێوەو دەربڕینەکانی إبن قوتەیبەو لە کتێبەنیدا شتی وا نەهاتووە.[1]

---

١ - عقيدة الامام إبن قتيبة، علي العلياني، لا (٩٠).

ـ إبن قوتەیبە پایەیەکی گەورەی لەلای زانایان داگیر کردووە ولەلای ئەوان بە ئەهلی سونەو متمانەی نوسین وئاینی ناسراوە، سەلەفی دەڵێت: إبن قوتەیبە یەکێکە لە کەسە جێ متمانەکانی ئەهلی سونە، إبن حەزم دەڵێت: لە ئاین و زانستیدا جێ ی متمانەیە، خطیبی بەغدادیش لەوەدا شوێن پێی هەڵگرتووە، إبن تیمیە لەو بارەیەوە دەڵێت: إبن قتیبە لەوانەیە، کە دەدرێنەوە پاڵ ئەحمەدو ئیسحاق و سەرخەرانی مەزهەبە ناودارەکانی ئەهلی سوننە[1]، پیاوێك ئەوە پایەی بێت لەلای زانا موحەقیقەکانی زانست عەقڵ قبوڵی دەکات نوسەری کتێبی (الامامة و السیاسة)بێت، کە مێژووی شێواندوەو شتی وای داوەتە پاڵ هاوەڵانی بەرێزکە تیایاندا نەبووە.[2]

ـ نوسەری (الامامة والسیاسة) بەتوندی قسەی کردووە لە ڕووی هاوەڵانی پێغەمبەردا ئەوە إبن عمری بە ترسنۆك وسعدی کوڕی ئەبو وەقاصی بە حەسودی داناوە، باسی محمدی کوڕی مەسلمە دەکات، کە علی کوڕی أبی تالیب(ﷺ) تورە بوو، چونکە مەرحەبای جولەکەی لەخەیبەردا کردووە، عائیشەیش فەرمانی کردووە بە کوشتنی عثمان.[3]

ـ دانەری (الامامة و السیاسة) تەنها بیست و پێنج لاپەڕەی لەسەر هەرسێ خەلیفە أبو بکر و عمر و عثمان نوسیوە، بەڵام دوو سەد لاپەڕەی نوسیوە لەسەر فیتنە و پشێوی نێوان هاوەڵان نوسەر کەوتۆتە کورت کردنەوەی مێژووی جوان وپڕشنگدارو لاپەڕەکانی بە مێژوویەکی پڕوپوچ ڕەش کردونەتەوە، کە تەنها کەمێکی ئەو نوسینە سەلمێنراوە.

ـ مەحمود شوکری ئالوسی لە (مختصر الاثنا عشرية) دا دەڵێت: لەفێڵ و تەڵەکەی ئەوانە ئەوە یە کە سەیری ناوی پیاوە ناودارەکانی ئەهلی سوننە دەکەن هەر ناوێکیان دۆزییەوە وەك ناو نازناوی یەکێك لە خۆیان بێت گێڕانەوەکانی ئەو شیعەیەی دەدەنە پاڵ، جا هەر کەسێك شارەزای ئەهلی سوننە نەبێت وادەزانێت یەکێ لەپێشەواکانیانە و قسەکانی بەهەند وەردەگرێت وپشت بەگێڕانەوەکانی دەبەستێت، وەك (السدی)، کە دوو

١ ـ لسان الميزان (٣/ ٣٥٧) تحقيق مواقف الصحابة (٢/ ١٤٤).

٢ ـ تحقيق مواقف الصحابة (١٤٤/٢).

٣ ـ الامامة والسياسة (١ / ٥٤ ـ ٥٥).

کەس یەکێکیان (السدی الکبیر)ە ودووەمیشیان (السدی الصغیر)ە گەورەکەیان لـەباوەڕپێ کراوی ئەهلی سونەیە و بچوکەکەیان لـە هەڵبەسـتکەرە درۆزنەکانـە، هـەروەها عبداللـە کوڕی موسلیمی کوڕی قوتەیبە، کە جێ متمانەیە لای ئەهلی سونەیە و کتێبێکی دانـاوە بەناوی (المعارف)، عبدالله کوڕی قوتەیبەش کتێبێکی داناوە و ناوی نـاوە (المعـارف) بـە ئامانجی گومڕاکردن[1]، ڕای دروستیش ئەوەیە کە کتێبی (الامامە والـسیاسە) هـی ئـیبن قوتەیبەی شیعەیە نەوەك ئیبن قوتەیبەی سوننەی، خەڵکیش لەبەر یەکچوونی ناویان لێیان تێکەڵ بووە[2]، زۆرێك لە نوسەرانی سەردەم پشتیان بـەو کتێبـە بەسـتووە و بەشـدارییان کردووە لە شێواندنی زۆرێك لە هاوەڵە بەڕێزەکاندا، بۆیە پێویستە خۆمانی لێ بپـارێزین و ئاگاداریان بین بە ڕێگەیەکی زانستی پشت بە تەحقیق و بەڵگە ببەستێت، نوسەری کتێبـی (الامامە والسیاسە) باسی ئەوەدەکات کە: معاویە بانگەشەی خیلافەتی کردووە، ئەمەش لە میانەی ئەو گێڕانەوانەی، کە تیایدا هاتووە، کە إبن (الکواء) بە أبوموسای ئەشعەری (ﷺ) وتویەتی: زانیم کە معاویە وتە بێژی ئیسلامەو باوکی سەرکردەی دەستەکانە وبەبێ ڕاوێژ معاویە بانگەشەی خیلافەتی کردووە، جا ئەگەر بڕوای بەتۆ کرد ئەوا لا دەچێت لـە خیلافەت، ئەگەریش بڕوای پێ نەبوو ئەواقسەکەی ئەوت لێ حەڕام دەبێت[3]، ئەم قـسەیە سەلمێنراوە، کە هی ئەمیری ئیمانداران علی بێـت، بـەڵکو ئـەوە قـسەیەکی هەڵبەسـتراوە وکتێبـەکانی مێـژوو و ئـەدەبیش پـڕ بـوون لـە گێڕانـەوەی لاوازو وهەڵبەسـتراوی وا کـە بانگەشەی ئەوە دەکەن معاویە لەپێناو ماڵ و دەسەڵات وسـەرکردایەتیدا لەگـەڵ عەلیـدا ناکۆك بووە[4]، کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیـە، نـاکۆکی نێوان علـی و معاویـە(ڕەزای خـوا لەهەردوکیان بێت) لەسەر ماوەی چەسپاندنی بەیعەتی معاویە و هاوەڵانی بوو بۆ علی لە پێش ئەوەی یان لەدوای ئەوەی ڕێکبکەون تا بکوژانی عثمـان بکوژرێنەوە، ئەمـەش هـیچ لەسەرباس و خواسی خیلافەت نیە چونکە ڕای معاویـە(ﷺ) وخـەڵکی شـامیش کەلـە

١ ـ مختصر تحفة الاثنا العشرية للالوسي، لا (٣٢).

٢ ـ عقيدة الامام إبن قتيبة، لا (٩٣).

٣ ـ الامامة والسياسة (١/١١٣).

٤ ـ تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٢/١٤٥).

دەوری بوون ئەوەبوو کە علی (ﷺ) بکوژانی عثمان بکوژێتەوە پاشان بەیعەتی پێ دەدەن.[1]

قاضی إبن العربی دەڵێ: هۆکاری جەنگی نێوان ئەهلی شام و ئەهلی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی هەڵوێستی نێوان ئەوانە واتە: خەڵکی عێراق داوایان دەکرد بەیعەت بە علی بدرێت و وشەی پێشەوا دابنرێت خەڵکی شامیش داوایان دەکرد بکوژانی عثمان لەناو ببرێت و دەیان وت: بەیعەت بەکەسێك نادەین، کە بکوژانی عثمان لەخۆ بگرێ.[2]

ئیمامی حەرەمەین جوەینی لەکتێبی (لمعە الادلە) دا دەڵێت: معاویە ئەگەریش جەنگی لەگەڵ عەلیدا کردبێت، بەڵام إنکاری پێشەوایەتی علی نەکردووەو بانگەشەی پێشەوایەتی بۆخۆی نەدەکرد، بەڵکو داوای بکوژانی عثمانی دەکردو پێی وئەبو کەڕاستی پێکاوە، بەڵام هەڵەی کردو نەی پێکا.[3] هیثمی دەڵێت: لەبیرو باوەڕی ئەهلی سوننەو وجەماعە ئەوەیە، کە ئەو جەنگانەی لەنێوان معاویەو عەلیدا (ڕەزای خوا لەهەردوکیان بێت) ڕوی دا، لەبەر ئەوەنەبو کە معاویە ناکۆکی لەگەڵ عەلیدا هەبێت لەسەر خیلافەت إجماع لەسەر ئەوەیە، کە علی شیاوتر بووە، جا ئاژاوەکە بەو هۆکارەوە هەڵنە گیرسا، بەڵکو بە هۆی ئەوەوە هەڵگیرسا کە معاویە ئامۆزای عثمانە عەلیش ڕێگەی پێ نەدا.[4]

گێڕانەوەکان زۆرن و ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە معاویە(ﷺ) هەڵوێستی ئەوەی نیشاندا داوای خوێنی عثمانی کردو ڕایگەیاند ئەگەر سزای بکوژانی عثمان بدرێت دەچێتە نێو گوێڕایەڵی عەلییەوە (ﷺ)، گریمان معاویە (ﷺ) باس وخواسی تۆڵە سەندنەوەی عثمانی کردبێتە بیانویەك بۆ جەنگان لەگەڵ عەلیدا لە پێناو دەسەڵاتدا، ئەی چی ڕوی دەدا ئەگەر علی سزای بکوژانی عثمانی بدایە بەدڵنیاییەوە ئەنجامەکەی ملکەچی معاویەو بەیعەتدانی بوو بە علی، چونکە ئەو لەو ئاژاوەیەدا پەیوەستی

---

١ ـ العواصم من القواصم،، لا (١٦٢).

٢ ـ العواصم من القواصم،، لا (١٦٢).

٣ ـ لمع الادلة عقائد اهل السنة و الجماعة،، لا (١١٥).

٤ ـ الصواعق المحرقة (٢/٦٢٢).

هەڵوێستی خۆی بو، هەر وەك هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا دە جەنگان لەسەر بنەمای سزادانی بکوژانی عثمان، ئەگەر معاویە(ﷺ) لەدەرونی خۆی دا شتێکی دابشاردبایە و ڕای نەگەیاندبێت ئەو کات هەڵوێستەکەلی هەڵوێستی مان و نەمان بوو نەدەکرا هەنگاوی بۆ بنێت ئەگەر تەماع و خواستی هەبوایە.[1] معاویە(ﷺ) لەنوسەرانی وحی و ئەوسەرکردە ناودارانەی موسڵمانان بوو، کە بە نەرم نیانی ناسراووە ئەو ڕێزەیشی بەسە، کە هاوەڵە، جاچۆن پێ وابێت لەگەڵ خەلیفەی شەرعیدا بجەنگێت و خوێنی موسڵمانان برێژێت لە پێناو ماڵ و دەسەڵاتێکی کاتیدا. معاویە دەیوت سوێند بەخوا ئەگەر دوشتم بخرێتە بەردەم لە نێوان خواو جگە لە خوادا ئەواخوا هەڵدەبژێرم.[2] پێغەمبەریش(ﷺ) لە بارەی معاویەوە(ﷺ) فەرمویەتی: (اللهم اجعلة هاديا و مهديا واهدبِهِ)[3] واتە: (خوایە بیکەیتە ڕێنیشاندراو و ڕێنیشاندەرو بەهۆیەوە ڕێنومایی کەسان بدەیت)، هەروەها فەرمویەتی: (اللهم علمه الكتاب وقه العذاب)[4] واتە: (خوایە لەقورئان شارەزای بکەیت و لەسزا بیپا ڕێزیت). لایەنی هەڵەی معاویە لە هەڵوێستی کوژرانی عثماندا(ﷺ) لەوەدا دەردەکەوێت، کە ڕازی نەبوو بەیعەت بدات بە علی(ﷺ) پێش ئەوەی هەنگاو بنێت بۆ کوشتنەوەی بکوژانی عثمان لەگەڵ ئەوەشدا ترسی معاویە لە خۆی و لە هەڵوێستەکانی پێشویدا بەرامبەر بەو ئاژاوە گێڕانەو سوربوونیان لەسەر کوشتنی، بەڵکو ترسی ئەوەی هەبوو، کە بکەوێتە ناویانەوە لەگەڵ ئەوەی دەیزانی، کە نابێ داواکاری خوێن حکوم بکات، بەڵکو دەبێت بچێتە ژێر گوێڕایەڵیەوەو سکاڵاکەی بەرز بکاتەوە بۆ حاکم لەلای ئەو داوای ماف بکات.[5] زانایانی فەتوا یەکدەنگن لە سەر ئەوەی بۆ کەس دروست نییە تۆڵە لە کەسێك بکاتەوەو مافی خوی لێ بسێبێتەوە بەبێ دەسەڵاتدار یان دەبێ دەسەڵاتدار ئەو کارەی بداتە دەست چونکە ئەوە دەبێتە مایەی ئاژاوە و بڵاوبوونەوەی

---

١ ـ تحقيق مواقف الصحابة (٢/١٥٠).

٢ ـ سير اعلام النبلاء (٣/١٥١).

٣ ـ صحيح سنن الترمذي للالباني، رقم: ٣٠١٨(٣/٢٣٦).

٤ ـ فضائل الصحابة (٢/٩١٣)اسناده صحيح.

٥ ـ تحقيق مواقف الصحابة (٢/١٥١).

پشێوی[1]، دەکرێت بڵێین: معاویە (ﷺ) ئیجتیهادو تەئویلی کردووەو گومانی وأبووە کە حەق لەگەڵ ئەودایە، بۆیە پاش ئەوەی خەڵکی شامی کۆکردەوە وتارێکی پێشکەش کردن و باسی ئەوەی بۆ کردن کەئەو (خوینگری) کەسی عثمانە _ئامۆزای بوو_ عثمانیش بە ستەملێکراوی کوژراوە، ئینجا ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُورًا﴾ [الاسراء: ٣٣]، پاشان وتی: من حەزدەکەم خۆتان پێم بڵێن: من بکوژانی عثمان چی لێ بکەم خەڵکی شامیش هەمویان هەستان و وەڵامیان دایەوە، کە داوای خوێنی عثمان بکات و، لەسەر ئەوەش هەموو بەیعەت و بەڵێنیان و پێ دا، کە ماڵ وگیانیان بەخت بکەن تا تۆڵەی خۆیان بسێننەوە یان لەناو بچن[2]، ئەو ڕووداوە سەخت و ناخۆشە، حەسەنی کوڕی علی هاوسەردەمیان بوو و هەڵوێستی هەر هاوەڵێکی لە ئاژاوە کەدا دەزانی و خۆی خوازیاری ڕێککەوتن و ئاشتی بوو، بەڵام ڕێگەیەکی دەست نەکەوت تا پەیڕەوی بکات.

## ٢- ئەمیری ئیمانداران علی پاش جەنگی صفین ڕێگەی نادات قسە بە معاویەو خەڵکی شام بوترێت:

لە صفین دا جەنگی نێوان علی و معاویە هەڵگیرسا، ئەمەیشم بە درێژی لە کتێبی (اسمى المطالب فى سيرة امير المؤمنين على ابى طالب)باسکردووە. جەنگەکە توند بوو کردو بەرەو ئەوە دەچو خەڵکی عێراق تیایدا سەرکەون بەسەر خەڵکی شامداو ڕیزی شامییەکان پەرش و بڵاوی تێکەوت و خەریك بوو شکست بخۆن، لەوکاتەدا خەڵکی شام لەسەر ڕمەکان قورئانیان بەرز کردەوەو وتیان: وا خەڵکی لەناو چوو با ئەم قورئانە لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بێت. دەبێ پاش خەڵکی شام کێ سنورەکانی شام بپارێزێت و پاش خەڵکی عێراق کێ هەبێت سنورەکانی عێراق بپارێزێت ؟ کاتێك خەڵکەکە قورئانە کانیان بینی، کە بەرز کراونەتەوە وتیان: دەچین بەدەم قورئانەوەو ملی بۆ کەچ دەکەین[3]، جا بانگەواز بۆ دادوەری کردنی قورئان بەبێ دووپات و دڵنیایی دانە دەستی بکوژانی عثمان بە معاویەو

---

١ ـ تفسير القرطبى (٢/٢٥٦).

٢ ـ صفين لابن مزاحم، لا ٣٢، تحقيق مواقف الصحابة (٢/١٥٢).

٣ ـ تنزية خال المؤمنين معاوية، لا ٣٦، نقلاً عن تأريخ الطبري.

رازیبون به دادوەری بەبێ دوپات کردنـەوەی چـونی معاویـە بـۆ ژێـر دەسـەڵاتی علـی و بەیعەت پێدانی گەشەسەندنێك بوو، کە ڕووداوەکانی جەنگی صفین سەپاندیان، چونکە ئەو جەنگەی تووشی ژیانی زۆریّ لەموسڵمانان بووبـوو، ئاڕاسـتەیەکی کۆمەڵایـەتی نیـشاندا کەوای دەبینی وەستانی جەنگ و خوێن ڕێژی پێویستییەکە، کە پارێزگاری شـان وشـکۆی ئوممەت و بنیادنانی هێزە لەبـەردەم دوژمنـدا دەیخوازێـت، ئەمـەیش بەڵگەیەکـە لەسـەر زیندوێتی و هوشیاری و ڕۆڵی لەبڕیارداندا[1]، ئەمیری ئیمانداران علی(رضي الله عنه) ڕازی بـوو لـە صفین دا جەنگ ڕابوەستێت و بەدادوەری ڕازی بوو، ئەوەشی بە فەتحێك زانـی و گەڕایـەوە بۆ کووفە و کۆمەڵێ هیوای بە دادوەرییەکە هەبوو تا ناکۆکی نەهێڵێ و یەکدەنگی و یـەك ڕیزی و بەهێز بوونی دەوڵـەت و گەڕاندنـەوەی سـەر لـەنوێی بزوتنـەوەی فتوحـات بـەدی بهێنێ، ئەمیری ئیمانداران پاش گەشتە جەنگییە کـانی لـە صـفین، بـەناو کوژراوەکانـدا دەگەڕاو لەسەر کوژراوەکانی خۆی وکوژراوەکانی معاویە ڕاوەستاو ووتی: خوا لێتان خـۆش بێت خوا لێتان خۆش بێت، لەهەردوو لاتان خۆش بێت.[2] یەزیدی کوڕی ئەصەم دەڵێـت: کاتێ ڕێکەوتنی نێوان علی و معاویە کرا، علـی بـەناو کوژراوەکانیـدا دەگـەڕاو دەیـوت: ئەوانـە لەبەهەشـتدان، پاشـان دەچـو بـۆ نـاو کوژراوەکـانی معاویـەو دەیـووت: ئەوانـە لەبەهەشتدان، کارەکەیش دەمێنێتەوە بۆ من و معاویە[3]، علی(رضي الله عنه)لەبارەیانەوە دەیوت: ئەوانە باوەڕدارن.[4] قسەکانی لە صفین دا جیاواز نەبوون لـە قـسەکانی لـەبارەی خـەڵکی جەمەلەوە[5]، دەگێڕنەوە علی(رضي الله عنه) کاتێك بیستی کە دوو لە هاوەڵە کانی قسەو لەعنەت لە خەڵکی شام دەکەن، نوێنەری نارد بۆ لایان ووتی: دەست لەو کارەتان هەڵبگرن، کە بۆم باسکراوە ئەوانیش هاتن و ووتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئایا ئێمە لەسـەر حـەق نـین و ئەوان لەسەر ناحەق؟ فەرموی: بەڵێ سوێند بە خوای کەعبە وتیان: دەی بـۆ ڕێگـەمان لێ دەگریت قسەیان پێ بڵێین و لەعنەتیان لێ بکەین؟ وتی: حەزناکەم ئێوە ببنە لەعنەتکـەر، بەڵکو بڵێن: خوایە خوێنی هەردو لامان بگرەوەو نێوانی ئێمەو ئەوان چاك بکـە و دوریـان

---

١ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الامويين، لا (٣٨).

٢ ـ خلافة علي بن ابي طالب، عبد الحميد، لا(٢٥٠).

٣ ـ مصنف إبن ابي شيبة (٣٠٣/١٥) سند حسن.

٤ ـ تاريخ ديمشق (٣٢٩،٣٣١/١)خلافة خلافة علي، لا(٢٥١)

٥ ـ خلافة علي، عبد الحميد لا(٢٥١)، تنزيه خال المؤمنين، لا (١٦٩).

بخەرەوە لە گومڕاییيان هەتا حەق بەسەر نەزانیدا وەربگرن و کێ یـاخیو لاساری نوانـدووە وازی لێ بهێنێ[١]، بەڵام ئەوەی دەوترێ علی لە قنوتی نوێژەکانیدا لەعنەتی لە معاویە و یارانی کردووە، معاویەش لە قنوتی نوێژەکانیدا لەعنەتی لە علی و إبن و عباس و حـسن وحوسەین کردووە، لە ڕووی سەنەدەوە نا چەسپێ، چونکە ئـەبو موخنـەف لـوطی کـوڕی یەحیای تێدایە کە لە ڕیوایەتەکانیدا متمانەی پێناکرێت، هەروەك لە ڕاستترین کتێبەکانی شیعەی لای خۆیاندا هاتووە، کە نابێ جنێو بە هاوەڵان بدرێت، علی ڕێگەی نەداوە کـەس قسە بڵێ بە معاویەو هاوەڵانی و دەڵێ: من حەز ناکـەم جنێـو فـرۆش بـن، بـەڵام ئەگـەر کەوتنە وەسفی کارو باسی باریان قسەی باشتر و عوزری چاکتر لە جیاتی جنێـو پێـدانیان بڵێن: خوایە خوێنی هەردوو لامان بگرەوە و نێوانمان چاك بکە[٢]، جا ئـەو جنێـو پێـدان و کافر کردنـە پـەیڕەوی ئـەمیری ئیمانـداران نـەبووە، دان پێـدانانی ڕاسـترین[٣]، هـەروەك حسن(رضي الله عنه) هاو سەردەمی ڕووداوەکان بووە، هەڵوێستی باوکی لەبارەی خـەڵکی شـامەوە دەبیست و دەدی، ئەو دیدە ساغ ودروستەی هاوەڵانی معاویـە یارمـەتی حەسـەنی کـوڕی علی دا، تا ئەو پرۆژەی ئاشتی و ڕێککەوتنەی دابڕێژێت، کە بەرەو یەك ڕیزی ئوممەتی برد و بە فەزڵی خواو پاشان بەلێزانی و تێگەیشتنی قووڵی حسن لە مەبەسـتەکانی ئیـسلام و دانای و وردی بە زانستی چاکەو بەرژەوەندی و خراپەو گەندەڵی یەکان هاتە دی.

### ٣- کوژرانی عەمماری کوڕی یاسر (رضي الله عنه)لە صفین و شوێنەواری لە سەر موسڵمانان:

فەرمودەکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ عەممار گە فەرمووی: (تقتلك الفئة الباغيـة)[٤]، بـە یەکێ لە فەرموودە صحیحەکان لەپێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) ڕیوایەتکراوە، شەهید کردنی عەممار شـوێنەواری هـەبووە لەسـەر جـەنگی صـفین، عـەممار پێـشەوایەك بـوو لـە هـاوەڵانی پیغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، کە بۆکوێ بچوایە شوێنی دەکەوتن، خوزەیمەی کوڕی ثابت لە صفین بـوو ئەو شمشێرەکەی نەخستە کار، بەڵام کوژرانی عەمماری بینی شمشێرەکەی هەڵگرت و کەوتە

١ ـ الاخبار الطوال، لا (١٦٥) نقلاً عن (تحقيق مواقف الصحابة)، (٢/٢٣٢).

٢ ـ نهج البلاغة، لا (٣٢٣).

٣ ـ اصول مذهب الشيعة (٢/٩٣٤).

٤ ـ مسلم: رقم (٢٩١٦ ).

کوشتنی خەڵکی شام، چونکە فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ)ی لە بارەی عەمارەوە بیستبوو (تقتلك الفئة الباغية)[1]، بەردەوام خوزەیمە جەنگا تا کوژرا[2]، کوژرانی عەممار کاریگەری هەبوو لەسەر سەربازگەی معاویە وەك عەمری کوڕی عاص و عبداللە کوڕی عەمری کوڕی عاص، أبوو ئەعوەری سەلمی کە هەردووکیان لە یەك سەرچاوەوە ئاویان دەخواردەوە لە کاتی ئاو خواردنەوەدا لەبارەی کوژرانی عەمماری کوڕی یاسرەوە قسەیان دەکرد، کە عبداللە کوڕی عەمر بە باوکی ووت: بە ڕاستی ئەو پیاوەمان کوشت، کە پێغەمەر(ﷺ)لە بارەیەوە دەفەرموێت: (تقتلك الفئة الباغية)، عەمریش بە معاویەی ووت: بە ڕاستی ئەو پیاوەمان کوشت، کە پێغەمبەر(ﷺ)لە بارەیەوە وای فەرمووە، معاویە(رضي الله عنه) ووتی: بێدەنگ بە سوێند بێ بەخوا تۆ خۆت پێ ناگیرێت بۆچی ئێمە کوشتومانە؟ ئەوە کوشتویەتی، کە هێناویەتی[3]، ئەو لێکدانەوەیەی معاویە لە نێوان خەڵکی شامدا بڵاو بوویەوە وەك چۆن ئاگر پووش دەسوتێنێ.

لە ڕیوایەتێکی صەحیحدا هاتووە، کە عەمری کوڕی حەزم چوە لای عەمری کوڕی عاص ووتی: عەممار کوژراو پێغەمبەر(ﷺ)لە بارەیەوە فەرموویەتی: (تقتلك الفئة الباغية) عەمری کوڕی عاصیش بەترسەوە هەستاو دەیویست بگەڕێتەوە، کە معاویە(رضي الله عنه) هاتە ژوورەوە و پێ ی ووت: ئەوە چی یە؟ ووتی: عەممار کوژرا ئیتر چی بێ! عەمر ووتی: لە پێغەمبەرم بیستوە، کە پێ ی دەفەرموو (تقتلك الفئة الباغية) معاویەش ووتی: بۆ وا ڕاوەستاوی بۆچی ئێمە کوشتومانە بە ڕاستی علی(رضي الله عنه) هاوەڵەکانی کوشتویانە هێنایان تاختسیانە ناو ڕمەکانمانەوە، یان ووتی: ناو شمشێرە کانمانەوە[4]، هەروەها لە ڕیوایەتێکی صحیحدا هاتووە: دوو پیاو هاتنە لای معاویەو دەمەقاڵەیان بوو، لە سەر عەممار هەریەکێکیان دەیوت: من کوشتومە عبداللە کوڕی عەمر وتی: با یەکێکیان گیانی پێشکەش بە خاوەن سەرەکە بکات، چونکە گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە دەیفەرموو: (تقتلك الفئة الباغية) معاویە ووتی: دەی ئیتر لەگەڵ ئێمەدا چی

---

١ ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ خلافة علي، ص(٢١١)، مجمع الزوائد(٧٢٤٢)، قال فيه رواه الطبراني وفيه معشر وهو لين.

٣ ـ مصحف عبد الرزاق (١١/٢٤٠) بسند صحيح.

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

دەکەیت؟ عبداللە ووتی: باوکم لەلای پێغەمبەر(ﷺ) شکاتی کردو ئەویش پێی فەرمووە: تا باوکت زیندووە گوێڕایەڵی بەو بێ گوێیە مەکە بۆیە من لەگەتاندام و شەڕ ناکەم.[1]

لەو ڕیوایەتانەی پێشوەوە تێبینی ئەوە دەکەین، کە هاوەڵی شارەزا عبداللە کوڕی عمر (رضي الله عنه) سور بوو لەسەر قسەی حەق و ئامۆژگاری، ئەو وای دەبینی معاویەو سەربازەکانی دەستەی یاخین، لەبەر ئەوەی عەمماریان کوشتووە ئەو قسەیەشی لە چەند بۆنەیەکی جیاوازدا دووبارە کردۆتەوە، بێگومان کوژرانی عەممار(رضي الله عنه) بەهۆی ئەو فەرمودەیەوە کاری کردە سەرخەڵکی شام، بەڵام معاویە (رضي الله عنه) بە شێوەیەکی نادروست فەرموودەکەی لێکدایەوە، ڕاستیش نی یە، کە ئەوانەی عماریان هێناوە بۆ جەنگ ئەوانە کوشتویانە[2]، علی (رضي الله عنه) بەرپەرچی قسەکەی معاویەی دایەوەو ووتی: (دەی بەو جۆرە بێت پێغەمبەر(ﷺ) حەمزەی کوشتوە کاتێك بردی بۆ جەنگ) ئەم قسەیەی علی ڕەدتکی وەلام و بەلگەیەکی بێ ڕەخنەیە[3]، هەروەها کوژرانی عەممار لە عەمری کوڕی عاص کرد، بەڵکو شەهید بوونی عەممار پاڵنەری بوو تا عەمری کوڕی عاص هەوڵ بدات کۆتای بە جەنگەکە بهێنێت[4]، عەمر (رضي الله عنه) وتی: خۆزگە دەخوازم پێش بیست ساڵ لەم ڕۆژە بمردمایە.[5]

لە بخاریدا هاتووە لە ئەبو سعیدی خدری یەوە(رضي الله عنه) دەڵێت: ئێمە یەك یەك خشتمان هەڵدەگرت، عەممار دوو دوو خشتی هەڵدەگرت پێغەمبەر(ﷺ) بینی فەرمووی: (ویح عمار تقتله الفئة الباغية يدعوهم الى الجنة ويدعونه الى النار) (هاوار بۆ عەممار دەستێکی یاخی دەیکوژن بانگیان دەکات بۆ بەهەشت، کەچی ئەوان بانگی دەکەن بۆ دۆزەخ) عەممار وتی: پەنا ئەگەرم بەخوا لە فیتنەو ئاژاوەو ناڕەحەتی[6]، عبدالزوبیر دەڵێت: فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە موتەواتری هاتون، کە فەرموویەتی: (تقتل

---

١ ـ مسندا احمد (١١/١٣٨ ـ ١٣٩).

٢ ـ خلافة علي بن ابي طالب، عبد الحميد لا(٣٢٥).

٣ ـ التذكرة(٢/٢٢٣).

٤ ـ معاوية بن أبي سفيان، الغضبان، لا (٢١٥).

٥ ـ انساب الاشراف (١/١٧٠)، عمر بن العاص، للغضاب لا(٦٠٣).

٦ ـ البخاري، رقم: (٤٤٧).

عمار الفئة الباغية)، واتە: (دەستەیەکی یاخی عەممار دەکوژن) ئەمەیش هەواڵدانی پێغەمبەر(ﷺ)بە غەیب ونیشانەی پێغەمبەرایەتی یەتی، ئەویش لەڕاسترین فەرموودەکانە.[1] ذهبی پاش ئەوەی فەرموودەکەی هێناوە دەڵێت: لەم بابەدا لە چەند هاوەڵێکەوە هاتووە بۆیە فەرموودەکە متەواترە.[2]

٤- تێگەیشتنی زانایان لە فەرموودەکەی پێغەمبەر بۆ عەممار(رضي الله عنه): (تقتلك الفئة الباغية).[3]

أ- إبن حجر دەڵێت: لەم فەرموودەیەدا نیشانەیەك لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی و گەورەی یەکی دیار هەیە بۆ علی(رضي الله عنه)و عمار(رضي الله عنه)، بەرپەرچدانەوەیەکە بۆ(نەواسیب)[4]، کە بانگەشەی ئەوە دەکەن، علی(رضي الله عنه) لە جەنگەکانیدا نە پێکاوە[5]، هەروەها دەڵێت: فەرموودەکە(تقتل عمار الفئة الباغية) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە علی(رضي الله عنه) لەو جەنگانەدا ڕاستی پێکاوە، چونکە هاوەڵەکانی معاویە کوشتیان.[6]

ب - نەوەوی دەڵێت: هاوەڵن لە جەنگی صفیندا دەکەوتنە شوێن عەممار، چونکە دەیانزانی عەممار لەگەڵ دەستەی دادپەروەردایە بەپێی فەرموودەکە.[7]

ج - إبن کثیر دەڵێت: علی و هاوەڵەکانی(رضي الله عنهم) لە ناو دوو تاقمەکەدا نزیکترینیان بوو لە حەق و زیاتر لە هاوەڵانی معاویە(رضي الله عنه)، بەڵکو هاوەڵانی معاویە(رضي الله عنه) لەوان یاخی بوو بوون، هەرروەك لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە فەرموودەکەی شوعبە لە ئەبو

---

١ ـ الاستیعاب (٣/١١٤٠).

٢ ـ تسیر أعلام النبلاء (١/٤٢١).

٣ ـ مسلم، رقم: (٥٩١٦).

٤ ـ مەبەست لەنەواسیب یەکێ لە دەستە بیدعە چیەکانە کە لە بیرو باوەڕیاندا هاتووەکە تەوفیق لە بیرو باوەڕی ڕاستدا ناکرێت لە هاوەڵاندا، شەیتان ئەو بیرو باوەڕەی بۆ جوان کردوون کە چوار خەلیفە ڕاشدینەکەو یەکێ لە پێشەوا ڕێنموکراوەکان علی کوڕی ئەبوو تالیبیان (رضي الله عنه) خۆش ناوێت و بە ناپەنداریشی دەزانن ئەگەر ڕقت لێی بێت و دژی بیت و شتی وای پێ بڵێیت کە ئەو لێی بە دوور بێت، هەر وەك ئەو ڕقەشیان هەبووە بۆ کەسانی دیکەی ناڵو بەیتیش وەك کوڕەکەی علی (حەسەنی کوڕی علی) و چەندێکی دی.

٥ ـ فتح الباري(١/٦٤٦).

٦ ـ هەمان سەرچاوە (١٣/٩٢).

٧ ـ تهذیب الاسماء وللغات (٢/٣٨).

سەلەمەوە لە أبو (نظرە)ەوە لە أبی سعیدی خدری یەوە(ﷺ)، دەڵێت: لە کەسێکی چاکتر لە خۆمم بیست ـ واتە أبوو قەتادە ـ کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە عەماری(ﷺ) فەرمووە: (تقتلك الفئة الباغية)[1]، هەروەها دەڵێت: ئەوەش کوژرانی عەماری کوڕی یاسرە بوو لەگەڵ ئەمیری ئیماندارانداعلی کوڕی أبوو تالیب(ﷺ)، کە خەڵکی شام کوشتیان، ئەو نهێنی یەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی پێدابوو بە دیار کەوت، کە دەستەیەکی یاخی دەیکوژن و بەوەیش بە دیار کەوت کە علی ڕاست و حەقەو معاویە یاخی بووە ئەمەش لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتین[2]

د - ذهبی دەڵێت: ئەوان دەستەیەکی ئیمانداران بوون یاخی بوون لە علی ئەمەش بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)کە بەعەماری فەرموو (تقتلك الفئة الباغية).[3]

ه- قاضی أبو بکری عەرەبی دەڵێت: لە فەرمایشتی خوای گەورەدا (وإن طائفتان) ئەم ئایەتە بنەمایە لە کوشتاری نێو موسوڵماناناداو یەکلایی یە بۆ جەنگی لێکدەرەوەکان (متأولين) قسەی هاوەڵانیشی لە سەرە، ناودارانی ئەم ئومەتە پەنایان بۆ بردووە و منیش لە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دەچم، کە دەفەرموێت: (تقتلك الفئة الباغية).[4]

و - إبن تیمیە دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لە سەر دروستی پێشەوایەتی علی و پێویستی گوێڕایەڵی بوونی، ئەوەش بانگەواز بۆ گوێڕایەڵی ئەو دەکات بانگەواز بۆ بەهەشت دەکات ئەوەش بانگەشە بۆ ئەوە دەکات، کە جەنگی لەگەڵ بکرێت بانگەشە بۆ دۆزەخ دەکات. با بە هەر جۆرێك لێکی بداتەوە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە دروست نی یە لەگەڵ عەلیدا بجەنگیت لەسەر ئەمەش ئەو کەسەی لەگەڵیدا دەجەنگێت هەڵە کارە ئەگەریش لێکدانەوەی بۆ بکات، یان یاخی ە بەبێ تەئویل ئەوەش ڕاسترین قسەیە بۆ هاوەڵانمان، حوکم دانە لەسەر ئەو کەسەی لەگەڵ عەلیدا(ﷺ) جەنگاوە هەڵەیە، ئەمە مەزهەبی پێشەوایانە بۆ هاوەڵانمان، هەروەها مەزهەبی ئەو زانا فیقە ناسانەی، کە لەسەر ئەمە

---

١ ـ البداية والنهاية (٦/٢٢٠).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٧/٢٧٧).

٣ ـ سير اعلام النبلاء (٢/٢٠٩).

٤ ـ أحكام القران (٤/١٧١٧).

کوشتنی یاخی لێکدەرەوەکانیان هێناوە[1]، هەروەها دەڵێت: لەگەڵ ئەوەی علی زیاتر حەق بووە لەوەی کەلێی جودا بوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی دەستەی یاخی عەمماریان کوشتووە - وەك دەقی لەسەر هاتووە - پێویستە باوەڕوەمان بە هەرچیەك بێت، کە لە خواوە هاتووە، دان بە هەموو ڕاستیدا، بنێین هەواو ئارەزوومان نەبێت و، بەپێ ی زانیاری قسە نەکەین، بەڵکو ڕێگەی زانست وداد پەروەری بگرینە بەر، ئەوەش شوێنکەوتنی قورئان و سونەت، بەڵام ئەوەی دەست بە هەندێ لە حەقەوە دەگرێت و هەندێکی تری بەردەدات ئەوە لەوێوە دووبەرەکی و جیاوازی سەر هەڵدەدات.[2]

ز- عبدالعزیز بن باز دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەکەی عەماردا(رضي الله عنه) دەفەرموێت: (تقتل عمار الفئة الباغية) جا لەجەنگی صفیندا معاویە و هاوەڵەکانی کوشتیان، بۆیە معاویەو هاوەڵەکانی یاخی بووە، بەڵام ئیجتیهادیان کردووە و وایان زانیوە ئەوان ڕاستیان پێکاوە لە داواکردنی خوێنی عثماندا.[3]

ح- سعید حەوا دەڵێت: پاش ئەوەی عەممار کوژرا دەقی لەسەر هاتووە و ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کە دەستەی یاخی ئەو دەکوژن، بۆ دوودڵو ڕاڕاکان ڕوون بۆوە، کە علی لەسەر حەقە و جەنگ لەگەڵیدا پێویست و واجبە، بۆیە إبن عمر باس لە دوا کەوتنی خۆی دەکات، بێ هیوا بوونیەتی بە هۆی ئەو دوا کەوتنەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی واجب و پێویستی یەکی پشتگوێ خستووە، ئەویش سەرخستنی پێشەوای حەقە بەسەر ئەوانەی بە ناحەق لە ڕێی دەرچوون، هەروەك فیقە ناسانیش فتوای ئەوەیان داوە[4]، لە ڕاستیدا حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) تەواو دڵنیا بووە و شارەزایی یەکی پتەو و ڕێکو پێکی هەبوو بەوەی کە باوکی لەسەر حەق بوو.

---

١ - مجموع الفتاوى(٤/٤٣٧).

٢ - هەمان سەرچاوە(٤/٤٤٩ - ٤٥٠).

٣ - فتاوى والمقالات متنوعة (٦/٨٧).

٤ - الاساس في السنة (٤/١٧١٠).

## ٥- هەڵوێستی حەسەنی کوڕی علی لەو جەنگەدا:

هەڵوێستی حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) لەو جەنگەدا، کە لەنێوان هاوەڵـە بەڕێزەکانـدا (ڕەزای خوایان لێ بێ) ڕوویدا هەڵوێستی ئەلی سوننە و جەماعە بوو، کە ئـەویش بریتـی بوو، لە دەستگرتنەوە لەو گرفتەی نێوانیان مەگەر ئەوەی پەیوەستی خۆیـان بێـت لـەوەی ببێتە هۆی هاتنەکایەی دوژمنایەتی و، کینە ورق بۆ یەکێ لە دوو دەستەکە، ئەوان دەیان وت: پێویستە لە سەر هەموو موسڵمانێك هەموو ئەو هاوەڵانـەیان خـۆش بوێـت و لێیـان ڕازی بێت و سۆزی هەبێت بۆیان و پایەیان وەك خۆیان بەرز ڕابگرێت و، بزانێت کامیان لە پێشتر ڕابگرێت و پلەو پایـەیان بـڵاو بکاتـەوە، ئـەوەش، کـە لـە نێوانیانـدا ڕوویـدا لـە ئیجتیهادێکەوە بوو هەموویشیان لە هەردوو بارەکـەدا ئەگـەر پێکابێتیـان یـان هەڵـەیان کردبێت هەر پاداشت وەردەگرن، بەڵام ئەوەی پێکاویەتی لە هەڵەکارەکەی ئیجتیهادەکـەی زیاترە و بکوژو کوژراوی هاوەڵان لە بەهەشت دان.

ئەهلی سونەت و جەماعە ڕێگەیان نەداوە، کە قسە لە گرفتی نێوانیـان پـێش ئـەوەی کۆمەڵێ وتەی ئەهلی سونە بهێنم، کە هەڵوێستیان نیشان دەدەن لە بارەی ئەوەی لە نێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە هەندێ دەق دێنم، کە تێیدا ئاماژە دەکات بۆ ئەو کوشـتنەی، کـە لـە نێوان هاوەڵاندا ڕوویدا و تێی کەوتن، ئەمەش ئەو دەقانەیە:[1]

أ- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩]، جا لـەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرمان دەکات تا نێوانی موسڵمانان چاك بکرێت ئەگەر لەنێوانیاندا جەنگێك ڕوویدا، چونکە ئەوان بران و ئەو جەنگـە لەوەسـفی ئیمـان دەریـان ناکـات، جـا ئەگەر جەنگی نێوان ئیمانداران ڕووبدات و ئەو کارە لە ئیمان دەریان نەکات، لەبـەر ئـەوە خوای گەورە لە ئایەتی دواتردا وەسفیان دەکات: (أنما المؤمنين أخوة فأصلحوا بين أخـويكم) دەی ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر(ﷺ)، کـە لەجـەنگی جەمـەل و دواتریـدا جـەنگیان کـرد

١ ـ عقيدة اهل السنة في الصحابة (٢/٧٢٧).

یەکەمین کەسانن، کە چوونەتە ناو ئەو ناوی ئیمانەی، کە لەو ئایەتەدا باس کراون، ئەوان بەردەوام لە لای پەروەردگاری خۆیان باوەڕدارێکی دروست و تەواو بوون و ئەو ناکۆکی یەی نێوانیان بە هیچ جۆرێك کاری نەدەکردە سەر ئیمانەکەیان، چونکە کارەکەیان لە ئیجتیهادەوە بوو.[1]

ب- لە أبو سعیدی خدریەوە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (تمرق ما رقة عند فرقة من المسلمين تقتلهم اولى الطائفتين بالحق)[2]، واتە: (کۆمەڵێك لەناو موسڵماناندا دەچنە دەرێ، ئەو کۆمەڵەی نێو دوو کۆمەڵەی موسڵمانان، کە زیاتر لەسەر حەق دەیان کوژن)، ئەو کۆمەڵەی، کە لە فەرموودەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە، لە ناکۆکی نێوان علی و معاویەدا نی یە، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) هەردوو لای بە موسڵمان و پەیوەست بە حەق وەسف کردووە، ئەو فەرموودەیەش نیشانەیەکە لەنیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) چۆنی باسکردبوو بەو جۆرە ڕوویدا، لە فەرمودەکەدا حوکمی موسڵمانی هەردوو کۆمەڵەکە دراوە ـ خەڵکی شام و خەڵکی عێراق ـ تیایدا هاتووە، هاوەڵانی علی زیاتر لە حەق نیزیکن، ئەوەش مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەمەماعەیە کە حەسەنی کوڕی علی کوڕی أبوو تالیبی (ﷺ) لەسەر بوو، کە علی پێکاویەتی بامعاویە(ﷺ) ئیجتیهادیشی کردبێت، لە لای خوا پاداشت وەردەگرێت، بەڵام علی پێشەوایەو دوو پاداشتی هەیە وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: (اذا اجتهد الحاكم فأصاب فله اجران او اذا اجتهد فأخطاء فله اجره).[3]

ج- لە ابی بکرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) وتاری پێشکەش دەکرد کە حسن هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (إبني هذا سيد و لعل الله ان يصلح به بين فئتين من المسلمين)[4]، واتە: (ئەم کوڕەم گەورەیە، ئومێد دەکەم خوای گەورە بە هۆیەوە نێوانی دوو کۆمەڵی موسڵمانان ڕێکبخات)، لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) شایەتی ئیسلام دەدات بۆ هەردوو کۆمەڵی ئەهلی عێراق و ئەهلی شام، لە فەرموودەکەدا بەر

---

١ ـ العواصم من القواصم (١٦٩/١٧٠)، احكام القران (١٧١٧/٤).

٢ ـ رواه مسلم (٧٤٥/٢).

٣ ـ البخاري مع شرح في فتح الباری (٣١٨/١٣).

٤ ـ البخاري: كتاب الفتن، رقم: (٧١٠٩).

پەرچدانەوەیەکی ڕوون هەیە بۆ ئەو خەوارجانەی کە علی و هاوەڵەکانی و معاویەو هاوەڵەکانیان بە بێ باوەڕ دەزانی، فەرموودەکە شایەتی دانی موسڵمانیەتی هەردوو کۆمەڵەی لە خۆ گرتووە، بۆیە سوفیانی کوڕی عویینە دەیوت: فەرموودەکەی، کە دەفەرموێت دوو کۆمەڵی لە موسڵمانان تەواو سەرسامان دەکات. بەیهەقی دەڵێت: لەبەر ئەوە سەرسامیان دەکات لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەموویانی بە موسڵمان ناوزەد کردووە، ئەوەیش هەواڵێکی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بەوەی حسن لە دوای کۆچی دوای علی کاروبارەکەی دایە دەست معاویەی کوڕی أبوو سوفیان.[1]

ئەم فەرموودانەی پێشوو تیایاندا ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەهلی عێراق ئەوانەی لەگەڵ علی(رضي الله عنه) بوون، ئەهلی شام ئەوانەی لەگەڵ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان(رضي الله عنه) بوون، پێغەمبەر(ﷺ)بە ئوممەتی خۆی وەسفی کردوون[2]، هەروەك وەسفی کردوون هەموویان پەیوەستی حەقن و لێ ی دەرنەچوون، هەروەك شایەتی یان بۆ دەدات، بەردەوامن لەسەر ئیمان و لە ئیمان دەرنەچوون بەهۆی ئەو جەنگەی لە نێوانیاندا ڕوویدا، هەموویان دەچنە ناو فەرمایشتی پەروەردگارەوە: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ [الحجرات: ٩]، پێشتریش وتمان، کە ناوەڕۆکی ئایەتەکە ئەوەیە، هەموو هاوەڵان ڕێکبخات و بە هۆی ئەو جەنگەوە کافرو فاسق نابێ، بەڵکو لێکدانەوەو ئیجتیهادیان کردووە. لەو جەنگەیشدا حوکم بۆ علی کوڕی أبوو تاڵیبە (رضي الله عنه) وەك باسمان کرد، جا پێویستە لە سەر موسڵمانان و ئەو کەسەی بانگەشەی خۆشەویستی ئالو بەیت دەکات لەو ڕووداوەی نێوان هاوەڵاندا ڕێڕەوی دەستەی ڕزگار بوو دەستەی سوننەو جەماعە ئەوانە بگرێتە بەر کە پێشەواو گەورەیانن کە ئەمیری ئیمانداران علی و دوو کوڕەی حسن وحوسەینن، ئەویش بە دەست گرتنەوە لەوەی لە نێوانیاندا ڕوویداوە و تەنها بەو جۆرە تاو بدەنە ئەو مەیدانە کە شیاوی هاوەڵانی بەڕێزە.

## ٦- شەهید بوونی ئەمیری ئیمانداران علی (رضي الله عنه):

---

١ ـ الاعتقاد: البيهقي، لا (١٩٨)، فتح الباری (٦٦/١٣).

٢ ـ مسلم (٧٤٦/٢).

جەنگی نەهرەوان زامێکی سەختی لە دەروونی خەواریجدا بەجێ هێشت و شەو ڕۆژ ئێش وپەژارەی زیاد دەکردن، بۆیە دەستەیەکیان ڕێك کەوتن گورزێك لە علی(ﷺ) بدەن و تۆڵەی برا کوژراوەکانی نەهرەوانیان بسێننەوە. عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلجەم توانی بە ناپاکی ئەمیری ئیمانداران شەهید بکات. محمدی کوڕی حەنیفە چیرۆکی کوژرانی ئەمیری ئیماندارانمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو شەوەی لە علی درا من لە مزگەوتی گەورە لەناو خەڵکێکی زۆری میسردا شەو نوێژییان دەکرد، لە نزیك دەرگا ئەوانیش نوێژیان دەکرد، لە هەستان وکوڕنوش و سوژدەدا بوون شەو تا بەیانی، علی(ﷺ) بەیانی دەرچوو بۆ نوێژوو بانگی دەکرد: خەڵکینە کاتی نوێژە، من نازانم لە دەرگا هاتە دەرەوە یان نا، کە ئەو قسانەی کرد؟ سەیری شمشێرەکەیم کردو گوێم لێ بوو: حوکم بۆ خوایە ئەی علی نەك بۆ تۆو هاوەڵانت، ئینجا شمشێرێکم دی، پاشان جاری دووەم دواتر گوێم لە علی بوو دەیوت: ئەو کەسەتان لە دەست دەرنەچێت خەڵکی لە هەموو لایەکەوە هەڵمەتیان بۆ کەسەکە برد، دەڵێ: هێندەی نەبرد، کە إبن مولجەم گیراو برا بۆ لای علی، منیش لە ناو ئەو خەڵکەدا بووم، کە چوونە ژووریٚ گوێم لە علی بوو دەیوت: (یەك کەس بە یەك کەس بۆ کوشتنەوە) ئەگەر مردم وەك چۆن کوشتمی بیکوژنەوە، ئەگەریش مامەوە خۆم دەزانم چی پێ دەکەم،[1] باس دەکات خەڵکی چۆنە لای حسن وترسیان لێ نیشتبوو، کە علی چی بە سەر هاتووە، ئەوان لەلای حسن بوون و ئیبن مولجەمیش لە بەردەستیدا بوو، کە (أم کەلثوم)ی کچی علی(ﷺ) بانگی کردو دەگریا: ئەی دوژمنی خوا باوکم تازە شەهید بوو خوا سەر شۆڕت بکات إبن مولجەم ووتی: سەر کێ دەگریت ؟ سوێند بەخوا بە هەزار کڕیومە و بە هەزار ژەهراویم کردووە، ئەو لێدانە لە هەموو خەڵکی میسر بدرایە یەکێکیان ڕزگاری نەدەبوو.[2] پزیشکەکان لە دەوری علی (ﷺ) کۆ بوونەوە تا برینپێچی بکەن، زانا ترینیان أثیری کوڕی عمر سکونی بوو، کە هاودەمی کیسرا بوو، ئەثیردەستی بە چارەسەرکردنی کرد، ئەویش بە دانانی دەمارێك لەناو سی ئاژەڵێك دانا، پاشان خستیە ناو برینەکەی علی، پاشان فوی تێ کردو دەری

---

١ ـ تاريخ الطبري (٦/٦٢).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٦/٦٢).

هێنا بینی دەماغی سپیەو لێدانەکە گەیشتووەتە مۆخی سەری، ئینجا ووتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران وەسیەتی خۆت بکە، چونکە تۆ دەمریت.[1] باسی ئەوەش دەکات جوندوبی کوڕی عبداللە چووە لای علی وپرسیاری لێ کرد و وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەگەر تۆمان لە دەستدا ـ لەدەستیشت نادەین ـ بەیعەت بدەین بە حسن؟ فەرمووی: نەفەرمانتان پێ دەکەم و نە ڕێگەتان پێ دەگرم خۆتان چاکتر دەزانن[2]، لەم گێڕانەوەیەوە ئەمیری ئیمانداران علی دەردەکەوێت بەوەی کە ئوممەت مافی خۆیانە کە جێگیرو خەلیفە هەڵبژێرن.

٧- وەسیەتی ئەمیری ئیمانداران علی بۆ حسن و حسین(ﷺ):

ئەمیری ئیمانداران حسن وحوسەینی بانگ کردو فەرمووی: وەسیەتتان بۆ دەکەم بەوە پارێزگاری خوا بکەن، بە دنیا یاخی نەبن ئەگەر دنیاش لێتان یاخی بێت، بۆ شتێکیش مەگرین، کە لە دەستتان چووە قسەی حەق بکەن وسۆزتان بۆ هەتیم هەبێت بەهانای لێ قەوماوانەوە بچن وئیش بۆ دوا ڕۆژ بکەن، دوژمنی ستەمکار بن وستەم لێکراو سەر بخەن و ئیش بە قورئان بکەن لە پێناوی خوادا و لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسن، پاشان سەیری محمدی کوڕی حەنیفەی کردو وتی: ئەم وەسیەتەمت بۆ دوو براکەت لەبەر کرد[3]، وتی بەڵێ ووتی: دەی هەمان وەسیەتم بۆ تۆیش هەیەو وەسیەتت بۆ دەکەم نەرم وهێدی بە لەگەڵ دوو براکەتدا، چونکە مافیان بەسەرتەوە گەورەیە، دەی شوێنیان بۆ بکەوەو لە قسەیان دەرمەچوو، پاشان وتی: ئەی حسن و حوسەین وەسیەتان بۆ دەکەم لە مەڕ محمدی حەنیفەوە، چونکە کوڕی باوکتانە دەیشزانن باوکتان خۆشی دەوێ، ئینجا بە حەسەنی ووت: ڕۆڵەکەم وەسیەتت بۆ دەکەم لە خوا ترس بیت و لە کاتی خۆیدا نوێژ بکەیت و لە شوێنی خۆیدا زەکات بدەیت وجوانی دەست نوێژبگریت، چونکە نوێژ تەنها بە پاکی دەکرێت کەسێکیش زەکات نەدات نوێژی لێ وەرناگیرێتی، وەسیەت بێت لە تاوان ببورە و ڕق بخۆرەوە سیلەی ڕەحم بەجێ بگەینە و لە کاتی نەزانیدا نەرم و لەسەرخۆبە و لە دین

---

١ ـ الاستیعاب (١١٢٨/١٣).

٢ ـ تأريخ الطبري (٦٢/٦).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(٦٣/٦).

شارەزا ببەو لە کارو فرماندا سەقامگیربەو پابەندی قورئان بەو، دراوسێیەکی باش بەو فرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە بکە و دوور بکەوە لە داوێن پیسی وخراپە.[1] کاتێ سەرە مەرگی هات وەسیەتی کردو وتی: بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ئەمە وەسیەتی علی کوڕی ئەبو تالیبە وەسیەت دەکات، کە شایەتی دەدات هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لە (الله) تەنها و بێ هاوەڵە محمدیش بەندە و نێردراویەتی، خوای گەورە بە ڕێنمونی و دینی حەق ناردویەتی تاسەرکەوێ بەسەر هەموو هەموو ئاینەکاندا هەرچەندە بێ باوەڕەکانیش حەزنەکەن، پاشان نوێژو کارو ژیان مەرگم بۆ پەردوەردگاری جیهانەو هاوەڵی نی یە، واش فرمانم پێ کراوەو منیش لەموسڵمانانم پاشان: ئەی حسن وهەموو کەس و کارو منداڵ خێزانەکانم وەسیەت بێت لە خوای پەروەردگارتان بترسن وبە موسڵمانی بمرن و هەموو دەست بگرن بە ئاینی خواوەو دوو بەرەك مەبن، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە (أبو لقاسم) کە دەیفەرموو: (ان صلاح ذات البین افضل من عامة الصلاة و الصیام)، واتە: (چاککردنی نێوان دووان باشترە لە یەك ساڵ نوێژ و ڕۆژو) سەیری خزمانتان بکەن و سەردانینان بکەن خوای گەورە لێپرسینەوەتان لەسەر ئاسان دەکات، توخوا توخوا وریایی هەتیوەکان بن دەمیان بێ ناز مەکەن و بە بێ بوونی ئێوە لە ناو دەچن، توخوا توخوا وریایی دراوسێکانتان بن، چونکە ئەوانە وەسیەتی پێغەمبەرەکانتانن بەردەوامی وەسیەتی دراوسێی دەکرد تا وامان گومان دەبرد، کە میراتیان دەکەوێت، توخوا توخوا قورئانتان بیر بێت ئیشی تر پێش قورئان نەخەن، توخوا توخوا نوێژەکانتان، چونکە پایەی ئاینەکەتانە، توخوا توخوا ماڵی پەروەردگارتان (کەعبە) تاماون چۆڵی نەکەن چونکە ئەگەر بەلانرا تەماشای ناکرێ، توخوا توخوا جیهادی ڕێی خواتان بیر بێت بەماڵ و گیانتان، هاوەڵەکانی پێغەمبەرتان(ﷺ) لەبیر بێت، چونکە خوا وەسیەتی بۆ کردوون لە بارەیانەوە، توخوا وریای هەژاران و نەداران بن لە ژیان و بەشتاندا بەشداریان بکەن، توخوا چاوتان لە کۆیلەو کەنیزەکانتان بێت، نوێژ، نویژ، لە پێناو خودادا، لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسن کێ ئێوەی ویست بەستانە کێ لێتان ئەڕەنجێ و یاخی دەبێ بەستانە. وەك چۆن خوا فرمانی پێ

---

١ ـ تاريخ الطبري (٦٣/٦).

کردوون قسەی باش بکەن، وریابن وابەستەو ڕنجدەر بن لێکجیاو دووبەرەك نەبن لە سەر چاکەو لەخواترسان یارمەتی یەکتری بدەن و لە تاوان و دوژمنایەتیدا مەبنە یاریدەر، لە خوابترسن، چونکە خودا سزای سەخت و بەجەرگە، خوای گەورە بتانپارێزێت ئەی ئال و بەیتی پێغەمبەرەکەشتان تێدا بپارێزێت.

بەخواتان دەسپێرم و، السلام علیکم ورحمة الله، پاشان هیچی نەوت، جگە لە (لااله الا الله) تا گیانی سپارد.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە: ... ڕۆڵەکانم: وەسیەتتان بۆ دەکەم لە پەناو ئاشکرادالەخوا بترسن لە ڕازیبوون و توڕەبووندا حەق بڵێن و لە هەژاری و دەوڵەمەندیدا نیازپاك و لەسەر دۆست ودوژمن دادپەروەرو لە چالاکی و خاووخلیچکیدا ئیش بکەن ولە سەختی و خۆشیدا لە خوا ڕازی بن. ڕۆڵەکانم چەند خراپە لەدوای بەهەشت خراپەو چەند باشە لەدوای دۆزەخ خێرو چاکە بێت، هەموو خۆشی یەك بەبێ بەهەشت سوکی و پوچی یە، هەموو بەلایەك بەبێ دۆزەخ خێرو حەسانەوەیە، ڕۆڵەکانم هەرکەس سەیری هەڵەو کەم و کورتی خۆی بکات، وای لێ دەکات بیری لای کەم و کورتی کەسی تر نەبێت، هەر کەس بەبەشی خوا ڕازی بێت، خەفەت بۆئەوە ناخوات کەلەدەستی چووە، هەرکەسیش شمشێری یاخی ی هەڵگرت بەو شمشێرە دەکوژرێت، هەرکەس چاڵێکی هەڵکەند بۆبراکەی خۆی دەکەوێتە ناویەوە، هەرکەس ئابڕوی پۆشتەو براکەی ببات ئەوا عەیب و عاری خۆی پیشان دەدات، هەرکەس هەڵەی خۆی بیر چویەوە هەڵەی خەڵکی تری لەلاگەورە دەبێت، هەرکەس بەڕای خۆی سەرسام بێت گومڕا دەبێت، هەرکەس تەنها عەقڵی خۆی لەلاگرنگ بێت زەلیل دەبێت، هەرکەس بەسەر خەڵکدا بنازێت زەلیل دەبێت، هەرکەس تێکەڵ بە إنذال بوو سوکو ڕسوا دەبێت، هەرکەس چویە دەروازەکانی خراپەوە تۆمەتبارە، هەرکەس لەگەڵ زانایاندا دابنیشێت هێدی و حەساوە دەبێت، هەرکەس شتێکی زۆرکرد بەو شتەدەناسرێت، هەرکەس قسەی زۆری کرد زۆر تێ دەکەوێت، هەرکەس هەڵەی زۆر بوو ئابڕوی کەم دەکات، هەرکەس ئابڕوی کەمی کرد ڕێزو شکۆی کەم دەکات، هەرکەسیش

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٦/٦٤).

(وەرعی) کەمی کرد دڵی دەمرێت، هەرکەسیش دڵی مرد دەچێتە دۆزەخ، ڕۆڵەکانم: ئەدەب و ڕەوشت چاکترین میراتە، ڕەوشتی جوان چاکترین هاودەمە، ڕۆڵەکانم لەش ساغی بردنەوە دە بەشە: نۆبەشیان لە بێ دەنگیدایە مەگەر بۆزیکری خوا، یەکێکیشیان لەدانەنیشتندایە لەگەڵ گەمژەو نەزانەکاندا ڕۆڵکانم گرو تین و سوربوون کلیلی سەختی و نارەحەتی یە بیر کردنەوە پێش کارو ئیش دەتپارێزێت لە پەشیمانی دەی چ بەخت ڕەشێکە کەسێك بگەڕێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی و دوژمنی بەندەکانی خوا بێت سەر بەرزی بۆکەسێك بەنیازی پاك کاروکردارو خۆشەویستی و ڕق و تورەیی وەرگرتن و فڕێدان و قسەو بێ دەنگی و ووتەو کرداری بۆ خوا بێت و بەس.[1]

## ٨- ئەمیری ئیمانداران علی ڕێگە نادات جەستەی بکوژەکەی بشێوێنرێت:

ئەمیری ئیمانداران علی(ﷺ) دەڵێت: ئەو پیاوە بگرن ئەگەر مردم ئەوا بیکوژن ئەگەریش ژیام ئەوا دەتوانم تۆڵەی لێ بسەنمەوە[2]، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە نان و ئاوی بدەنێ و لەگەڵیدا چاك بن ئەگەر چاك بومەوە خاوەنی خوێنی خۆمم یان لێی دەبورم یان ئەگەر ویستم تۆڵەی لێ دەسێنمەوە[3]، لە گێڕانەوەیەکی تردا زیاتر هاتووەو دەڵێت: ئەگەرمردم بیکوژن و دەست درێژی مەکەن، چونکە خوای گەورە دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێ[4]، علی ڕێگری لە حسن کرد، کە جەستەی بشێوێنن و ووتی: ئەی نەوەی عبدالمطلیب، نامەوێ بکەونە ڕشتنی خوێنی موسڵمانان و بڵێن: ئەمیری ئیمانداران کوژرا. نەخێر جەنگ نەکەن، حسن(ﷺ) بڕوانە یەك بە یەك بدە لەوەی، کە لێی داوم و جەستەی مەشێوێنە، چونکە گوێم لە پێغەمبەر بووە (ﷺ) کەفەرمویەتی:(ایاکم والمثلة ولوانها بالكلب العقور)[5]، لەدەقی وەسیەتەکەی ئەمیری ئیمانداراندا باسی بکوژەکەی بە چەندین گێڕانەوە هاتووە، کە ڕاست ولاوازیش لەو گێڕانانەوانەدا هەن. جا ئەو

---

١ ـ الشهب اللامعة في السياسة النافعة: إبن رضوان، لا(٦٣٢/٦٣٣).

٢ ـ فضائل الصحابة(٢/٥٦٠) بسند حسن.

٣ ـ المحن: إبن ابي العرب، لا (٩٤)، خلافة علي، عبد الحميد، لا(٤٣٩).

٤ ـ الطبقات (٣/٣٥).

٥ ـ تأريخ الطبري (٦/٦٤).

گێڕانەوەیەی تیایدا علی (ﷺ) فرمانی کرد لە دوای خۆی ئەو بکوژەی بسوتێنن سەنەدەکەی لاوازە، ئەو گێڕانەوانەی تریش بە یەك ئاڕاستەدا دەڕۆن لە هەموویاندا علی (ﷺ) فرمانی بە کوشتنی پیاوەکە کردوە ئەگەر بەو لێدانە گیانی لە دەستدا جگە لەوە ڕێگیری لێکردووە.

ئەو گێڕانەوانانە تەواوکەری یەکترین ولەلایەکەوە دەبنە بەڵگە، هەروەك ئەمیری ئیمانداران بە مورتەدو هەڵگەڕاوەی دانا تا فرمان بە کوشتنی بدات، بەڵکو کاتێك موسڵمانان ویستیان بیکوژن ڕێگەی ئەوەی لێگرتن و وتی: ئەو کەسە مەکوژن ئەگەر ڕزگارم بوو ئەوا تۆڵەی بریندار دەسێنمەوە ئەگەریش مردم ئەو کات بیکوژن.[1]

گێڕانەوە دیارەکانی مێژوو باس لەوە دەکەن، کە کاتێ علی (ﷺ) گیانی سپارد، حسن ناردی بەدوای إبن مولجەمدا ئەویش بەحەسەنی وت: تۆ ئەم سیفەتەت تێدایە؟ سوێند بەخوا من هەر بەڵێنێکم دابێت بەخوا بردومەتە سەرمن بەڵێنم بەخواداوە، کە علی و معاویە بکوژم یان بێ هەردوکیان بمرم، ئەگەر دەکرێ بەرم دەی تا بچم بۆی، بەڵێنی خوا بێت ئەگەر نەمکوشت یان کوشتم و مامەوە بێمەوە بۆلات و دەست بخەمەدەستت حسن پێی ووت: سوێند بەخوا دۆزەخ بۆ تۆ باشە پاشان پێشی خست و کوشتی[2]، پاشان خەڵکی بردیان و بەئاگر سوتاندیان بەڵام ئەم گێڕانەوەیە پچڕاوە[3]، ڕاستی نێو گێڕانەوەکان و ئەوەی شیاوی حسن و حوسەین و نەوەکانی ئال و بەیت بێت ئەویە، کە ئەوان پەیوەستی وەسییەتەکەی ئەمیری ئیمانداران علی بوون لە هەڵس و کەوت کردنیان بەرامبەر بە عبدالرحمانی کوڕی مولجەم کەتیایدا ئاکاری بەرزی ئیسلام دەردەکەوێت، کە ڕێگری کردووە لەوەی جەستەی بشێوێنرێت و با پەیوەستی تۆڵەی شەرعی بن ئەو گێڕانەوەیەش نەچەسپاوە، کە دەڵێت: کە علی بەخاك سپێردرا إبن مولجەم یان هێناو خەڵك کۆبونەوەو نەوت و داریان هێناو محمدی کوڕی حەنیفەو حوسەینعبداللە کوڕی جعفری کوڕی أبوتالیب وتیان وازمان لێ بهێنن با پارچە پارچەی بکەین، ئینجا

---

١ ـ مناهج السنة (٥/٢٤٥).

٢ ـ تاريخ الطبري (٦/٦٤).

٣ ـ خلافة علي بن ابي طالب، عبد الحميد لا(٤٤٠).

عبدالله هەردو دەستو قاچی بڕی و کەچی ئەو هیچ هاوارو قسەی نەکرد، ئینجا چاوی هەڵ کۆڵی، هیچ هاواری نەکرد و دەی ووت: تۆ دوو چاوی مامی خۆت هەڵکۆڵەو دەی وت ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾[ العلق:١] تا سورەتەکەی تەواو کرد هەردوو چاوی خوێنیان دەڕشت پاشان فرمانی کردو زمانیان دەرهێنا بیبڕن، ئینجا هاواری کرد وتیان بۆچی هاوار دەکەیت وتی: ئەوە هاوارو ناڵە نی یە، بەڵکو ئەترسم تۆزقاڵێ لە دنیادا بمێنمەوەو یادی خوا نەکەم، ئینجا زمانیان بڕی، پاشان سوتاندیان، پیاوێکی ئەسمەرو جوان بوو، پرچی هەتا سەر گوێ ی درێژ بوو، لە نێوژەوانە شوێنی سوجدە بەدیار کەوتبوو.[1] لای ئێمە إبن مولجەم خراپترین کەسی ڕۆژی دواییە، لە لای ئێمەی ئەهلی سوننە إبن مولجەم کەسێکە، کە خوازیارین بچێتە دۆزەخ، نەوزەك وەك قسەی خەواریج لە بارەیەوە، حوکمەکەشی وەك حوکمی بکوژی عثمان و زوبێرو طلحة و سعیدی کوڕی جوبەیر وعەمارو حسین وایە، ئێمە لەبەر خوا لێیان بە دوورین و ڕقمان لێیانەو دەیاندەینە دەست خوای گەورە ـ عزوجل ـ[2]

## ٩- وتاری حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) لە دوای کوژران باوکی:

عمری کوڕی حوبشی دەڵێت: حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) وتاری بۆ داین و وتی: دوێنێ پیاوێك، کە پێشینەکان و دواینەکانیش بە زانستیدا نەدەگەیشتنەوە بەجێی هێشتن ئەو کەسە پێغەمبەر(ﷺ) بینارد ایەو ئاڵای بدایەتە دەست نەدەگەڕایەوە[3] تا فەتحی دەکرد لە هەرچی هەیەتی تەنها حەوت سەد درهەم لە بەخششی مایەوە، کە دایناب وو بۆ خزمەت گوزاری خێزانەکەی.[4]

## ١٠- پێشوازی معاویە لە هەواڵی کوژرانی علی (ڕەزای خوا لەهەردکیان بێت):

---

١ ـ طبقات إبن سعد (٣٩/٣)، الاخبار الطوال، لا(٢١٥).

٢ ـ تأريخ الاسلام، عهد الخلفاء الراشدين، لا(٦٥٤).

٣ ـ فضائل الصحابة(٧٣٧/٢) إسناده صحيح.

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

کاتێك هەواڵی کوژرانی علی هات بۆ معاویە(ﷺ)، معاویە کەوتە گریان ژنەکەی پێی ووت: جەنگت لەگەڵ کرد و بۆیشی دەگریت ؟ معاویەش(ﷺ) ووتی: قوڕت بەسەر تۆ نازانیت خەڵکی فەزڵ و زانایی و زانستیان لەدەستدایە[1]، معاویە(ﷺ) هەرچی نەزانیبایە نامەی دەنوسی بۆ علی کوڕی أبو تاڵیب و پرسیاری لەو دەکرد، کاتێ هەواڵی کوژرانی علی بیست وتی: فیبقهەو زانست بە مردنی علی کوڕی أبو تاڵیب لە دەست چوو، عوتبەی برای پێی ووت: با خەڵکی شام ئەمەت لێ نەبیستن ئەویش وتی وازم لێ بهێنە[2]، با دان بەکەسایەتی عەلیدا بنێین کاتێ معاویە لەکاتی دەسەڵاتیدا داوای خیراری صودائی کرد وەسفی علی بۆ بکات ئەویش وتی: وازم لێ بهێنە ئەی ئەمیری ئیمانداران، معاویە وتی: سوێند بە خوا دەبێت وەسفی بکەیت ئەویش وتی: کە هەر دەبێ وەسفی بکەم دەی بە خوا دووربین و بەهێز بووبەداد پەروەری حوکمی دەکرد، وەکو کانی زانستی لێ دەر دەچوو[3]، دانایی لەهەمو لایەکەوە لێ بەدیاردەکەوت و خۆی لەبەزم و کەیفی دونیا بەدوور دەگرت، بەشەو شەوگخونی دەکێشاو پڕ لەپەند بوو بیر تیژو دوور بیر بوو، حەزی لەجلی کورت و خۆراکی کەم نرخ دەکرد، لەناوماندا وەك یەکێ لەئێمە بوو ئەگەر داوامان لێ بکردایە وەڵامی دەدایەوە ئەگەر داوای هەواڵمان بکردایە هەواڵی پێدەداین سوێند بەخوا ئێمە لەگەڵ ئەوەی لێمان نزیك بوو لێی نزیك بووین نەمان دەتوانی لەبەر شان و شکۆیدا قسەی لەگەڵ دا بکەین کەسانی دینداری بەرز ڕادەگرت و لەهەژاران نزیك دەبویەوەو خۆراکی بەهێزی نەدەدا لە باتڵیدا و لەدادوەریدا لاواز بێ هیوا نەدەبوو شایەتی دەدەم، کەئەم لە هەندێ هەڵوێستیدا بینیوەمە، کەشەوی ئاوا کردووە و ئەستێرەکانی دەرکردون و ڕیشی دەگرت و وەك دەردەدار هاواری بوو و لەتاو خەفەت و پەژارەدا هاواری دەکردو دەیوت: ئەی دونیا برۆ کە سی تری جگە لەمن هەڵ مەخەڵەتێنە، بەرەو ڕوی من بویتەوە یان توشم بویت ئەی هاوار ئەی هاوار من سێ جار تەڵاقم داویت و گەڕانەوەت نی یە، بۆیە تەمەنت کورتەو مەترسیت کەمە، ئاه لە کەمی دونیا نەویستی و دووری گەشت

---

١ ـ البداية والنهاية (١٣٣/٨).

٢ ـ الاستيعاب (١١٠٨/٣).

٣ ـ هەمان سەرچاوە (١١٠٧/٣).

و ترسی ڕێ، ئینجا معاویەگریاو ووتی: ڕەحمەتی خوا لە أبو حسن سوێند بەخوا وا بوو، ئەی خرار خەفەتی تۆ بۆ ئەو چۆنە ؟ ئەویش وتی: خەفەتی منداڵەکەی سەربڕن و خۆی لەماڵەوەیدا بێت.[1]

لە عمری کوڕی عبدالعزیزەوە دەڵێت: لە خەودا پێغەمبەر(ﷺ)م بینیو أبو بکر و عمریش لەلای دانیشتبون منیش سەلامم لێ کردو دانیشتم هەر کە دانیشتم علی و معاویە هاتن و هاتنە ژورێ، دەرگاکە گەڕایەوە دواوە و داخراو منیش سەیرم دەکرد بەپەلە علی چویە دەرێ و دەی وت: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە بۆم بڕاوەتەوە، پاشان بەپەلە معاویە چووە دەرێ و وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە لێم خۆش بوو.[2]

إبن عەساکیر لە ئەبو زەرعەی ڕازی یەوە دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك پێی ووت: من ڕقم لە معاویە یە ئەویش وتی: لەبەرچی؟ وتی: چونکە بکوژی علی یە ئەبو زەڕ کە پێی وت قوڕت بەسەر پەروەردگاری معاویە میهرەبانە، نەیاری معاویەش نەیارێکی بەخشندەیە ئینجا تۆ لەونێوەندەیاندا چیت بەدەستە؟[3]

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٣/١١٠٨).

٢ ـ البداية والنهاية (٨/١٣٣).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(٨/١٣٣).

# بەشی دووەم

بەیعەت پێدانی حەسەنی کوڕی علی و گرنگترین سیفەتەکانی و هەندێ هەڵوێستی لەژیانی کۆمەڵایەتی وئەو پرۆژە چاکسازیەی کە لە یەکبوونی ئومەتدا خێراو تاجداری کرد.

## جێ باسی یەکەم

## بەیعەت پێدانی حەسەنی کوڕی علی

بەیعەت پێدانی حەسەنی کوری علی (ﷺ)لە مانگی ڕەمەزا نی ساڵی٤٠ك، دوای شەهید کردنی ئەمیری ئیمانداران علی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ)لەسەر دەستی خەواریجیەك، کە عبدالرحمن کوڕی مەلجەمی مرادی بوو(خوای لێ ڕازی نەبێ)[1]، خەڵکی لەدوای باوکیدا حەسەنیان(ﷺ) هەڵبژارد و ئەمیری ئیمانداران(ﷺ) لەدوای خۆی کەسی دیاری نەکرد، ووتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران، کە سوکارەکەی لەناو نەبەین[2]، ووتی: کەواتە دەتانەوێ جگە لە بکووژم کەسی تر بکوژن سویندتان بەخوا دەدەم گەر شتی وا بکەن ووتیان: کەسێکمان بۆ بە خەلیفە بکە وجیگەت بگرێتەوە، ووتی: نەخێر، بەڵکو بەجێتان ئەهێڵم بۆئەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)بۆی بەجێ هێشت، ووتیان: گەر بەپەوەردگارت گەیشتی چی دەڵێ ی، کە بەو جۆرە جێمان ئەهێڵی، وەکیع دەڵێ[3]: ووتی: ئەڵێم پەروەدەگار لەنێوانیاندا جێت هێشتم، پاشان بۆلای خۆت بردتمەوەو لەنێو ئەواندای، ویستت بێ چاکیان دەکەی، ویستت بێ خراپیان دەکەی.[4] دوای کوژرانی عەلیش(ﷺ)،

---

١ ـ الطبقات (٣ / ٣٥ ـ ٣٨) تحقيق د. احسان عباس.

٢ ـ مجمع الزوائد(١٣٩/٩)، مسند أحمد (٣٢٥/٢) حسن لغيره.

٣ ـ وكيع بن الجراح، ثقة حافظ عابد، التقريب ٥٨١.

٤ ـ مسند أحمد (٢ / ٣٢٥) حسن لغيره الموسوعة الحديثية.

حەسەنی کوڕی علی(ﷺ)نوێژی لەسەر کرد و، چوار(تەکبیرەی)لەسەر کرد، لە کوفەدا نێژای، یەکەمین کەسێکێش بەیعەتی بەحسن دا قەیسی کوڕی سعد بوو، ووتی: دەستت بکەرەوە لەسەر قوئانەکەی خوا وڕێبازی پێغەمبەر وکوشتاری لادەران بەیعەتت پێ دەدەم، حەسەنیش(ﷺ) فەرمووی: لەسەر قورئانی خوا و ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ)و هەریەکە و لەدوای مەرجێکەوەیە: بەیعەتی پێداو بێدەنگ بوو، خەڵکیش بەیعەتیان پێدا[1]، خەڵکی عێراق ویستیان بەیعەتی بە حسن بدەن، حسن مەرجی لەسەردانان وپێیانی ووت: ئەبێ گوێگرو وگوێڕایەڵ بن و ئاشتەوایی هەرکەس دەکەن، کەمن ئاشتەوایی دەکەم، جەنگی هەرکەس دەکەن، کەمن جەنگی دەکەم. [2] ڕیوایەتی لەوجۆرەش زۆر هاتووە و گشت ئەوانەش بەڵگەن لەدەستپێکردن و هەنگاونانی خێرای حەسەنی (ﷺ)بۆ ئەو ئاشتەواییەی، کە بە پشتیوانی خوای گەورە بە درێژی باسی دێت. بۆیە لە لێکۆڵینەوەی بەیعەت پێدانی حسندا چەند پەند و وانە و سوودێك بەدەست دەخەین لەوانە:

## یەکەم: بەر پەرچدانەوەی کێشەی دەق لەسەرخیلافەتی حسن(ﷺ)

باسکردنمان لەبارەی بەیعەت پێدانی حسن(ﷺ)لە بەرانبەرماندا باسێك سەرهەڵدەدا، کە(شیعەی) برەوی پێ دەدات و، ئەویش باسی دەقێکە لەلایەن علی کوڕی ئەبی تاڵیب لەسەر خیلافەتی حسن[3] ئەوەش لەو درۆ هەڵبەستراوانەیە، کە خراوەتە سەر ئەمیری ئیمانداران علی(ﷺ)، کە گواستنەوەی لەلایەن ئەوەوە ڕاست نیە، شیعە باوەڕیان وەهایە، کە ئیمامەت تەنیا بەدەقە لە لایەن خوای گەورە و لەسەر زمانی پێغەمبەرە(ﷺ)، کەبەوە ئاشکرا دەکرێ وەکو پێغەمبەرایەتیش لوتفێکە لەلایەن خواوە، بۆیە هیچ سەردەمێك نابێ بێ ئیمامێکی دانراو لە لایەن خواوە، کە بەگوێکردنی پێویستە، مرۆڤیش مافی دیاریکردن وهەڵبژاردنی نیە و ئیمامیش مافی نیە لەدوای خۆی ئیمام دیاری بکات، لەوەشدا دەیان ڕیوایەتیان بە زمانی پێشەواکانیان هەڵبەستاوە، هەندێك لە گێرانەوانەیان خستۆتە پاڵ ئیمام محمد الباقر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، کە وتوویەتی:

---

١ ـ تاريخ الطبري (٦/ ٧٣).

٢ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو (٦ / ٧٧).

٣ ـ فرق الشيعة للنوبختي، لا ٣٤، مرويات خلافة معاوية.

ئەزانن ئەم ئیمامەتە لە نێو ئیمەدایە و خۆمان دیاری دەکەین؟ نەخێر سوێند بەخوا ئەمە لە پێغەمبەرەوە دروست بووە و هەر جارە بەخاوەنی خۆی دەگاتەوە[1]، شیعە باوەڕیان وەهایە، کە پێغەمبەر(ﷺ)ئیمامەکانی دوای خۆی دیاریکردووە و ناوی ناون دوانزە ئیمام، زیاد و کەمیان نیە، کە ئەمانەن:

١.علی کوڕی أبو تالب(رضي الله عنه)، کۆچکردووی ٤٠ك

٢.حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه)،کۆچکردووی ٥٠ك

٣.حسینی کوڕی علی سەیدی شەهیدان(رضي الله عنه)، کۆچکردووی ٦١ك

٤.علی کوڕی حسین- زەینولعابدین- کۆچکردووی ٩٥ك

٥.محمدی کوڕی علی ئەلباقر کۆچکردووی ١١٤ك

٦.جعفری کوڕی موحومەد سادق کۆچکردووی ١٤٨ك

٧.موسای کوڕی جعفری کازم، کۆچکردووی ١٨٣ك

٨.علی کوڕی موسای الرضا کازم، کۆچکردووی ٢٠٣ك

٩.محمدی کوڕی علی ئەلجەواد کۆچکردووی ٢٢٠ك

١٠.علی کوڕی محمدی هادی، کۆچکردووی ٢٥٤ك

١١.حەسەنی کوڕی علی عەسکەر، کۆچکردووی ٢٦٠ك

١٢.محمدی کوڕی حەسەنی مەهدی، کۆچکردووی ٢٥٦ك

بناغە دانەری بیرو باوەڕی وەسێت(عقیدەالوصیە)یش إبن سەبەئە و ئەو وەسێتەش لە علی(رضي الله عنه)تەواو دەبوو، بەڵام دواتر بۆ کوڕانیشی گشتگیریان کردووە و ئەو ڕافیزەییانە بە بێدەنگ ونهێنیە وەکاریان دەکرد و ئەهلی بەیتیش ئەوەیان ڕەتکردەوە هەروەکو علی ئەمیری ئیماندارانی باپیریان(رضي الله عنه)ئەوی ڕەتکردۆتەوە، بۆیە ئەو گومڕایانە بیرباوەڕی توقیەیان داهێنان و وەکو بیر و فیکری خۆیان بڵاویانکردەوە....[2]

---

١ ـ الاِمامة والنص، فیصل نور، لا ٨.

٢ ـ أصول الشیعة الإمامیة(٢/٨٠٠).

له مەترسیترین ئەوشتانەی شیعە دایان هێنا ئەوەیە، کە پێغەمبەر(ﷺ)لەدوای خۆی ڕاستەوخۆ وەسیەتی خیلافەتی بە علی کردووە(رضي الله عنه)و، ئەوانەی پێشی کەوتوون مافی عەلیان(رضي الله عنه) داگیر کردووە، هەر وەك لە کتێبی(الکافی)یاندا هاتووە: هەر کەسێ بمرێ و خۆی نەناسی ئەوە مردنی نەفامانەی کردووە، بە دوا داچونی مێژوویی بۆ مێژووی خەلیفە ڕاشیدینەکان، ئەوە لە خیلافەتی أبوبکر(رضي الله عنه)و عمردا(رضي الله عنه)بوونی وەسێت نابینێت، بەڵکو سەرەتای دەرکەوتنی ئەو ووشەیە لە سالآنی کۆتایی خیلافەتی عثمان(رضي الله عنه)و دەرکەوتنی سەرەدەمی ئاشوبەدا ئەبینین، بێگومان هاوەڵان ئەو قسەیەیان ڕەت کردۆنەوە و بە درۆیان خستۆتەوە، دیارترین ئەو هاوەڵانەش علی کوڕی ئەبو تالب ودایکی ئیمانداران عایشەیە(خوای لێ ڕەزابێ)، پاشان دەبینین ئەم قسەیە لە سەردەمی خیلافەتی عەلیدا (رضي الله عنه) لەبیرۆکەی ئاڕاستە کراو و بیرو باوەڕێکدا خۆی ڕۆشن دەکردە و بۆ باوەڕهێنان و بانگەواز بۆکردنی، ئەو شتەش کە ڕافیزە بانگەشەی دەکات ئەوە زاناکانیان وەکو(النوبختی)و (الکشی)باسیان کردووە سەلماندوویانە، کە دانروی عبدالله کوڕی سەبەئەو لە کتێبەکەمدا(اسمی المطالب فی سیرة امیر المؤمنین علی بن ابی طالب)(رضي الله عنه)بەدرێژی باسمکردووە و بەوەی کە لە گواستنەوەی ڕاست دا، کە لە لایەن هەندێ لە هاوەڵانەوە(خوای لێ ڕەزابێ)وخودی عەلیش (رضي الله عنه) هاتووە بەسە بۆ وەڵام دانەوەی ئەو قسە پوچەیان، بەڵگەش زۆرە، لەوانە:

١. لای عایشە باس کراوە پێغەمبەر(ﷺ) وەسێتی خیلافەتی بۆ علی کردووە، عایشە فەموویەتی: کێ ئەمەی ووتووە؟ من پێغەمبەری خوام بینی و لەسەر سنگم بوو، کە کۆچی دوایی کرد نەمبینی و نازانم کەی وەسێتی بە علی کردووە [1]، ئەم قسەیەی عایشەش(رضي الله عنها) پێغەمبەر(ﷺ) وەسێتی بە علی نەکردووە گەورەترین بەڵگەی نەبوونی

---

١ ـ البخاري، رقم: ١٤٧١، كتاب: الوصاية.

وەسیّتە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەکەی ئەودا وەفاتی کرد گەروەسیّتێك هەبووایە ئەوە لە هەموو خەڵکی لە پێشتر بوو بۆ زانینی.[1]

٢.لە إبن عباس دەڵێ: علی کوڕی ئەبو تاڵیب(رضي الله عنه)لە کاتی ئە وئازارەی کە پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا وەفاتی کرد لای پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوەو خەڵکیش ووتیان ئەی باوکی حسن: پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەزعی چۆنە؟ ئەویش ووتی: سوپاس بۆ خوا ئێستا باشە، عباسی کوڕی عبدالمطلیب دەستی گرت و ووتی: سوێند بەخوا من پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبینم لەم ئازارەیدا وەفات دەکات و من لە کاتی مردندا ڕومەت و شێوەی نەوەی عبدالمطلیب دەزانم، بمانبەن بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بالێ ی بپرسین کاروباری موسڵمان دوای خۆی بۆکێ دەبێ، گەر بۆ خۆمان بێ ئەزانین و گەر بۆ خەڵکی دیکەش بێ ئەوە وەسیّتمان پێ دەکات، عەلیش ووتی: سویند بە خوا گەر لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوا بپرسن ئەوە ڕێگریمان دەکات و لەدوای خۆی خەڵکیمان ناخاتە دەست، سوێند بە خوا لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) داواناکەم.[2]

لەقسەیەیدا (رضي الله عنه) شایەتیدانە بۆ هاوەڵە بەرێزەکان ڕەزای خوایان لەسەر بێ لەو پەڕی پابەندیان بەجێ بەجێکردنی فرمانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، کە ئامۆژگاریەك هەبوایە ئەوە هاوەڵان لێ ی دوا نەدەکەوتن، کاتێك ئەنصار لە سەقیفەدا بەو پەڕی ئازادی وبوێری وڕاستگۆییەوە بۆچوونی خۆیانیان دەربڕی "ئەمیرێ لە ئێمە و ئەمیرێ لەئێوە"[3] ئەوە بەیعەتیان بەو کەسە دەدا، کە وەسیّتی بۆکراوە، یان بەلای کەمەوە ئەو وەسیّتەیان یادی یەکتر ئەخستەوە، گەر پێش ئەویش دەقێك هەبوایە ئەوە علی بەعباسی ئەووت: (چۆن لەو باوەرە لێ ی بپرسین کە وەسیّتی خیلافەتی بەمن داوە) پێغەمبەری خواش (ﷺ) هەمان ڕۆژ وەفاتیکرد، بۆیە کە هیچ شتێك لەو وەسیّتە بوونی نەبوو، ئەوە ئەو دەقە بانگەشەیەکی بێ بناغە و ناڕاستە و هەرشتێ لەو بارەوە هاتبێ بەسەر عەلیەوە بەدەق

---

١ ـ بذل المجهود في إثبات مشابهة الرافضة لليهود(١ / ١٩٠).

٢ ـ البخاري، كتاب، المغازي، رقم: ٤٤٤٧.

٣ ـ البخاري، كتاب: الحدود، رقم ٦٨٣٠.

ڕەتکراوەتەوە، چونکە پێچەوانەی دەقی ڕاشکاوانەی خودی عەلیە (رضي الله عنه)، لەبەرئەوەی بەڵگە بیستراویەکەیان بەڵگە نیە بۆ بانگەشە بۆکراو.[1]

٣.لە علی (رضي الله عنه)پرسیارکرا ئایە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەشتێك ئێوەی تایبەت کردووە، فەرمووی بەهیچ شتێ ئێمەی تایبەت نەکردووە خەڵکی پێ تایبەت نەکردبێ، پەڕەیەکی دەرکردووە تیایدا نووسرابوو، ((لعن اللة من ذبح لغیراللة، ولعن منسرق منا الارض ، ولعن الله من لعن والدة، ولعن الله وامن الله من اوی محدثا))[2] (إبن کثیر) ووتوویەتی: ئەم فەرموودەیەلەهەردوو(صحیحین) وئەوانیتردا ڕاستە و سەلماوە، کە لە عەلیەوە وەڵام دانەوەی گروپی ڕافیزەیە، کە وەهای دادەنێن پێغەمبەری خوا وەسێتی خیلافەتی بۆکردووە٠

٤.لە عەمری کوڕی سوفیانەوە: کە علی ڕۆژی جەمەل دەرکەوت ووتی: ئەی خەڵکینە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەئیمارەت دا هیچ شتێکی بەڵێن پێنەداین و وەباشمان زانی، کە أبوبکر بە خەلیفە بکەین وئەویش هەمان ڕێبازی گەیاند.[3]

٥.أبوبکر البیهقی بەئینسادی خۆی بۆ شەقیقی کوڕی سەلمە باسی لەو ڕیوایەتە کردووە و دەڵێ: بە علی ووترا (رضي الله عنه) کەسمان بۆناکەیتە خەلیفە و لەدوای خۆت خەلیفە دانانێ ی؟ ئەویش ووتی: پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) خەلیفەی دانەنیا، بەڵام گەر خوا بە خەڵکی بوێ ئەوە دوای من لەسەر چاکترینیان کۆیان دەکاتەوە هەروەکو دوای پێغەمبەرکەیان لەسەر چاکترینیانی کۆکردەوە[4]، ئەوش بەڵگەیەکی ڕونە، کە باسی دەقی بە خەلیفە بونی علی(رضي الله عنه) لەدوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم). دروستکراوی ئەو کەسانەیە ڕقیان بەرامبەر هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و علی و ئەهلی بەیتە و دەیانەوێ لە ژێر ئەو پەردەو پیلان بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان دابڕێژن وفێلیان لێ بکەن٠[5]

---

١ ـ الإمامة و الرد علی الرافضة، تحقیق علي ناصر فقیهي، لا ٢٣٨.

٢ ـ مسلم (٣ / ١٥٦٧) رقم: ١٩٧٨.

٣ ـ الاعتقاد، لا ١٨٤، وقال البیهقي في دلائل النبوة: سنده حسن.

٤ ـ هەمان سەرچاوە، إسناده جید.

٥ ـ عقیدة اهل السنة و الجماعة في الصحابة(٢/ ٦٢٠).

لەودەقانەشدا بە تەواوی ڕون دەبێتەوە بیر و باوەڕی وەسێت(عقیدەالوصیە)دانراوە و تانە دانەو دانراوی عبداللە کوڕی سەبەئەوەو درۆیەکی ئاشکرا بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانراوە و تانەدانە لە هاوەڵان ڕەزای خوایان لەسەر بێ.

لە(نهج البلاغە)دا ڕاشکاوانە وا دەڵێ: ئەو کەسانە بەیعەتیان پێکردم لەسەر ئەوەی بەیعەتیان بە أبوبکر و عمر و عثمان کرد، ڕاوێژ بۆ موهاجرین و ئەنصارە، و گەر لە کەسێك یەکدەنگ بوون بەوەی ناوی ئیمامیان لێنا ئەوە خوا ڕەزامەندی لەو یەکدەنگی ئەوانی هەیە[1]، بەو ڕستەیە ئەمیری ئیمانداران ئاماژەی کردۆتە کۆمەڵە ڕاستەقینەیەك جیێ گرنگیە وەهای کردووە.

- شورا بۆ موهاجرین و ئەنصارەکانی هاوەڵانی پێغەمبەرخوایە(ﷺ)و (حل وعقد)یان بەدەستەوەیە.

- ڕێکەوتیان لە کەسێك هۆکارەی ڕەزامەندی خوا و نیشانەی ڕەزامەندیەتی بۆیان.

- لە زمانی ئەوان و بەبێ هەڵبژاردنی ئەوان ئیمامەت دروست نابێ.

- تەنیا بیدەعەچی ستەمکار و لادەر لە ڕێگای ئیمانداران لە قسە و بڕیاریان دەردەچن، ئەی چی لەو کەسانەی پێچەوانەی ئەوانە دەکەن.[2]

پرسی ئەو دەقە ئەوە لە هیچ ڕوویەکەوە جیگیر نەبوو و بابەتی کورتکردنەوەی ئیمامەکان لەچەندکەسێکدا ئەوەبەبێ ی قورئان سوننەت ڕەتکراوەتەوە عەقڵ و مەنتیقی ڕوودا و قبوڵی ناکات، چونکە دوای تەواو بوونی ئەو ژمارە دیارانە دەکرێ ئەم ئوممەتە بەبێ ئیمام بمێنێتەوە؟ چونکە ئەو ئیمامانەی ئەوان باسی دەکەن تەنیا بە دووسەدەو نیو و کەمتر ژیاون.

مامۆستا(أحمدالكاتب)یش پەرەسەندنی بیری سیاسی شیعە ی لە شوراوە بۆ ولایەتی فەقیهی جیاکردۆتەوە و باسی کردووە و لەبارەی ئەمیری ئیمانداران حەسەنی کوڕی علی(ﷺ)و شوراوە قسەی کردووە و دەڵێ: ڕونیکردۆتەوە، کە حەسەنی کوڕی علی لە

---

١ ـ نهج البلاغة، كتاب: إلى معاوية رقم ٦ لا ٥٢٦.

٢ ـ ثم ابصرت الحقيقة، لا ١٦١.

باسکردنی هیچ دەقێك لەبارەیەوە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) یان لەلایەن علی ئەمیری ئیماندارانی باوکیەوە لەبەیعەت پێکردنی خەڵکیدا پشتی نەبەستووە، لەباوەڕی حەسەنەوە قسەی کردووە، کە لە سیستەمی شورا و مافی ئوممەت دا ڕوانیویتیە خیلافەت وهیچ دەقێکی لەو بارەوە بۆخۆی نەبینیوە.

لە هەڵبژاردنی پێشەوای خۆی، ئەم باوەڕەش جارێکی تر گەیشتە لوتکە، کە بۆ معاویە دەستی لە خیلافەت هەڵگرت و گەڕانەوەی بۆ سیستەمی شورای نێو موسوڵمانان لەسەر بە مەرج کرد، بۆیە ئەگەر خیلافەت بە دەق لەلایەن خواوەبوایەو دیارکردنی پێغەمبەر بوایە هەروەکو تیوری ئیمامەت وەهای بانگەشە ئەکات ئەوە بۆ حسن نەبوو گەرچی لە هەر بارو دۆخێکدا بوایە بۆ هیچ کەسێ دەستبەرداری بکردایە، دواتریش نەدەبوو بەیعەتی بە معاوییە بکردایە یان هاوەڵان و شوێن کەوتووانی بۆ بەیعەتدان بە معاوییە بانگەواز بکات، دەبینین هیچی وانەبوو، بەڵکو ڕێگەیەکی تری گرتە بەر مافی موسوڵمانانی پاراست لەوەی لە ڕێگەی سیستەمی شوراوە مافی هەڵبژاردنی پێشەوای خۆیانیان هەبێت، حوسەینی شەهیدیش تا دوا ساتەکانی ژیانی بە بەیعەت پێدانی معاوییە وە پایەند بوو، پێشنیارێکی دوای وەفاتی حەسەنی ئەمیری موسوڵمانانیش ڕەتکردەوە کە داوایان کرد دژ بە معاوییە شورش بکەن و ڕوونیکردەوە کە لە نێوان خۆی و معاوییە و پەیمان و بەڵێن هەیە و بۆی نیە هەڵیوەشێنێتەوە و بواری خۆی نەدا ئەو کارە بکات، تەنانەت داوی معاویە نەبێت، کە خیلافەتی بە یەزیدی کوڕی دا و حوسەینیش بەیعەت پێدانی ڕەت کردەوە و سوور بوو لەسەر ئەوەی بۆ عێراق دەربچێت لە ساڵی ٦١ی کۆچی لە کەربەلا شەهید کرا.[(١)]

---

١ ـ تطور الفكر السياسي الشيعي من الشورى إلى ولاية الفقية، لا ١٧، ١٨.

دووەم: ئەوەی شیعەی دوانزە ئیمامیەکان لە دیاریکردنی ژمارەی کتێبە سونەتەکاندا هاتووە دەیکەنە بەڵگە.

لە جابری کوڕی سمرەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((یکون اثناعشر أمیراً)) وشەیەکە کە نەمبیستووە، باوکم ووتی: فەرموویەتی: ((کلهم فی قریش))[1]، واتە: (هەموویان لە قورەیشن)) لە موسلیمیشدا جابر ووتوویەتی: (بیستم پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لایزال الاسلام عزیزاً الی اثنی عشرة خلیفة)) پاشان ووتی: وشەیەکە لێی تێنەدەگەیشتم، پاشان بەباوکمم وت: کێت ووت ؟ ووتی: هەموویان لە قورەیشن[2]، لە أبوو داودیشەوە ڕیوایەتیکردووە: ((لایزال هذا الدین قائماً حتی یکون علیکم اثنا عشر خلیفة کلهم تجمع علیهم الأمة)).[3]

لەو کاتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕاوەتەوە بۆ ماڵ و قورەیش هاتوونەتە لای ووتویانە: دوای ئەو دوانزە خەلیفەیە چی ئەبێت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەس بۆ خۆی و پەشێوی.[4] شیعەش ئەو دەقەیان کردووەتە بەڵگە بەسەر ئەهلی سوونە و ئەویش لەبەر باوەڕبوونیان نییە لەوەی لە کتێبی سوونەدا هاتووە[5]، بەڵکو بۆ بە بەڵگە کردن وتاوانبارکردنە، بە تێڕامانی تەواو و بابەتیانە بۆ ئەو دوانزە ئیمامەی وەسف کراون بەوەی خیلافەت وەردەگرن و ئیسلامیش لە سەردەمی ئەواندا لە شکۆمەندی و سەربەرزی خەڵکیان لەدەور کۆدەبێتەوە لەسەردەمی ئەواندا خەڵکی لە ئاسوودەیدان، گشت ئەو وەسفانە نا سەلمێنێت بۆ ئەو کەسانە وەها بانگەشە دەکەن، کە ئیمامەت تەنها بۆ ئەو دوانزە ئیمامەیە، چونکە هەر ئەمیری موسوڵمانان علی و حسن و کاروباری موسوڵمانانیان ڕاپەڕاندووە، هەروەها کاروباری ئومەت لەسەر دەمی هیچ یەکێك لەو ئیمامانەدا سەقامگیر نەبووە، لە تێڕوانینی خودی شیعەشدا وەهایە، بەڵکو کاروباری

---

١ ـ البخاری، کتاب: الأحکام، باب الاستخلاف (٨ / ١٢٧).

٢ ـ مسلم: کتاب: الامارة، باب الناس (٢ / ١٤٥٣).

٣ ـ سنن أبي داود (٤، ٤٧٢) فتح الباري (١٣ / ٢١١).

٤ ـ المصر السابق نفسه(٤/٤٧٢)، فتح الباري(١٣/٢١١).

٥ ـ أصول الشیعة الامامیة (٢ / ٨١٥).

ئۆممەت نالەبار بووە و ستەمکار و بێباوەڕان بەسەریاندا زاڵبوونە[1]، خودی ئیمامییەکانیش لە کاروباری ئایندارپدا بە توقیە خۆیانیان حەشارداوە[2]، سەردەمی علی ئەمیری ئیماندارانیش، کە لەسەر کورسی خیلافەت بووە سەردەمی توقیە بووە، هەروەکو زانایان ئەوەیان باس کردووە[3]، نەیتوانیوە قورئان دەربخات و بەتێکڕای حوکمەکانی قورئان بڕیار بدات، هەروەکو شێخی جەزائیریان ئەوەی ڕاگەیاندووە[4]و، ناچار بووە لەسەر حسابی ئایین خۆی لە هاوەڵانی نزیك بخاتەوە، وەکو شێخەکەیان المرتضی دانی بەوەدا ناوە، [5].. ....

فەرموودەکە لە لایەکەو بانگەشەی ئەو کەسانەش لە لایەکی دیکەوەیە، پاشان لەو فەرموودەدا ژمارەی پێشەواکان بەو جۆرە کورت نەبووەتەوە، بەڵکو ئیسلام لە سەردەمی گشت ئەوانەدا بەشکۆ بووە، سەردەمی خەلیفە ڕاشدییەکان و بەنی ئەمەوییەکان شکۆمەندی و دەسەڵات داری بووە.[6] لەوەشدا ئبنو تەیمییە دەڵێ، ئیسلام و شەریعەتەکەی لەبەنی ئومەییەدا، لەوەی دوای خۆیان زیاتر و فراوانتر بووە، پاشان بەڵگەی بەم فەرموودەیە هێناوەتەوە، ((لایزال هذا الامر عزیزاً الي أثنی عشرة خلیفة کلهم من قریش))، پاشان دەڵێ: بەو جۆرە بووە، أبوبکری خەلیفە و عمر عثمان و علی، پاشان ئەوەی، کە خەڵکی لەسەری یەکدەنگ بوون و شکۆ و دەسەڵاتی هەبوو، کە مەعاوییە و یەزیدی کوڕی بوون، پاشان عبدالملك و چوار کوڕەکەی و عمری کوڕی عبدالعزیز یشیان تێدایە و دواتر ئەو ناتەواویە دروست بوو، کە تاوەکو ئێستاش ماوە پاشان ئەوەی شي کردەوە.[7]

---

١ ـ منهاج السنة (٤ / ٢١٠) المنتهی، لا ٥٣٣.

٢ ـ أصول الشیعة الامامیة (٢/ ٨١٦).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(٢ / ٨١٦).

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

٥ ـ هەمان سەرچاوە.

٦ ـ أصول الشیعة (٢ / ٨١٦).

٧ ـ منهاج السنة (٤ / ٢٠٦).

پاشان لەو فەرموودەیەدا دەڵێ: هەموویان لە قورەیشن.[1] ئەوەش واتای ئەوە دەگەیەنێ، کە تایبەت بە علی وکوڕانی علی نییە، بۆیە گەرتایبەت بە علی و کوڕانی بوایە شتێکی باس دەکرد، کە پێیەوە تایبەتمەند و جیا بن، ئایە نابیستی نەیفەرموو هەموویان لە کوڕانی ئیسماعیلن و عەرەب نین، بۆیە گەر لە نەوەی هاشم بوایەن یان علی ئەوە لەوێدا تایبەت ئەکران، کە بە قورەیش داینان زانیویەتی قورەیشین و بە بنەماڵەکەییەوە تایبەت نین، بەڵکو بەنی(تەیم و عەدی و عەبد شمس و هاشم )و، گشت خەلیفە ڕاشدییەکان لەو هۆزانەن[2]، بۆیە هیچ وەسفێك نەماوەتەوە بەسەر ئەوەدا بچەسپێت، کە ئەوان مەبەستیانە تەنیا پەنا دەبەنە بەر ژمارە، ژمارەش بەڵگەی نیە لەسەر هیچ شتێك.[3]

## سێ یەم: ماوەی خیلافەتی حەسەنی ئەمیری ئیمانداران و باوەڕی ئەهلی سوننە لەبارەی خیلافەتەکەی:

ئەمیری ئیمانداران حەسەنی کوڕی علی دوای بەیعەت پێدانی خیلافەکەی بۆ ماوەی حەوت مانگ وتراویشە هەشت مانگ و وتراویشە شەش مانگ بەسەر حیجاز و یەمەن و عێراقەوە بەردەوام بوو، خیلافەتەکەی لەو ماویەدا خیلافەیەکی ڕاشدی تەواو بووە، چونکە ئەو ماوەیە تەواوکەری ماوەی ئەو خیلافەتە ڕاشیدیە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوە ماوەکەی سی ساڵە و، پاشان دەبێتە پادشایەتی[4]، (ترمذ)یش بە ئیسنادی خۆی ڕیوایەتکراوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((الخلافة في أمتي ثلاثون سنة ثم ملك بعد ذلك))[5] واتە: (خیلافەت لە ئومەتی مندا سی ساڵە وپاشان ئەبێتە پادشایەتی) إبن کەسیریش لەم فەرمودەیەدا دەڵێ (ئەو سی ساڵە بە خیلافەتی حەسەنی کوڕی علی تەواو بووە و، لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چل و یەکدا خیلافەتی بۆ معاویە بەجێ هیشت لە وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی یانزەی

---

١ ـ مسلم (٢ / ١٤٥٣).

٢ ـ منهاج السنة (٤ / ٢١١).

٣ ـ أصول الشيعة (٢ / ٨١٨).

٤ ـ عقيدة اهل السنة و الجماعة في الصحابة (٢ / ٧٤٣).

٥ ـ سنن الترمذي مع شرحها الأحوذي (٦ / ٣٩٥ ـ ٣٩٧) حديث حسن.

کۆچی بووە، تا ئەو کاتە تەواو کردنی ئەو سی ساڵەیە و ئەوەش یەکێکە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی سەلامی خوای لەسەر بێ، بەوەش حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) پێنجەمین خەلیفەی ڕاشدینە[1]، هەریەکە لە ئەبو بکر بن العربی و قاضی و حافظ بن کثیر و شارحی تەحاوی و مەناوی و وإبن حەجەری هەیثەمیش بەڵگەی فەرمودەیان هێناوەتەوە، کە خیلافەتی حسن خیلافەی ڕاشدی بووە و تەواوکەری ئەو سی ساڵەیە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی.

چوارەم: وتارێك حسن دوای کوژرانی باوکی وتبێتی دانە پاڵ حسن دروست نیە:

ئەم باسە دەهێنێتەوە تەنیا بۆ ناسینەوەی پۆچەڵی و لێ وریا بوونی هەروەکو شاعیر دەڵێ:

عرفت الشر لا للشر و لكن لتوقيه     و من لا يعرف الشر من الخير يقع فيه

شەڕو خراپەم ناسی نەك لەبەر خودی خراپیەکە، بەڵکو لەبەر خۆپارێزی لێکردنی، هەرکەسێکیش خراپە لە چاکە جیا نەکاتەوە ئەوە دەکەوێتە خراپە کاریەوە.

شیعە دوانزە ئیمامییەکان زۆرێك وتاریان داهێناوە و بەدرۆوە خستویانەتە پاڵ حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) ئەمەش چەندنمونەیەکە: هەرکەسێ من بناسێ ئەوە منی ناسیوە، هەرکەس نامناسێ ئەوە من حەسەنی کوڕی عەلیم، من موژدەدەر و کوڕی ئاگادارکەرەوە و کوڕی بانگەوازکارم بۆ لای خوای گەورە، من کوڕی چرای ڕوناکی بەخش و نەوەی ئەهلی بەیتم ئەوانەی خوای گەورە پیسی لێ داماڵیون و پاکی ڕاگرتوون، خوای گەورە لە قورئانەکەیداخۆشەویستیانی پێویست کردووە، کە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُ فِيهَا حُسْنًا﴾ [الشورى:٢٣]بۆیە ئەنجامدانی چاکە خۆشویستنی ئیمەی ئەهلی بەیتە.[2]

---

١ ـ مآثر الأنافة (١ / ١٠٥)، مرويات خلافة معاوية، خالد الغيث، لا ١٥٥.

٢ ـ مقاتل الطالبين لأبي الفرج الأصفهاني لا ٥١ ـ ٥٢.

ئەو دەقانەش لە کتێبەکانی (مقاتل الطالبین)و (الأغاني) ئەسفەهانی وکتێبی (نهج البلاغة) هاتووە زانایانیش لە بارەی ئەسفەهانی و کتێبەکەیدا ووتوویانە:

## ١- ئەسفەهانی خاوەنی کتێبی (الأغاني)

کتێبی (الأغاني) ئەبی فەرەجی ئەسفەهانی بە کتێبێکی ئەدەب و گاڵتە و گۆرانی دادەنرێ و کتێبی زانست و مێژوو فیقە نیە و خۆشی و نەزاکەتێکی لە گۆمی ئەدەب دۆستان و مێژوو نوساندا هەیە و زانایانی کۆنیش لە بارەیەوە ووتویانە:

* خە طیبی بەغدادی دەڵێ: أبوفەرەجی ئەسفەهانی درۆزنترین خەڵکیە وزۆر شتی لە کتێب و پەڕەکان کڕیووە و پاشان گشت ئەو گێڕان وانەی لێ پێك هێناوە.

* إبن الجوزی ئەڵێ: گێڕیانەوەکەی جێ ی متمانە نیە و ئەوەی نوسیوێتی خراپەکاری لەسەر پێویست ئەکات و عەرەق خواردنەوەی بەئاسان دەزانێ لە بارەی خۆیشیەوە وەها دەگێڕێتەوە، هەرکەسێکیش لە کتێبی (الأغاني) ڕامێنێت ئەوە هەموو خراپی و ناشرینیەك ئەبینێت.[١]

*(ذهبی) ئەڵێ: شێخی پایە بەرزمان تقی الدین إبن تیمیەم ئەبینی ئەسفەهانی لاواز ئەخستەوە و لە گواستنەوەکانیدا تاوانباری ئەکرد و زۆرێك بە باسەکانیەوە لکاندووە.[٢]

هەندێ هاوچەرخیش لە بارەیەوە وتویانە:

*مامۆستا شەوقی ئەبو خەلیل ئەڵێ تەنانەت فیلیب لە کتێبەکەیدا مێژووی ئەدەبی عەرەبی پشتی بە باسەکانی ئەسفەهانی بەستووە و، کەچی کتێبەکەی کتێبی ئەدەبە نەك کتێبێکی مێژوویی، زۆر وەسفێکی خراپی ژیانی عباسیەکانی کردووە بە گۆرانی و خواردنەوە و ئارەزووبازی و ئەوەش گونجاوە بە خودی دانەر و خەیاڵ و جۆری ژیانیەوە و ئەو کتێبەشی کتێبی مێژوویی نیە بکرێتە بەڵگە.[٣]

---

١ ـ المنتظم (٧ / ٤٠، ٤١).

٢ ـ میزان الأعتدال (٣ / ١٢٣).

٣ ـ موضوعیة فیلیب حتی في کتاب تاریخ العرب المطول، لا ١٨٧.

*أبو عبيده مەشهوری كوڕی حەسەنی ئال مەشهوریش ئاماژەی بەوە كردووە، كە هەندێ لێكۆڵەر ئاماژەیان بۆ كردووە هەواو و ئارەزووی شیعە گەریانەی ئەسفەهانی ڕۆڵێكی گرنگیان بینیوە لەوەی ئەو كتێبەی پێ پێك هێناوە. دكتۆر محەمەد خلق الله لە كۆتایی كتێبەكەیدا (أبو الفرج الاسفهانی)ش هەر بە ئارەزووبباری تاوانباری كردووە و وریایی لەسەر ئەو كتێبەداوە بەوەی:[1]

١- ناوبانگی زۆری هەیە.

٢- زۆرێك بە خۆرئاوییەكارەكان پشتی پێ دەبەستن.

٣- باسی خراپی بەرامبەر ئیسلام و، هاوەڵان و خەلیفە و والیە ڕاست و داد پەروەرەكانی تێدایە.

٤- هەروەها لەبەر سووربوونی زۆرێك لە هاوچەرخەكان بەوەی كتێبێكی ڕاست و تەواوە و لەوەشدا شفیق جبری لە كتێبەكەیدا (دراسة الأغاني) كە بەهاندانی تەها حسین دایناوە، بەڵام پوختەی ئەم كتێبە سەرەڕای نرخە ئەدەبی و شێوازە بە هێزەكەی بەڵام باسەكانی پێویستیان بە هەڵوێستەو ڕەخنەیە.[2]

* مامۆستا وەلید العظمي لە پێشەكی كتێبەكەیدا(سیف الیماني في نحر الأصفهاني):

لێرەوە جوان ڕوانیمە كتێبی (الأغاني)و گەڕامەوە بۆ كتێبەكانی لاواز خستنەوە و متمانە داركردن و جەرح و تەعدیل و لەوێدا بینیم ئەسفەهانی پیاوێكی جێ ی متمانە نیە و، زانا وردبینەكانمان متمانەی پێ ناكەن، دوو ساڵی تەمەنی خۆمم بۆ كتێبی (الأغاني) تەرخان كردووە و، ڕوانیمە دەق و هەڵوێستەی هەموو باسێكیم كرد و تیایدا ئاگری ڕق و كینەی ئەو دڵ هەڵچووەم بینی و پڕ بە درۆ و ستەمكاریە بەرامبەر ئالوبەیت.[3]

---

١ ـ أبو الفرج الأصفهاني، لا ٢٣٥، كتب حذر منها العلماء(٢/٣٠).

٢ ـ كتب حذرمنها العلماء (٢/ ٣٠، ٣١).

٣ ـ السيف اليماني، لا ١٠ ـ ١٣.

* (أنور الجندی)یش ئەڵێ: ڕەوتی بە ڕۆژئاواییکردن و ئارەزوی ڕوناکبیری گرنگی تەواویان خستووەتە سەر هەردوو کتێبی (الأغاني)و (ألف ليله و ليله) و بە مەبەستی وێناکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ پلەی سەرچاوە بنەڕەتیەکان بەرزیان کردووەتەوە، ئەبینین، کە نوسەر دوژمنی ئیسلام و دووەمیش کتێبی سوك و ڕیسوایە و دانراو نیە.

(الأغاني)یش مەوسوعیەکی بیست و چەند بەرگیە و ئەسفەهانی بۆ دەسەڵاتدار و خراپەکارانی شەو نوسیوێتی و مەبەستی لێی زانست یاخود مێژوو نەبووە و خودی ئەسفەهانیش کۆمەڵگەی موسوڵمانان و عەرەبی ڕەتکردۆتەوە و لایەنگری دوژمنانی ئیسلام و وباطنی و رافضة و ئەوانی تر بووە و ئەو کارەشی جۆرێکە لەو جەنگە سەختەی کە شعوبیەکان کردیانە سەر ئیسلام و موسوڵمانان، ئەوەش وەکو ویستی تێکشکاندنی فیکریان وەکو ئامرازێك بۆ وێرانکردنی کۆمەڵگەکەیان، و خاوەنی تیۆری ڕەخنەی ئەدەبی ڕۆژئاوایش گرنگیان بەو کتێبەکەداوە و زیندویان کردۆتەوە و بە سەرچاوەیەك لە لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکان وەرگیراوە وەکو سەرچاوەیەکیش بۆ وێناکردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی و، دکتۆر (طه حسين)یش بانگەوازی بۆکردووە و گرنگی پێداوە ئەوەشی باس کردووە، کە شعوبی و فێڵباز و ڕۆچوی ئارەزوو بووە.

هەروەها (لامنس)ی ڕۆژهەڵاتناسیش لە کتێبەکەیدا (مێژووی بەنی ئومەیە) پشتی بە (الأغاني) بەستووە و هەروەها (ڤلهوزن)ی ڕۆژهەڵاتناسیش لە کتێبەکەیدا (الدولة العربية و سقوطها) باسی لێ هێناوەتەوە و جبور عبدوالنوریش هەوڵیداوە بەرگری لە (الأصفهاني) بکات وئەپرسێ ؟ ئاخۆ پێویستە کە مێژوو نوس خراپەکار یان زیادە ڕەو بێت و ئارەزو باز بێ مێژووی نوس نەبێ و، لەوەی ئەیگێڕێتەوە یان ئەیڵێ یان ئەینوسێت ڕاستگۆ نەبێ؟ ئێمەش پێی ئەڵێین: بەڵێ لە فیکری ئیسلامیماندا بەو جۆرەیە مێژوو نووس ڕاستگۆ بێ و گەر لە فیکری ڕۆژئاوادا نەبێ ئەوە شتێکی ترە. فیکری ئیسلامی ڕێساکانی لێکۆڵینەوە و ڕەخنە و زانستی لەسەر بناغە گەلێکی پەیوەندییەکی ڕیشەی لە نێوان زانستی لێکۆڵەر و کەسێتیەکەی داناوە، گەر کەسەکە لە ژیانیدا لادەر و کەسێتیەکی شلەژاو و دور لە عەقڵ و ئاین بێ، ئەوە وەکو سەرچاوەیەکی زانستی ڕەتیدەکەینەوە و شایەتی مێژووییانەی لێ وەرناگرین، ئەسفەهانیش بە شایەتی دۆست و

دوژمنانی بۆی کەسێکی بۆچوون و بێ شایەتیە، خراپەکاریەکەشی زۆرێك حەزو ئارەزووی خستۆتە نێو ئەوانەی باسی کردوون، سەرباری لادانە فیکری و عەقیدەی و کۆمەڵایەتیەکەی کە بۆچوونەکانیشی خراپ دەکات، سەرباری ئەوەی کتیبی (الأغاني) سەرچاوەیەکی زانستی نیە، بەڵکو لەو کتێبە گاڵتەییانە، کە کاتە بێ کاریەکانی ئارەزووباز و خۆش ڕفێنەکان خۆش ئەکات، بۆیە لێرەشەوە هیچ کات ناکرێ سەرچاوەیەکی زانستی بێ بۆ لێکۆڵینەوە لە بواری (أدب) و (مێژوو)[1]. بێگومان ئەو کتێبە کاریگەریەکی گەورە و بینیوە لە شێواندنی مێژوومان و بۆیە خۆپاراستنی لێ پێویستە.

---

١ ـ مؤلفات في الميزان، لا(١٠٠ ـ ١٠٣).

## جیٚ باسی دووەم

## گرنگترین سیفەت و ژیانی لەکۆمەڵگەدا

### یەکەم: گرنگترین سیفەتەکانی

کەسیەتی حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ)بەکەسایەتیەکی سەرکردەیی دادەنریٚ و، بەسیفەت گەلیکی ڕەبانیش وەسف کراوە.

لەگرنگترین ئەو سیفەتانەش، باوەڕی پتەویٚتی بە ڕۆژی دوایی و وزانستی شەرعی و متمانەی بەخوا و پیٚشەنگی و ڕاستگۆیی و لیٚهاتوویی و بویٚری و پیاوەتی و زوهد و تیکۆشا ن و خاکەرایی و وەرگرتنی ئامۆژگاری و نەرم و نیانی و وئارامگرتن وهیمەت بەرزی و بەڕیٚوەبردنی بەهیٚز ودادگەری و بەتوانا لە چارەسەرکردنی کیٚشەکان و سیفەت گەلیٚکی تریش، کە لەو کەڵە پیاوە وا هەبووە.

بەهۆی ئەو سیفەتە سەرکردایتیە توانی پرۆژە چاکسازیەکەی پیشبخات وتووانی جیٚ بەجیٚ کردن و زاڵبونی بەسەرڕیٚگریەکان و، بەتوانا بەهیٚزەکانی تووانی ئەم ئومەتە یەك بخات.

ئەو سیفەتانەش کەدەمانەویت تیشکیان بخەینەسەر ئەمانەن:

١. زانست:

حسن لە ماڵی پیٚغەمبەردا پەروەردە بوو، بۆیە هەر لەمنداڵیەوە بە پیٚغەمبەری(ﷺ)باپیری و فاتیمەی دایکی کاریگەر بوو، لەباوکیشی زۆری سود وەرگرت، بیٚگومان گرنگیەکی گەورەی پیٚدا لە پەروەردەکردنیدا، ئەمیری ئیمانداران علی (ﷺ) قورئانی فیٚری خەڵکی دەکرد و لەنیٚو ئەو خەڵکەشدا کوڕانی بوو، لەوانەش ئەمیری ئیمانداران حسن وحوسەین بوو، بەرنامەکەیان لیٚوە فیٚربوون بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی و شیٚوازی هەڵیٚنجانی بڕیارو، پابەند بوون بەڕواڵەتەکانی قورئانی پیرۆز وخستنی بڕیاری ڕەها (مطلق) بەسەر (مقید) وە (مُجمل) لەسەر (مفسر) و زانستی (ناسخ و منسوخ) و ڕوانینە زمانی عەرەب و تیگەیشتنی دەق بە دەقیکی تر و پرسیارکردن لە

بارەی ئالۆزیەکانی و، زانستی پەیوەندی ئایەتەکان بەیەکەوە، (تخصیص)و (عام)، زانینی نەریت و حاڵ و باری عەرەب و هێزی تیگەیشتن و فراوانی پەیبردن. ئەوەنی یە کە حەسەنی کوڕی عەلیش یەکیك بوو لەو نەوەیە، قورئانی پیرۆزیان لەتەك ڕینشاندەرەی پیغەمبەری خوادا(ﷺ) بەرنامەی پەروەردەییان بوو.

ئەو قورئانەی لە باوکیەوە علی ئەمیری ئیماندارانەوە ئەیبیست لەزانست و داڕێژرانی کەسیەتیەکەیدا کاریگەری خۆی هەبوو، بیگومان دڵ و دەروونی پاککردەوە و لەگەڵ ڕۆحیدا ئاوێتەی بوو، بۆیە لەجیهانی بووندا ڕاستەقینەکانی بینی، لەو مامۆستایانەش، قورئانی لە لای لەبەر کردن عبدالله کوڕی حەبیبی کوڕی روبەیعەو أبو عبدالرحمن سەلەمی قورئان خوینی کوفە بوو، باوکیشی لە عەلیەوە (رضي الله عنه) گیڕاوەتەوە و لە عبدالله کوڕی مسعود و عثمانی کوڕی عەفان و عاصم وحسن و حوسەینیش زانستی قرائەتی لێوەرگرتووە، ئەو بەیانیان بیست ئایەت و ئێوارانیش بیست ئایەتی خوێندۆتەوە و زانا بووە و، لەماوەی خیلافەتی عبدالملك کوڕی مەرواندا لە کوفەدا کۆچی دوایی کردووە، خاوەن متمانە بووە فەرمودەی زۆریشی ڕیوایەتکردووە[1]، لەعبدالله کوڕی موبارەك کەلە عەتائی کوڕی سائیب ڕیوایەتیکردوە و دەڵێ: چووینە لای أبو عبدالرحمن سولەمی لەمزگەوتدا لەسەرە مەرگدا بوو، پێمان ووت: خۆزگە دەچویتە جێگەوە و ماندوویەتیت دەحەساوە، فلان کەس بۆمی باسکردووە، کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ((لایزال احدکم في صلاة مادام في مصلاه ینتظر الصلاة))[2]، واتە: ((هەرکەسێ لەئێوە لەشوێنی خۆیدا و لەمزگەوتدا چاوەڕێی نویژ بکات، ئەوە لە نویژیدایە)).

لە ڕیوایەتەکەی(إبن سعد)دا: ((الملائکة تقول: اللهم اغفر له اللهم ارحمه))، واتە: (فریشتەکان، دەڵێن: خوایە لێی خۆش بە و ڕەحمی پێ بکە). أبو عبدالرحمن سولەمی فەرمووی: ئەمەوێ مزگەوتەدا بمرم[3]، بەرنامەکەشی لە فێرکردنی قورئاندا بەرنامەی هاوەڵە بەڕێزەکان بوو. لە أبو عبدالرحمن سولەمیە گێراوەتەوە، کە دەڵێ: ئەوانەی کە

---

١ ـ تهذيب والتهويب(٥/ ١٨٣ ـ ١٨٤)، الطبقات (٢/ ١٧٣).

٢ ـ كتاب الزهد، رقم: ٤٢٠، لا (١٤٢،١٤١).

٣ ـ الطبقات الكبر (٦/١٧٤/ ١٤٥).

قورئانیان خویندۆتەوە، وەکو عثمانی کوڕی عەفان و عبدالله مەسعود وکەسانیتریش بۆ ئیمە یان باسکردوە: ئەوان گەر دە ئایەتیان لە پیغەمبەری خواوە(ﷺ) فێربوونایە، ئایەتی دیکەیان لەبەرنەدەکرد تا نەیانزانیبا کارکردن بەو ئایەتانە چیە ونەیانکردایەتە کردار، ووتویانە: بۆیە قورئان و زانست کارمان پیکەوە وەرگرتووە وناسیووە، لە لەبەرکردنی سوورەتێکدا ماوەیەك ماونەتەوە[1]، أبو عبدالرحمن سولەمی لەقورئانی پیرۆزدا بەمامۆستای حەسەنی کوڕی علي و بەناوبانگترین خوێندکارەکانی عثمانی کوڕی عەفان (ﷺ) دادەنرێ[2]، حەسەنی کوڕی علی لە لەبەرکردن و تیگەیشتن و کارکردن بە قورئانی بیرۆز هەمان ڕێبازی أبو عبدالرحمن سولەمی وەرگرتووە.

* تێڕوانینی ئەمیری ئیمانداران حەسەنی کوڕی علی بۆخوا و گەردوون و ژیان و وبەهەشت و دۆزەخ:

حسن لەڕێگەی قورئانی پیرۆز و پەروەردەی ئەمیری ئیمانداران علی باوکیەوە فێربووە ئەو خوایە کێیە کە پێویستە بپەرستریت، بۆیە تێڕوانینی حەسەنی کوڕی علی بۆ خواو گەردوون و ژیان و وبەهەشت و دۆزەخ و قەزاو قەدەر ڕاستەقینەیی مرۆڤ و ململانی لەگەڵ شیطاندا لە قورئانی پیرۆز وسونەتی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگرتبوو.

خوای گەورە دوورە لە ناتەواوی وخاوەن وەسفی تەواوە و، تاك و بێ هاوەڵە.

خوای گەورە ناوەڕۆکی ئەوپەرستنەی دیاری کردووە، ئەو یەکتاپەرستیەش لە قورئانی پیرۆزە.[3]

* تێڕوانینی بۆگەردوون لەم ئایەتەی خواوە وەرگرتوە، کەدەفەرمووێ: ﴿قُلْ أَإِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠) ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا

---

١ ـ الفتاوى(١٣/١٧٧).

٢ ـ تيسير الكريم المنان في سيرة عثمان بن عفان، لا ٢٥

٣ ـ منهج الرسول في غرس الروح الجهادية. لا(١٠ ـ ١٦ ).

طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظاً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴾[فصلت:٩ـ ١٢].

* تێڕوانینی بۆ ژیانیش گەرچی درێژە بکێشێت، هەر جێ هێشتنیەتی، خۆشیەکەشی هەرچەندە گەورەو زۆر بێ، ئەوە کەمێکی سووك وپوچە، پەروەردگار ئەفەرموویێت: ﴿ إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَامُ حَتَّى إِذَا أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَاراً فَجَعَلْنَاهَا حَصِيداً كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[يونس: ٢٤].

* تێڕوانینی بۆ بەهەشت، ئەوەی لەمیانەی ئەم ئایەتە پیرۆزانە وەرگرتووە، ئەو ڕوانینەشی بەسەردا زاڵبووە، ئەوکەسەی ژیانی حەسەنی کوڕی علی بخوێنێتەوە تێدەگات لەقوڵی خۆ ئامادەکردنی بۆلای خواو زۆر ترسان لەسزای خواو تۆڵە سەندنەوەکانی. تێگەیشتنی لەقەزاو قەدەر وە لە قورئانی پیرۆز و فێرکردنەکانی پێغەمبەری خواو (ﷺ) بۆ خۆی وەری گرتبوو، بێگومان چەمکی قەزاو قەدەر جوان لەدڵیدا چەسپابوو، هەروەکو پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾[ التوبه:٥١].

* حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه)لەمیانەی قورئانی پیرۆزەوە ڕاستی ململانێی نێوان مرۆڤ و شەیتانی شارەزا بووە، کە ئەو دوژمنەی لەپێش و پشت و ڕاست و چەپەوە بۆ مرۆڤ دێت و بەخراپە بەگوێیدا ئەچرپێنێ وشوێنی شەهوەت ئەوروژێنی، بۆیە لەبەرامبەر ئیبلیسی دوژمندا پشتی بەخوا بەستبوو، لەژیانیشیدا بەسەریدا زاڵبووە.

* لەهەڵەی ئادەمەوە فێربوو چۆن موسڵمان پشت بەخوا ببەستێ، هەروەها گرنگی تەوبە و داواکردنی لێبوردن لەژیانی ئیماندارو، خۆپارێزی لەحەسودی و، خۆ بەگەورە زانی و، گرنگی دان بە جوان قسەکردن لەتەك هاوەڵاندا فێربوو، ئەوەش بە فەرمایشی خوای گەورە: ﴿وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْزَغُ بَيْنَهُمْ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلْإِنْسَانِ عَدُوّاً مُبِيناً﴾[ الإسراء:٥٣].

خوای گەورە حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) بە ژیان لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، ڕێزگرتووە ئەویش لەگەڵ قورئان ژیاوە و ئەسل و لقەکانی لەقورئانی پیرۆز و سونەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگرتوە و بووەتە پێشەوا، ئەو پێشەوایانەی، کەنەخشەی ژیانیان بۆ خەڵکی ئەکێشن و خەڵکی لەم ژیانەدا بەقسە و کرداریان مامەڵە دەکەن، حسن (رضي الله عنه) لە خەڵکانی قورئان بوو، بۆیە وتارەکانی بە قورئانی پیرۆز بوو، لەو بارەشیەوە ڕیوایەتکراوە، کە ڕۆژی هەینی ووتاری داوە و لەسەر مینبەردا سورەتی ئیبراهیمی خویندۆتەوە تا تەواوی کردووە[1] لەقوتابیانی پێغەمبەر (ﷺ) بووە، کەسورەتی (ق) بەتەواوی خویندۆتەوە لەسەر مینبەردا. موسلیمیش لە أم هیشامی کچی حاریسەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی: ﴿ق والقرآن المجيد﴾م تەنیا لەزەمانی پێغەمبەری خواوە وەرگرتووە، کە هەموو ڕۆژانی هەینی لەسەر مینبەردا وتاری بۆ خەڵکی داوە [2]، لەإبن ماجەوە ئەویش لەثوبەی إبن کەعبەوە دەڵێ: ڕۆژی هەینی پێغەمبەری (ﷺ) بەڕاوەستاییەوە (تبارك) خویندۆتەوە و ڕۆژگاری خوای وەبیرمان هێناوەتەوە. لەمەدا ئیمام إبن قەیم ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەڕونکردنەوەی سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە ووتاردانیدا دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەزۆری بەقورئان ووتاری داوە [3]، بۆیە حەسەنی کوڕی عەلیش (رضي الله عنه) بەقورئانی پیرۆز ئاراستەی خەڵکی کردووە بەسەریانی خوێندۆتەوە، بەپشت بەستن بەبەرنامەی پێغەمبەرەوە لەخوێندنەوەی قورئاندا بە پوختی بیرکردنەوەو خشوع و دەنگ خۆشکردن، کە دڵان بلەرزینێت چاوان فرمێسکی بۆ برێژێت. گەر هەوڵ بدەن کە تێڕامێنن لەسورەتی إبراهیم (علیه السلام) کە هەمووی لەسەر مینبەر بخوینێتەوە، ئەوە تێبینی ئەکەین کە گرنگترین بابەتەکانی ئەمانەن:

- پتەوکردنی بناغەی بیرو باوەڕ بوون بە پێغەمبەران و زیندوبونەوە و پاداشت و داننان بەیەکتا پەرستی و ناسینی خوای ڕاستەقینەی دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی و، ڕوونکردنەوەی ئامانج لەدابەزینی قورئانی پیرۆز، کە دەرکردنی خەڵکیە لە تاریکیەوە بۆ

---

١ ـ الطبقات، تحقيق السُلمي(١/٢٧٨) إسناده ضعيف.

٢ ـ مسلم رقم: ٨٧٣١.

٣ ـ زاد المعاد (١/ ٤٣).

ڕوونـاكی و یـەكبوونی بانگـەوازی پێغەمبـەران لەبنـچینەكانی بـیرو بـاوەڕو گـەورەیی وپەرستنی خواو ڕزگاربونە لە گومڕایی.

- موژدەو هەڕەشە: سەرزەنشت كردنی بێ باوەڕان و هەڕەشەدانیان بە سزای سەخت لەو بێباوەڕیەیان، كە هەیە و بەڵێندانە بەئیمانداران لەسەر كارە چاكەكانیان: [٢٣، ٢٨، ٣١].

- قسەكردن لەبارەی ناردنی پێغمبەران بەزمانی نەتەوەكانیان، بۆ ئاسان بوونی تێگەیشتن [٤].

- دڵدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەوەی پێغەمبەرانی پێشوو لەگەڵ نەتەوەكانیان چیان بەسەر هاتووە، نەتەوەی نوح و عادو ئەوانەی دواتر وبیرخستنەوەی سزاكانیان، هەروەكو لەئایەتەكانی[ ٩، ١٢ ]، [١٣، ١٨] داهاتووە.

- دەسپێكردن بە گفتۆگۆی موسی بۆهۆزەكەی و بانگەواز كردنیان بۆ پەرستنی خوای باڵادەست لەنێو چیرۆكی هەندێ لە پێغەمبەرانی پێشیندا(علیهم السلام). لەئەیەتەكانی [ ٥ ـ٨ ]دا هاتوە.

- داواكردنەكانی ئیبراهیم (علیه السلام)دوای دروستكردنی بەیت بۆ خەڵكی مەككە بریتی بوو لە ئاشتی وئارامی و ڕزق و پەیوەستبونی دڵان بەماڵی خواو دورخستنەوەی بەخۆی ونەوەكانی لەپەرستنی بتە، سوپاسی خوای كرد كە دوای پیر بوون ئەو منداڵانەی پێ بەخشیووە، بۆ ڕاپەڕاندانی نوێژیش خۆی و نەوەكانی سەلامەت كردووە، داوای لێخۆشبونیشی بۆخۆی وئیمانداران كرد ئایەتەكانی[٤١- ٥٢ ]دا هاتوە.

- ڕونكردنەوەی دیمەنیكی گفتوگۆی نێوان خەڵكی دۆزەخ لە ئاخیرەتدا ئایەتەكانی[ ١٩ـ ٢٣]دا هاتوە.

- هێنانەوەی نمونە و پەند بۆ ووشەی ڕاست وباوەڕ ووشەی پوچـەڵ و گـومڕایی بـەداری پوخت و داری پیس وخراپ ئایەتەكانی[٢٤ـ ٥٢ ]دا هاتوە.

- بیرخستنەوەی ناخۆشیەكانی قیامەت و هەڕەشەكردنی سـتەمكاران و ڕونكردنـەوەی جۆری سزاكانیان لە ئایەتەكانی: [٤٢ـ٥٢]دا هاتوە.

- ڕونکردنەوەی حیکمەت لەدواخستنی سزا بۆ ڕۆژی قیامەت، ئەو باسەش، کە سورەتەکە کۆتایی پێ هێنراوە [1]، [٥١ـ ٥٢]دا هاتوە.

سورەتی إبراهیم (علیه السلام) ئەم بابەتانەی لەخۆی گرتووە، هەروەها حەسەنی کوڕی عەلیش (ﷺ) لەسەر مینبەردا وتاری هەینی پێ ئەدا، هەروەها حەسەنی کوڕی عەلیش(ﷺ) گەر بچوایەتە جێگەیەوە سورەتی (الکهف)ی دەخوێند، ئەم سورەتە بە وەسفکردنی قورئان دەستی پێکردووە، کە ڕاست و ڕەوان و بێ جیاوازی و کەم و کورتیە لە ووشە و واتادا، پاشان موژدەی هیناوە پاشان ڕویکردۆتە وە بۆ لای جوانی ئەو شتانەی لەزەوی یدا هەیە و، بەڵگەن لەسەر گەورەیی خوا، ئەم سورەتە سێ چیرۆکی جوانی قورئانی پیرۆزی باسکردووە، کە چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوت و چیرۆکی موسا لەگەڵ خضر و چیرۆکی ذوالقرنین، بەڵام چیرۆکی سورەتی الکهف[٩ــ ٢٦] نمونەیەکی بەرزو هێمایەکی بڵندانەی گیانفیداکاریە بە نیشتمان و کەس و کار و نزیکان و هاوڕێیان و سەروەت و سامان لە پێناو بیرو باوەڕی ڕاست و وشوێنکەوتنی ڕێبازی ڕاستدا. ئەو چەند گەنجە ئیماندارانە لەستەم و زۆرداری ئەو پادشا بت پەرستە هەڵهاتن و لە ئەشکەوتێ لە چیادا خۆیان حەشارداو خوای گەورەش سێ سەدو نۆ ساڵی (قمری) خەواندیانی و، پاشان زیندوویانی کردەوە تاوەکو بەڵگەیەکی زیندووە بوونەوە بێ بۆخەڵکی لەتوانای خوا لە زیندووکردنەوەدا دوای ئەو چیرۆکەش خوای گەورە فەرمانی بەپێغەمبەر(ﷺ)کردووە خاکەرایی دانشتن لەگەڵ هەژارە ئیماندارەکانی و دوورنەکەوتنەوە لە دەوڵەمەندان تاوەکو بۆ ئیسلام بانگەوازیان بکات: ﴿ وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم﴾ [ الكهف: ٢٨].

پاشان خوای گەورە لەپاش دەرکەوتنی ڕاستیدا هەڕەشەی لە بێباوەڕان کردو ئەوەی یادخستنەوە، کە بۆ ڕۆژی دوایی چ سزایەکی بۆ ئامادەکردون: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ﴾ [الكهف: ٢٩] ئەوەشی بەرامبەر کرد بەوبەهشتە خۆشانەی خوای گەورە بۆ ئیماندارانی ئامادەکردووە: [الكهف:٣٠ ـ ٣١].

---

١ ـ التفسير المنير (١٣/ ١٩٨، ١٩٩).

واته: ئەو ئیماندارانەی باوەڕیان هێناوە و چاکە دەکەن ئەوە ئێمە چاکەی کەسیان نافەوتێنین، چاکترینیان لە بیر ناکەین، ئەوانە لە بەهەشتانی ڕازاوەن و بازنی ئاڵتون و بەرگی سەوزی و سندوسیان هەیە و تیایدا ئەحەوێنەوە و ئەوەش جوانترین پاداشت و پلە بەرزیە.

چیرۆکی موساش لەگەڵ خضردا لەئایەتی: [٦٠ ـ ٧٨] نمونەی خاکەراییی (تواضع)ن بۆ زانایان لەبەرامبەر زانستخوازاندا، ئەو زانیاریانەی لای ئەو بەندە چاکە کارە بوو لەوزانستە بوو، کە سەرچاوە و بناغە ئایینی بوو، لای پێغەمبەرانیش نەبوو، ئەوەش بەڵگەی کونکردنی کەشتیەکە و کوشتنی منداڵەکەو بەرزکردنەوەی دیوارەکە، چیرۆکی (ذوالقرنیین)یش لەئایەتەکانی: [٨٣ـ ٩٩]پەندن بۆ دەسەڵاتدارو سوڵتانەکان، چونکە ئەم پاشایە توانی دەست بەسەر جیهاندا بگرێ، ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای زەوی و، دروستکردنی بەربەستی گەورە، ئەوەش سیفەتی لەخوا ترسی و دادگەری و چاکەخوازییەوە هەیبوو.

ئەم چیرۆکە سێ چیرۆکی دیارو جوانی وەرگیراوە واقیعی لەخۆگرتووە، بۆدەرخستنی ئەوەی کەماف و ڕاستی بەدەسەڵات و دەوڵەمەندیەوە پەیوەست نیە، بەڵکو بەباوەڕەوە پەیوەستە و یەکەمین ئەو نمونانەش چیرۆکی خاوەن دووباخەکەیە[٣٢، ٤٤]بۆ بەراوردی نێوان دەوڵەمەندو نازکارو بەسەروەتەکەی و هەژاری سەربەرز بەباوەڕەکەی، ئەوەش بۆ ڕونکردنەوەی حاڵی هەژارە ئیماندارو دەوڵەمەندە بێ باوەڕەکانە، دووەمیش: نمونەی ژیانی دونیایە [٤٧ ـ ٤٩]. سێ یەمیش چیرۆکی شیطان و خۆ بە گەورە دانانیەتی لەبەرامبەر ئادەمدا[٥٠، ٥٣] و ئەوکارەی کەبوو بەهۆی دەرکردن و بێبەشبوونی لەسۆزی خواو ووريایکردنەوەی خەڵکی لەخراپەی شیطان و، نێوان پەرستن و بۆ خواو خاکەرایی و ئەو لێخۆشبونەش کەخوا داویەتی، ئەوەشی بەڕونکردنەوەی گرنگیدانی قورئانە بەهێنانەوەی نمونە گەلێك بۆ خەڵکی بەمەبەستی پەند وەرگرتن و یاد کردنەوەی و ڕوونکردنەوەی گرنگی پێغەمبەرە بۆ موژدەدەران و ورياكردنەوەی خەڵکی لەپشت کردن لەئایەتەکان خوا[٥٤، ٥٧] بەسێ بابەتیش، ئەوسورەتە کۆتایی پێ هاتووە:

یەکەم: ڕاگەیاندنی ناشرینی کاری بێباوەڕان و لەدەست چوونی پاداشتی کارەکانیان لەئاخیرەتدا[١٠٠، ١٠٦].

دووەم: موژدەدان بەو ئیماندارانەی کەچاکەیان کردوە بەوەی بەهەشتی هەمیشەییان بۆ هەیە[١٠٧، ١٠٨].

سێ یەم: زانستی خوای گەورە سنورو کۆتایی بۆ نیە.[١]

کۆتا ئایەتی سورەتەکەش تەواوی دەردەخا، کە خوا فرمانی بە محمد(ﷺ) کردوە کە خاکەرابێ (متواضع): ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾ [الكهف: ١١٠].

ئەو کەسەی باوەڕی بەگەیشتنی خوا هەیە و تەماحی لە پاداشتی خوای هەیە لەگوێڕایەڵی کردنیدا، ئەوە با بە کردەوەی چاك لە خوا نزیك بێتەوە و، لە پەرستندا دڵسۆز و نیەت پاکی ئەنجام بدات و، کردنێکی دیاربێ وەکو پەرستنی بت یان داواکردن جگە لە خوایان نەزۆرکردن بۆ دروستکراوەکانی یان باوەڕ بوون بەوەی مەخلوقەکان لەتوانایاندا هەیە لەوەی تەنیا خوا توانادارە لێی سوودیان هەبێ یان لەجۆرەکانی بەندایەتی وەکو کارێك بۆ ڕیا یاخود ناوبانگ[٢]، ڕیاش هاوەڵ پەیداکردنی بچووکە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إن أخوف ما اخاف عليكم الشرك الأصغر، قالوا: وما الشرك الأصغر يا رسول الله؟ قال: الرياء، يقول الله يوم القيامة إذا جزي الناس بأعمالهم، إذهبوا الى الذين كنتم تراؤون في الدنيا، فانظروا هل تجدون عندهم الجزاء)) ئەوەی کە زۆریی لێئەترسم توشتان بێت: ((ڕیایە، خوای گەورە کاتێك لەقیامەتدا پاداشتی کاری خەڵکی ئەداتەوە ئەفەرمووێ: بڕۆن بۆلای ئەوکەسانەی، کەلە دونیادا بۆئەوەی بتابینن کارت ئەکرد، تەماشا بکەن کەپاداشتیان لایە بتاندەنێ))[٣].

ئەو ئایەتە پیرۆزە دوو مەرجی قەبوڵکردنی کاری کۆکردۆتەوە: شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ): ((فليعمل عملاً صالحاً)) نیەت پاکی بۆ خوای گەورە: ((ولايشرك بعبادة ربه أحدا)). واتە: (هیچ بەندەیەك نەکاتە هاوبەشی خودا).

---

١ ـ التفسير المنير (١٦، ١٩٧ـ ١٩٩).

٢ ـ التفسير المنير (١٦/ ٤٣).

٣ ـ مسند أحمد (٥/٤٢٨، ٤٢٩) بسند حسن.

ئەم واتا پیرۆزانە و ئەو ئایەتەنە حەسەنی کوڕی علی بەتێگەیشتن و ووردبوونەوەوە ئەیخویندەوە، لەدەرون وژیانیدا کاریگەری هەبوو، هەروەها حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) گرنگی بەژیانی پێغەمبەردا، ئیسماعیلی کوڕی محمدی کوڕی سعدی إبن أبی وقاص دەڵێ: ((باوکم جەنگەکانی پێغەمبەری (ﷺ) فێر ئەکردین بۆ مانی ئەژمارد و ئەیفەرموو: شوینەواری باوکانتانە و یادکردنەوەی لەبیر مەکەن.[1]

علی کوڕی حەسنیش دەڵێ: ئێمە چۆن سورەتەکانی قورئان فێربووین ئاوەهاش فێری جەنگی ژیانی پێغەمبەری خواش ئەبووین.[2]

سەبارەت بە(السنة النبویة) ئەوە علی ئەمیری ئیمانداران زیاتر لە خەلیفە ڕاشیدنەکان فەرموودەکانی پێغەمبەری ئەگێڕایەوە، ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەوان درەنگتر کۆچی کردو لێیەوە ڕیواتکراوەو تایبەت بە زانست خوازەکانیش فراوانبونەوە لەوانەی زۆر پرسیاریانەکردو ئەو فەرموودانەش، کەپێویستیان گەیاندن و گێڕانەوە هەبوو، لەکاروبار گەلێکی تریشدا بەدەست پاکیەوە هەرشتێکیان لێ وەرگتبێت گواستویانەتەوە و، حەسەنی کوڕیشی سوودی زۆری لێ بینیوە.

سەبارەت بە باپیریشی، وەکو دیارە حسن منداڵ بوو پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، بۆیە لە پێغەمبەری خواوە فەرموودە گەلێکی وەرگرتووە.

حسن(ﷺ) منداڵەکانی بۆ زانست خوازی هاندەدا، کوڕەکەی خۆی وبرازاکەی بانگکردوەو دەڵێ: کوڕەکەم برازاکەم ئێوە بچوکی نەتەوەیەکن و ئەبنە گەورەی کەسانیتر، بۆیە فێربن وبخوێنن، بۆیە هەرکەسێکتان نەیتوانی بیگێڕێتەوە، یان لەبەری بکات بابینیوسێتەوەو لەماڵەکەیدا دایێنی[3]، حەسەنی کوڕی علی وتاربێژێکی لێهاتوو بوو، بۆیە ئەمیری ئیمانداران علی(ﷺ) ڕۆژێك پێ ی دەڵێت: ئەی حسن هەستە و بۆ خەڵکی ووتار بخوێنە، حسن کەچووە سەرمینبەر سوپاسی خوای کردوە دەستی کردە وتار

---

١ - البداية والنهاية (٢٤٢/٢).

٢ - البداية والنهاية (٢/ ٢٤٢)، السيرة النبوية للصلابي (٦/١).

٣ - الطبقات (٢٩٢/١)، إسناد حسن، تحقيق السُلمي.

خوێندنن(١)، پاشان دابەزی و عەلیش فەرمووی: ﴿ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[آل عمران: ٣٤] حسن لەباپیری (ﷺ) و باوکیەوە، وتاربێژی و ڕەوانبێژی و هێزی ڕونکاری بۆمایەوە، کتێبەکانی مێژوو گێراویانەتەوە، کە علی (رضي الله عنه) لەحەسەنی کوڕی چەند شتێکی لەبارەی پیاوەتیەوە لیّ ی پرسیوەو، فەرموویەتی: کوڕی شیرینم، سەداد چیە؟ ئەویش فەرموویەتی: باوکە گیان سەداد لادانی خراپەیە بەچاکە. فەرموویەتی پیاوەتی چیە؟ فەرموویەتی: پاکی و چاك ڕێکخستنی ئەوشتانەیە کە مرۆڤ بۆی هەیە.

پرسیوێتی: ووردبینی(دقه) چیە؟ فەرموویەتی: ڕوانینە ئاسان و ڕێگری کردنی هیچ و پوچی و شتی سوك، پرسیوێتی (اللُّوم)چیە؟ دەڵێ جڵەوگیرکردنی دەروون و توانایەتی، کە ئەیپارێزێ. پرسی سەماحەت چیە؟ ووتی: هەوڵدانە لەخۆشی و ناخۆشیدا. پرسی: ڕەزیلی چیە؟ ووتی: ئەوەی لەنێو دەستدایە بەگەورەی بزانی و، کە بەخشیت بە لە ناو چووی بزانی، پرسی برایەتی چیە؟ فەرمووی: ئەمەکداریە لەنەبوونی و دەوڵەمەندیدا. پرسی ترسنۆکی چیە؟ ووتی: بوێریە بەرامبەر هاوڕێ و سەر شۆڕکردنە بەرامبەر دوژمنان. پرسی غەنیمە چیە؟ ووتی: ئارەزووی تەقواکردن و دونیا بەکەم گرتنە. پرسی نەرم و نیانی چیە؟ ووتوی: خواردنەوەی توڕەیی و دەروون کەچکردنە. پرسی دەوڵەمەندی چیە؟ فەرمووی: ڕەزامەند بونی دەروونە بەوەی خوادا داویەتی گەر کەمیشبێت، چونکە دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دەرونیە. پرسی زەلیلی چیە؟ فەرموی شڵەژانی سەختە لەهەواڵی ڕاستەقینەدا. پرسی بوێری چیە؟ ووتی: گونجاوە بەهاوڕێی و دۆستی هەموان. پرسی ئەرك قورسی چیە؟ ووتی: قسەیەکە پەیوەندی بە تۆوە نەبێ. پرسی شکۆ چیە؟ ئەوەیە لەبژاردندا بەخشەرو لە هەڵەدا لێبووردە بێت. پرسی عەقڵ چیە؟ ووتی: پاراستنی دڵە لەگشت ئەوانەی پێتدرا بۆ پاراستن. پرسی نەفامی و گێلی چیە؟ ووتی: ئەوەیە دوژمنایەتی پێشەواکەت بکەیت و دەنگی بەسەردا بەرز بکەیتەوە. پرسی پیاهەڵدان چیە؟ ووتی: کردنی جوانی و نەکردنی ناشیرینیە. پرسی خۆگرتن چیە؟ ووتی: نەرم و نیانیە نەك ترسان و خۆ دوورگرتنە لە گومان و خراپە بەخەڵکی. پرسی گەورەیی چیە؟ ووتی: گونجانە

---

١ ـ الطبقات (٢٧٦/١) إسناده ضعيف مرسل.

لەگەڵ برایان و پارێزگاری کردنی هاوسێیانە. پرسی پوچی چیە؟ فەرموی: شوێنێکەوتنی کەسانی نەفس نزم و سەرگەردانە. پرسی بێ ئاگایی چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە بەش و پشکی خۆت واز لێ بهێنیت کە خرابێتە بەر دەستت. پرسی گەورە کیە؟ ووتی: ئەوکەسەیە لەسەروەتدا گێل و لەناموسدا بێخەم و وەڵامی جنێودان ناداتەوە و لەکاروباری خێزان و بنەماڵەدا خەفتبارە، پاشا ن فەرمووی: کوڕی شیرینم بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: لەنەفامی هەژارتر نیە و هیچ سەروەتێك بەعەقڵ ناگاو لەخۆنازکردن خراپتر نیەو لەڕاوێژکردن دیمەنیکی جوانتر نیە، هیچ وەك ڕێکخستن نابێت، ڕچەڵەکیش وەك ڕەوشت جوانی وەرعیش وەکو دوورکەوتنەوە لەتاوان نیە هیچ پەرستنێك وەکو بیرکردنەوە هیچ باوەڕێك وەکو شەرم، سەری ئیمان ئارامگرتنە، نەخۆشی قسەکردن درۆیە و، نەخۆشی زانینیش لەبیرچونەوەیە و، نەخۆشی پەرستنیش دوورکەوتنەوەیە و، نەخۆشی ئازایەتیش ستەم کردنە و، لێبوردنیش منەت کردن و جوانیش خۆهەڵکێشان و خۆشەویستیش شانازیکردنە.

پاشان علی(رضي الله عنه) فەرمووی: کوڕی شیرینم هیچ کاتێك کەس بەکەم نەزانێ گەر لەتۆ گەورەتر بێت وای دابنێ کە باوکتە وەکو خۆتیش بوو ئەوەبراتە گەرلەخۆشت منالتر بوو وای دابنێ کوڕی خۆتە. ئەوە بوو علی لەبارەی پیاوەتیوو جوامێریەوە ئەو پرسیارانەی لێکرد، قازی أبوو فەرەجیش دەڵێ: لەم قسانەی دانایی و سوودی زۆری تیادایە و سوودی زۆی لێ دەبینێ ئەو کەسەی بێپارێزی و کاری پێ بکا بەکارکردن پێی خۆش بێ و ئامۆژگاری بکات و بەگەڕانەوە بۆی مامەڵەی خۆی پوخت بکاتەوە، بەهەڵوێست کردنیش سودی زیاتر بێت، ئەوەشی لەگەورەی ئیمادارن و چەندانی تر لەپێغەمبەری خوا گێڕاویانەتەوە زیاد نیە بۆ ژیرێکی شارەزاو ووتاربێژێکی هۆز و نەتەوە لەوەی بەگوێ بکەن و لێ ڕابمێنن، ئەوکەسەش بەگوێ بکات ئەوە بەختەوەر و خاوەن بەشە.[1]

إبن کثیر لەو قسەیەدا زیادی کردوە دەڵێ: بەڵام ئەم (أثر)ە ئەو فەرموودە (مرفوع) و (ضعیف)انەی، کە تیایدایە و نموونەی ئەو ووشانە لە دەربڕینەکانیدا لەهەرێکیاندا

١ ـ البداية والنهاية(١١/ ٢٠٢).

بەڵگەی ڕەتکردنەوەی (نكارة) تیادایە بەوەی پارێزراو نیە، خواش زاناترە[1]، بەلام لەبەرئەوەی ئەوشتانەی باسمانکردوە لەگەڵ قورئان وسونەتەدا دژ نابێ وبیرو باوەڕی یان پەرستنێکی لەسەر بنایت نەنراوە و تەنیا بانگەوازێکە بۆ ئەخلاق جوانی، ئەوە لە بەلگە پێ هێنانەوە ڕێگریەك نیە.

بێگومان ئەمیری ئیمانداران علی(ﷺ) لە حەسەنی کوڕی پرسی نێوان باوەڕ و یەقین چەندە؟ حسن (ﷺ) فەرموویەتی: نێوانیان چوار پەنجەیە. ئەمیری ئیمانداران(ﷺ) پرسی: چۆن؟ حەسەنیش فەرموویەتی: باوەڕ (إيمان) ئەوەیەکە چاوت بینیویتێ و، دڵیش پێ ی دڵنیا بووە، نێوان چاووگوێش تەنیا چوار پەنجەیە[2].

لە ووتەکانیدا: جوان پرسیارکردن نیوەی زانستە[3]، لەبارەی بێدەنگیشەوە پرسیاری لێکراوە؟ فەرموویەتی: چاو داپۆشینە یان ناموس پاکیە، بکەرەکەی لەئاسودەیی و هاوڕێگەشی لەپارێزراویدایە[4]، لەزانسیشدا ئامۆژگاری بەفێربونی عەرەبی[5]، دوپاتی فێربونی کردۆتەوە، دووپاتکردنەوەی ئەوەی جێبەجێکردنی ڕێسا زانستیەکان لەخوێندنەوەدا پێویستە تایبەت لەخوێندنی قورئانی پیرۆز دا بووە، چونکە زمانی عەرەبی ئەو زمانەیە کە بەنوسین و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزی پێ دابەزێنراوە وشەریعەتی پێی هێنراوە و، بەوەش پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیاندویەتی وسونەتە پیرۆزەکەی فێری هاوەڵان کردووە و، بەو زمانەش کتێبە ئایینی و زانستی و داناییەکان نوسراوەتەوە، بۆیە پێویستە پێگەیشتوو فێری ببێ، دەنا لەئایندا نەفام و لەزانستیشدا ناتەواوە، سەرباری ئەو تایبەتمەندیەش، کە ئەم زمانە هەیەتی لەڕووی ڕەوانبێژی و ڕوانی وپوختی وخۆشی لە گوێکاندا.[6]

---

١ ـ البداية والنهاية(١١/٢٠٢) الطبراني الكبير، حديث موضوع.

٢ ـ التبين في أنساب القرشيين، ١٢٧.

٣ ـ نورالأبصار للشبلنجي، ١٢٢، الحسن بن علي رسالة ماجستير، ٣٨.

٤ ـ من أقوال الصحابة، ٦٧ گواستراوەتەوە لەحەسەنی کوڕی عەلیەوە، رسالة ماجستير٣٨.

٥ ـ مفتاح السعادة، أحمد مصطفى (٨٢/٢)، گوستراوەتەوە لەحەسنی کوڕی عەلیەوە.

٦ ـ نصيحة الملوك ٣٥٠ للماوردي.

ئەوشتانەش کەدوپاتی توانای حەسەنی کوڕی علی لەزانینی زمانی عەرەبیدا دەکەنەوە، ئەوەیە، کە بەیەکێك لەقسەزانەکانی عەرەب دانراوە، عەمری کوڕی علاء وتوویەتی: لەحەسەنی کوڕی علی(ﷺ) قسەزان و ڕەوانبێژترم نەبینیوە.[1]

حەسەنی کوڕی علی کۆمەڵێك قوتابی جوامێری هەبووە، لەوانە حەسەنی کوڕی و مەسیبی کوڕی نەجبە و، سویدی کوڕی غەفلە و عەلائی کوڕی عبدالرحمن و شەعەبی و هوبەیری کوڕی یریم و ئەسبەغی کوڕی نەباتەو جابری کوڕی خالید أبو حوراء و عیسای کوڕی مأمونی کوڕی زوراره ئەووترا: إبن مأمون و ئەبو یەحیا عومەیری کوڕی سعیدی نەخەعی و ئەبو مەریەم قەیسی سەقەفەی و طحرب العجلی و ئیسحاقی کوڕی یساری باوکی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و سوفیانی کوڕی لەیل و عمری کوڕی قەیس، کە کوفی بوون.

لەزانستی (المصالح والمفاسد)دا زانیاری فروان و وردی هەبوو و تێگەیشتی قووڵی دەرەکەوێت لەمەبەستە شەرعیەکان لەپێشخستنی یەکبونی ئومەت و پاراستنی خوێنان خستە پێش بەرژەوەندی دونیا، کە لەبەرژەوەندی معاویەدا لەخەلیفایەتی پاشگەزبوویەوە.

## ٢ـ عیبادەتی:

حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) لەپەرستندا لەڕیزی تێکۆشەران و لە ژیانیدا چەمکی گشتگیری پەرستنی کارپێکردووە (العبادة الشامل)، ئەو شیری پەرستنی لەگەڵ دوعای پێغەمبەرێتی و پەروەردەکەی زەهرای دایکی، کە هاتەلای باوکی (علیه السلام) تا خزمەتگوازی داوابکات، ئەوەی پێ نیشاندا کەلەوە باشتر ئەوەیە، کە حەمدکردن و لا الە إلا الله والله أکبر کردنە، لەشەویشدا کەلە جێگەدا بوون بەخۆ و بەعلی مێردیشی فەمووی: (ألا تقومان فَتُصليان)؟ ئایە هەڵناسن و شەونوێژ ناکەن؟

ئەو لەماڵی زوهد و پەرستن و وەرع و لەخواترسی و نەرمونیانی وئارامگرتن و نقوم بوو بوو لە چەمك و نموونەی ژیاردەر درێژەی بەژیان دا، تابوبە نمونە، نمونەی پێ ئەهێنرایەوە و لەوەشدا هاوەڵە بەرێزەکان شایەتی بۆ ئەدەن.

---

١ ـ الكامل في التأريخ (٤/ ١٣٤).

* لەوانەی لەتەکیدا تێکەڵ بوون وتویانە بەزانین بەندە و بەدڵنیایی ڕوو لەخوا بووە و بەڕەزامەندیەوە پشتی لەدونیا و سەرقاڵیەکان کردەوە، بۆیە کەدەستنوێژی شۆردووە لەدەستنوێژ بۆتەوە ڕەنگی گۆڕاوە، لەوەشدا پرسیاری لێکراوە فەرموویەتی: حەقە ئەوکەسەی قسە لەگەڵ خاوەن عەرشدا ئەکات ڕەنگی بگۆڕێ.[1]

إبن سعد دەڵێ: لەحەسەنی کوڕی علی و عمری کوڕی عەبدولعەزیز کەسی ترم نەبینیوە وەك ئەوان لەخوا ترسابێ، وەکو ئەوەی دۆزەخ تەنیا بۆ هەردووکیان دروستکراوبێ[2]، بۆیە هەرچ کاتێ ئەو بەندەیە لەخوای خۆشەویستی نزیکبێتەوە و ناو و سیفەتەکانی ناسیبێ، ئەوە دەسەڵاتی خوای زیاتر لەدڵدا زۆربووە و لێ ترساوە، خوای بالادەست فەرموویەتی: ﴿ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ [آل عمران:٢٦].

دەوڵەت لەناو دەبات و دەوڵەتێکی تر ئەهێنێتە بوون، فریشتەکان لەفەرمانیدان و بەپێی ویستی پەروەردگار ئەجوڵێنەوە دەسەڵاتی خوابێ کەم و زیادو پێشخستن و دواخستن جێبەجێ دەکرێ، لەئاسمەکان و زەوی و دەریاکان و گشت بەشەکانی جیهان بە تۆزوقاڵەکانیەوە چۆنی بۆی هەڵی دەگەڕێتەوە و دەگۆڕێ[3]، پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ ﴾[السجدة: ٥]، بۆیە خوای گەورە هەستکردن و بەگەورەیی و مەزنی خواو ناسینی ناو سیفەتەکانی ترس لەخوای گەورە لای بەند دروستدەکات، ئەو خوایەی کەهەموو شتێك ملکەچێتی[4]: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَظِلالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ﴾[الرعد:١٥].

---

١ ـ وفيات الأعيان(٢/٦٩).

٢ ـ الطبقات الكبرى(٢/٣٩٨).

٣ ـ الإيمان أولاً فكيف نبدأبه، مجدي الهلالي، ٧٦.

٤ ـ هەمان سەرچاوە.

* حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) گەرنوێژی بەیانی بکردایـە تابەرزبونـەوەی خـۆر یـادی خوای دەکرد و گەورە و بەڕێزەکانیش لای دادەنیشتن و پرسیارو قسەیان لێ دەکرد، پاشـان ئەچووە سەردانی دایکـانی ئیمانـداران و سـەلامی لێیـان ئـەکردو، پاشـان ئەچـویەمالّی خۆی[1]، ئەوانە بەختەوەرن کە فریشتەکان دوعاو نوێـژیان لەسـەر دەکـەن، ئەوانـەی دوای کردنـی نوێـژەکانیان لەشـوێنی خۆیانـدا ئەنیـشن، بەڵگـەی ئـەوەش ئـەم فەرموودەیـەی خوارەوەیە: ئەحمەد لە أبوو هورەیرەوە ڕیوایەتیکردووە، کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویـەتی: (الملائكة تصلي على أحدكم مادام في مصلا، الذي صلى فيه، مالم يحدث، اللـهم اغفـر لـه اللهم ارحمه[2]، وإن جلس نتظر الصلاة صلت عليه الملائكة، وصلاتهم عليه: اللهم اغفر له، اللهم ارحمه) ئەو کەسەی کە لەشوێنی نوێژەکەیدا دەمێنێتـەوە دوای نوێـژ کـردن، دەسـت نوێژی هەبێ، ئەوە فریشتەکانی بۆی ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن خوایـە لێ ببـوری، خوایەبـەزەیت پێدا بێتەوە.[3]

پێشەوا ئەحمەد لەعەتائی کوڕی سائب ڕیوایەتی کردووە کـە دەڵـێ ڕۆیـشتمە لای أبـو عبدالرحمن سولەمی نوێژی بەیانی ئـەکرد بەدانـشتنەوە، پـێم ووت: خۆزگـە بـچویتایەتە جێگەت و ماندویەتیت دەربچوبایە، ئەویش ووتی: لە علی بیـستم فـەرمووی: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من صلى الفجر ثم جلس في مصلاه صلت عليـه الملائكـة، وصـلاتهم عليه: اللهم اغفر له اللهم ارحمه، وإن جلس نتظر الـصلاة صـلت عليـه الملائكـة، وصـلاتهم عليه: اللهم اغفر له، اللهم ارحمه). هەرکەسێ نوێژی بەیانی بکات و لەشـوێنی نوێژەکـەی دا بمێنێتەوە، ئەوە فریشتەکان نوێـژی پارانـەوەی لەسـەر دەکـەن پارانەوەشـیان لەسـەری ئەوەیە: خوایە گیان لێی ببووریّ، خوایـە گیـان بـەزەییت پیـدا بێتـەوە، هەرکەسـێکیش چاوەڕێی نوێژ بکات ئەوا فریشتەکان پارانەوەیان لەسـەر دەکـەن، پارانەوەشـیان لەسـەری ئەوەیە خوایەگیان لێی ببوریّ خوایەگیان بەزەییت پیدابێتەوە.[4]

---

١ ـ البداية والنهاية(١١/١٩٤،١٩٣).

٢ ـ مسند أحمد رقم: ٨١٠٦ صححه أحمد شاكر.

٣ ـ مسند أحمد: ١٢١٨ حسنه أحمد شاكر.

٤ ـ مسند أحمد (٢/ ٣٠٥ ـ ٣٠٦) حسنه أحمد شاكر.

له زانای پایه بەرز عەبدالعزیز بن باز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پرسیارکرا: ئایە مانــەوە لەماڵدا بۆ خویندنی قورئان لەدوای نوێژی بەیانی تاخۆرهەڵاتن، پاشــان دوورکـات نوێـژی چێشتەنگاو بکات، هەمان پاداشتی مانەوەی لە مزگەوت هەیە؟ لە وەڵامدا فەرمووی:ئەم کارە چاکەو پاداشتی زۆری تێدایە، بەڵام زاهیری ئەو فەرمودانەی لەوە دا هـاتووە هـەمان ئەو پاداشتەی نیە، کە پەیمانی پێدراوە وەکو ئەوکەسەی لەمزگەوتداو لەشوێنی نوێژەکەیدا ئەمێنێتەوە، پاشان گەر لەبەر نەخۆشیەك یان لەترسێك لەماڵدا نوێژی کرد، ئەو چاکەیەی بۆ وەدی هاتووە، کە لەم فەرموودەیەدا هاتووە بۆئەویش هەیە، چونکە نوێژکردنی لەماڵدا پاساوی خۆی هەیەو ڕێگەدراوە. بەوشێوەیە ئـافرەتیش گـەر لـەدوای نوێژەکەیـدا مایـەوە وپارایەوە یادی خوای کردەوە یان قورئانی خوێند تا خۆر هەڵاتن وپاشان دوورکـات نوێـژی کرد ئەوە ئەو پاداشتەی بۆ هەیە کەلە فەرموودەکەدا هاتووە[1].

بەڕاستی حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) فێری گرنگی یادمان دەکات لەبەیانیا و لە ڕێگەی ژیانە خواو ویستەکەیەوە ئارەزووی خەو بەجێ هێـشتنمان بـۆ دەکـات لەبەیانیانـدا، إبـن القیم باسی گرنگی یادمان بۆ ئەکات لەبەیانیان و دەڵێ: ئەوەی بەلایانەوە حەز پێ نەکراو بێ خەوی نێوان بەیانیان و هەڵاتنی خۆر بووە، چونکە ئـەوکات کـاتی دەسـتکەوتنە، بـۆ ڕێبوارانیش لەوکاتەدا گرنگیەکی گەورەی هەیە، تەنانەت گەر بەدرێژایی شـەو ڕێگەشـیان بڕیبێ، ئەوە لەوکاتەدا ڕێگە بەدانیشتن و نادەن تا هەڵاتنی خۆر، چـونکە سـەرەتا وکیلـی ڕۆژ و کاتی دابەزینی ڕۆزی و وەدەست هێنانی بەش و بەرەکەتەو لەوەو ڕۆژ دێت، بڕیاری گشتیشی ئەکەوێتە سەرئەو پشکە، بۆیە پێویستە خەوتن لەوکاتەدا خەوی ناچاربێ.[2]

لەبـەر گـەورەیی ئـەو کاتـە و ڕۆیـشتن ڕووەو خـوا، ئـارەزووی زۆر ئـەبینیت لـەوەی بەیادکردنەوە زیندو و بکاتەوە.

لەئەنەسەوە (ﷺ) ئەفەرمووی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((من صلى الفجر في جماعة، ثم قعد يذكر الله تعالى حتى تطلع الشمس ثم صلى ركعـتين كانـت كـأجر حجـة وعمرة تامة تامة))، واتە: (هەرکەسێ نوێژی بەیانی بەکۆمـەڵ بکـات و، پاشـان تـا

---

١ ـ مجموعة فتاوى ومقالات متنوعة، إبن باز(١١/ ٤٠٣ ـ ٤٠٤).

٢ ـ تهذيب مدارج السالكين ٢٤٨.

خۆر هەڵهاتن یادی خوای گەورە بکات و، پاشان دوورکات نوێژ بکات وەکو پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواوی هەیە)).[1]

إبن ڕەجەب دەفەرموێ: لەبەرئەوەی حەجکردن باشترین کردارەکانەو دەروونەکان بۆی تامەزرۆن، لەبەر ئەو خۆشەویستیەی بۆ ئەو ماڵە گەورەیە خوا خستوتیە دڵانەوە، زۆرێك خەڵکیش توانای پێ گەیشتنیان نیە، بەتایبەت لەهەموو ساڵێکدا، خوای گەورە بۆ بەندەکانی کردار گەلێکی داناوە، کە پاداشتەکانیان وە پاداشتی حەج دەگەن و، بەوەش ئەوانەی ناتوانن حەج بکەن ئەوکارە قەرەبوکاریەکە بۆیان[2]، مامۆستا (البناء) دەڵێ: برای خۆشەویستم: لە هەموو ڕۆژێکدا لە بەیانیان و ئێواران و بەرەبەیاندا ساتێکت بۆ هەیە و ئەتوانی ڕۆحی پاکت بگەیەنیتە ئاسمان و (ملك الأعلی) بەرزبکەینەوە و خێری دونیاو ئاخیرەت وەدەست بخەیت، وەرزی گوێڕایەڵیەکان و ڕۆژگاری پەرستنەکان و ئەوانەی نزیکبونەوەکانت لەبەردەمایە، کە قورئان و پێغەمبەرە مەزنەکەت بۆ دەوێت یان ئاراستەکردووە، بۆیە سووربە لەسەر ئەوەی لەیادەکاران بی نەك بێ ئاگایان، کار ڕاپەڕێنەران بی نەك تەمەڵان، کات کۆ کەرەوە، چونکە کات وەکو شمشێرە، دوورکەرەوە لەوەی دوایی کردارەکەم، چونکە لەو قسەیە زیانبارترنیە.[3]

حەسەنی کوڕی علی لەکاتی خۆرهەڵاتندا ئەیفەرموو: (سمع سامع تحمد الله الأعظم لا شريك له له الملك و له الحمد وهو على كل شيء قدير، سمع سامع بحمد الله الأمجد لاشريك لةلة الملك ولة الحمد هو على كل شيء قدير)).[4]

حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) پەیوەست بووە بەو ویردو پاڕانەوەی، کە لە پێغەمبەری خواوە سەلماوە و ئامۆژگاری خەڵکی کردوە لەوەی لەمزگەوتدا نوێژبکەن وئەیفەرموو هەرکەسێ لەگەڵ مزگەوتدا بووە، ئەوە خوای گەورە چەند شتێکی پێ ئەبەخشێ: برایەکی

---

١ ـ سنن الرمذي وقال الترمذي حديث حسن صحيح رقم: (٥٨).

٢ ـ لطائف المعارف، لا ٣٥١، البدر في الحث على صلاة الفجر دكتور عماد علي، لا ٨٦.

٣ ـ الرقاق، لا ١٨ نقلاً عن لجلة الدعوى، العدد٨ سنة ١٩٥١، الإيمان أولاً، لا ٢٨٤.

٤ ـ الطبقات (١/ ٢٩١) تحقيق السلمى إسناده صحيح.

سودبەخش و ڕەحمەتێکی داپۆشەریان زانستێکی پاك یان ووشەیەك، بەڵگەی ڕێشاندەری، یان وازهێنان لەتاوان لەترسا یان لەشەرما بێ.[1]

حسن (رضي الله عنه) خەریکی شەو نوێژ بووە، لەسەرەتای شەودا لەشەو نوێژدا بەشی خۆی وەرئەگرت و لەکۆتایی شەویشدا نوێژی ئەکرد، چونکە شەو نوێژی لەئامرازە گرنگەکانی و ورياکردنەوەی باوەڕە، کەچاکە کاران ئەنجامیان داوەو، لەزیندو کردنەوەی دڵاندا ئەوپەڕی شوێنەوارو کاریگەری تیادا دۆزیوەتەوە.[2]

إبن لحاجیش لە (المدخل)دا دەڵێ: شەو نوێژ سوودی زۆرە، لەوانە: چۆن بای توند گەڵای وشك لەدار ئەکاتەوە، ئاوەهاش تاوان لەناو دەبات، یەکێکی تر لە کاریگەریەکانی ئەوەیە دڵ ڕوناك ئەکاتەوە و فریشتەکان لەئاسمانەوە شوێنی ئەبینن چۆن ئەستێرەی پرشنگدار خەڵکی زەوی ئەیبینێ و فوی شەو نوێژیش بەفەڕو ڕوناکی ئەگەڕێنێتەوە بۆسەر خاوەنەکەی.[3]

بەڕاستی شەو نوێژ گەورەیی ئیماندارو ڕێزەکەیەتی، هەروەکو پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: گەورەیی ئیماندار نوێژەکەیەتی لەشەوان و، سەربەرزیەکەشی چاو نەبڕینەتی لەوەی لەدەستی خەڵکاندایە.[4]

بێگومان کەسانی شەو نوێژ بکەن لەناو خەڵکیدا بەڕێزترن، کەسانی خەواڵو بێ ئاگا و هاوشێوەکانیانیش ئەو کەسانە شەرمەزارن.[5]

لەژیاننامەی حەسەنی کوڕی عەلیە وە گرنگی شەو نوێژ فێرئەبین، لەشەودا مرۆڤ ئەتوانێ إخلاص لە دڵیا بچێنێ، بەئەندازەی چاندنەکەیش بەرهەمی چاکە لە دڵتدا ئەبێ، هەرچاکەیەکیش ڕووبەرەکەی فراوان بویەوە ئەوە لەهەموولایەکەوە ڕوناکی دایئەپۆشێ: ﴿إِنْ يَعْلَمِ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْراً﴾ [الأنفال: ٧٠].

---

١ ـ عيون الأخبار (٣/ ٥) الحسن بن علي، لا ٢٧.

٢ ـ الزهد لابن حنبل، لا ١٧١، رهبان الليل(١/ ٤٠٣) للعفاني.

٣ ـ الايمان أولاً، لا ١٧٢.

٤ ـ صحيح الجامع، رقم ٣٧٠١ السلسلة الصحيحة رقم: ١٩٠٣.

٥ ـ الإيمان أولاً: لا ١٧٣.

شەو نوێژی لەگرنگترین پایەی سوپاسگوزاریە، کە حەسەنی کوڕی(رضي الله عنه) ئەنجامیداوە، سوپاسکردنی خوایە لەسەر ئەو نازونیعمەتەی کەناژمێردرێ، بەندەی سوپاسگوزاریش ئەوەیە، کە شوێنەواری نیعمەتی بەسەرەوە دیارە و ئەوپەڕی شوێنەواری نیعمەتیش پێویستە لەسەربەندە دەرکەوێ لەزیاتر ملکەچکردن و چەمینەوەو بەگەورەڕاگرتنی خوای بەخشندە.[1]

خوای پەروەردگاریش ئەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّ الْإِنْسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيباً إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِنْ قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَنْدَاداً لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِهِ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلاً إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ (٨) أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴾[الزمر: ٨، ٩ ] لە ئەم ئایەتە پیرۆزەدا لەبارەی دووکۆمەڵەی خەڵکێیەوە قسە ئەکات، کەخوای گەورە نیعمەتی پێداون، یەکەم کۆمەڵ لەئەزمونێکی سەختدا تێپەڕ بووەو لەتەنگ و چەڵەمەدا بووە و بەڕاستگۆییەوە داوای خوای کردووە و کێشەو نارەحەتیەکە لاچووە، بەڵام سوپاسی نەکردووە گەڕاوەتەوە باردۆخی خۆی، ئەوی تریش لە ڕێگەی سوپاسگوزاریەوە بەردەوام بووە و، بە دوعاو کروزانەوە بۆخوای ڕێگەی سوپاسگوزاری گرتۆتەبەر، خوای گەورەش ئاوها باسی هەردوو حاڵەت ئەکات: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾[الزمر: ٩] هەردوو وەکو یەك نابن ئەوانەی کە مافی سوپاس و نازونیعمەت ئەزانن و ئەوانەی کە نایزانن.[2]

شاعیریش دەڵێ:

القانتون المخبتون لربهم     الناطقون بأصدق الأقوال

يحيون ليلهم بطاعة ربهم     بتلاوة وتضدع وسؤال

وعيونهم تجرى بفيض دمعهم     مثل أنهمال الوابل الهطّال

في الليل رهبان و عند جهادهم     لعدوهم من أشجع الأبطال

---

١ ـ هەمان سەرچاوە ١٧٤.

٢ ـ الإيمان أولاً، لا ١٧٥.

بوجهم أثر السجود لـــــربهم وبها أشعة نوره المتلالـــي[1]

واته: ئەوانەی بکرۆزیـەوە پـەروەردگاریان بەڕاسـترین قـسەیادەکەنەوە و لەگوێڕایـەڵی پەروەردگاریان بەقورئان خوێنـدن و ملکەچـی وپارانـەوە و شـەوانیان زینـدو دەکەنـەوە و چاوانیان وەکو بارانی بەخوڕ فرمێـسکی لێ ئـەبارێ، لەشـەودا گۆشـەگیر و خواپەرسـتن و لەجەنگی دوژمنا نیشانیدا لەئازاترین پاڵەوانن، بەڕوویانـدا شـوێنەواری کڕنوشـبردنیان بـۆ پەروەردگاریان دیارە و تیشکی ڕووناکی لێوەدیارە.

حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) حەجی زۆر دەکـرد، عبداللـە کـوڕی عباسـیش وەتویـەتی: لەیەك شتدا پەشیمانیم کێشاوە، ئەوەیە لەگەنجیـدا بـەپیادە حـەجم نـەکردەوە، بێگومـان حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) بیست و پێنج جار بەپیادەیی حەجی کردووە، ئەمەش بەڵگەیـە لەسەر گەورەیی حەج بەپیادە لەگەنجیەتیەکەیدا سێ جاریش سەروەتەکەی دابەش کـردووە، ئەوەش بەڵگەیە لەسـەر گـەورەیی حـەجکردن بـە پیـادەیی، پاڵپـشتی ئـەو گەورەییـەش پەشیمانیەکەی إبن عباسـە (رضي الله عنه) لـەوەی ڕۆژگـاری گەنجێتیەکـەی بـە پیـادەیی حـەجی نەکردووە و حەسـەنیش لـەوەدا بـەردەوامی هـەبووە لـەو ئـازارو نارەحەتیـەی لەحەجـدا بینیوێتی، ئەوەش بەڵگەیە لە هێزی بـاوەڕی و ئـارەزووی ڕاسـتگۆیانەی لـەزیاتر کردنـی کاری چاکەدا، مەبەستیش لەبـەپیادە ڕۆیـشتن بۆحـەج لەمەکـەوە بـۆ عەرەفـە و پاشـان لەعەرەفەوە بۆ مەککە مەبەست لەوە نیە حـاجی بـەپیادە وە لەدەوڵـەتی خۆیـدا بۆحـەج دەربچێ[2]، لەژیانی حەسەنی کوڕی عەلیەوە گرنگی گەشت کردن بۆ ماڵی خوا فێر دەبین، هەر چۆن باردۆخمان ڕێگەیدا و ماڵ و بارمـان لـەبار بـوو، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمویـەتی: ((تابعوا بين الحج والعمرة، فإن متابعة بينهما تنفى الفقر والذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد)).[3]

---

١ ـ رهبان الليل (١/ ٣٦٥).

٢ ـ التاريخ الإسلامي (١٩/ ٢٢).

٣ ـ الإيمان أولاً: لا ٢٤٩.

بۆیە حسن بەپیادە حەجی کردوە هەندێ لە ڕیوایەتەکانیشدا باس دەکرێ کەبیست و پێنج جار جوامێریانە ڕاپەڕاندووە [1]، دەڵێ: شەرم لەپەروەردگار ئەکەم کەپێی بگەم بەپیادە بۆ ماڵی نەڕۆیشتم[2]، حسن (رضي الله عنه) زۆر بێدەنگ و لەسەر ڕێبازی باپیرەی (ﷺ) بەندایەتی دەکرد.

## ٣. دونیا بەکەمگرتنی (زهدە).

حسن(رضي الله عنه) لەڕێگەی ژیانی لەگەڵ قورئانی پیرۆز و هاوەڵیەتی کردنی ئەمیری ئیمانداران علی (رضي الله عنه) باوکیەوە و بیرکردنەوەی لەم ژیانەدا تێگەیشت کەدونیا شوێنی تاقیکردنەوەیە، بەقورئان پەروەردکراو باش ئەو ئایەتانەی لەگوێ گرت، کەباس لەدونیا سوکی و دابڕان و خێراتیاچوونی ئەکات، هەموو ڕۆژی سورەتی(کهف)ی ئەخوێندەوە ئایەتی:﴿وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيماً تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقْتَدِراً (٤٥) الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَاباً وَخَيْرٌ أَمَلاً﴾ [الكهف ٤٥: ٤٦] دەگەیشت، ئەوەش بەڵگەیەلەسەر سووکی دونیا و تیاچونی هەموو خۆشیەکانی و ملنانیەتی ڕووەو تیاچوون.

خوای گەورە ڕونی کردۆتەوەکە دونیا خێرا تیادەچێ و نامێنێ، ئەوە بەلای کەسی ژیرەوە ناشیرینی ئەکات کە شانازی بەدونیاوە بکات [3]، ﴿ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴾[ الكهف: ٤٦ ] واتە: کارە چاکەکان و کردارە گوێڕایەڵیەکانی وەکو نوێژەکان باشترین پاداشت و گەورەترین نزیکبونەوەیە لەخواو مانەوەترین شوێنەواری هەیە، کەپاداشتەکەی بۆخاوەنەکەی ئەگەڕێتەوە، باشترین ئومێدیشە کەخاوەنەکەی لەئاخیرەتدا پاداشتێك وەردەگرێت کە لەدونیادا ئومێدی بۆهەبووە.[4]

---

١ ـ تأريخ إبن عسكر (١٤/ ٧٢).

٢ ـ هەمان سەرچاوە (١٤/ ٧١).

٣ ـ التفسير المنير(١٥ / ٢٥٩).

٤ التفسير المنير(٢١٦/١٥).

حەسەنی کوڕی علی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری باپیری(ﷺ) پەروەردەبوو کە زاناترین خەلق بوو بەرامبەر دونیا، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لو کاتن الدنیا تعدل عند الله جناح بعوضة ما سقی کافراً شربة ماء))، دونیا ئەگەر باڵە مێشێك قیمەتی هە بوایە لای خواوە ئەوا بێ باوەڕ قومێ ئاوی تیا نەدەخواردەوە[1]، هەروەها فەرموویەتی: ((ما الدنیا في الاخرة الا مثل ما یجعل أحدکم في الیم فلینظر بما ترجع))، دونیا لەچاو ئاخیرەتدا وەکو ئەوە وایە یەکێ لەئێوە پەنجە بخاتە نێوئاوێکەوە پاشان دەریبهێنێ پاشان بڕوانێ کەچی هێناوەتەدەر لەو ئاوەوە[2] پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((الدنیا سجن المؤمن وجنة الکافر))، دونیا بەندیخانەی ئیماندارو بەهەشتی بێ باوەڕە[3] بێ گومان ئەمیری ئیمانداران حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه)، بەپەروەردەی قورئانی و پێغەمبەری کاریگەربوو، لەراستگۆترین نمونەی موسڵمانەکان بوو لە زوهد و دونیا بەکەم گرتندا.

لە زوهدا بەنمونە دەهێنرایەوە و درێژەی ئەو باسەیەشت بۆباس دەکەین.

سوربوونی مرۆڤ لەسەرگەورەیی و دەسەڵات زیاترە لە سوربونی لەسەر سەروەت و سامان، هەروەکو چۆن داواکەردنی گەورەیی دونیا و سەرۆکایەتی کردن بەسەرخەڵکی و گەورەنواندن لەزەویدا لەداواکردنی سەروەت بەسەربەندەوە زیاترە، زیانی گەورەیە و بەکەم کردنی سەختە، چونکە سەروەت و سامان و گەیشتن بەسەرۆکایەتیکردندا ئەبەخشێ، سوربونیش لەگەوریدا دووجۆرە:

یەکەمین: داواکردنی گەورەیی بۆ دەسەڵات و سەروەت، ئەمەش زۆرترسناکە و بە زۆریش چاکەی ئاخیرەت و گەورەیی ڕێزەکەی ناهێڵێت، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾[القصص: ٨٣].

---

١ ـ سنن الترمذي رقم: ٤١١٠ صحیح غریب.

٢ ـ المسلم، رقم ٢٨٥٨.

٣ ـ مسلم، رقم: ٢٨٥٦.

که من ئەوکەسانەی لەسەرۆکایەتی کردنی دونیادا قیامەتیان مسۆگەرکردبێ[1]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) بە (عبدالرحمانی کوڕی سمُر)ی فەرموو: ((یا عبدالرحمان لا تسأل الإمارة فإنك إن أعطيتها عن مسألة وكلت اليهان وإن أعطيتها عن غير مسألة أعنت عليها))، ئەی عبدالرحمان داوای ئیمارەوەو دەسەلآت مەکە، چونکە گەرباشت ڕاپەڕاند پاداشت دەدرێ و گەر بەپێ خۆی ئەنجامت نەدا ئەوا سزای لەسەروەردگری و پەشیمانی ئەکێشی.[2]

لە أبوهرەیرەوە(ﷺ) کەپێغەمبەر فەرموویەتی: (إنكم ستحرصون على الإمارة وستكون ندامة يوم القيامة فنعمت المرضعة وبئست الفاطمة)، ئێوە لەسەر وەرگرتنی کارو بارو دەسەلآت سورو بەجۆشن بێگومان لەقیامەتدا پەشیمانی کێشانە.

بێگومان خۆش ویستنی سەروەت و دەسەلآت و سوربوون لەسەریان ئاینی مرۆڤ وێران دەکەن، مەگەر ڕەحم بەو کەسانە بکات دەنا ئاینیان نامێنێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ما ذئبان جائعان أُرسلا في غنم بأفسد لها من حرص المرء على المال والشرف لدينه))، بەقەد ئەوەی سوربونی مرۆڤ لەسەرسەروەت و گەورەیی بۆدینەکەی خراپەیە، ئەوەندەی دووگورگی برسی بۆسەر مەڕ مەترسی نیە کەوێرانیان بکەن و قڕیان بەکەن.[3]

بنچینەی خۆشەویستی سەروەت و گەورەیی، خۆش ویستنی دونیایە، بنچینەی خۆش ویستنی دونیاش شوێنکەوتنی ئارەزووە.[4]

وهبی کوڕی مونبهیش دەڵێ: لەشوێن کەوتنی ئارەزوو (هوی) ئارەزوو بونی لەدونیا و ئارەزویشی تیایدا خۆش ویستنی سەروەت و شورەییو دەسەلآتە، لەخۆش ویستنی سەروەت وگەورەییش حەلآل کردنی حەرامەکانە[5] بۆیە پەروەردگاری باڵا دەست لە سورەتی النازعا ت دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ طَغَى (٣٧) وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا (٣٨) فَإِنَّ

---

١ ـ ما ذئبان جائعان إبن رجب لا ٣٣.

٢ ـ البخاري رقم: ٦٦٢٢.

٣ ـ الإحسان في التقريب الصحيح إبن حبان، رقم: ٣٢١٨، حسن الصحيح.

٤ ـ شرح الحديث ماذئبان جائعان لابن رجب، لا٧١.

٥ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٧١.

الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى (٣٩) وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى (٤٠) فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ [٣٧ـ ٤١] دەروون، کە حەزبەپلە بەرزی دەکات بەسەر بەنەوەی ڕەگەزەکەی خۆیدا و لەوێشەوە خۆبەگەورەزانی و ئیرەیی دروستەبێ، بەڵام کەسی ژێر کێبڕکێ بۆئەو پلە هەمیشە بەرزەدا ئەکات کە تیایدا هاوسێ ونزیکی خواو وەدەست هێنەری ڕەزامەندی خوایە و ئارەزوو حەزی بەوپلەو پوچ و هەڵوەریوەی نیە کە توڕەیی خواو نزمی ودوری و دەرکردنی لەڕەحمەتی خوا و سزای ئەدات، ئەو دووەم پلەیەداریەی کەسەرزەنشتکراوە خۆبەگەورەزانی گەورە نواندنی ناحەقانەیە لەزەویدا، پلەداری یەکەم و سوربوونیش لەسەری هەڵزاوە و پیادا هەڵزاوە، لە ئایەتێکی تر خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ [المطففين: ٢٦].

وەهیبی کوڕی وەردیش ووتەویەتی: ئەگەر توانیت کەس نەتوانێ بۆ نزیکبونەوە لە خوا پێشت بکەوێ ئەوە هەوڵبدە[١]، پێش برکێ بۆ کاری چاکە هەمووکات ڕەوایە، مرۆڤ نابێ لە هەوڵدان بۆ کاری چاکە بەکەم ڕازی بێت لەکاتێکا تووانای چاکەکردنی زۆرتری هەبێ.

ئەوکەسەی لە کاری چاکە دابڕێ، سبەینێ خاوەنەکەی داخ و پەژارە دەچێژێ و سەر شۆڕی ئەبینێ، ئەو کەسەیە[٢]، ئەو تێگەیشتنە کامڵ و قوڵەش بەڕازیبون بەو پاداشتەی لای خوا هەیە وبەپاراستنی خوێنی موسڵمانان، لەپادشایەتی و دەسەڵات دەستی هەڵگرت و دوورکەوتەوە لەپلەداری دونیاو بەجێ هێشت لەکاتێکدا لەهێزو دەسەڵاتێکی گەورە دابوو، بێگومان فەرموویەتی: ئێسقان و خوێنی عەرەبم لەدەستدا بوو، ئاشتەوایی هەرکەسم بکردایە ئاشتەوایان ئەکردو، جەنگی هەر کەسم بکردایە جەنگیان دەکرد، بەڵکو لەبەر ڕەزامەندی خوا دەستم لێ هەڵگرت.[٣]

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٧٢.

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٧٣.

٣ ـ البداية والنهاية (١١/ ٢٠٦).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ:...بەڵام ئەترسام لەڕۆژی قیامەتدا حەفتا هەزار یان هەشتا هەزار، کەمتر یان زیاتر بێت و هەموویان خوێنیان لێ بچۆڕێ و خوای گەورە بەمنی کۆکاتەوەو ئەوانیش داوای مافی خۆیانم لێ بکەن.[1]

بێگومان دوای کۆچی دوایی علی حەفتا هەزار کەس بەیعەتیان بەحەسەنی کوڕی علی دا[2]، ئەویش وازی هێنا و دای بە معاویەو فەرمووی: لەسەردەستی من دڵۆپێك خوێن نارێژرێ[3]، لەڕیوایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: قەت حەزم نەکردووە تۆزقاڵێك لە لاشەی ئومەتی محمد خوێنی لێ بچۆڕێ، زانیومە چی شتێك سودی بۆم هەیە و چی شتێك زیانم لێ ئەدات، بۆیە بگەڕێنەوە شوێن و جێگەی خۆتان.[4]

٤. بەخشین و سەخاوەتیەکەی:

خورەوشتی سەخاوەتی وبەخشین لەپێناوی خوادا لەو خورەوشتە قورئانیەیە، کە دەروون پاکەکان پێیەوە وەسف دارن و لە کەسایەتی حەسەنی کوڕی عەلیدا(﵁) بەرجەستە بوو بوو، قورئانی پیرۆز بە گەورە باسی بەرچاو تیژ دەکات و ئەو وەسفە جوانەش لەیەکەمین شوێنی قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ الم (١) ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ(٢)الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾، پاشان وەسفیان دەکات بە: ﴿أُولَئِكَ عَلَى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[ البقرە:١، ٥ ].

بێگومان ئەمیری ئیمانداران حسن بەبەها قورئانیەکان و سونەتی پێغەمبەر کاریگەربوو، ئەو کاریگەریەش لەدەروونیدا ڕەنگی دایەوەو، شوێنەوارگەلێکی بۆ وەجێ هێشتون، کەبەڵگەی ڕەسەنیەتی و ڕیشەداری ڕەوشتی بەرچاوتیژی و بەخشینە گەورەکەیەتی.

---

١ ـ تاريخ دمشق (١٤/ ١٥٤).

٢ ـ هەمان سەرچاوە (١٤/ ٩٨).

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

٤ ـ هەمان سەرچاوە (١٤/٨٩).

بێگومان کەسێکی سەخی بوو لە یارمەتی دانی هەژاران، چۆن بەوشێوەیە نابێت، کە لە گەنجیەتیدا پیری دا لە ماڵی، کەماڵی پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ)، کە بەخشینی داوەو لەهەژاری نەترسیّ، ئەو خوڕەوشتە پیرۆزەی پیّ گەیشت و لەمنداڵیەتیدا دەرونی خۆی پیّ گۆشکرد، سەخاوەتیەکەشی بوو بە پەندو نمونەی جوانی وپێشەوای پیاوەگەورەکان.[1]

لەوانە: محمدی کوری سیرین فەرموویەتی: حەسەنی کوڕی علی سەد هەزاری بەیەك پیاو داوەو، سعدی کوڕی عبدالعزیزیش دەڵیّ: حسن لەپاڵی خۆیدا گوی ی لەپیاوەك بووەو لیّ پاڕاوەتەوە، کە دەهەزار درهەمی پیّ بدات، بۆیە ئەویش چۆتە ماڵەوەو ئەو بڕە پارەیەی بۆناردوە[2]، گێڕاویانەتەوە کەلە دیوارێکی مەدینەدا غولامێکی بینیوە کە کولێرەی خواردووە لەوێدانانی بە سەگێك داوە، بەغولامەکەی وتووە: چی وەهای لێکردوی ئەم کارەبکەی ئەویش دەڵیّ: شەرم ئەکەم نان بخۆم و خواردن بەو نەدەم، حەسەنیش پیّ فەرمووە: شوێنی خۆت بەجیّ مەهێڵە تا ئەگەڕێمەوە، بۆیە چۆتە لای گەورەکەی و کڕیویەتی و ئەوحەوشەشی کڕیوە کەتیایدا بووەو ئازادی کردوە دیوارەکەشی پێداوە، غولامەکەش پێی ووتوە: ئەی خۆشەویست ئەو دیوارەت بەخشیە ئەوکەسەی منت پیّ بەخشی.[3]

ئەبو هارون العبدیش دەڵیّ: بۆ حەج دەرچوین و چوینە شاری مەدینەوە و چوینە لای حەسەنی کوڕی علی وباسی حاڵ و باری ڕێگە و کاروانی خۆمانمان بۆکرد، کاتێك بەجێمان هێشت بۆهەریەکەمان چوارسەد درهەمی نارد، ئێمەش گەڕاینەوە و ووتمان: کە دەوڵەمەندین و پارەمان هەیە، ئەویش فەرمووی: چاکەکەم بۆمەگەڕێننەوە ئەگەر ئەم حاڵەم نەبوایە ئەوە بۆ ئێوە ئاسان دەبوو، بەلام من هاوکاریتان دەکەم، خوای گەورە بەبەندەکانی لەڕۆژی عەرەفەدا بیری مەلائیکەتەکانی ئەهێنێتەوە.[4]

---

١ ـ الدوحة النبوية الشريفة. لا ٨٤.

٢ ـ تهذيب الكمال (٦/٢٣٤).

٣ ـ البداية والنهاية(١١/ ١٩٦).

٤ ـ سير أعلام النبلاء (٣ / ٢٦١).

ئەوەیە حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) هاوکاری ئەو حەجاجانەی کردووە و ئەو پارەیەی پێداون، سەرباری زانینی دەست ڕۆیشتویان، ئاخۆ گەر خاوەن پێویستی و هەژاری بونایە چۆن ئەبوو، کاتێکیش دەریان خست کە پێویستیان بەو پارەیە نیە، ئەوە ڕازی نەبوو ئەوپارەیەیان بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەوەش بەڵگەی بەهێزە لەپاڵنەری دەرونی ڕوەو سەخاوەتی و بەرچاوتێری، ئەوەشی لەبیر نەکرد، کە هاوکاریان بکات لەوەی چی لەوە چاکترە و باسیشی لەگەورەیی ڕۆژی عەرەفە کرد، کەخوای گەورە پێیانەوە بەسەر فریشتەکاندا(علیهم السلام) شانازی ئەکات.[1]

لە عبدالله کوڕی عمریشەوە کە دەڵێ: إبن عباس لەحەسەنی کوڕی عەلیەوە ڕیوایەتیکردووە: خوای گەورە سێ جار ماڵی خۆی دابەشکردووە، ئەمەش نمونەیەکی جوانی سەخاوەتیە، حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) سێ جار ماڵەکەی دابەش کردووە، لە لێپرسینەوەی دەروونی خۆیدا وردەکار بووە، وەکو ئەوەی کارێکی پێویست ڕاپەڕێنێت، بەوەش لەکاری چاکەکاریدا بۆ موسڵمانان خۆی کردبووە پێشەنگ.[2]

بێگومان حسن(ﷺ) سەخاوەترین کەسانی سەردەمی خۆی بوو[3]، لەنێو سەخاوەتەکاندا ژمێردراوە[4]، لەباسی سەخاوەتیەکاندا ئەوەیە، معاویەی کوڕی أبوسوفیان سەد هەزار درهەمی بۆناردووە و، ئەویش لەنێو کەسانی ئامادەبودا دابەشی کردوە و هەریەکەیان دەهەزاری بەرکەوتووە.[5]

لەو هەواڵانەی تر ئەوەیە چووەتە لای ئوسامەی کوڕی زەید کەقسەی لەگەڵ خۆیدا دوواوە وتوویەتی: ئای چەندە ناخۆش و خەفەتاویە، حسن پێ وتوە: مامە چ شتێك خەفەت باری کردووی؟ پێ ی ووتوە: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەرزێکی شەست هەزار درهەمی قەرزارم و توانای دانەوەم نیە، حەسەنیش دەڵێ: خۆم قەرزەکەت بۆ

---

١ - التأريخ الإسلامی(١٧/ ١٣٦).

٢ - التأريخ الإسلامی(١٧/ ١٣٧).

٣ - المحاسن والمساوئ، لا ٥٥، الحسن بن علي، لا ٣٢.

٤ - الحسن إبن علي، رسالة ماجستر، لا ٣٢ بلاو نەکراوەتەوە.

٥ - البداية والنهاية نقلاً عن الحسن بن علي، لا ٣٢.

ئەگەڕێنمەوە، ئوسامەش وتوویەتی: خوا قەرزت لەسەر لابەرێ ئەی کوڕی پێغەمبەر بەڕاستی خواباشی زانیووە چۆن پەیامی خۆی ئەنێرێ.[1]

خەڵکی شایەتیان بۆ سەخاوەتی حسن(ﷺ)داوە، بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە ئەعرابییەك چووەتە مەدینە و داوای هاوکاری کردووە، ووتویانە برۆ لای حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیب(ﷺ) یان عبدالله کوڕی أبو جعفر یان سەعیدی کوڕی وەقاص، بۆیە چۆتە لای سعیدی کوڕی وەقاص و ئەویش بڕێك پارەی پێداوە.[2]

یەکێکی تر لە نمونەکانی سەخاوەتی حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) پێ ی وتراوە: کێ خۆشترین ژیانی هەیە؟ دەڵێ: ئەوکەسەی لەژیانی خۆیدا خەڵکی تر بەشدار بکات، پێ وتراویشە کێ خراپترین خەڵکە؟ دەڵێ: کەسێکی خۆشگوزەران خەڵکی هەژار نەکاتە هاوبەش لەماڵی خۆی.[3]

لە حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) پرسیارکراوە: لەبەرچی ئێمە تۆ ئەتبینین کاتێك کەسێکی سواڵکەر داوات لێ دەکات دەستی هاوکاری بۆ درێژ دەکەی لە کاتێکاخۆشت هەژار بێت، ئەویش فەرموویەتی: من لەخوا داوائەکەم و ئارەزووی ئەوە ئەکەم خوای گەورە بۆم ئەیگەڕێنێتەوە و، نیعمەتی خۆیم بەسەردا ئەڕژێنێ بەو مەرجەی نیعمەتەکانی بەسەر خەڵکیدا بڕژێنم، بۆیە ئەترسم ئەگەر من یارمەتی خەڵك نەدەم خوای گەورەش لە نیعمەتەکانی خۆی بێ بەشم بکات[4]، حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) لە سەخاوەتی و چاوتێریدا جیاوازی نەکردووە لەنێوان دەوڵەمەند و هەژار گەورەو بچووك، دوور و نزیك، چونکە ئەو دەروونەی کە بۆ بەخشین ئاسودە بووە، لە سەخاوەتیدا سروشتی کردووە کە چێژی لەبەختەوەرکردنی خەڵکیدا بێ[5]، لەبەر ڕەزامەندی خواو ویستی پاداشت ئەوە ئاسودەیی تیادا ئەبینێ، حافز ئیبراهیمی شاعیریش لەوەسفی حسندا(ﷺ) دەڵێ:

إني لتطربني الخلالَ كريمة　　　طرب الغريب بأوبة وتلاقي

---

١ ـ المحاسن والمساوئ، لا ٥٧.

٢ ـ غاية المرام، غرالدين القريش(١/٩٥).

٣ ـ تاريخ اليعقوبي(٢/ ٢٢٦، ٢٢٧).

٤ ـ نصيحة الملوك، لا ٤٣٨ للماوردي.

٥ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٨٤.

ويهزني ذكرَ المروءة والندى    بين الشمائل هِزة المشتـــاقٍ
فإذا رَزِقت خليقة محمـــودة    فقد اصطفاك مقسّم الأوراق
فالناس هذا حظه مال، وذا    علم، وذاك مكارم الأخـلاق

واته: من ڕەوشت جوانی زۆر دڵخـۆش و ئاسـودەم ئـەکات، هـەروەکو چـۆن کەسـانی غەریب بە کەس و کار و خزمان شاد و خۆشحاڵ دەبن، باسکردنی پیـاوەتی و جـوامێریش لەخۆشیدا تەزی بەللەشمدا ئەهێنێ.

گەر تۆ خورەوشتێکی جوانت وەرگرتبێ، ئەوەدابەشـکەرەوەی ڕۆزیـدەران تـۆی پـاك و پاراو هەڵبژاردووە، بۆیە خەڵکێك هەیە خواسەروەتی پێـداوەو هەشـە زانـستی پێـدراوە و ئەویتریش ڕەوشت جوانیەکانی پێ دراوە.

لە علی کوڕی ئەبی تالیبەوە(ﷺ)، کە ووتاری بۆ خـەڵکی دەدا، پاشـان دەیفـەرموو: برازاکەتان حەسـەنی کـوڕی عەلیـە سـەروەتێکی کۆکردۆتـەوە و، دەیـەوێت بەسـەرتاندا دابەشی بکات، خەڵکی ئامادەبوو، حەسەنیش هەستاو فەرمووی: تەنیا بۆ هەژارەکان کۆم کردۆتەوە، بۆیە نیوەی خەڵکی هەستایە سەرپێ و، پاشان یەکـەمین کەسـێك لـەو ماڵـەی وەرگرت ئەشعەسی کوڕی قەیس بوو.[1]

لە ژیانی حەسەنی کوڕی علی یەوە فێر دەبین سەرەتای ڕوولـە خـواکردن و خـۆ ڕزگـار کردن لەوشتانەی پەیوەندیان بەدونیاوە هەیەو خۆ دەر باز کردن لە ڕەزیلـی پەیوەسـتە بـە ماڵ بەخشین لەڕێگەی خوادا تاوەکو ئەبێتە سروشت و لەسەرەوەتدا دونیا بەکەم وەردەگرێ و خۆشەویستیەکەشی لەدڵدا دەردەچێ و، خاوەنەکەشـی بـەزیاتر بـونی دڵخـۆش نـابێ و بەکەمبونیشی دڵتەنگ نابێ، وەکو خوای گـەروە ئەفـەرمویێت: ﴿لِكَيْلا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾[الحديد: ٢٣] هـەروەکو چـۆن صدقە کاریگەری گەورەی هەیە لەپاککردنەوەی دەروندا، سودگەلێکی گـەورەی دیکەشـی هەیە لەدونیا و ئاخیرەتدا، لەوانە:

---

١ ـ الطبقات (١/ ٢٧٨) إسناده صحيح.

* (صدقه)باشترین وەبەرهێنەری سەروەت و سامانە.

لە ئەبو هورەیرەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێ دەنکە خورمایەکی پاك و جوان ببەخشێ، خواش تەنیا پاك و جوانی قبوڵە، ئەوە خوا بەدەستی ڕاستی قبوڵی دەکات و، پاشان بۆ خاوەنەکەی بەخێوی ئەکات، هەروەکو چۆن یەکێ لەئێوە ئێسترەکەی بەخێوکات تا وەکو هێندەی چیایەکی لێ دێت.[1]

* (صدقه)پەردەیەکە لەبەردەم ئاگری دۆزەخدا:

عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (ﷺ): ((ياعائشة استتري من النار ولو بشق تمرة، فإنها تسد الجائع مسدها من الشعبان))[2]، واتە: ئەی عائشە خۆت لەئاگری دۆزەخ بپارێزە گەر بە دەنکە خورمایەکیش بێت، وەکو چۆن برسی ئەپارێزی ئاوەهاش لەئاگر دوورت ئەخاتەوە.

* (صدقه)سێبەری خاوەنەکەیەتی لەڕۆژی قیامەتدا:

لە عەقبەی کوڕی عامیرەوە (ﷺ)توویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)بوو فەرمووی: تاوەکو کاروباری خەڵکی لێکدەدرێتەوە هەموو مرۆڤێك لەژێر سێبەری سەدەقەکەیدایە.[3]

* (صدقه) سزا لادەدات و مافی نێوان خەڵکیش ئەگەڕێنێتەوە:

لە ئەبو سەعیدی خوذري (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵەی ژنان (صدقه) بکەن و زۆر داوای لێبوردن لەخوا بکەن، چونکە بینیم زۆرینەتان دۆزەخین، ئێوە زۆر نەفرەت دەکەن و چاکەی مێردەکانتا ن لەبیر دەکەن.[4]

---

١ ـ صحيح متفق عليه.

٢ ـ صحيح الترغيب والترهيب للألباني ٨٥٥.

٣ ـ صحيح الترغيب والترهيب للألباني، رقم: ٨٢٢.

٤ ـ متفق عليه.

إبن حجريش دەڵێ: لەو فەرموودەیەدا ئەوە فێردەبین: کە سەدەقە سزا دورەخاتەوە و تاوانی نێو دروستکراوەکان ناهێڵێ.[1]

لە دونیاشدا سودی زۆرو پڕ بەهایە و ئەو فەرموودانەشمان هەیە، کە پشتگیری ئەو سودانە دەکەن، دەرمانن بۆ نە خۆشی و لادانی کارەسات و ئاسان بونی کاروبارەکان و بەدەست هێنانی ڕزق و پارێزراو بوون لەتیاچوونی خراپ و کوژێنەرەوەی توڕیی خوا، سڕینەوە شوێنەواری تاوانەکان.[2]

بە ڕاستی (صدقە)لەپێناوی خوادا پەیوەندیەکی توندو تۆڵی هەیە لەگەڵ ڕێگا گرتن بۆ لای خوا، ئامرازێکی کاریگەرە، هەروەکو لەو ئامرازە سەرەکیانەیە لە زیندووکردنەوەی دڵ و زیادکردنی ئیمان، بە ڕاستی لە بەخشین و چاوتێری و سەخاوەتیدا حەسەنی کوڕی علی پێشەنگێکی جوانە بۆ ئێمە.

(صدقە) لە پێناوی خودا یەکێکە لەگەورەترین دەرگاکانی بەهەشت، لەکەسانیتر زیاتر کلیلی ئاسانکارانەو لەڕێگەیەوە گەورەکانی ئەم ئومەتە لەنمونەکانی عثمان و عبدالرحمن کوڕی عەوف و حسن و کەسانیتر ڕۆیشتنە بەهەشتەوە، بۆیە لەم سەردەمە نوێیەدا پێویستە دەوڵەمەندانی موسڵمانان لەو دەرگایە بدەن و، پشتگیری کێشەو گرفتەڕەواکانی ئیسلام و پرۆژەکانی بانگەواز بۆ کردنی بدەن بەوەی لەتوانایاندایە، بەوەش ڕەزامەندی خواو چونەبەهەشت و هاوکاری سەرخستنی ئاینی خواو فریاکەوتنی خاوەن پیویستیانە دەدەن و ڕزیلی نەکەن، چونکە خوای گەورە لەو ڕەزیلە ناڕەحەتیان ئەکات.

## ٥. نەرمونیانیەکەی:

حەسەنی کوڕی علی و مەڕوانی کوڕی حەکەم گفتو گۆیان بووە، مەڕوان ڕۆیشتە لای و بەسەریدا توڕەبووە، حەسەنیش بێدەنگ، ئینجا مەڕوان بەدەستی ڕاستی داوێنی خۆی خوراند، حەسەنیش (ﷺ) فەرمووی: لەنێوبچی ئەی نازانی دەستی ڕاست بۆ ڕوومەت و

---

١ ـ فتح الباري (١/ ٥٣٦).

٢ ـ الإيمان أولاً كيف نبدأ به، لا( ١٨٨ـ ١٨٩).

چەپیش بۆ داوێنە، لەنێوبچی، مەڕوانیش بێدەنگ بوو[1]، بێدەنگی حەسەنیش لێبووردنی بوو لەمافی خۆی، بەڵام کەمەروان پێچەوانەی سونەتی کرد، بۆخـواو سـونەت تـوڕە بـوو ڕاستیشی بۆ ڕوونکردەوە[2]، کاتێکیش حسن (ﷺ) کۆچی دوایی کـرد، مـەڕوانی کـوڕی حەکەم لەسەر تەرمەکەی گریا، حسێن ووتی: دەگری و زۆریـش ئازارتـدا؟ ئـەویش ووتـی: وەهام کرد تا نەرم و نیانی لێوە فێربم و ئاماژەی کردە چیاکە[3]. لە إبـن عائیـشە ووتـی: پیاوێکی خەڵکی شام دەڵێ: ڕۆیشتمە مەدینـەو پیـاوێکم لەسـەر ئێـسترێك بینـی، لـەو جوانترو پوختەترم نەبینیبوو، بۆیە حەزم کرد بیناسم و لەو بارەیەوە پرسیم، ووترا: حەسنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیبە، بۆیە دڵم پڕ بەرق بـوو بەرامبـەری، ئیرەییم بەرامبـەر بـە علی بۆ دروست بوو، کە کوڕێکی وەهای هەیە، بۆیە بـەرەو ڕووی ڕۆیـشتم ووتم: تۆکـوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیبی؟ ووتی :بەڵێ کوڕی عەلیم، منـیش جنێـوم بـەخۆی و بـاوکی دا، کەقسەو جنێوەکەم تەواو کرد، ووتی: وابزانم غەریبەی؟ ووتم بـەڵێ: ووتـی: گـەر خـانوت پێویستە خانوت دەدەینێ، پارەت پێویستە هاوکاریـت دەکـەین، هەرپێویـستیەکت هەیـە هاوکارت ئەبین، ووتی: ڕۆیشتم و لەسەر زەوی کەسیترم لەو زیاتر خۆش نەدەویـست، بـیرم کردەوە چۆن مامەڵەی کردوو سوپاسم کـرد و خـۆمم شـەرمەزارکرد، [4] لـەو هەڵویـستە پیرۆزانـەی ژیـانی حەسـەنی کـوڕی عەلیـەوە (ﷺ) نـەرمویانی فێربـووین و چـۆنیەتی ڕاکێشانی کەسی دژ بە چاکەکردن بۆیان و، ئارامگرتن لەئازارو حەزکردن بەچـاکە بۆیـان، بۆئەوانەی نەزانین نەناسینی ڕاستە قینەکانیان بەسەردا زاڵـە، بەچەسـپاندنی فەرمایـشتی خوا: ﴿ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ [الأعـراف: ١٩٩]حـسن شـوێن کەوتوی باپیری(ﷺ)بوو، ئەوباپیرەیەی(ﷺ) لەنەرمونیانی و دەرون پارێزی و لەبەرامبەر ئەو خراپانەی درابووە پاڵی لە لوتکەی نەرمونیانیدا بوو، سـەرباری خراپـەکاری و ئـازاری بێباوەڕ و هاوەڵدارانی عەرەب، وەکو ژنەکـەی ئـەبو لـەهب و أبوجـەهل و ئوبـەی کـوڕی

---

١ ـ سير أعلام النبلاء (٣/٢٦٠).

٢ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٨٧.

٣ ـ تهذيب الكمال (٦/ ٢٣٥).

٤ ـ وفيات الأعيان (٢/ ٦٧، ٦٨).

خەڵەف و گاڵتە جارەکانی تری مەککە[1]، عائیشەی دایکی ئیمانـدارانیش (رەزای خـوای لێ بێ) وەسفی خورەوشتی پێغەمبەری خوای کردووە(ﷺ) دەڵێ: بەخراپە وەڵامی خراپەی نەداوەتەوە، بەڵکو لێبوردە بوو[2]، هەر عائیشە دەڵێ: پێغەمبـەر هـیچ کـات بەدەسـتی شتێکی نەهاوێشتووە بۆ ژنێ یان خزمـەتگوزارێ تـەنیا لـەپێناو خـوا نـەبێ، هەرکەسـێ خراپەی بەرامبەر بکردایە تۆڵـەی نـەدەکردەوە، تـەنیا لـەوەدا نـەبێ کەسـنورەکانی خـوا بەزێنرابێ و لەپێناو خوادا تۆڵەی دەسەندەوە.[3]

لە موعازی کوڕی ئەنەسەوە (ﷺ) کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((مـن کظم غيظاً – وهو قادر على ان ينفذه دعاه الله يوم القيامة على رؤوس الخلائق حتـى يخير مـن أي الحور العين شاء))، واتە: (هەرکەسێ تورەییەك بخواتەوە و توانای هەبێ لەوەی ئەنجامی بدات، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت و لەبـەردەم دروسـتکراوەکانی بـانگی دەکـات تاوەکو کام حۆری ئەوێ هەڵی بژێرێ).[4]

لە وەسفی نەرم ونیانیشدا شاعیر دەڵێ:

في الحلم ردع للسفيه عن الأذى        وفي الخرق إغراء فلاتك أخرفـــا

فتندم إذلاتنفعك ندامـــــة        كما ندم المغبون لما تفرَّقـــــا

نەرم و نیانی قەڵغانە لەوەی هیچ و پوچ خراپە بکـات، نـەفامیش لەخـشتە بردنـە و تۆش نەفام مەبە، چونکە پەشیمانی ئەشکێی پەشـیمانیش سـوودی بۆتۆنیـە، وەکـو بـێ ئاگاکان لەدوای بیرکردنەوە پەشیمانی ئەکێشن.[5]

---

١ ـ الأخلاق بين الطبع والتطبع، فيصل الحاشدي، لا ١٣٩.

٢ ـ رواه الترمذي، رقم: ٢٠١٦، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي، رقم: ١٦٤٠.

٣ ـ مسلم، رقم: ٢٣٢٨.

٤ ـ سنن الترمذي: رقم: ٤٧٧٧ حسنه الألباني صحيح الجامع (٢/ ٦٥١٨).

٥ ـ الأخلاق بين الطبع و التبط، لا ١٥١.

٦. خاکەرایبوونی(تواضع)ی:

حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) بەلای کۆمەڵێ هەژار تێپەر بوو خەریکی خواردنی وورده نان بوون کەلەسەر ڕێگەدا کۆیان کردبووه و ئەیانخوارد وبانگیان لەحسن کرد تاوەکو بەشداریان بێت، ئەویش بەشداریانی کرد و ووتی: خوا خۆ بەگەوره زانانی خۆش ناوێت، کاتێشێك لەو خواردنه بونەوه بۆ میوانداری بانگی کردن و نان وبەرگی پێدان [1].

له خاکەراییەکەدا ئەوەیه جارێکیان بەلای کۆمەڵه منداڵێکدا تێپەڕا بوو خەریکی نان خواردن بوون و داوەتی دەکەن بۆ نان خواردن، ئەویش بەدەم داوەتەکەیانەوه دەڕوات، پاشان ئەیانباتەوه ماڵ و لەچاکەی خۆی ئەیانبەخشێ ووتی: دەست و سەخاوەتی بۆئەوانه، چونکه لەوەزیاتریان نەبوو کەخواردنیان پێدام، بەڵام ئیمه ئەوەمان هەیه کەبەوانمان بەخشی [2]، خوای پەروەردگاریش ئەفەرمووێ: ﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاماً ﴾[الفرقان: ٦٣].

سیفەتی (تواضع) نیشانەیەکه له نیشانەکانی خۆش ویستنی خوا بۆ بەندەکەی، خوای گەوره فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾[المائده: ٥٤].

لەژیانی حەسەنی کوڕی عەلیەوه(ﷺ) سیفەتی خاکەرأبوون فێرەبین، شاعیریش دەڵێ:

تواضع كالنجم لاح [3] لناظر — على صفحات الماء وهو رفيع

ولاتك كالدخان يعلو بنفسه — على طبقات الجو وهو وضيع

واته: وەکو ئەستێره خاکەرابەوه لەسەرلاپەرەکانی ئاو بۆ تەماشا کار دەرکەوه له کاتێکدا ئەستێره بەرزه، وەکو دوکەڵ مه بەخۆی بەرزبێتەوەو لەئاسمان دا نزم و پوچ بێ.

---

١ ـ حياة الإمام الحسن بن علي (١/ ٢٩١).

٢ ـ صلاح الأمة في علو الهمة(٥/ ٤٣٧).

٣ ـ الأخلاق بين الطبع والتطبع، لا ١٢٨.

### ٧. گەورەییەکەی:

بێگومان پێغەمبەری خوا (ﷺ) پایەو ڕێزی گەورەی ئەم پێشەوایەی لەنێو خەڵکیدا ئاشکرا کردووە، فەرموودەکانی (ﷺ) لەبارەی حەسەنەوە زۆرگێڕاونەتەوە، : ((إن إبني هذا سيد)) ئەم کوڕەی من سیدە، إبن عەبدالبریش فەرموویەتی: فەرموودەکان لەبارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) زۆر هاتوون کەلەبارەی حەسەنی کوڕی علی فەرموویەتی: ((إن إبني هذا سيد وعسى الله أن يبقيه حتى يصلح بين فئتين عظيمتين من المسلمين))[1] واتە ئەم کوڕەی من سەیدە ئومێد ئەکەم خوای گەورە بیهێڵێ تاوەکو ئاشتەوایی نێوان دووکۆمەڵەی گەورە موسڵمانان بکات.

لەم فەرموودەیەش هاتووە کە جابری کوڕی عبدالله دەڵێ: کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: إني إبني هذا - يعني الحسن - سيدو ليصلحنَّ الله به بين فئتين من المسلمين))[2] واتە: ئەم کوڕەی منە - واتە حسن - سەیدە و خوایگەورە ئاشتەوایی نێوان کۆمەڵی موسڵمانانی پێ ئەکات.

لە سعیدی کوڕی ئەبو سەعیدەوە دەڵێ: لەتەك ئەبو هورەیرەدا دانشتبوین و حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیب هات و سەلامی لێکردین، ئێمەش وەڵامی سەلامەکەمان دایەوە، ئەبو هورەیرەش ئاگای لە سەلام و هاتنی حسن نەبوو، ئەویش ڕۆیشت، ووتمان ئەی أبوهورەیرە ئەوە حەسەنی کوڕی علی بوو سەلامی لێکردین، ئەویش هەستاو پێ گەیشت و وتی ئەی بەڕێزم، ووتم: پێ ی دەڵێ ئەی بەڕێزم (سەیدم)؟ وتی: من لەپێغەمبەری خواوەم (ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: ئەمە سەیدە (إن سيد)[3]، لەجابری کوڕی عبدالله وە کە فەرموویەتی: ((من سره أن ينظر إلى سيد شباب أهل الجنة فلينظر الى الحسن بن علي))[4] واتە: هەرکەسێ حەز ئەکات بڕوانێتە گەورەی گەنجانی بەهەشت بابڕوانێتە حەسەنی کوڕی عەلی، لەئەبو سەعیدی خودریشەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا

---

١ ـ البخاري، فضائل الصحابة (٧/ ٩٤).

٢ ـ الطبراني في الكبير، رقم: ٢٥٩٧.

٣ ـ المستدرك (٣/ ١٦٩) وقال الحاكم صحيح وأقره الذهبي.

٤ ـ صحيح إبن حبان (١٥/ ٤٢١، ٤٢٢)، مجمع الزوائد (٩/ ١٧٨).

(ﷺ) فەرموویەتی: ((الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنه))[1]، واتـە: (حـسن و حـسين گەورەی گەنجانی بەهەشتن).

کۆمەڵێ زۆری هاوەڵانیش باسی گـەورەیی حـسن و حـسینیان لەبەهەشـتدا بـۆ ئیمـە گواستۆتەوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆرجار و لەزۆر شـوێن کۆرو کۆبونەوەدا ئەوپلەیەی ئاشکرا کـردووە، ڕۆژگـار و تێپـەربوونی مـانگ و سـاڵانیش ڕەخساوی سیفەتی گەورەییان لەسەندا سەلماندووە، لە ڕێکخستنی خـوادا بـۆی لەبەسـتنی ئاشتەوایی لەگەڵ معاویەدا پلەی بەلوتکە گەیشت، ئومەتی کـۆکردەوە، بێگومـان حـسن گەورەیەکی پایە بەرزبوو، حسن فێرمان دەکات کە گەورەیی بە توندو تیژی و خوێن ڕشـتن و بەفێرۆدانی سەروەت و سنوربەزاندن نیە، بەڵکو گەورەیی لەپاراسـتن و نەهێـشتنی ڕق و کینەیە.

بۆیە بە ئاشتەوایەتی و پارێزگاریکردن لەخوێنی موسڵمانان گەیشت بە لوتکـەی ئـەو گەورەیی و دەسەڵاتەی کە ئەوکەسەی بیر لە هێز دەکاتەوە و پیێ ی نەگات و بۆی نەتوانیێ.

حسن ئاشتەوایی معاویەی کرد و هەزاران کەسی تەماحبازیان تێدأبوو، بـەڵام زۆرزۆریێ لەدڵسۆزە ئەمەکدارەکانیش هەبوون، نەیویست بەهۆی خۆیەوە دڵۆپێ خوێن برێـژرێ، یـان لەوپێناوەودا موسڵمانێك نیشانەیەکی بریناوی پێیەوەبێ، چونکە گەرگەورەیی بۆپاراستن و پارێزگری کردنی و خزمـەتی هـۆزو نەتەوەنـەبێ، ئـەوە جۆرێکـە لـە تـاغوتی کوێرانـە و هەڵپـەدانی گێلانـەو ئـەو قومارباز یـەی کـە خـوێن ڕشـتن و کاولکـاری و سەرشـۆڕیەی لەتەکدایە، خاوەنەکەشی بە تورەیی خواونەخزمـەتی مێـژووش ئـەکات، لەوەشـدا خـوێن ڕشـتنی مرۆڤایـەتی بەدرێـژایی سـەردەمەکان تـەنیا لەئـەنجامی سـوربوون بـووە لەسەرۆکایەتیکردن و دەسەڵات و هەڵپەدان بووە بۆدونیا.

---

١ ـ مستدرك الحاكم (١٣/ ١٦٦). لە زۆر ڕووەوە ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە.

### ٨. سیفەتە شێوەییەکانی:

حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) سەید و گەنجێکی قۆز و ڕەنگ سپی و گەش و چاو و گۆنا سووك وریش پڕ، گەردنی زیوین بوو، مەچەك گەورە نەکورت و نەدرێژبوو، ڕووی لەخەڵکانی تر جوانترو قژپڕ ولاشە جوان بوو[١]، لەفەڕوبەرەکەتی خوا لەسەر حسن ئەوەبوو لەپێغەمبەری باپیری(ﷺ) دەچوو.[٢]

## دووەم: لەژیانی حەسەنی کوڕی علی لەکۆمەڵگادا:

حەسەنی کوڕی علی هەڵوێست گەلێکی دیاری خۆی بۆبەجێ هێشتووین لەکۆمەڵگەی ئیسلامی ڕاشیدیدا، ئەو سوور بوو لەسەر ڕاستکردنەوەی چەمك و تێگەیشتنەکان و جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی خەڵکیدا وبە جوانی تێکەڵیکردنیان و ڕێشاندەریان بەپەندو دانایی دەگمەن، ئەمەی خوارەوەش درێژەی کارەکانێتی:

### ١. نەهێشتنی بیرۆکەی گەڕانەوە:

لە عەمری کوڕی (أصم)ەوە کەدەڵێ بەحسنم ووت: شیعە وای دادەنات کەپێش ڕۆژی قیامەت علی دێتەوە سەرزەوی، حەسەنیش فەرمووی: سوێند بەخوا درۆیانکردووە، ئەوان کەی شیعەن (شوێنکەوتەن)، ئەگەر بمادوعانیيایە ئەگەڕایەوە ئەوە ژنەکانمان بەشوونەدەدا و ماڵەکەشمان بەش نەدەکرد[٣] و، یەکەمین کەسێکیش باسی لەگەڕانەوەی کردإبن سەبەء بوو، ئەیوت کەدیارنەماوە و ئەگەڕێتەوە، مردنەکەشی بەڕاست نە دەزانی، بیروباوەڕی گەڕانەوەش (الرجعە) تایبەتە بەگەڕانەوەی ئیمام لای سەبەئیەکیسانیەکان و ئەوانی ترەوە، بەڵام بوویە بیروباوەڕی ئەوانی تریش.

بێگومان إبن سەبەئی جولەکە ڕۆڵی دامەزرێنەری هەبوولەبنەمای گەڕانەوەدا، بەڵام گەڕانەوەیەکی تایبەتە بەعەلیەوە هەروەکو لەبنچینەدا ڕودانی مردنی علی ڕەتکردۆتەوە.

---

١ ـ سیر أعلام النبلاء، لا ٩٤.

٢ ـ الحسن بن علي، فتیحان کردي، لا ٢٤.

٣ ـ سید أعلام النبلاء (٣/ ٢٦٣).

## ٢. وەجێ هێنانی پێویستیەکانی خەڵکی:

پیاوێك هات بۆلای حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) و باسی پێویستی خۆی بۆکرد و حەسەنیش بۆ وەجێهێنانی پێویستیەکانی لەگەڵ کابرادا ڕۆیشت، پیاوەکە وتی: حەزم نەکرد لەپێویستیەکەمدا تۆ ڕاسپێرم، بەحسینم ووت، ئەویش ووتی: گەر لە (ئیعتکاف) نەبوایەم بۆ وەجێ هێنانی پێویستیەکەت ئەهاتم، حەسەنیش ووتی: بەجێهێنانی پێویستی براکەم بۆخوا بەلامەوە خۆشترە لەئیعتکافی مانگێك[1] لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە کە(طواف) ی بەجێ هێشتوە و بۆ پێویستی مرۆڤێك ڕۆیشتووەکە پێویستەکەی لای کەسێکی دیاربووە[2] لەقسەکانی حسندا هاتووە و هەندێ کتێبیش باس لەوەدەکەن کەقسەی حوسەین بێ(رضي الله عنه) کەدەڵێ: ((پێویستبوونی خەڵکی بەئێوە لەنیعمەتی خوابەسەرتانەوەیە، ڕقتان لەو نیعمەتە نەبێ چونکە ئەبێتە ئەنیقمەت، بشزانن چاکەکاری سوپاس ئەهێنێ وپاداشتی بەدواوەیە، کەپیاوێکتان بینی چاکەکاربوو، ئەوە جوان و شرین ئەبینن کەبینەران خۆشحاڵ ئەکات، گەر سەرزەنشتکراوشتان بینی، ئەوەناشیرینی و شێواوی ئەبینن، کەدڵ و بینینەکان لێ ی هەڵدێن[3] دانەری کتێبی (الشهب اللامعة فی السياسه النافعة) باسیکردووە: کە پیاوێك داواکاری پێویستەکەی خستۆتە بەردەم حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه)، ئەویش دەڵێ: خوێندمەوەو پێویستەکەت جێبەجێ بووە، پێ ی ووتراوە ئەی کوڕی کچی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خۆزگە بڕوانتایەتە ناوەڕۆکەکەی کە چی تیادایە، ئەویش فەرموویەتی: ئەترسم لەبارەی شێوازی ماڵی خراپی بزانم بۆیە نەمخوێندووە تا نەزانم و لاوازتر و خەجاڵەت نەبێت[4] ئەوەهەڵوێستانەش بەڵگەی ڕەوشت جوانیەتی لەگەڵ خاکەرایەکی گەورە، ئەوەش لەحەسەنی گەورەمان دوورنیە، چونکە خۆی فەرموویەتی: ((ڕەوشت جوانی دەشتە: زمان پاکی، ڕاست جوامێری، بەخشین بەداوا کەر، ڕەوشت جوانی، پاداشتی هاوکاریکاران، گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، بەزەیی هاتنەوە

---

١ ـ تاريخ دمشق الكبير(١٤/ ٧٦).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٧٦/١٤).

٣ ـ الشهب اللامعة في السياسة النافعة، لا ٤٤١.

٤ ـ هەمان سەرچاوە(١٤/ ٧٦).

بەهاوسێ، زانینی مافی هاوڕێ، گەورەی هەمووشی شەرمە[1] هەروەها دەڵێ: خراپتر لەبەڵا ڕەوشت خراپیە[2] ئەو هەڵوێستە جوانانەی حسن(ﷺ) جێبەجێکردنی ئاراستەکانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ). لەعبداللە کوڕی دینارەوە لەهەندێ هاوەڵی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وترا ئەی پێغەمبەری خوا خۆشەویسترین خەڵکی لای خوا کێیە؟ فەرمووی: ئەوەی بەسودتربێ بۆ خەڵکی و باشترین کارێکی لای خوا خۆشیەکە بیخەیتە دڵ ئیماندارەوەو مەینەتیەکی لەسەر لابەری یان قەرزێکی لەسەرلابەری یان برسیەتیەکی نەهێڵی، گەر لەگەڵ برا موسڵمانەکەمدا بۆ پێویستیەکانی بڕۆم کە جێ بەجێ ی بکەم بەلامەوە خۆشترە لەوەی دوومانگ لەمزگەوتێك بمێنمەوە، هەر کەسێکیش بۆ پێویستیەك لەگەڵ برا موسڵمانەکەی بڕوا، تاوەکو بۆی جێ بەجێ بکات و بۆی بچەسپێنێ، ئەوەلەو ڕۆژەدا پێکانی بۆ چەسپاو دەکات، کاتێك قاچەکان تێیدا ئەترازێن، ڕەوشت ناشیرینیش کاربۆگەن دەکەن، هەروەکو چۆن خەڵ هەنگوین و بێتام دەکات))[3] لەمەسلمەی کوڕی مەخلەدەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((من ستر مسلماً في الدنيا ستره الله في الدنيا والاخرة، ومن نجا مكروبا فك الله عنه كربةً من كرب يوم القيامة ومن كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته))، ((هەرکەسێ لەدونیادا موسڵمانێ داپۆشێ و باسی نەکات ئەوەخوای گەورە لەدونیا و ئاخیرەتدا عەیبەکانی دادەپۆشێ، هەرچ کەسێکیش کەسێکیان بێ چارە و مەینەت بار ڕزگار بکات، ئەوەخوای گەورە ئازارو ناخۆشی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەبا و هەرچ کەسێکیش لەبەجێ هێنانی پێویستی براکەیدا بێ، ئەوەخوای گەورەش پێویستەکەی بۆ وەدی ئەهێنێ))[4].

### ٣. ژن هێنان لە تەڵحەی کوڕی عبیداللە ی(ﷺ):

لە شوعەیبی کوڕی یەسارەوە کە حەسەنی کوڕی علی هاتۆتە لای کوڕێکی تەڵحەی کوڕی عوبەیدڵڵا و[5] دەڵێ: بۆپێویستەیەك هاتوومەتەلات، ئەویش ووتی: پێویستیت

١ ـ من أقوال الصحابة، محمد خورشيد،لا ٦٨ الحسن بن علي، لا ٣١.

٢ ـ تاريخ اليعقوبي(٢/ ٢٢٧).

٣ ـ سلسلة الأحاديث الصحيحة، رقم ٩٠٦و حسن الألباني إسناده في الصحيح الجامع.

٤ ـ منصف عبدالرزاق، رقم: ٦ ١٨٩٣، حديث صحيح.

٥ ـ کە ئیسحاقی کوڕی تەڵحەبووە.

چیە؟ ووتی: خوشکەکەتم لێ مارەبکە[1] ئەویش ووتی: معاویەنامەی بۆناردوم کەلە یەزیدی مارە بکەم، وتی: هاتووم و لەمنی مارە بکە، پاشان ووتی: بچۆرەلای کەس و کارت و پرسیان بکە و ئینجا مارەی کرد و ئەوهەوالەش گەشتە معاویە، ئەویش نامەیەکی بۆ مەروان نووسی کە هەڵبژاردنێکی باشە و دواتریش ئەوئافرەتە لەدوای حسن بوو بە یەك لەخێزانێکی حوسەین[2].

## ٤. ژن هێنانی بەخەولەی کچی مەنزور:

لە إبن ئەبو مەلیکەوە کە دەڵێ: حەسەنی کوڕی علی خەولەی کچی مەنزوری مارەکرد و حەوت شەو لای مایەوە[3] إبن عمریش ووتی: چەند ڕۆژێکە أبومحمددمان نەبینیوە باسەردانی بکەین، ڕۆیشتنە لای حسن و خەولەش بەحەسەنی ووت، دوایان بخە تاوەکو خواردنیان بۆبکەم، ووتی: باشە، إبن عمریش ووتی: حسن قسەیەکی خۆشی بۆگێڕاینەوە لەخۆشیدا گوێمان لێگرت تاوەکو خواردن هات[4].

## ٥. دایکی ئیمانداران نابینێ:

حسن و حوسەین دایکی ئیماندارانیان نەدەبینی، إبن عباسیش دەڵێ: بینینی داکی ئیماندارانیان بۆ حەڵاڵ بووە، ئەوەش بەڵگەی ئەوپەڕی شەرمی حسن بووە.

## ٦. غیرەت لە ڕەچەڵەکی پێغەمبەردا:

حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) بۆ پێویستیەك کەبیکڕێ چوە بازاڕو لەخاوەن دوکانێك بۆ شتێك لەخاوەنەکەی پرسیاری کرد، خاوەن دوکانەکەش نرخی گشتی پێوتبوو، پاشان کەزانی حەسەنی کوڕی علی کچەزاری پێغەمبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم) لەبەر ڕێزو گەورە ڕاگرتنی

١ ـ دایکی ئیسحاقة.

٢ ـ الطبقات، تحقیق السلمي (١/ ٢٩٢) إسناده لابأس به.

٣ ـ روونە لەسونەتدا گەرپیاو ژنی هێنایەسەر ژنەکەی دیکەی، ئەوە حەوت ڕۆژ بەردەوام لای ئەمێنێتەوە وەگەر کچ بوو، بێوەژنیش بوو سێ ڕۆژەو ئینجا شەو ورۆژیان لەنێواندا بەش ئەکات، خەولەش کاتێ شووی بەحسن کرد کچ نەبوو، بەڵکو پێشتر ژنی موحەمەدی کوڕی تەلحەی کوڕی عبیداللە بووە هەر وەکو لە ((جمهرە أنساب العرب ئیبن حجر)) لەلا ٢٥٨ داهاتووە و مانی سێ ڕۆژە نەك حەوت ڕۆژ، ئەمەش دووپاتی لاواز بوونی گێڕانەوەکە ئەکات ئیسنادەکەشی زۆرلاوازە.

٤ ـ الطبقات، تحقبق السلمي(١/ ٣٠٧، ٣٠٨) إسناده ضعیف.

حسن لەنرخەکەی کەم کردەوە، بەڵام حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) ئەو کەم کردنەوەیەی قەبوڵ نەکرد، لەکڕینی پێداویستەیەکەی پەشیمان بوویەوە، ووتی: نامەوێ لەشتێکی پوچدا سوود لەشوێنی خۆم لەبنەماڵەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)وەربگرم.[1]

ئەوەش سروشتی ئەهلی بەیت بوو، ئەوانەی بە قورئان و سونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژیانیان جوان کردبوو، ئەوەش زینەلعابدینی علی کوڕی حوسەینە کە جوریریەی کوڕی ئەسماء کەدیارترین خزمەت گوزاری بووە ـ لەبارەیەوە ئەفەرمووێ: هیچ کات علی کوڕی حوسەین بەهۆی نزیکێتی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەرهەمێکی نەخواردووە[2]

گەرگەشتی بکردایە خۆی نەدەناساند، لەوەشدا پێ ووترا، ئەویش ووتی: ڕازینابم بەخزمایەتیم بەپێغەمبەری خوا هیچ شتێك وەربگرم[3] ئەوگەورانەی ئەهلی بیت کەسانی زۆربەغیرەت بوون، ئەورەچەڵەکەیان بۆ بەرژەوەندیەکانی دونیا وەرکانەهێناوە، وەکو بنەماڵەی سەرکردە ئاینیەکانی تر کە لەهەمووحاڵەتێك پیرۆزیەکی لەڕادەبەدەریان وەرگرتووەو وەکو کەسانی سەرومرۆڤ لەتەك شوێنکەووتوەکانیان مامەڵە دەکەن، نەوەکانی ئەهلی بەیت لەدەستکەوتنی دونیا بەناوەکانیان دووربوون، غیرەتی نەفسیان وێنایەکی ژیاننامەو هەڵس و کەوتیانی کردووە زۆرجیاواز لەژیانی چینی ئایدوعانەکانی بەرهەمیەت و کاهینەکانی ئاین و میللەتانی تر، چونکە ڕەچەڵەکێتی لەڕێگای ئاینەوە قودسیەتی و گەورەیی هەیە لەوەدەست خستنی بژێوی و پێداویستیەکانی ژیانیدا کە پێویستی بەهەوڵ و تێکۆشان نیە[4]

### ٧. نوێژکردنی لەسەر ئەشعەسی کوڕی قەیس:

ئەشعەسی کوڕی قەیس لەدوای کوژرانی ئەمیری ئیمانداران علی بەچل ڕۆژ وەفاتی کرد، حەسەنی کوڕی عەلیش نوێژی لەسەر کرد[5] حسن مێردی کچی ئەشعەسی کوڕی

---

١ ـ المرتضى للندوي، لا ٢٢٨.

٢ ـ البداية والنهاية، نقلاً عن المرتضى للندوى، لا ٢٢٨.

٣ ـ وفيات الأعيان(٢/ ٤٣٤).

٤ ـ المرتضى للندوى، لا ٢٢٨.

٥ ـ الكامل في التأريخ(٣/ ٤٤٤).

قەیس بوو[1] هەندێ لەگێڕاوە لاوازەکانیش بـاس لـەتێوەگلانی ئەشعەسـی کـوڕی قـەیس دەکەن لەکوشتنی ئەمیری ئیمانداراندا، ئەوەش بەڵگەنیە، چونکە ڕۆڵی ئەشعەسـی کـوڕی قەیس لەخیلافەت ی عەلیدا(ﷺ) دڵسۆزانەو ئەمەکدارانـەبووە، یەکـەمین کەسـێك بـوو جـەنگی خـەڵکی شـامی کـرد لەکوشـتنی سـەرئاوداو لەدروسـتبونی خەوارجیـشدا دوژمنایەتیانی دەرخست و هەواڵی بەعلی (ﷺ) کە خەوارج ئەڵێن: علی لـە تاوانەکـەی تەوبەی کردووە و لە(تحکیم) پاشگەزبۆتەوەو عەلیش لە نەهرەوان جەنگی خەواریجی کـرد، زۆر سوور بوو، لەسەر ئەوەی پەیوەندیەکەی بەعلی زۆر توند و تۆڵ بکات وبەو هۆیەشـەوە حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) کردە زاوای خۆی ومێردی کچەکەی، ئەشـعەس دوای کـوژرانی علی و کۆچی دوایی کرد و حەسەنی کوڕی عەلیش نوێژی لەسەر کرد و لەبنەماڵەی علـی کوڕی ئەبو تالیبیشدا کەسێك بەو هۆیـەوە ئەشعەسـی تۆمەتبارنـەکرد، بـەڵکو کوشـتنی علـی لـەکاری خـەواریج و پیلانـەکانیان بـوو وەکـو تۆڵەسـەندنەوەی کوژراوەکـانی نەهرەوانیان[2].

## ٨. مامەڵەکردنی ئەوکەسەی خراپەی لەگەڵ بکردایە:

پیاوێك هاتە مەدینەو ڕقی لەعلی بوو، خواردن و ئاژەڵی سـواری نـەبوو، گلـەیی ئـەو نەبونیەشی لای خەڵکی مەدینە کرد، پێیان ووت: بڕۆلای حەسەنی کوڕی علی، پیاوەکەش ووتی: ئەوشتەم دەست نەکەوت تەنها لای حەسن و باوکی نـەبێ. پـێ ی ووتـرا: لەحـسن باشترت دەست ناکەوێ، ئەویش ڕۆیشتە لای حسن و باسی خۆی بۆ کرد، ئەویش فرمانیـدا خواردن و ئاژەڵی سواری پێ بـدرێت، پیاوەکـەش ووتـی: خـوا زانـاترە چـۆن پەیامەکـەی ئەنێرێت، بەحەسەنیش ووترا: پیاوێکت هاتەلا و ڕقی لەخۆت و باوکیشت بوو، تۆیش پارە خواردن و ئاژەڵت پێدا، حەسەنیش فـەرمووی: ئـەی بـەخواردن و پـارەو ئـاژەڵ ناموسـی خۆمی لێ نەکڕم.[3]

---

١ ـ تهذيب التهزيب(٢/ ٣٠٠).

٢ ـ دراسة في تأريخ الخلفاء الأمويين، بطانية، لا ٥٢.

٣ ـ تاريخ إبن عساكر(١٤/ ٧٦).

ئەدەب و ڕەوشتی حسن لەدانیشتنەکاندا:

ڕۆژێك لەشوێنێکدا دانشتبوو، وویستی هەڵسێ و بڕوات پیاوێکی هەژارهات و ئەویش بەخێرهاتنی کرد و، قسەی خۆشی لەتەکا کردوو پێ ووت: لە هەستانی مندا تۆ دانیشتی ڕێگەم دەدەی بڕۆم؟ ئەویش ووتی: بەڵێ ئەی کچەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## ٩. ڕەوشت جوانی حسن لەنێو خەڵکدا:

لەعومەیری کوڕی ئیسحاقەوە دەڵێ: هیچ کەسێ لامدا قسەی نەکردووە وەکو ئەوەی یەکێ حەزیکردایە قسەی بکردایە ئەوە حەسەنی کوڕی علی بێدەنگ دەبوو، تەنیا یەکجار گوێم لێ بوو قسەی ناخۆش بکات، ئەویش ئەوکاتەی نێوان خۆی و عەمری کوڕ عثمان دژایەتیەکیان لەنێواندا بوو، حسن ووتی: بەلای ئێمەوە هیچ نیە، تەنیا نزمی نەبێ، ئەوەش ناخۆشترین قسەبوو لێیەوە گوێم لێ بوو.[1]

## ١٠. یاریکردنی بە(المداحی).[2]

سولەیمانی کوڕی شەدید دەڵێ: بە(مداحی) لەگەڵ حسن و حوسەین یاریم کردووە، گەر بەردەکانی تێبکەوتایە دەیووت: دەکرێ لە پارچە گۆشتێکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ببەیتەوە؟ گەر بەردەکانی منیش پێبکەوتایە پێی ئەوتم: سوپاسی خواناکەی لەپارچە گۆشتێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ی بردتەوە.[3]

## ١١. دووربونی لە زۆر وتندا:

حەسەنی کوڕی علی زۆربەی کاتەکانی بێدەنگ دەبوو، گەرقسەشی بکردایە قسەبێژان بێدەنگ دەبوون، حەسنی کوڕی علی فێرمان دەکات لە زۆر ووتن دووركەوینەوە، ئەوەش لەئامۆژگارییەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)یە کەدەفەرموێت: ((لایستقیم إیمان عبد حتی

---

١ ـ البدایة والنهایة(١/ ١٩٨).

٢ ـ المداحي: کۆمەڵە بەردێکە و چاڵێك دەکەنن و ئەوبەردانەی تێ ئەگرن، گەربەردەکان کەوتنە چاڵەکەوە ئەوە ئەوکەسەی هاوێشتوویەتی بردویەتیەوە، گەرنەکەوتنە چاڵەکەشەوە ئەوە دۆڕاندوویەتی، یاریەکە خەڵکی مەکە ئەنجامیان داوەو لەبارەی پێشبڕکی پێیەوە لەإبن حوسەیب پرسیارکراوە، ودەڵێ: ناساییە.

٣ ـ الطبقات، تحقیق السلمي(١/٢٩٤).

يستقيم قلبه، ولا يستقيم قلبه حتى يستقيم لسانه))، واته: (باوەڕی بەندە ناچەسپێ تا دڵی چەسپاو نەبێت، دڵیش دانامەزرێ تاوەکو زمانی دانەمەزرێ).[1] هەروەها فەرموویەتی: ((من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليقل خيرا أو ليصمت))، واتە: (هەرکەسێ باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە باچاکە بڵێ و یان بێدەنگ بێت).[2] هەروەها هاتوە:(هەرکەسێ بێدەنگ بوو سەرفراز بووە).[3]

لە پێغەمبەری خواش (ﷺ) پرسیارکراوە لەبارەی زۆربەی ئەوخەڵکانەی دەچنە دۆزەخەوە؟ فەرموویەتی: (دەم و داوێنە).[4] موعازیش لەبارەی ئەو کارانەی ئەیانخاتە بەهەشتەوە و، لە دۆزەخ دووریان ئەخاتەوە لەپێغەمبەری خوای (ﷺ)پرسیووە، پێغەمبەریش (ﷺ) ئاماژەی کردۆتە سەر داوێن و، پاشان فەرموویەتی: ((ئاگادارت بکەمەوە لەوەی چی گەورەی هەموویەتی؟)) موعازیش ووتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش (ﷺ)زمانی خۆی گرت و، پاشان فەرمووی ((ئەمە بەسە بۆلەنێو بردنت)) ئینجا موعازیش ووتی: ئیمە لەسەر ئەوقسەیەی ئەیکەین لێپرسینەوە ئەکرێین؟ فەرمووی: ((لەبار دایکت بچوایەی ئەی موعاز ئاخۆ خەڵکی لەبەر ڕوویان پاشەوەیان ئەخرێنە ئاگرەوە یان گشتی بەرهەمی زمانیانە)).[5]

إبن عوبێدیش دەڵێ: هەریەکێ لەخەڵکی زمانی بەلاوە گرنگ بێ ئەوە سەلامەتیی یەلە گشت کارێکیدا،[6] إبن لکاتیبیش ئەیوت: گەرترس لەدڵدا نیشتەجێ بوو، ئەوە زمان لەوەدا دێتەگۆ، کە تایبەت بەخۆیەتی[7]، ئەوزاعیش دەڵێ: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی بۆنوسین: هەرچ کەسێ زۆر یادی مردن بکا ئەوا بەکەمی دونیا ڕەزامەندبووە، هەرچ کەسێکیش قسەی بەپێی کارەکەی بوو، ئەوا بەپی پێویست و سوود گەیاندن

---

١ ـ السلسلة الصحيحة، رقم: ٢٨٤١.

٢ ـ البخاري، رقم: ٦١٣٦.

٣ ـ صحيح الجامع: رقم: ٦٣٦٧.

٤ ـ السلسة، رقم: ٦٦٩.

٥ ـ سنن الترمذي وقال حديث صحيح.

٦ ـ صفة الصفوة (٣/٣٧٢).

٧ ـ هەمان سەرچاوە(٤/ ٣٢٣).

قسەدەکات، والسلام.[1] بۆیە حەسەنی کوڕی علی قسەکانی بەپێ ی کارەکانی ژماردووە، بۆیە زۆربێدەنگ بووە.

### ١٢ـ ڕێزگرتن و بەخشیشی حەسەنی کوڕی علی بۆ ئوسامەی کوڕی زەید(رضي الله عنه):

لە حەرمەلەی ـ مەولای ئوسامەوە ـ دەڵێ: إبن زەید ناردمی بۆلای علی کوڕی ئەبو تاڵیب(رضي الله عنه) وپێ ی ووتم: ئەو لەتۆ ئەپرسێت و پێت دەڵێت: هاوڕێکەت چی ووت: ڕاسپاردەی چی بوو؟ تۆش بڵێ: گەر لەنێو دەمی شێرشدابێ حەز دەکەم لە تەکتدا بم، بەڵام ئەمە کارێکە ونەم بینیوە، ڕۆیشتەلای علی و هیچ شتێکی پێ نەدام، ڕۆیشتمە لای حسن و حوسەین و عبدالله کوڕی جعفر(رضي الله عنه) ولاخیان بۆم دابین کرد.[2]

### ١٣. حەسەنی کوڕی علی و جولەکەیەکی هەژار:

حسن(رضي الله عنه) خۆی شۆردو لەهەندێ ڕۆژ لەماڵدا دەرچوو و بەرگی جوان و ڕازاوەی لەبەردابوو، لەڕێگایەك جولەکەیەکی بینی بەرگی پێستی لەبەردابوو هاتەبەردەمی نەخۆشی پەکی خستبوو، پشتی چەمابووە، گۆزە ئاوێکی خستبووە سەرملی، حەسەنی وەستاندو ووتی: ((دونیا بەندیخانەی باوەڕدارەو بەهەشتی بێ باوەڕە)).[3] تۆش باوەڕدارو منیش بێ باوەڕم، دونیا بەتەنیا بە بەهەشتی تۆوە ئەبینم و نازی لێ دەبینی و بەندیخانەیەکە بۆمن و هەژاریەکەشی لەنێومی بردوومە. حەسەنیش (رضي الله عنه) پێ ی ووت: ئەی پیاو گەربڕوانیتە ئەوپاداشتەی کە خوا لەئاخیرەت بۆمی داناوە، ئەوەئەزانی ئەم حاڵەتەم بۆ بەندیخانەیە، گەر بڕوانیتە ئەوسزایەی خوای گەروە لەئاخیرەتدا بۆت ئامادەکردووە ئەوە ئەزانی حاڵی ئیستا بەراوردبەوە بەهەشتێکی فروانە)).[4]

---

١ ـ سیر اعلام النبلاء (٥/ ١٣٣).

٢ ـ ذخائر العقبی، لا ٢٣٧.

٣ ـ مسلم و إبن ماجه، رقم: ٤١١٣.

٤ ـ الحسن و الحسین، محمد رشید رضا، لا ٣٢.

حەسەنی کوڕی علی وەڵامی ئامادەبوو، وەڵامـی شایـستەی ئەدایـەوە بـەجۆرێ بـۆی ڕوونەکردەوە، کەئەو حاڵەتەی ئەو گلەیی لێ هەیەبەهەشتە بـەراورد بـەو سـزایەی خـوای گەورە بۆ بێ باوەڕانی داناوە، ئەو حاڵەتەی حەسەنیش کەبەنازو نیعمـەت ژماردوویـەتی، ئەوە بەراوردە بەو بەهەشتەی، کەخوا بۆ بێباوەڕانی داناوە وەکو بەندیخانەیە.[1]

## ١٤. ڕێزگرتنی إبن عباس لەحسن و حسین(رضي الله عنه):

مودرك أبوو زیاد دەڵێ: ئیمە لەنێو حەوشەکەی إبن عـباس دابوین، إبن عباس و حسن وحسین هاتن بەدەوری بێستانەکەدا گەڕان و تەماشایان ئەکرد، پاشان هاتنە سەرجۆگەیەك و لەکەنارەکەیدا دانیشتن و حسن پـێ ووتم: ئـەی مودریـك خواردنـت هەیـە؟ ووتم: نانمـان کردووە، ئەویش فەرمووی بیهێنە، ووتی: نانە جۆیەکی زبری خوێواویم بۆ هێناو خـواردی، پاشان فەرمووی: ئەی مودریك چەندە خۆشـە، پاشـان خواردنەکـەی هێنـا و خـواردنیکی زۆرخۆش بوو، پاشان فەرمووی ئەی مەدریك غوڵامەکانی نێـو بێـستانم بـۆ کۆبکـەرەوە، ووتی: ئەوانیش هاتن و دەستیان بەخواردن کردوو، حەسەنیش هیـچی نـەخوارد، ووتم: بـۆ ناخۆی؟ ووتی: ئەوەی تۆم بەلاوە لەم خواردنە خۆشترە، پاشان هەڵـسان و دەسـت نوێـژیان شۆردوو، پاشان وڵاخەکەی حسن هێناو إبن عـباسیش جڵەوەکەی گـرت، تـاوەکو سـواربێ ئەویش سواری بوو، کـاتێکیش ڕۆیـشتن ووتم: ئـەی إبـن عـبـاس تـۆ لـەوان بەتەمـەنتری تۆدەستیان دەگری و بۆ سواربوون بەرزیان ئەکەیتەوە، ئەویش ووتی: ئـەی پۆخـڵ ئـەزانی ئەودووانە کێن؟ ئەوە دوو کوڕی پێغەمبـەری خـوان(صلى الله عليه وسلم) ئـەوەش نـازو گـەورەیی خوایـە دەستیان بگرم و بیان خەمە سەروڵاخەکەیان[2]، ئەو ڕێزگرتنەی إبـن عباسـیش لەحـسن و حوسەین بەڵگەی خۆشەویستی و ناسینی گەورەیی یە بـۆ ئەودووانـە، هـەروەکو بەڵگـەی گەورەی إبن عـباسیشە، چونکە کەسانی بەڕێز نرخی ڕێز ئەزانن.

علی ئەمیری ئیمانداران هەڵسوکەوتی لەگەڵ عباسی مامی کرد، کـەباوکی عبـد الله بوو، بەجۆرێ شێوەی نەبووە لەڕێز گرتندا، هەر لە إبن عـباس(رضي الله عنه) دەڵێ: عباسـی بـاوکم

---

١ ـ الحسن و الحسین، لا ٣٣.

٢ ـ تاریخ إبن عساکر، (١٤/ ٦٩).

نەخۆش کەوت وعەلیش هاتەسەردانی کردنی، بینی پێکانی ئەشێلم ئەوهات ولەدەستمی وەرگرت ولەشوێنەکەمدا دانیشت و فەرموی: من لەتۆ شیاوتر بەمامەم، خوای گەورە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و حەمزەی مامەم و جعفری برامی بردەوەو عباسی بۆ هێشتوومەتەوە، مامی ئەوپیاوەو برای دایك و باوکی، خوایە گیان عافێتی خۆت بەمامم ببەخشی و پلەی بەرزکەیتەوە و لای خۆت لە (عليين) داینێ.[1]

## ١٥. پیاهەڵدانی عبدالله کوڕی زوبەیر بە حسن:

عبدالله کوڕی عروة دەڵێ: بینیم عبدالله کوڕی زوبیر لەخواردنی بەیانیانێکی زستانی سارد دا لای حەسەنی کوڕی علي دانیشتبوو، سوێند بەخوا تاوەکو نێوشانی عارەقی نەکرد هەڵنەستا، ئەوەش تۆڕەیکردم، بۆیە ڕۆیشتمە لای و ووتم: مامە! ووتی: چیت دەوێ؟ ووتم: بینیم لای حەسەنی کوڕی علي دانیشتبووی ئەوەندە مایتەوەتا نێو شانت ئارەقی کرد، ئەویش ووتی: ئەی برازا ئەوە کوڕی فاتیمەیە، سوێند بەخوا نمونەی فاتیمە لەژناندا نیە.[2]

## ١٦. نێوان حسن و حسین(رضي الله عنه):

إبن خەلەکان باس دەکات وتراوە: قسەکەوتە نێوان حسن و حوسەین و لەیەك زیز بوون، بەحوسەیەن ووترا، گەربچوایەیتە لای براکەت ولەتۆ بەتەمەنترە، ئەویش فەرموی: گەورەی بۆ دەستپێشخەرەو منیش حەزناکەم گەورەبییم بەسەربراکەمەوە هەبێ، ئەو هەواڵەش بەحسن گەیشت و حسن هاتەسەردانی.[3]

## ١٧. بەڕێزترین خەڵکی لەباوك ودایك و باپیری و داپیری و خاڵوو ومام و پور:

معاویە عەمری کوڕی عاص و کۆمەڵێ لەگەورەکانی لەگەڵ بوو - ووتی: کێ لەخەڵکی لەباوك و دایك و باپیر و داپیر و پورەوە بەڕێزترینە؟ نوعمانی کوڕی عەجلانی

---

١ ـ ذخائر العُقبى، لا ٣٣٧.

٢ ـ تاريخ إبن عساكر(١٤/ ٧٠).

٣ ـ وفيات الأعيان (٢/ ٦٩).

زورقانی هەڵساو دەستی حەسەنی گرت و ووتی: ئەمە علی باوکێتی و فاتیمە دایکێتی و باپیریش پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خدیجەش داپیریەتی و جعفریش مامێتی و أم هانئی کچی ئەیوب پورێتی و قاسم خاڵۆیەتی زەینەبیش پورێتی.[1]

## ١٨. خۆشەویستی خەڵکی بۆحسن و حسین و کۆبونەوە لەدەوریاندا لەماڵی خوادا:

ئەبو سعید دەڵێ: بینیم حسن و حوسەین لەگەڵ ئیمامدا نوێژی عەسریان کردووە و، پاشان هاتنەلای بەردەڕەشەکە و سلاویان لێکرد، پاشان تەوافیان کردو دوو ڕکات نوێژیان کرد، خەڵکی ووتیان: ئەم دووانە کچەزای پێغەمبەری خوا (ﷺ)ن، ووتی: خەڵکی دەورەیانیان لێدا تاگەیشتە ئەوەی نەتوانن لەوقەرەباڵغیە دەربچن و پیاوێکی بەهێز توانی دووریان بخاتەوە.

## سێ یەم: لەو قسەو ووتار و ئامۆژگاریانەی، کەخەڵکی لێیەوە لەبەریان کردووە:

١) حەسەنی کوڕی علی دەڵێ: لەنێو چوونی خەڵکی لەسێ شتدایە: خۆ بە گەورە زانین و سووربون (پێداگری) و ئیرەییە، خۆ بە گەورە زانیین لەنێو بەری ئایین و هۆکارەکاری نەفرەت کراوی ئیبلیسە، سووربونیش (پێداگرتن) دووژمنی مرۆڤە و، هۆکاری دەرکردنی ئادەمە لەبەهەشت، ئیرەیش پێشەنگی خراپە کارییە و لەوێشەوە قابیل هابیلی کوشت.[2]

ئەوە نەخۆشیەکانی دڵە حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) هۆشداری داوە، کەترسناکترین نەخۆشیەکانن و ئەمەش هەندێ ڕونکردنەوەیە.

أ- نەخۆشی خۆبەگەورەزانین: چونکە خۆ بە گەورە زانیین لەنێوبەری ئایین و هۆکاری نەفرەت لێکردنی ئیبلیسە!

---

١ ـ تاريخ إبن عساكر(١٤/٧٠).

٢ ـ علموا أولادكم حب آل بيت النبى(ﷺ)، لا ٣١.

خۆ بەگەورە زانیین دژ بەخاکەراییە (التواضع)، گەورەکردنەوەی دەروون و گەورەکردنی حاڵی دەروونیەکەی ڕوانیینە کەسانێکی دیکە بەچاوێکی سوك ڕاگرتنەوە، لەدەردە گەورەکانە لەوێشەوە زۆرترین بەڵاکان دروست دەبێت و، لەلایەن خوای گەورەوە خێرا تورەیی و سزا پێویست دەکات، چونکە گەورە ڕاگرتن تەنیا شیاوی خاوەن و خوداوەندی بەتوانایە و خۆبەگەورە زانیش مافی ئەوەی هەیە خوای گەورە بچوکی بکاتەوە ڕقی لێ بێت، چونکە ڕێزی خوای بەزاندووەو سیفەتێکی بۆ خۆی داناوە کەشیاوی دروستکراو (مخلوق) نیە.[1] نیشانەکانی خۆبەگەورە زانین: لەوانە حەزکردن لە کەوتنە پێش خەڵکی و دەرخستنی بەرزبوونەوە بەسەریاندا، خۆ هەڵکێشان بە جوانی و بە باسکردنی دەرون پاکی خۆی و هەڵنانی وشانازیکردنی بە باو باپیران و ڕەچەڵەك و سامان و زانست و عەشیرەت.[2]

خۆپارێزی و چارەسەرکردن لەو نەخۆشیە:

پێویستە موسڵمان لەخۆی بپرسێتەوە و چاودێری دڵی بکات، کەئاخۆ خۆ بە گەورەزانە؟ ئایە حەزی گەورەزانی هەیە؟ گەردەرونی خۆی بینی ئارەزووی خاکە رایی و ڕقی لە خۆبەگەورەزانین و خۆبەگەورەزانان بوو، باسوپاسی خوا بکات لەونیعمەتەی پێی بەخشیوەو دەرونی سەرزەنشت بکات و لێپرسینەوەی بکات بەزۆر یادکردن و، پەرستن و گوێڕایەلی بێ بەشکردنی دەروون لەزۆر حسانەوەو لە هۆی گاڵتە جاڕی و ئارەزووە ڕێپدراوەکانی، تا بگاتە دۆخی ژیریەکەی و دوور لە ڕێگەی ستەمی بێ و لە نەخۆشیەکەی ڕزگاری بێ.

پێویستە موسڵمان چاوی بخاتە سەر ڕاستەقینەی ئەو نەخۆشیە و ئەنجامەکانی لەدونیا و ئاخیرەتدا و چاو بخاتە سەر حەرام یەکەی لەشەریعەت و سزاکەی لەدونیا و ئاخیرەت و لەقورئان نوسینەوە و، واقع و چیرۆك و ژیانی چاکە کارانەوە چۆن تەماشا دەکرێت، ئەوەش قورئانی پیرۆز دەری دەخات، کەخۆ بە گەورەزانین لە سیفەتەکانی شەیتانە و،

---

١ ـ منهج الإسلام في تزكية النفس، لا ٣٤٢.

٢ ـ منهج الإسلام في تزكية النفس، لا ٣٤٢.

خوای گەورەش لەبارەی ئیبلیسەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ [البقرە: ٣٤].

خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ لاَ جَرَمَ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ﴾[النحل: ٢٣] . خوای گەرە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾[لقمان:١٨].

خۆ بەگەرە زانی و شانازی بە خۆە کردن لە سیفەتەکانی مرۆڤی خۆ بە گەورە زانە، خۆبەگەرەزان پشتی لە ئاینی خوایە، چونکە خوای گەرە مۆری لەسەر دڵی داوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾[غافر: ٣٥].

بێگومان خۆبەگەورە زانین بەزانست و پەرستن گەورەترین دەردەکانی خۆبەگەورە زانینە، پێویستە بزانێ کەخوای گەورە بیانوو بەڵگەی لەسەرخاوەن زانستەکان هەیە... ئەگەر لەبەر نەزانیندابێ نەك لەبەر زانابیدا، خۆ بەگەورە زانین لەخوای گەورە یاخی بوونە تاوانەکەشی ناشینترو سزاکەشی گەورەترە، گەرخۆ بە گەورەزانینیشی بۆرەچەڵەك بێ، بابزانێ کەشانازی کردن بەکەماڵی یەتی باو باپیرانی، ئەو باوکە نزیکەکەی دڵۆپێکی پیسەو باوکی دووریشی خۆڵە.

ئەگەر بە هۆی جوانیەکەی خۆی بەگەورە بزانێ بابەڕوانینی ژیرەکان بڕوانێتە ناوی خۆی نەك وەك ڕوانینی ئاژەڵان بڕوانێتە ڕواڵەتی، ئەگەر لە هێزدا خۆبەگەورە ئەزانێ، بابزانێ ئەگەر ئازارێکی بۆبێت لە بێتواناکان بێ تواناتر دەبوو، هەرکەسێك بە هۆی دەوڵەمەندیەکەی خۆی بەگەورە بزانێ بابڕوانێتە ئەوانەی لەخۆی دەوڵەمەندترن، وەك قارون و هامان چیایان بەسەر هات، لەوەدا خۆی بە بچوکتر دەزانێ لەوەی خۆی بەگەورەتر بزانێ، پێویستە خاکەرابێ و خواش بەرزی ڕادەگرێ لەدونیاو ئاخیرەتیشدا لێ دەبوورێ، پێویستە پەند لەکەسانی تر وەربگرێ لەوانەی قورئانی پیرۆز یان سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) یان چیرۆکی پیشینان لەوانەی خۆیان بەگەورە زانیوە باس کراوە، ئاخۆ پاشە ڕۆژ سەروەت و سەرشۆڕیان لەدونیا و ئاخیرەتدا چی بووە؟ بێگومان لەوەدا پەندیان لێوەردەگیرێ، خۆ لە بەگەورەزانین دەپارێزێت و ئەگەرهاتوو توشی نەخۆشی خۆ بە گەورە زانیش بوو با

هاوڕیەتی خاکەرا و چاکە خوازەکان بکات، تاوەکو سودیان لێوەربگرێ و ئەخلاق و شێوازی مامەڵەکردنی کەسانی تریان لێوەربگرێ و لەخۆ بەگەورەزانان دوورکەوێتەوە، لەگەڵیاندا دانەنیشێت، تاوەکو ئەوشتانەیان لێوەرنەگرێ کەزیانی دونیاو ئاخیرەتی تێدایە یان پێیان کاریگەربێت و، تێکەڵ بەئارەزوو گۆڕانکاریەکانیان بێت.[1]

ب- سوور بوون: قسەی حسن لەوەی سوور بوونی دووژمنی مرۆڤ و بە هۆی سوور بوونیشەوە بوو ئادەم لەبەهەشت دەرکرا:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ماذئبان جائعان أرسلا في غنم بأفسد لها من حرص المرء على المال ولشريفه ولدينه))[2]، واتە: دووگورگی برسی ئەگەر بچنە سەر ڕانە مەڕێك لەپێ داگیری مرۆڤ بەسەروەت و گەورەیی بەرامبەر ئاینەکەی مەترسی داترو خراپتر نیە. ئەوەش نمونەیەکی زۆر گەورەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بۆخراپ بوونی ئاینی موسڵمان هێناویەتیەوە، لە پێداگیریەکەی لەسامان و گەورەیی لەدونیا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە سوربونی مرۆڤ لەسەروەت وگەورەییدا نەهێڵەری ئاینەکەیەتی و کەمتر نیە لەنەهێڵەری مەڕەکان لەلایەن ئەو دوو گورگەوە، بەڵکو خراپەیان زیاترە، ئاماژە دەکاتە ئەوەی سووربوون وەدەستهێنانی سەروەت و گەورەیی بەکەمی نەبێ دینەکەی سەلامەت ناکات، ئەم نمونە گەورەیەش ئەوپەڕی ووریاکردن لەخۆنەگرێ لەپێداگریکردن لەسەروەت و گەورەیی لەدونیادا، پێداگریکردن لەسەروەت و ساماندا دووجۆرە:

١.حاڵی ئەو کەسەی سورە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ:

* سەخترین حاڵەت خۆشویستنیکی بێ ئەندازەی سەروەتە لەتەك زۆر بەدواداچونی ڕووەو ڕێداروەکان (المباحات) و زیادە ڕەویکردن لەبە دواکەوتنیدا و زۆرهەوڵدان و زۆر خۆماندوو کردن، لەوەشدا هاتووە هۆی ئەوفەرموودەیە تووشبوونی هەندێ کەس بووە بەوجۆرە پێداگریەوە، هەروەکو طبراني[3]، لەفەرموودەیەکی عاصمی کوڕی عەدی(رضي الله عنه) تەخریجی کردووە دەڵێ: سەدپشکی خەیبەرم کری و هەواڵی ئەوکرینەش بەپێغەمبەری

١ ـ منهج الإسلام في تزكية النفس، لا ٣٤٦.

٢ ـ الأحسان في تقريب صحيح إبن حبان، رقم: ٣٢١٨ حسن صحيح.

٣ ـ الطبراني في الأوسط(١/ ٤٧٠)، رقم: ٨٥٥.

خوا(ﷺ) گەیشت و ئەویش فـەرمووی: ((ماذئبـان ضـاريان ضـلا في غـنم أضـاعها ربهـا بأفسد في طلب المسلم المال ولشريفه ولدينه)).[1]

إبن ڕەجەبیش (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵـێ: گـەر لەپێـداگری کردن لەسەروەت و ساماندا تەنیا بەفێرۆدانی ئەو تەمەنە پیرۆزە نـەبێ نرخـی نیـە، ئـەوە خاوەنەکی پلەی بەرزەو نازو نیعمەتی هەمیشەیی بۆ دەبوو، بۆیە لەدەسـتی ئـەدا لـەداوا کردن و گەڕان بەدوای ڕزمێکدا دەستە بەرو دابەشـکراو و بەئەنـدازەی دەیـدرێتێ، پاشـان سوودی لێنابینێ، بەڵکو بۆکەسێ بەجێ ی دەهێڵێ، لێپرسینەوەی لەسەر ئەوە سوودەکەی بۆ خەڵکی دیکەیە، بۆیە کۆی دەکاتەوە بۆکەسێ سوپاسـی ناکـات و دەیخاتـە بەردەسـتی کەسێ لەبەشە کەمەکەی لێ ی نابورێ، ئەوەش خراپەی پێداگریـە، بۆیـە کەسـی پێـداگر ماوەگەورەکـەی لەدەسـتدەدات و دەروونـی خـۆی دەخاتـە مەترسـیەوە کـە لەگەشـت و سواربوونە مەترسیدارەکاندا، بۆکۆکردنەوەی سامانی بۆ کەسانی تر دەرونی خـۆی دەخاتـە مەترسیەوە.

هەروەکو ووتراوە:

ومن ينفق الأيام في جمع ماله        مخامة فقر فالذي فعل الفقر[2]

واتـە: (هەرکەسـێ بـۆ کۆکردنـەوەی سـامانەکەی ولەترسـی هەژاریـدا ڕۆژگارەکـانی ببەخـشێ، ئـەوە بۆخـۆی کـارێکی هەژارانەیـە). إبـن مەسـعودیش (ﷺ)فەرموویـەتی: دڵنیایی (یقین) ئەوەیە بـەتوڕەکردنی خـوا خـەڵکی ڕەزامەنـد نەکـەیت و لـەڕزقی خـوادا حەسودی بەکەس نەبەیت، لەوەی خوا بەتۆی نەداوە کەس سەزەنشت نەکەی، چـونکە ڕزق سووربونی هەرپێداگریەك نایکرێ و هیچ ڕقکـارێکیش ڕەتـی ناکاتـەوە وڕێگـری ناکـات، چـونکە خـوای گـەورە بەبەشـکردنی خـۆی گیـان و خۆشـی کردۆتـەوە نێـو دڵنییـایی و ڕەزامەندیەوە و، خەم و خەفەت و پەژارەشی کردۆتەوە گومان و تووڕەیی.[3]

---

١ ـ الإحسان في تقرير صحيح إبن حبان، رقم:٣٢١٨ حسن صحيح.

٢ ـ ماذئبان جائعان لإبن رجب، لا ٢٣.

٣ ـ ماذئبان جائعان، لإبن رجب،لا ٢٦.

عبد الواحدی کوڕی زەیدیش سوێندی بەخوا خواردووە پێداگیربوونی لە دونیا قورسترە لەسەر سەختترین دوژمن و، دەیفەرموو: برا خۆشەویستەکانم خۆزگەی پێداگری مەبەن لەسەروەت، کە لەکارێکدا و ماڵێکدا، بەڵکو بەچاوی نەبونەوە بڕوانە سەرقاڵی ڕۆژێ لەوەی سبەی چی دەبات و، پاشان خۆبەگەورە زانی، پاشان دەیفەرموو: دووجۆر پێداگری هەیە، پێداگری کارەساتبارو پێداگری سوودبەخش، پێداگری سوودبەخش، پێداگری مرۆڤە لەسەر گوێڕایەڵیکردنی خوا، پێداگری کارەساتبار پێداگری مرۆڤە لەسەردونیا.[1]

حەکیمێکیش نامەیەکی بۆبرایەکی کە بۆدونیا لەهەڵپە دابووە نووسیویێتی: پاشان وەهات بەسەرداهاتووە بۆدونیا پێداگربیت و، خزمەتی بکەیت و ئەویش بەنیشانەو نەخۆشی و نەهامەتی و لەخۆیدا دەرت ئەهێنێ، وەکو ئەوەی پێداگریەکی بێبەش بوو هەروەها دونیا بە کەمگرێکی ڕۆزیدارت نەبینی بێ، هەندێ داناش ووتوویانە: ئەوکەسەی خەڵکی زیاتر پەژارەداربێ ئیرەیبەرانە(الحسود) و، خۆشترینیان کەژیانیان ئاسوودەبێ کەسانی قانیع وئارامگرتنینانە لەسەرخراپە وئازارەکانی، ئەوشیان کەزۆرپەشیمانی ئەکێشێ زانایەکی زیادەڕەوە.[2]

| | |
|---|---|
| الحرص داء قد أضرَّ | بمن ترى إلا قليـــــلا |
| كم من حريص طامع | والحرص صَيّرهُ ذليلا[3] |

واتە: (پێداگری نەخۆشیە وزیانی گەیاندووە بەپێداگران و، تەنیا کەمیان نەبێ بێ زیان بووبن، ئاخۆ چەندە پێداگر هەبووە پێداگری لاواز و سەرشۆڕی کردووە).

محمود الوارقي شاعیریش دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ونازح الدار لاينفك مغتربـــاً | عن الأحبة لايدرون بالحــــــال |
| بمشرق الأرض طوراً ثم مغربها | لايخطر الموت من حرصٍ على بال |
| ولوقنعت أتاك الرزق في دعـــة | إن القنوع الغنى لاكثرة المــــال |

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا٢٦.

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٢٧.

٣ ـ ماذنبان جائعان، لا٢٦.

واتە: (ئەی ئەوکەسەی لەوماڵە داگیرساویەتەوە(گۆڕ) ئەوە غەریبی و دووری لەکەس و کار هیچ سوودت پێناگەیەنن وزانیاری حاڵ و باری بۆیان نیە، مەرگیش باکی نیە لەوەی کێ دەباتە وەو چی پەژارەیەکی هەیە، گەرتۆش چاوان قەناعەت بووی، ئەوە لەپشویەکدا ڕۆزی دێتە لات و بشزانە کە قەناعەت کردن دەوڵەمەندیە نەك ڕۆزی و سەروت).

هەروەها دەڵێ:

أيها المتعب جهداً نفســـه    يطلب الدنيا حريصاً جاهداً

لالك الدنيا ولا أنت لهـــا    فاجعل الهمين هماً واحـــــداً[1]

واتە: (ئەی ئەوکەسەی خۆتت زۆرماندکردووە لەپێداگری لەسەرسەروەت و، زیادکردنی نە دونیا بۆ تۆیە و نە تۆش بۆ ئەوی، بۆیە هەردوو پەژارەکەت بە یەك پەژارە بخە).

٢. جۆری دووەمیش لەوەی لەجۆری یەکەم باسکرا، تاوەکو لە ڕووە قەدەغەکراوەکان بەشوێن ماڵدا بگەڕێ ومافە پێویستیەکان ڕێگری بکات، ئەوەیشە ڕژدی سەرزەنشتکراو، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی:﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنْفِقُوا خَيْراً لِأَنْفُسِكُمْ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾[ التغابن: ١٦]. لەسونەی ئەبو داودیشدا هاتووە لەعبدالله کوڕی عەمرەوە(ﷺ) لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ)فەرموویەتی: ((اتقوا الشحَّ فإن الشحَّ أهلك من كان قبلكم أمرهم بالقطيعة فقطعوا، وأمرهم بالبخل فبخلوا، وأمرهم بالفجور ففجروا))[2]، واتە: (خۆتان لەچروکی بپارێزن، چونکە چروکی و ڕژدی لەنێو بەری نەتەوەکانی پێشووترتان بوو، فرمانی نەگەیاندی سۆزو بەزەیداوە و، ئەوانیش پەیوەندیەکەیان پچڕاندووە، فرمانی ڕژدی داوەو ئەوانیش ڕژدیان کردووە، فرمانی خراپەکاریانی پێداوە ئەوانیش خراپەکاریان کردووە.

هەروەها کۆمەڵی لەزانایانیش ووتویانە: ڕژدی ئەو پێداگرییە توندو سەختەیەکە خاوەنەکەی هەڵەنێ لەوەی بەبێ گەیشتنی شتەکان وەربگرێ و مافەکەی ڕێگری بکات.[3]

---

١ ـ ماذنبان جانعان، لا٢٩٧.

٢ ـ سنن أبي داود(٢/ ٣٢٤)، رقم: ١٦٩٨، صححه الألباني.

٣ ـ ـ ماذنبان جانعان، لا٣١٧.

بـه خیلـی(ڕەزیلـی)یـش، گرتنـەوەی ئەوشـتەیەکە لەدەسـتتدایە، ووتراوەکـە ڕژدی سەرچـاوەی گـشت تاوانەکانـە، ئـەوجۆرەش إبـن مەسـعود و سـەلەفەکانی ترپێناسـەی (الشح:البخل) کردووە[١، ٢]

هەر چ کاتێکیش سووربوون و پێداگری لەسـەردونیا گەیـشتە ڕژدی، ئـەوە بـەڕوودانی ئایین و باوەڕی کەمکردۆتەوە بەکەمی نەبێ گەر ڕێگری پێویـستیەکانی (واجبـات) کـردو حەڕامەکانی خوارد و بەکارهێنا ئەوە بێگومان ئایین و باوەڕی پێ کەم دەبێتەوە تادەگاتـە ئەوەی هیچی لێ نەمینێ.[٣]

پێداگری کردنی مرۆڤیش بۆوەدەست هێنانی گەورەیی و دەسەڵات ئەوەلە پێداگریکردن لەوەدەست هێنانی سەروەت و سامان لەنێو بەرترە، چونکە گەڕان بەدوای گەورەیی دونیـا و بەرزبونەوە تیایدا و سەرۆکایەتیکردنی خەڵکی و لووت بەرزی لەزەویدا بۆبەندە لەگـەڕان و هەڵپەی سەروەت و سامان زیانبارترە، زیانی زۆرترو زوهدیش تیـادا قورسـترە، چـونکی سـەروەت و سـامان لـەپێناو سـەرۆکایەتیکردن و گەورەییـدا ئەبەخـشرێ، پیـداگریش لەوەدەست هێنانی گەورەیی دەسەڵاتدا دووجۆرە: یەکەمیان گەڕانەوە لەدوایی بۆدەسـەڵات ومالّ و ئەوەش زۆر مەترسیە و بەزۆریش خێریی ئاخیرەت ڕێگر دەکات و گەورەیی وڕێـزی ناهێڵێ، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿ تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾[القصص: ٨٣].

کەم کەس هەیە لەپێداگیربوون لەگەورەی و دەسەڵاتی لـەدونیادا سـەرکەوتوو بـووبێ، بـەڵکو تیاچـووە، هـەروەکو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـە عبـدالرحمنی کـوڕی (سُمرة)ی(رضي الله عنه)ووتووە: ((یاعبدالرحمن لاتسأل الإمارە فإنك إن أعطیتها عن مسألە وکلت إلیها، وإن أعطیتها من غیر مسألە أعنـت علیهـا))[٤]، واتـە: (ئـەی عبـدالرحمن داوای

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٣١.

٢ ـ بۆئاگاداری خوێنەری بەڕێز ئەودوو ووشەیە لەفەرهەنگ و واتاکوردیەکەیدا هەر(چروکی وڕژدی و ڕەزیـل) دەگـەێنێ کەیـەك شـتە، بـەڵام بەوپێیە لەبابەتەکەدا دیارە هەندێ جیاوازی هەیە، لەنەگەیاندنی تەواوی پێکان بمان بورن.

٣ ـ ماذئبان جائعان، لا٢٩٧.

٤ ـ البخاري، رقم: ٦٦٢٢.

دەسەڵات و بەرپرسیاریەتی مەکە، چونکە گەر بەباشی بە دیت هێنا ئەوە پاداشت دراوی و، خراپش ئەنجامت دا ئەوە باری بەرپرسیاریەکەت لەسەرشانە. بزانە پێداگری لەوەدەست خستنی گەورەییدا لەگەڕان و تێکۆشان لەهۆکارەکانیدا و پێش پێگەیشتنی زیانێکی گەورە پێویست دەکات و دوای پێگەیشتنیشی ئەوپێداگریە گەورە پێویستە خاوەن دەسەڵات لە ستەم و خۆبەگەورەزانین خراپەکارییەکانی دیکە ئەنجامی دەدا.[1]

بەشی دووەم: گەڕان بە دوای گەورەبوونی دەسەڵات بەسەر خەڵکیدا بە هۆکارە ئاینەکانی وەکو زانست و کردارو زوهد، ئەمەش لە پێداگری یەکەم ناشیرنترو گەندەڵترو مەترسیدارترە، چونکە زانست و زوهد و کردار تەنها بەکاردەهێنرێ بۆ ئەوەی لای خوای گەورە پلەی بەرزو نازو نیعمەتە هەمیشەو لێك نزیك بوون پێی دەویسترێ.[2] ڕێگای چارەسەریش لەپێداگری نابووت و سەرزەنشتکراوە تەنها بەزوهدە و هۆکار گەلێکی تێدایە، لەوانە:

- ڕوانینی بەندەیە بۆ خراپی پاشەڕۆژ و گەورەیی دەسەڵات و بەرپرسیاریتش لەدونیا بۆکەسێ مافی ئاخیرت نەدات.

- ڕوانینی بەندەیە بۆپاشە ڕۆژی ستەمکارو خۆبەگەورەزانەکان و بەرگی خۆ بە گەورەزانەکانیش چۆن ململانێ خوا ئەکات.

- ڕوانینی بەندە بۆ پاراستنی ئەوانەی لەدونیادا بۆ خوا خاکەرابوون لە وەدەستهێنانی پلەبەرزی ئاخیرەت، چونکە هەرکەسێ بۆخوا خاکەرا (متواضع)بێ ئەوا خوا پلەی بەرزدەکاتەوە.

- ئەوەش لەتوانای بەندەدا نیە، بەڵکو گەورەیی و سۆزی خوایە ئەوسەروەت وگەورەیی خوا بەبەندە عاریف و زاهیددەکانی داوە لەدونیایاندا خوا لەگەورەیی تەقواو گەورەدانانیان و چێژی ناسین و ئیمان و گوێڕایەڵی ناخیش خوا دەسەڵات و سەروەری پێداون.

---

١ ـ ماذنبان جائعان، لا( ٣٥، ٤٣).

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٤٧.

ئەوەش ئەوژیانە خۆشەیە خوا بەبەندە نێرو مێكانی خۆی داوە، باوەڕدارن ئەو ژیانە خۆشە پادشایانی دونیاو دەسەڵاتدارەكان چێژیان نەكردووە، پێداگریش لەوەدەست هێنانی دونیا وەك ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: گەر پادشایان و نەوەی پادشایان خۆشی ژیانی ئێمەیان بزانیبایە ئەوە بەشمشێر بۆبردنی ئەوخۆشیە ململانێی ئێمەیان دەكرد.

ڕزقی خواییش بۆی سەرقاڵ نەكردنیەتی دوورخستنەوەیەتی لەگەڕان و هەوڵدان بۆگەورەیەكی هەڵوەشاوەو دەسەڵاتی تیاچوو(فانی).[1] پەروەردگاری باڵادەستیش فەرموویەتی: ﴿وَلِبَاسُ التَّقْوَىَ ذَلِكَ خَيْرٌ﴾[الأعراف: ٢٦] .

بۆیە حەسەنی كوڕی عەلیش(ﷺ) لەپێداگری خراپە ووریامان دەكاتەوە و بەوهۆیەشەوە دەڵێ: پێداگری دوژمنی دەروونە و هۆی دەركردنی ئادەم بوو لە بەهەشت.[2] ئیرەیی (الحسد) حسن دەڵێ: ئیرەیی پێشەوای خراپەو هۆكاری كوشتنی قابیلە بوو لەلایەن هابیل:

ئیرەیی دژ بەخۆش ویستنەو ئارەزووكردنی نەمانی خۆشی كەسانی ترە و نەخۆشیەكی لەنێوبەرو ناشیرنە، خوای گەورەش فەرمانی بەپێغەمبەرەكەی (ﷺ) كردووە پەنابگرێ لەخراپەی ئیرەیی، هەروەك چۆن فەرمانی پێكردوە پەنابگرێ بەخوا لەشەیتان فەرموویەتی: ﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾[ الفلق: ٥]، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاتحاسدوا ولاتقاطعوا ولا تباغضوا ولاتدابروا وكونوا عباد الله إخواناً))[3] واتە: (ئیرەیی بەیەك مەبەن و پێوەندی مەپچڕێنن و توڕە مەبن و پشت لە یەكتر مەكەن و بەندەی خواو برای یەك بن).

ئەنەسیش ووتی: ڕۆژێك لای پێغەمبەر خوا (ﷺ) دانشتبووین فەرمووی: ((يطلع عليكم ألآن من هذا الفج رجل من أهل الجنة)) واتە: (لەوشوێنەدا ئیستا پیاوێك

١ ـ ماذئبان جائعان، لا ٧٥، ٧٦.

٢ ـ علموا أولادكم حب آل بيت النبي(ﷺ)، لا ١٣١.

٣ ـ البخاري، رقم: ٦٠٦٥.

دەردەکەویت خەڵکی بەهەشتە). ووتی: پیاوەکەمان لێ دەرکەوت کەپیاوێکی ئەنصاری بوو ڕیشی ئاووی دەست نوێژی لێ دەتکایەوە، نەعلەکانی بەدەستی چەپی هەڵگرتبوو، کە گەیشت سەلامی کرد، کەبەیانیش هات پێغەمبەر(ﷺ) هەمان شتی ووت و هەمان پیاو دەرکەوت، لەڕۆژی سیّ یەمیش ئەوەی فەرموو هەمان پیاو دەرکەوت پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو ڕۆیشت، عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص شوێنی پیاوەکە کەوت و پێی ووت: لەگەڵ باوکم پەیوەندیم ئاڵۆز بووە و سوێندم خواردووە سیّ ڕۆژ نەچمەوە ماڵ دەکرێ ئەو سیّ ڕۆژە لای تۆدابم، ئەویش ووتی: بەڵێ ئەویش سیّ شەو لای مایەوە نەی بینی شەونوێژ بکات جگەلەوەی لەجێگا هەڵدەستا یادی خوای دەکرد، تەنها بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستا، ووتی: تەنها قسەی باشی دەکردو سیّ شەوەکە تەواوبوو، خەریك بوو ڕقم لەکارەکەی ببێتەوە ووتم: ئەی بەندەی خوا هیچ تووڕەییەك لەنێوان خۆم و باوکمدا ڕۆی نەداوە و لێك زوویر نەبووین، بەڵام بیستم پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەها باستی کرد، منیش ویستم بزانم چ کاریك ئەنجام دەدەی وەها وەسفتی کردوو کارێکی وام لێ نەبینی، چ کارێك تۆی بەم پلەوپایەیە گەیاندووە؟ ئەویش ووتی: کاتێك ڕۆیشتی باسم مەکە ووتی: تەنها کەبینیت هەرئەوەئەنجام دەدەم، جگەلەوەی لەدەروونمدایە ئەوبەخشینەی خوا بەموسڵمانانی داوە حەسودیان پیّ نابەم.

عبدالله ووتی: پێم ووت: ئەوە ئەوەیە تۆی گەیاندۆتە ئەو پلەیە، ئەوەش ئەوەیە لە توانی ئێمەدا نی یە.[1] حەسودیش هۆکاری زۆرە لەوانە دوژمنایەتی و ڕق و بەخۆ سەرسام بوون (العجب)و حەزی گەورایەتی کردن و دەروون پیسی و ڕژدیەکەی و نەخۆشەکانی تری دڵ، حەسودیش کۆکەرەوەی گشت دەردونەخۆشیەکانە، لەگشتیان خراپتر بەرامبەر ئایین و باوەڕوو خۆشەویستی وبرایەتی، خراپەکاریە، زۆربونی حەسودیش لەنێو نەتەوەکاندا زۆربوونی ئەو هۆکارانەیە باسمانکردن، بەزۆریش لەنێوکەسە نزیکەکاندا ڕوودەدات، براو ئامۆزاو خاوەن کاروپیشەو زانا و بازرگانەکاندا، بنچینەی حەسودیش

---

١ ـ مسندأحمد، رقم: ١٦٦/٣، إسناده صحيح.

گردبوونەوەو قەرەباڵغی کردنە لەسەر یەك مەبەست و سەرچاوەی دروستبونی گشت ئەوەش خۆشویستنی دونیایە، دونیاشی بە قەرەباڵغکارەکانی تەنگ هەڵچنیوە.[1]

چارەسەرکردنی نەخۆشی ئیرەیی بردن(الحسد):

چەند دەوایەکی خۆپاریزی و چارەسەری لەنەخۆشی (حەسودی)هەیە لەوانە:

١. زانین بەوەی نەخۆشی ئیرەیی بۆدونیاو ناسینی ئیرەیی زیانی هەیە، لەڕووی ئاین و دونیایشەوە زیانی ئیرەیی ئیرەیبراو (المحسود) ناگەینرێ، نازو نیعمەتی خواش بەئیرەیبەر لەئیرەپێدراو لە نێوناچێ، کەواتە: ئیرەیی بەر(حاسد) لەئیرەبردنەکەی تەنیا توڕەیی و ئازار و ئاخ و هەڵچون و دەبێتە لەدەست دانی دین دونیا، کەواتە ئیرەیی بەر چۆن دەیەوێ نیعمەت نەهێڵێ کەخوای گەورە بەئیرەیی پێبراوی بەخشیوە، خوا حەزدەکات نیعمەتی بەبەندەکەی خۆی ببەخشێ، ئیرەیی بەریش حەزدەکات ئەو نیعمەتە لەناو بچێ، بێگومان حەزدەکات بەشتێ خوا پێ ی ناخۆشە و ڕقی لەشتێکەخوا پێ خۆشە، ئەوەش دەردێکی هەڵوەرێنەری ئاین و باوەڕە، چونکە ئیرەیی بەر حەزی بەو خۆشیە نەکرد، کەبۆ خۆی حەزی لێیەتی و براکەشی لەو خۆشیەدابێ.

ـ هەمیشە بیرکردنەوە لەخراپیەکانی ئەم نەخۆشیە لەئاین و دونیا و توڕەیی خوا لە بەرامبەری و ڕقی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی و ئەو ئەنجامەی ئیرەیی بەر لەدونیاو ئاخیرەتدا بەدەستی دەهێنێ، گشت ئەمانە یارمەتی دەری ڕاستەقینەی ئیرەیی و خۆپاریزی دوورکەوتنەی و گەڕان بەدوای چارەسەردا.

- پەند وەرگرتن لەئایەت و فەرموودەو چیرۆك و واقیعی ئیرەیبەران و ئەنجامی ئیرەییەکان، گشت ئەوانەش یارمەتیدەری خۆپاریزی و چارەسەرکردنن لەو نەخۆشیە ترسناکە.

ـ لێپرسینەوەی دەروون و سەرزەنشتکردنی لەکاتێ هەموو بیرۆکەیەکی ئیرەیی (حەسوودی) بەسەردا بێ و هەوڵدان لەوازهێنان لەئیرەییپێبراو، بەڵکو هەڵنان و داوای

---

١ ـ منهج الإسلام في تزكية النفس، لا ٣٤٠.

پارێزی و بۆ زیادکردنی بۆبکات، ڕێگریش نیە لەوەی وەکو کەسانی تر خۆیشی ئومێدی پێی بێ بەبێ ئەوەی ئیرەییان پێ ببات.

- ڕازیبون بەبەخشینی خوا و قەناعەت پێکردنی و، باوەڕبوون بەوەی ڕزق و بەخشین گەورەیی خوایە و بەهەرکەس بیەوێ ئەیبەخشێ و، هیچ کەسێکیش ناتوانێ نیعمەتێ لەناو بەرێ، کە خوا بەبەندەیەك لەبەندەکانی ببەخشێ، هیچ کەسێکیش بەبێ گەوریی خوا ناتوانێ بەخشینی خوا بەدەست بێنێ، بەندە تەنیا ڕەزامەندی وپاڕانەی بۆ هەیە، کەواتە بەندە بۆ لەبەردەم ئەو دەرگایە ناوەستێ، کە خێر و پاداشتی لێیە؟ بۆ چیش لەونەخۆشیە دوور ناکەوێتەوە کە خراپە ئەهێنێ؟.[1]

ئەوەش حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه)یە لە ئیرەیبردن وورڕیایمان دەکاتەوە ووتوویەتی: ئیرەیی بردن پێشەوای خراپەو هۆکاری کوژرانی هابیلە بەدەست قابیلەوە[2]، کاتێك حەسودی بەبراکەی برد لەوەی خوا پێ ی قبوڵ بووە ئەویش لێ ی ڕازی نەبووە.

٢. پایەی ڕازیبون (الرضا) لەنێوان حسن و (أبو ذر) دا:

أبوالعباس محمدی کوڕی یەزیدی موبەڕید دەڵێ: بەحەسەنی کوڕی علی ووترا: (أبو ذر) دەڵێ: هەژاریم پێ خۆشترە لە دەوڵەمەندی، نەخۆشیم پێ خۆشترە لە لەش ساغی، ئەویش ووتی: خوا بەزەیی بە(أبو ذر) دابێتەوە، بەڵام من دەڵێم: هەرکەسێ ڕازی نەبێ بە هەڵبژاردنی خوا بۆی، با خۆزگە نەخوازێ جگە لەو حاڵەتەی، کەخوا بۆی هەڵبژاردووە، ئەوەش سنوری وەستانە لەڕەزامەند بوون بەوەی کەقەزا مامەڵەی پێ دەکات.[3]

بەڕاستی حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه) لەوقسەیەدا وەسفی کارێ لەکارەکانی دڵ دەکات و بەڵگەی زانیاریەتی بەوکارە خۆشەویستەوە، بۆیە ڕازیبون لەکارەکانی دڵە و هاوشێوەی جیهادە لەکارەکانی دەست و لاشەیەو هەموو ئەو دوانەش لوتکەی باوەڕە.[4]

---

١ ـ منهج الإسلام في تزكية النفس، لا ٣٤١.

٢ ـ علموا أولادكم محبة آل النبي (ﷺ)، لا ٣١.

٣ ـ البداية والنهاية (١/ ١٩٩).

٤ ـ مدارج السالیکین(٢/ ٢١٤).

ڕازیبوون(رضـا) بەرهەمێکە لەبەرهەمەکانی خوای گـەورە بـەرزترین مـەقامی بەنـدە نزیکەکانێتی، ڕاستی ئەوەش بەلای زۆرەوە ناڕوونە، ئەوەش دەرگای گەورەی خواو ئارامی عارفەکان و بەهەشتی دونیایە، جێ ی ئەوەیە هەرکەس دەروونی خۆی ئامۆژگاری بکـات ئارەزووی تیایدا جۆش بـدات و بەشـتی دیکـە نەیگۆڕێتـەوە، ڕازیبـونی خـواش لەبەنـدە لەبەهەشت و ئـەوەی تیایدایـە گـەورەترە، چـونکە (ڕەزا)سـیفەتی خوایـە و بەهەشـتیش دروستکاروێتی، خوای گەوزە فەرموویەتی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾[التوبة: ٧٢].

ئەم ڕازیبوونەش پاداشتی ئەوکەسانەیە لەدونیادا لە خـوا ڕازیبوونـە، ئـەو پاداشـتەش گەورەترین پاداشتەکانە، هۆکارەکەشی باشترین کارە. توڕەییش دەرگای پەژارەو خەم و دڵ نائارامی و بارخراپیە و خراپ گومانکردنە بەخوا، تەنیا ڕازیبون لەگشت ئەوانـە ڕزگـاری دەکات و، پێش بەهەشتی ئاخیرەت بەهەشتی دونیای بۆدەکاتەوە، چونکە ڕزامەندبوون دڵ ئارامی وفێنکی دڵ و گیرسانەوەی بـۆ ئـەهێنێ، تـوڕەیی و ڕقـیش شـڵەژان و وەرەسـی و بێقەراریە و تووڕەیش هەمەڕەنگی بۆ پێویست دەکات و لەگەڵ خودا دانامـەزرێ، چـونکە ئەوکەسە هەربە سروشت و دەرونی خۆی ڕەزامەندە، ئەنـدازەکانیش ـ بەویـستی گونجـانی خۆی دەوێ، هەرچی پێ ی خۆش بوو پێ ی خۆشحاڵ دەبێ، گەر بۆئەویش نەگونجا تـوڕەی ئەکات و بۆلای خوا هەنگاو هەڵناگرێ، بۆیە گەر لە هەموو حاڵەکاندا لەمەعبودی خـۆی (الله) ڕازیبوو، ڕووە و خوا ئەڕوات، هیچ شتێکیش بەقەد ڕازیبوونی بەندە جوان ناکات.

ڕازیبوون دڵ بۆخوا پاك دەکاتـەوە و خۆشەویـستی وپـشت پـێ بەسـتنی بـەخوا پـڕی دەکـات، هـەرچ کەسـێکیش پـشکی ڕەزامەنـدی نـەبوو ئـەوە دڵـی بـەتوڕەیی پـڕ بـوو لەبەختەوەریدا نابێ، سەرەتای ڕازیبونیش دەسکەوتی بەندەیە و لـەکۆی پلەبەرزەکانیدایـە و، کۆتایەکەشی لەکۆی حاڵ و بارەکانە، سەرەتاکەی پلەیە و کۆتاییە کەشی حاڵ و ژیانـە،

بێگومان خوای گەورە کەسەکانی بۆ هەڵناوە و وەسفی جوانی بۆکردوون، ئەوەش بەڵگەیە لەوەی ڕێزی لێیان ناوە.

پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی: ((ذاق طعم الإيمان من رضى بالله ربا وبالإسلام ديناً وبمحمدً رسولاً))[1]، واتە (چێژی باوەڕی کردووە ئەوکەسەی ڕازی بێ بەوەی پەروەردگار خوای بێ و ئیسلام ئاینی بێ و محمدیش پێغەمبەربێ، هەروەها فەرموویەتی(ﷺ).((من قال حين يسمع المؤذن، وأنا أشهد أن لا إله إلاّ الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، رضيت بالله رباَ، وبمحمد رسولاً، وبالإسلام ديناَ، غفر الله له ماتقدم مِنْ ذنبوبه))[2]، واتە: (هەرکەسێ گوێ لە بانگ بێژ بوو بانگی داو ووتی: منیش شایەتی دەدەم جگە لە(الله) خوایەکی ترنیە و تاکە و بێ هاوەڵە وشایەتیە دەدەم محمدیش بەندە ونێردراوی خۆیەتی و ڕازیم بەوەی (الله) پەروەردگارمە و محمدیش پێغەمبەرمە(ﷺ)، ئیسلامیش ئاینمە، ئەوە خوای گەورە لەتاوانی پێشوی خۆشە دەبێ).

إبن القيم دەڵێ: ئەم فەرموودەیە پلەو پایەکانی ئاینشیان لەسەر دەوەستێ و لەوێشدا کۆتایی دێت، چونکە ڕازیبون بەپەروەردگاری و تاکی خواو ڕەزامەندبوون بەپێغەمبەرەکەی و ملکەچی بوون بۆی و ڕازی بوون بەئاینی خوایان لەخۆگرتووە، هەر کەسێکیش ئەو چوار شتەی تێدا کۆ بۆوە، ئەوەبەڕاستی ڕاستگۆیە(الصديق)، لە بانگەشەو زماندا ئاسانە، لەڕاستەقینەیی وتاقیکردنەوەشدا قورسترین کارە، بەتایبەت گەر یەکێ پێچەوانەی ئارەزووی دەرونی بجولێیەوە، لەوەشدا ڕوون بۆتەوە ڕزامەند بوون (الرضا) زمانی پێ دێتە قسە، لەزمانیایەتی نەك لەماڵیدا.

- ڕازیبون بەخوایەتی خوا: ڕازیبون بەخۆشەویستی تاکی خۆی و ترس و گەڕانەوەو ڕەجا پێ کردنی و هێزی وویست و خۆشەویستی تەنیا بۆخوا بگەڕێتەوە لەخۆ ئەگرێ، پەرستن و دڵسۆزی بونیش لەخۆئەگرێ.

---

١ ـ مسلم، رقم: ٤٣(١/٦٢).

٢ ـ مسلم، رقم: ٣٨٦(١/ ٢٩٠).

ـ ڕازیبون بەپەروەردگاریەتی خوا: ڕازیبون بەوەی خوا بۆ بەندەکەی ڕێکخستووەو پشت پێ بەستن و ممتمانە پێکردنی لەخۆئەگرێ، پێویستە ڕازی بێ بەگشت ئەوەی خوا ڕای ئەپەڕێنێ، بۆیە یەکەم شت ئەوە لە خۆ ئەگرێ، کە خوا فرمانی پێ دەدا، دووەمیش: ڕزامەندی لە خۆ دەگرێ بەگەشت ئەوەی بۆی دیاری کردووە.

ـ ڕازیبوون بە پێغەمبەرەکەی: تەواوی ملکەچبوون لەخۆ دەگرێ بەجۆرێك لەخۆی خۆشتری بوێ و پایەکەی لەمرۆڤەکانی تر بەرزتر ڕابگرێ و کەس بەشداری پایە و تایبەتمەندیەکەی نەکات، لەوەوە شت وەربگرێ و ئەو بکات بە دادوەر و کەسی تر نەکاتە دادوەرو، هیچ کات بەبڕیاری کەسی تر ڕازی نەبێ، گەر لەوەدا بێتوانا بوو ئەوە بڕیاردانی کەسانی تر وەکو خواردنی ناچاری بێ جگە لەگۆشتی مردارەوە بوو خوێن نەبوو، باشترین حاڵەتی: وەکو خۆڵ وەهابێ، کە لە نەبوونی ئاوی پاکدا بەکار دەهێنرێ.

ـ ڕازیبوونیش بەئاینەکەی، ئەوە ئەگەر ووتی: یان بڕیارێدایان فرمانیدا یان ڕێگری کرد ئەوە بەگشت ڕازیبونێك وشتێکی لەدڵدا نەمایەوە تەواو بۆی ملکەچ بوو، ئەگەر چی پێچەوانەی دەروون و ئارەزوویان قسەی پێشەوا و مامۆستاو کۆمەڵەکەشی بێ[1] ...ووتی: ... ڕازیبون کۆتا پشت پێ بەستنە، هەرچ کەسێکیش پێکانی دامەزرا لەپشت پێ بەستن و ملکەچ بوون، ئەوە گەیشتۆتە ڕەزامەندی، بەڵام لەبەرگەورەیی خوا و بەدەمەوەچونی زۆربەی دەرونەکان بۆی و قورسبونی بەسەریانەوە، لەبەزەیی خۆیدا بەسەریانەوە پێویستی نەکردووە و ئەو قورسی و سەختییەی لەسەر هەڵگرتوون، بەڵکو شوێنکەوتووانی هەروەها ڕایگەیاندووە، کە پاداشتی خوا ڕازیبوونە لەبەرامبەریان گەورەتر و پیرۆزترە لەبەهەشت و ئەوەی تیایدایە، ئەوەی لەپەروەردگاری ڕازی بێ، خواش لێ ی ڕازیە، بەڵکو ڕازی بوونی بەندە لەخوا لەئەنجامی ڕازیبونی خوایە لەبەرامبەری، بۆیە ڕازیبوو ڕەزامەندی دەرگای گەورەی خوا و بەهەشتی دونیا وحەسانەوەی عاریفان و ژیانی خۆشەویستیان و ناز و نیعمەتەکانی لەخواترساوەکان و گلێنەی چاوی تامەزرۆیانە.

## چۆن ڕەزامەندی دێتە دی؟

---

١ ـ مدارج السالكين(٢/ ١٧٢ ـ ١٧٣) صلاح الأمة في علو الهمة(٤/ ٤٩١، ٤٩٢).

گەورەترین هۆی وەدەست هێنانی ڕەزامەندی: ئەوشتە وەربگرێ، کە خواڕەزامەندی تێدایە، بێگومان ئەوەش ئەیگەیەنێتە پلەی ڕازیبون.

به یەحیای کوڕی موعازیش ووترا، چ کات بەندە دەگات به پلەی ڕازیبون ؟ ئەویش ووتی: گەر دەروونی لەسەر چوار بنچینە دامەزراند بەوەی پەروەردگاری مامەڵە ی پێ دەکات و دەڵێ: گەر بۆم ببەخشی قەبوڵمە، گەرلێشم بگریتەوە ڕازیم، گەر وازم لێ بێهینێ ئەتپەرستم، بانگشیم بکەی بەدەم داوەتتەوە دێم.

جونەیدیش دەڵێ: ڕازیبوون (الرضا)ساغی زانستی گەیشتوە بەدڵ، گەر ڕاستەقینەی زانست موژدەی دایە دڵ و دڵیش پێشوازی کرد، ئەوە ئەگەینێتە ڕازیبون، ڕازیبوون و خۆشەویستیش وەکو ڕەجاو ترس نیە، چونکە ڕازیبوون و خۆشویستن دوو شێوە ژیانی خەڵکی بەهەشتن، لەدونیا و بەرزخ و ئاخیرەتیشدا لەوکەسەنابنەوە، کە خۆیانیان پێ پۆشیوە، پێچەوانەی ترس و ڕەجاکردن، چونکە بەگەیشتنی خەڵکانی بەهەشت و گەیشتن بەو ئومێدانەی لێ ی ئەترسان ئەڕەوێنەوە، گەرچی هەمیشە ڕەچاو کردنیان بۆگەورەییەکەی بووە، بەلاّم جیاوازیشە لەڕەجایەك گومانایە، بەڵکو ڕەجایەکە متمانە دارە بەبەڵێنێکی ڕاستگۆیانە لەلایەن خۆشەویستێکی توانا دارەوە، بۆیە ڕەنگ و ڕەجایان لەدونیادا بەو جۆرەیە.

إبن عەتائیش دەڵێ: ڕازیبوون ئارامی دڵە بۆ هەڵبژاردنیکی پێشوتری خوا بۆبەندەکە باشتری بۆ هەڵبژاردووە، ئەویش پێ ی ڕازیە.[1]

هەندێ لەعاریفانیش ووتویانە: هەرکەسێ پشت بەخوا ببەستێ و بەقەدەری خوا ڕازیبێ، ئەوە باوەڕی دامەزراندووە و دەست و قاچەکانی بۆ وەرگرتنی چاکە ئاوەلاّکردووە، ئەو ئەخلاقە جوانانەی ڕاپەڕاندووە، کە کاروباری عەبدی جوان و شیاو کردووە، ڕازیبوون(الرضا) دەرگای ڕەوشت جوانی لەگەڵ خوا و خەڵکیدا دەکاتەوە، چونکە ڕەوشت جوانی لەڕزایبوون، ڕەوشت ناشیرنیش لە توڕەیی وناڕەزاییە.

---

١ ـ مدارج السالكين(٢/ ١٧٢ ـ ١٧٣) صلاح الأمة في علو الهمة(٤/ ٤٩١، ٤٩٢).

ڕەوشت جوانی خاوەنەکەی دەگەیەنێتە پلەی ڕۆژ و گر، ڕەوشت ناشرینیش چاکەکان لەناو دەبات، هەروەکو چۆن ئاگر گژوگیاو دار دەسوتێنێ، ڕازیبوون خۆشحاڵی دڵ وەبەر دەهێنێ بەئەندازەی کاروبارەکان و دەروون پاکی و دامەزراویەکەی لەگشت حاڵەتێکدا، بۆیە هەندێ لەعاریفان ڕازیبونیان ناوبردووە بە ڕەوشت جوانی لەگەڵ خوا، وەهانەکات لەموڵکی خۆیدا ڕەخنەگرتن لەخوا بیگرێ و، نەهێشتنی زیادەڕەوی لەقسەدا ڕەوشت جوانی نبووت دەکات.[١]

شاعیریش دەڵێ:

العبد ذو ضجرو الرب ذو قـدر — والدهر ذو دول والرزق مقسومُ

والخير أجمع في ماختار خالقنا — وفي اختياره سواه اللّومُ والشّومُ

شاعیر دەڵێ:

إذ ارتحل الكرام إليك يومـاً — ليلتمسوك حالاً بعد حال

فإن رحالنا حطت لترضـى — بحلمك عن حلول وارتحـال

أنخنا في فنانك يا إلهـي — إليك معرَّضين بلا اعتلال

فسُسْنا كيف شئت ولا تكلنا — إلى تدبيرنا ياذا المعالي[٢]

ئەمەش هەندێ واتایەلە پلەی ڕازیبون لەقسەی ئەمیری ئیمانداران حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) ڕون دەبێـەوە کاتێك وتوویەتی: هەرکەسێ لەجوان هەڵبژاردنی خوا ناڕازی بێ، ئەوە باخۆزگە نەخوازێ لەجگە لەو حاڵەتەدا بێ کە خوا بۆی هەڵبژاردووە و ئەوەش سنوری وەستانە لەبەردەم ڕازیبوندا بەوەی قەزا کردوویەتی.[٣]

---

١ ـ صلاح الأمة (٤/ ٥١٢) نقلاً عن مدارج السالكين.

٢ ـ صلاح الأمة في علو الهّمة(٥٢٩/٤).

٣ ـ البداية والنهاية (١١/ ١٩٩).

٣- ئەمیری ئیمانداران حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) دەڵێ: لە بارەی برایەکمەوە هەواڵتان پێ ئەدەم گەورەترین کەسە لەبەر چاومدا، ئەوەی لای من گەورەی کرد بچووکی دونیا بوو لە چاوەکانیدا، لە دەرەوەی دەسەلاّتی زگیدا بوو، ئەوەی نەیبوایە ئارەزووی نەدەکرد، ئەگەر هەشیبوایە زۆری نەدەکرد، لە دەرەوەی دەسەلاّتی داوێنیدا بوو، ژیری و بۆچوونی بۆ کەچ نەدەکرد، لە دەرەوەی دەسەلاّتی نەفامیدا بوو، بە پێی متمانەی سوود هەنگاو و دەستی ڕەوان نەدەکرد، تووڕە نەدەبوو لە تێکەڵ بوونی لەگەڵ زانایاندا گوێبیستی دەکرا، بەسەر قسەدا زاڵ بوایە بەسەر بێدەنگیدا زاڵ نەدەبوو، زۆری بێدەنگ بوو، گەر قسەی بکردایە قسە بێژان بێدەنگ دەبوون، لە مشت و مڕدا دەستی وەر نەدەدا، بەڵگە و پاساوی نەدەهێنایەوە تاوەکو وەك دادوەر ببینرێت، لە براکانی بێئاگا نەدەبوو، بەوەی لۆمەی بکەوتایەتە سەر وەکو ئەو سەرزەنشتی کەسی نەدەکرد، گەر بکەوتایەتە نێوان دوو کارەوە نەیدەڕوانیە ئەوەی کامیان نزیك بە(حق)ە، بەڵکو دەیڕوانیە ئەوەی کام لەم دوو کارە نزیك بە ئارەزوویەتی بۆیە پێچەوانەی ئەوەی دەکرد کە ئارەزووی لێی هەبوایە.[1] لەم ووتە زێرینەدا ڕینشاندەری و ڕوونکردنەوە و ئاڕاستەی خەڵکی ڕووەو سیفەت گەلێکی پیرۆز ڕەوشت گەلێکی جوان دەرەکەوێت، ئەوەش بەرنامەیەکی بەرزو بڵندە پێویستە خۆمان و نەوەکانمانی لەسەر پەروەردەبکەین، تا دەگوازرێتەوە واقعیکی هەست پێکراو لەژیانیدا، لەم ووتەیەشدا وانەو پەندگەلێکی لێ فیردەبین کەئەمانەن:

ـ ووتەی حسن (ﷺ) ئەوەی ئەو برایەی لەچاوانماندا گەورە کرد، بچوکی دونیا بوو لەچاویدا[2]، دونیا تەنیا لەچاوی کەسانێکەوە بچوك دەبێتەوە، کە ڕاستی ڕووداوەکان بزانێ، وتێڕوانینی ڕاستی لەبەرامبەر خواو ژیان و گەردوون وبەهەشت و دۆزەخ و قەزا و قەدەر دامەزراوە و بەتێگەیشتنەوە خۆی ئامادەکردووە بۆ لای خوا و دڵنیا بووە کە دونیا شوێنی تاقیکردنەوەیە وکێڵگەی ئاخیرەتە، بۆیە خۆی ملکەچی پەروەردگاری دەکات و بەکۆمەڵە ڕاستەقینیەك گەیشتووە لەدڵیدا گیرساوەتەوە و هاوکاری زاهیدی بوونی کردووە لەدونیادا، لەو ڕاستەقینانەش ئەمانەی خوارەوەیە:

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (١١/١٩٩).

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

* دڵنیایی تەواو بەوەی ئێمە لەم دونیایە دا لە ڕێبوارێك دەچین، هەروەکو پێغەمبەرفەرموویەتی: ((کن في الدنیا کأنك غریب أوعابر سبیل))،[1] واتە: ((لەدونیا بژی وەك ئەوەی غەریبی یان ڕێبوارێکی)).

* ئەم دونیایە جگە لەگوێڕایەڵی خوا، لای خوای گەورە هیچ بەهایەکی نیە، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لوکانت الدنیا تعدل عند الله جناحَ بعوضةٍ ماسقی کافراً مِنها شُربة ماءٍ))[2]، واتە: (گەر دونیا لای خوای گەورە نرخی باڵە مێشوولەیەکی هەبوایە، خوای گەورە قومە ئاوێکی نەدەدا بەکافر).

هەروەها فەرموویەتی: ((الدنیا ملعونة، ملعون فیها الا ذکر الله وما والاه أوعالماً أو متعلماً))[3] واتە: (دونیا نەفرەت لێکراوە، جگە لەخوا و ئەوەی جوان بیّ بۆی و یان زانا و فێرخوازێك بێت هەرچی تیابیّ نەفرەت کراوە).

* تەمەنی دونیا نزیکی کۆتایی بۆتەوە، چونکە فەرموویەتی: ((بُعِثْتُ أنا والساعة کهاتین))، واتە: (هاتنی من و ڕۆژی قیامەت وەکو ئەم دوانەیە)، ئاماژە ی بۆ پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەڕاست کرد[4]، قیامەتی مرۆڤ بەمردنی دەست پیّ دەکات و تەمەنیش کورتە، گەر تەمەنی منالّی و خەو وپیری لیّ دەربکەین، ماوەیەکی پوختمان بۆ نامێنێتەوە.

* ئاخیرەت مانەوەو نەمریە، شوێنی گیرسانەوەیە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، ئیماندارێکی ئالی فیرعەون و دەڵێ: ﴿یَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَیَاةُ الدُّنْیَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ (٣٩) مَنْ عَمِلَ سَیِّئَةً فَلا یُجْزَى إِلَّا مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ یَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ یُرْزَقُونَ فِیهَا بِغَیْرِ حِسَابٍ﴾[ غافر:٣٩، ٤٠].

---

١ ـ الترمذي، کتاب: الزهد رقم: ٢٣٣٣وهو حدیث صحیح.

٢ ـ الترمذي، کتاب: الزهد رقم: ٢٣٢٠.

٣ ـ الترمذي، کتاب: الزهد رقم: ٢٣٢٢ وقال: حسن غریب.

٤ ـ مسلم، کتاب: الفتن وأشراط الساعة. رقم: ١٣٢ ـ ١٣٥.

به ڕاستی گەر ئەو ڕاستیانە لەدڵی مرۆڤی موسڵماندا گیرسایەوە ئەوە دونیا لەچاوانیدا بچووك دەبێتەوە.

* ووتەی حسن(ﷺ) لە دەرەوەی دەسەڵاتی سکیدایە و ئارەزووی لەوەیە، کەهەیەتی و گەر هەیشی بێ زۆری ناکات[1]، لەم ئاڕاستیە دا بانگەوازێکە بۆ وازهێنان لە زۆرخۆری، چونکە هۆکارە بۆ جۆریکی زۆری خواردنەوە و دەست و پەنجەکان ڕووەو خراپەکاری و سەرپێچی ئەبزوێنێ و گوێڕایەڵیکردنەکانی بۆ خوا لەسەر قورس و گران ئەکات، ئاخۆ چەند تاوان تێر بوون و زۆر خۆری هۆکاری بووە، بێگومان هەرچ کەسێك لەتووشی خراپەی سکی هاتبێ خۆی بپارێزێ، ئەوە لە خراپەیەکی گەورە ڕزگاری بووە، شەیتانیش ئەو مرۆڤانە ئەجوڵێنێ کەسکیان بەخواردن پڕبووە[2]، بۆیە خوای پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی شوێن شەیتان و فڕوفێڵەکانی نەکەوین، کە دەبێتە هۆی ستەم و هەڵچوون بەحەڵاڵ ڕازینەبوون، بۆیە خوا دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلالاً طَيِّباً وَلا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾[ البقرة: ١٦٨].

هەروەها خوای گەورە ڕێنمایی کردووین بۆ زێدە ڕەوی نەکردن لە خواردن و خواردنەوە، تاوەکو نەبێتە مایەی زاڵ بوونی ئارەزوو(شهوة)، لە ئایەتێکی تر فەرموویەتی: ﴿ يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴾[الأعراف: ٣١].

ئەوەی کە بەڵگەی شەهوەتی زاڵبوونی ئەوەیە لە سەرووی پێویستی ئەو کەسەیە خواردن و خواردنەوە زۆربکات ولە تێری زیادەڕەوی بکات، بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی کردۆتە مەترسی زیادەڕەوی (الإسراف) وزیانەکانی لەسەرجەستەو دەروونىدا لەو فەرموودەیەی ترمذی لە مقدامی کوڕی معدی کرب ڕیوایەتی کردووە، لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستویەتی: ((ماملأ ادمي وعاء شراً من بطنه، بحسب إبن آدم أكلات يُقمن صلبه، فإن كان لامحالة فثلث لطعامه، وثلث لشرابه، و ثلث لنفسه))[3]، لەم فەرموودە

---

١ ـ البداية والنهاية (١١/ ١٩٩).

٢ ـ جهاد النفس ، علي الدهامي، لا ٩٣.

٣ ـ الترمذي، كتاب الزهد، رقم: ٢٣٨٠، حديث حسن صحيح.

پیرۆزەشدا ڕونکردنەوەی ئەوبەرنامە ڕاستەیە، کە پێویستە پێیەوە پابەندبین لەکەمکردنەوە لەخواردنەوەو زیادەڕۆیی نەکردن لەئارەزووی سك دا، چونکە ئەو زیادە ڕۆییە مرۆڤ تووشی خراپەیەکی گەورە دەکات، مەبەست لەو خراپەیەش لێرەدا تەنیا ئەوەنیە پەیوەست بێ بەنەخۆشیەکانی گەدەوە، بەڵکو مەبەست ئەو شەڕەو خراپەیەشە تووشی مرۆڤ دێت لەوکاتەی خو بەوخراپەیەوە دەگرێ لەخواردن و خواردنەوە و پابەند بوون پێیەوە، لەوەشدا خواردن لەئامرازێکی خۆراکی و بەهێز کردنی لاشەیەو دەبێتە ئامانج و خاوەنەکەی لەپێناویدا هەوڵدەدات، ئەو تەقەلایەش سەرقاڵی دەکات و لەکاروبارەکانی دایدەبڕێت و دەیخاتە پەژارەوە، هەرچ کاتێکیش سکی تێربێ دەرونی تێرنابێ، چونکە شەهوەتی سك پێوەری بەختەوەری لا نەهێشتووە.[1]

بۆیە زیادەڕەویانەی خواردن و خواردنەوە تەنیا زۆر خواردنی ناگەیەنێ، چونکە زۆر خواردنی نیشانەیەکی دیاری ئەو نەخۆشیەیە، بەڵکو ڕاستەقینەیی ئەو نەخۆشیەش خراپیەکەیەتی لە دەروون و مادیەتی دەروون و گۆڕینی خواردنە لە ئامرازەوە بۆ ئامانج، تاوەکو مرۆڤ وەکو ئەو ئاژەڵانەی لێ دەکات، کە ئارەزووەکانیان ڕێگەیان پێ دەگرنە بەر، لەو بارەیەوە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوىً لَهُمْ﴾ [محمد: ١٢] بخاری ومسلیم لە إبن عمرەوە ئەویش لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕیوایەتیکردووە، کە فەرموویەتی: ((الكافر يأكل في سبعة أمعاء والمؤمن يأكل في معي واحد))،[2] واتە: (بێباوەڕان لەحەوت گەدە و ڕیخۆڵە ئەخوات و باوەڕداریش لەیەك گەدە). واتای ئەو فەرموودەیەش ئەوە ئەگەیێنێ ئیمانداران، خواردن کەمبکەنەوە بەمەبەستی سەرقاڵبون بە پەرستن، بێباوەڕیش پێچەوانەی گشت ئەوەیە و زۆر خۆرن، چونکە پاشکۆی ئارەزووی دەروونیێتی، لەشوێنکەوتنی حەڕامدا نەترسە، گەر کەمیش بخوات ئەوە بۆدونیا بە کەمگرتنی نیە، بەڵکو بۆچاودێری لەش ساغیە، لەبەر سەختی پێداگیریەکەی لەدونیا وەکو ئەوەیە لەحەوت ڕیخۆڵە و گەدەوە بخات، ئیمانداریش لەیەك گەدەوە بخوات، هەروەکو دەوترێ: فلانەکەس دونیا بە تێکەڵەیەك (پاروویەك) ئەخوات و ئیمانداریش لەیەك گەدەوە ئەخوات. پێغەمبەر(ﷺ)ئەم نمونەی هێناوەتەوە

---

١ ـ أمراض النفس، د. أنس كرزون، لا ١٠٩.

٢ ـ مسلم، رقم: ٢٠٦٠.

بۆئیمانداران زوهدەکەی لەدونیاو وپێداگیری بێباوەڕان لەبە دەست خستنی دونیـادا[1]، نەوەویش (ڕەحمەتی خوای لێ بێـت) واتایـەکی تـری لـەم فەرموودەیـە وەرگرتـوە دەڵـێ: ووتراوە: مەبەست بەو حەوتە، حەوت سیفەتە، سور بوون و خراپیەکەی، ئومێـد درێـژی و تەماحکاری، تەبیعەت خراپی، ئیرەیی و، قەڵەوی.[2]

إبن القەیم دەڵێ: لەخودی خۆیدا وەکـو حەڕامەکانـە، دووەمـیش ئـەوەی بەئەنـدازەی سـنوور بەزاندنەکـەی وەکـو زیـادە ڕەوی لـەخواردنی حـەڵاڵ و زۆر خۆریـدا، ئەوەیـە لـە گوێڕایـەڵی خـوا سیـست و تەمبـەڵی دەکـات بەسـکیەوە سـەرقاڵی دەکـات و لـەپێناو تێرکردنیدا تێبکۆشێت، گەر وەدەستیشی هێنا ئەوە بە سەرقاڵیەکەیەوە سەرقاڵی دەکـات و، زیانەکانی ئەچێنێتەوە، ئارەزووەکانی زیاددەکات و ڕێڕەوی شەیتانی لەسەر دەکاتـەوە، چونکە شـیطان لەناو بۆڕی خوێنی ئادەمیزاد دا ئەگەڕێ، بۆیە ڕۆژانە ئەو بۆریـەی لەسـەر تەسك دەکاتەوە و دەرگای لێ دادەخـات و زۆر خـۆریش دەرگـای بۆدەکاتـەوە و فراوانـی دەکات، هەرکەسێکیش زۆر بخوات، زۆریش ئەخواتەوە زۆریش ئەخەوێ و بەمـەش توشـی زیان دەبێت.[3]

حسن(رضي الله عنه) دەڵـێ: لەدەسـەڵاتی داوێنـی ئـازدا بـوو، ژیـری و بۆچـوونی بـۆ ملکـەچ نەکردووە[4]، حسن (رضي الله عنه) بانگەواز بۆ بڕیاری ژیرانـە دەکـات لـەئاروزووی داوێـن پیـسی ڕزگار بن، مرۆڤ بەوە ئارەزووی خۆی تێربکات، کە خوای گـەورە بـۆی دانـاوە، ئیـستاش هەڵچوونی ئارەزووی داوێن ئەنجام گەلێکی ترسـناکی هێناوەتـە ئـاراوە، وەکـو دڵڕەقـی و لاوازی باوەڕ، هەرچ کاتێك ئارەزووی داوێن بـۆ ڕژان هەڵـچێ، ئـەوە دڵ زۆر ڕەق دەبـێ و تاریکی و ترسی زۆری لێ دەنیشێ ئەوەش بە نەزەر دەست پێ دەکات، کە خـوا حـەڕامی کردووە، پاشان تێکەڵ بوونی هەردوو ڕەگـەز ئـەوەی دواتـریش لـەوەی ژنـان وەك پیـاوان خۆیان پشان دەدەن لەبەرگ، پیاوانیش ژن ئاسا خۆیان دەردەخەن، ئەو ئەنجامـەی دیکـەش

---

١ ـ فتح الباري شرح البخاري (٩/ ٥٣٨ ـ ٥٣٩).

٢ ـ شرح النووي على صحيح مسلم (١٤/ ٢٣).

٣ ـ مدارج السالكين (١/ ٤٥٨ ـ ٤٥٩).

٤ ـ البداية والنهاية(١١/ ١٩٩).

لەئاسایی بوونی خراپەکاری و ڕەخساندنی تـا تـووش بـوون و لەوەشـدا نەخۆشـی لەدڵـدا دەگیرسیتەوە و باوەڕی ڕاستەقینەش لێ دوور دەکەوێتەوە.

ڕاستی ئەوەش فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ): ((لايزني الزاني حين يزنـي وهـو مـؤمن، ولا يـشرب الخمـر حـين يـشربها وهـو مـؤمن))[1]، بخـاری لەڕیوایـەتێکی ئـەم فەرموودەیەدا دەڵێ: واتە لەکردنی داوێن پیسی و خواردنەوەی عەرەقدا باوەڕی تەواو نیە، لە ئەبو هورەیرەوە(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا زنى العبد خـرج منه الإيمان، فكان فوق رأسه كالظلة ـ فإذا خرج من ذلك العمل رجع إليه الإيمـان))[2] واتە: (گەریەندە داوێن پیسی کرد ئەوە باوەڕی تیادا نامێنێ وبەسەریەوە وەك سـێبەرێك وایـە، گەر لەوکارە دەستی هەڵگرت ئەوە باوەڕی بۆ دەگەڕێتەوە).

لە ئەنجامەکانی هەڵچوون و سنور بەزاندنی داوێندا، زۆرکەوتنە تاوانە، چـونکە تـاوان سەرپێچیە گەرچی بچوکیش بێت ئەوە سەردەکێشی بۆشوێن کەوتنی سەرپێچی ترو تاوەکو ئاسان دەبێت و کەسەکەش مەترسیەکەی نازانێ، نەزەر پەلەکێشی بۆبیرکردنـەوەو لەدڵـدا شت دروست دەکـات و، ئـارەزوو دەجـوڵێنێ و ئـەوەش دەبێتـە مایـەی پێـداگیری بـوون لەکرداری ناشیرین، گەر هۆکارەکانی ئاسان بوون ئەوە دەکەوێتە تاوانەوە، بۆیە نـەزەر وەك پێشەکیەك لەپێشەکیەکانی داوێن پیسی دانراوە و دەرگایەکە بۆگەیـشتنە زینـا. موسـلیم لەأبوو هوڕیڕەوە(ﷺ) ڕیوایەتی کردووە، کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ((كُتـبَ على إبن آدم نصيبه مـن الزنـى، مـدرك ذلـك لامحالـة، فالعينـان زناهمـا النظـر، والأذنـان زناهما الإستماع، واللسان زناه الكلام، واليد زناها البطش، والرجل زناهـا الخُطا، والقلـب يهوى و يتمنى، ويصدق ذلك الفرج أو يكذبه)).[3] واتە: (هەموو نەوەی ئادەمێك پـشکی زینای بۆ نوسراوە، کە ڕزگار بوونی لێ نیـە، زینـای چـاوەکان ڕوانیـە نامـەحرەم، زینـای گوێچکەش بیستنی شتی خراپ، زینای زمان قسەی خراپە، زینای دەست ستەمە، زینـای قاچەکانیش هەنگاونانە، بەدەمەوە چون و ڕەتکردنەوەی ئەوەش داوێنە).

---

١ ـ البخاري، كتاب الحدود(٨/ ١٣) مسلم، رقم: ٥٧.

٢ ـ صحححة الحاكم في المستدرك(١/ ٢٢) ووافقه الذهبي.

٣ ـ مسلم، رقم: ٢٦٥٧.

لەوەشدا دزە کردنی سەرپێچی بۆدڵی بەندە بە پلە و لەسەر خۆیەیە و کاریگەری دەخاتە سەر تاوەکو بێ دەر بەستی دەکات، یان بێتوانای دەکات لە دەست هەڵ گرتن لەو کارە و داوای زیاتریشی دەکات.[1]

لەوەدا إبن القەیم دەفەرمووی: بەڕاستی سەرپێچیکردن و هاوشێوەکانی دەچێنێ و یەکتر دێننە بوون تاوەکو وازلێ هێنان و لێ دوورکەوتنەوە لەسەر بەندە سەخت دەکات...تاوەکو دەبێتە نیشانە و سیفەت گەلێك لە و کەسە ڕەگ دادەکوتێت، گەر تاوانبارەکەش لەسەرپێچی وازی هێناو بۆ گوێڕایەڵیکردنی خوا هەنگاوی هەڵگرت، باری قورس دەبێ تابگەڕێتەوە باری جارانی، بۆیە زۆرێك لەفاسیقەکان بێ چێژ وەرگرتنێك تاوان دەکەن و پێویستیشیان نیە، تەنیا ئەوە نەبێ بەنەکردنی تاوانەکە تووشی ئازاردەبن.[2]

لەئەنجامی سنوور بەزاندی شەهوەتی داوێن نەمانی ئابڕووە، گەر بەندە لە ئەنجامی سنور بەزێنی ئارەزووی داوێندا بەتاوان خوی پێوەگرت، ئەوە دەگاتە حاڵەتێك گوێ ناداتە ئەوەی خەڵك ببینێ، بەڵکو زۆرێك لە کەسە خراپەکارەکان باسی ئەوخراپە کاریەی خۆیان بۆخەڵکی دەکەن و شانازی پێوە دەکەن، چونکە لەشەرمیان نەماوە.

بەوشێوەیە دەبینین کەسستی نواندن و ئاسان ڕوانیین لەخۆپاراستنی ئارەزووی داوێن لەلادان گەرچی کەمیش بێت، کەم کەم ڕوەو ترسناکی دەڕوات و دەکەوێتە داوی سنور بەزاندنی ئەو ئارەزووەی کە لەنەهامەتیەکانی ڕزگاری نیە، لەکۆتاییشدا ڕەق کردن و تاوانبارکردنی دڵی تاوانبارەکەیە و داڕنینێتی لە ڕەوشتە جوانەکان، سەرباری ئەو نەخۆشیە دەرونی و لاشەییەی کە توشی دەبێ.[3]

بێگومان ئیسلامیش ڕێوشوێن گەلێکی خۆپارێزی لەسنور بەزاندنی ئارزووی داوێن داناوە لەوانە:

---

١ ـ أمراض النفس،لا ١٢١.

٢ ـ الجواب الكافي، لا ٥٩ ـ ٦٠.

٣ ـ أمراض النفس، لا ١٢٣.

* چاو داخستن و عەورەت داپۆشین:

لەبەرئەوەی ئەو ڕێگەیەی تیری شەهوەتی لێوە دەگاتە دڵ، چاوە، بۆیە خوای گەورە فرمانی بە بەندەکانی خۆی داوە لە ئاست ئەوەی لەسەریان حەرامە چاو دابخەن و خۆیان داپۆشن، خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾[ النور: ٣٠].

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((لاينظر الرجل إلى عورة الرجل ولا المرأة إلى المرأة، ولا يفضى الرجل إلى الرجل في ثوب واحد ولاتفضى المرأة إلى المرأة في ثوب الواحد)).[١] واتە: (پیاو نەڕوانێتە عەورەتی پیاو ژنیش نەروانێتە عەورەتی ژن و پیاویش لەگەڵ پیاوێکی تر لەیەك بەرگدا نەبن و ژنیش وەها).

إبن القيم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خوای گەورە چاوی کردۆتە ئاوێنەی دڵ، گەر بەندە چاوی داپۆشێ، ئەوە دڵیش ئارەزو ویستی دادەپۆشێ، گەر چاویشی جوڵا ئارەزووشی دەجولێ.[٢]

هەروەها دەفەرموێ: (ڕوانین کار لەدڵ دەکات، کە تیر لەکەوان نایکات، گەرنەیکوژێت ئەوا برینداری دەکات، وەکو پرشکی ئاگر وایە فڕێی دەیتە نێو گژوگیای ووشکەوە، گەر هەموو گژوگیا کە نەسوتێی هەندێکی دەسوتێ، ووتراویشە:

كل الحوادث مبدأها من النظر ... ومعظم النار من مستصغر الشرر
كم نظرة فتكت في قلب صاحبها ... فتك السهام بلا قوس ولا وتر
والمرء مادام ذاعين يُقلّبها ... في أعين الغير موقوف على الخطر
يَسُرُّ مقلته ماضر مهجته ... لامرحبا بسرور عاد بالضرر.[٣]

---

١ ـ مسلم، رقم: ٣٣٨.

٢ ـ روضة المحبين، لا ١٠٩.

٣ ـ روضة المحبين،لا ١١٤.

واتـه: (هـەموو ڕووداوەکـان دەسـتپێکەکانیان تەماشـاکردنە، زۆربـەی ئـاگریش لـە پریشکێکی بچوکەوە دروست دەبـێ، ئـاخۆ چـەند ڕوانـین دڵـی خاوەنەکـەی پارچەپارچە کردووە، وەکو بریندارکردنی تیر. مرۆڤیش تاوەکو چاوی هەیەو دەسوڕێتەوە، ئـەوە لەسـەر مەترسی وەستاوە، چاو تروکەکانی بەلاوە دڵخۆشکەرە، دەك بەخێر نەیەت ئەو خۆشحاڵیە کە بەزیان دەگەڕێتەوە).

* تێکەڵ بوونی ژن و پیاو حەڕامەوە و، فرمان کردن بەباڵا پۆشی ئافرەتان:

بـۆ ڕونکردنـەوەی ئـەم بابەتـە ئایـەت گـەلێکی زۆر هـاتووە، لەوانـە خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا النَّبِـيُّ قُـلْ لِأَزْوَاجِـكَ وَبَنَاتِـكَ وَنِـسَاءِ الْمُـؤْمِنِينَ يُـدْنِينَ عَلَـيْهِنَّ مِـنْ جَلَابِيـبِهِنَّ ذَلِـكَ أَدْنَـى أَنْ يُعْـرَفْنَ فَـلا يُـؤْذَيْنَ وَكَـانَ اللَّـهُ غَفُـوراً رَحِيمـاً﴾[الأحـزاب: ٥٩] هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعـاً فَاسْـأَلُوهُنَّ مِـنْ وَرَاءِ حِجَـابٍ ذَلِكُـمْ أَطْهَـرُ لِقُلُـوبِكُمْ وَقُلُـوبِهِنَّ﴾ [الأحـزاب: ٥٣] بخـاری و موسـلیم لـە عقبـەی کـوڕی عـامرەوە (ﷺ)ڕیوایەتیان کـردووە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ((إیـاکم والـدخول علـی النـساء))، واتە: (وریاو ئاگاداربن، کە بچنە لای ژنان و تێکەڵیان بن و تـەنیا بمێننـەوە). پیـاوێکی ئەنـصاریش ووتـی: بـۆ بـرای مێـردیش؟ پێغەمبـەری فەرموویـەتی: ((الحمـو الموت)).[1] واتە: (بۆ شوبرا هەر مردنە. (حمو): شووبرا یان نزیکانی مێردە وەکو بـرازاو و ئامۆزاو ئەوکەسانەی کە مەحرەم نین، فەرموویەتی: بەوەی شوبرا هەر مردنە، واتای ئـەوە دەگەینێ، کە لە کەسی تر مەترسیدارترە، کە پێ بگات و لە تـەك ئافرەتەکـە بمێنێتـەوە، پێچەوانەی کەسی بێگانە بەئاسانی بەئافرەت ناگات.[2]

لە إبن عباس(ﷺ) ڕیوایەتیکردووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((لایخلو رجل بإمرأة إلا ومعهـا ذومحرم، ولاتـسافر المـرأة إلا مـع ذي محـرم)).[3] واتـە: (هـیچ پیاوێـك لەگـەڵ

١ ـ مسلم، رقم: ٢١٧٢.

٢ ـ شرح النووي على صحيح مسلم(١٤/ ١٥٣).

٣ ـ مسلم، رقم: ١٣٤١.

ئافرەتێکدا نەبێت، کە ئافرەتەکە مەحرەمی لەگەڵدا نەبێت وە ئافرەتیش بێ مەحرەم نابێ گەشت بکات و دوور بڕوات)).

هەروەها لە زۆرێك فەرموودەدا هەڕەشەی زۆر هاتووە لەو پیاوانەی خۆیان بە ئافرەت ئەچوێنن و ئەوئافرەتانەش خۆیان بەپیاو ئەچوێنن جل و بەرگ و هەڵسو کەوتدا، لەبەر ئەوەی وروژاندنی ئارەزوو و لادانی لێ دروست دەبێ، بخاری لەإبن عباس(رضي الله عنه) ڕیوایەتی کردووە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی لەو پیاوانە کردووە، کە خۆیان بەئافرەتان دەچوێنن و ئەو ئافرەتانەش، کە خۆیان بەپیاوان ئەچوێنن. [1]

* هەڵنان بۆ بە ڕۆژو بوون لەکپکردنەوەی شەهوەتدا:

گەر هاوسەرگیری ئاسان نەبوو هەروەها توانای هاوسەرگیری لەبەر دەستدا نەبوو، لەبەر هەر هۆیەك، ئەوە پێویستە مرۆڤ خۆی لە هەڵچون و دەسەڵاتی ئارەزوو(شەهوە) بپارێزێ، ئەوەش بە ڕۆژوو بوون دەکرێ، چونکە لە بەڕۆژوو بوندا ئارەزوو کەم دەبێتەوە و هەڵچوونی نامێنێ، ئەو ڕێنشاندەریەش لەو فەرموودەدایە، کە بخاری و موسلیم لەعبداللە کوڕی مەسعودەوە (رضي الله عنه) ڕیایەتیانکردووە فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((یامعشر الشباب من استطاع منکم الباء فلیتزوج، فإنه أغض للبصر، وأحصن للفرج، ومن لم یستطع فعلیه بالصوم فإنه وجاء)). [2] واتە: (ئەی کۆڵی گەنجان هەرکەسێ لە ئێوە دەتوانێ باژن بهێنێ، چونکە هۆیەکە بۆ چاو گرتن و، قەڵایەکە بۆ داوێن، ئەوەی ناتوانێ ژن بهێنێ ئەوا با بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو قەڵغانە)، ڕۆژوو دەتوانێ کاریگەریەکەی کەم بکاتەوە، بۆیە مرۆڤ گەر ئەو ڕێوشوێنە خۆپاراێزیانەی نەگرتە بەر و، پێیەوە پابەند نەبوو، ئەوە پێویستە تیری شەهوەت پەردەی دڵی بدڕێت، لەبەرئەوەی ئامادەیی قەبوڵکردنی ئەو لادانەی هەیە، لەوەشدا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەونەخۆشیە دا مەودا ئەکێشێ و ئارەزووەکەی دەگاتە ڕژان تاوەکو کەسەکە دەخاتە نێو بێ ئابڕوویی و سوکیەوە. [3]

---

١ ـ البخاري، کتاب: اللباس(٧/ ٥٥).

٢ ـ مسلم، رقم: ١٤٠٠.

٣ ـ أمراض النفس،لا ١٢٦.

بۆیە قسەی حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) لەدەروەی دەسەڵاتی داوێنییدایە و ژیری و بۆچونەکەی بۆ کەچ ناکات[1]، بانگەوازێکی ئاشکرا و ڕاشکاوانەیە بۆ دامرکاندنەوەی هەڵچونی شەهوەتی داوێن. وتەی حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه)

ئەگەر قسەبکات لەتەك زانایاندا بۆ قسەکردنی گوێدەگرێ. [2]

ئەوەش ڕێزی زانایان و سوود لێ وەرگرتنیانە، بۆیە ڕێز لێگرتنیان بەشێکە لەسونەت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ((ليس منا من لم يرحم صغيرنا و يؤقر كبيرنا، ويأمر بالمعروف وينهى عن المنكر ويعرف لعالمنا حقه))[3]، واتە: (ئەوکەسە لەئێمە نیە سۆزو بەزەیی بەبچوکەکانمان دانەیەتەوە، ڕێز لەگەورەکانمان نەگرێ و فرمان بەچاکە و ڕێگری لەخراپییەکان و مافی زانایانمان نەزانێ).

بێگومان پێشینانی ئەم ئومەتە زۆر ڕێزیان لەزاناکانیان گرتووە و لەوان ئەدەبیان وەرگرتووە وزۆر زانستخوازیش لەشێوازی قسەکردن سوودی زۆریان لە زانانیاندا بینیووە، وەك لەکتێبە ڕەوشتیەکانی زانا و فێرخوازەکاندا زۆرە، گرنگتر لەوەش ئەوەیە علی کوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه) دەڵێ: (مافی زانا ئەوەیە پرسیاری زۆری لێ نەکرێ و لەوەڵامدا تانە نەدرێ و گەر تەمەڵ ولاواز بوو پێداگری لەسەرنەکرێ و، گەر هەستا جل و بەرگی ڕانەکێشرێ، نهێنی نەخرێتە بەردەستی خەڵکی و غەیبەت نەکرێت، گەر هەڵەی کرد عوزری قەبوڵبکرێت، پێویستە لەبەر خاتری خوا ڕێزی لێ بگیرێت، لەبەرئەوەی ئاینی خوا دەپارێزێ و، لەپێشی دانەنیشی و گەر پێویستیەکی هەبوو پێش هەموو کەس خزمەتی بکەیت. [4] حسن دەڵێ: مافی زانا بەسەرتەوە ئەوەیە گەر چویتە لای بەتایبەتی سەلامی لێ بکەیت و لەکەسەکانی دیکەش سەلامێکی گشتی و بەدەستەکانت ئاماژەی بۆنەکەیت

١ ـ البداية والنهاية(١١/ ١٩٩).

٢ ـ هەمان سەرچاوەی (١١/ ١٩٩).

٣ ـ سنن الترمذي، رقم: ١٩٨٦ صححه إبن حبان، رقم: ١٩١٣.

٤ـ جامع بيان العلم وفضلة (١/١٢٩).

و چاوانت دانەگری، نەڵێ ی فلانەکەس پێچەوانەی قسەی تۆی هەیە، لە پرسیارەکردندا زۆر لێ مەکە، چونکە وەکو دارخورمایەکی تەڕ بەردەوام شتت بۆ بەردەداتەوە.[1]

عبدالرحمنی کوڕی مەهدی(ڕەحمەتی خوا لێ بێت)، دەڵێ: گەر زانایەك بەکەسێك بگەشتایە و لەوزانستدا لەسەرەوەی خۆی بوایە ئەو ڕۆژەی بەدەستکەوت دەزانی پرسیاری لێ بکات وشتی لێیەوە فێربێ، گەر بەکەسێکیش بگەشتایە کەسەکە لەزانستدا لەخوار خۆیەوە بوایە فێری دەکردو ڕێزدارانە مامەڵەی لەگەڵ دەکرد، گەر بەکەسێکیش بگەشتایە وەکو خۆی بوایە ئەوەبیری دەهێنایەوە.[2]

پێشینی چاکەکان باشترین نمونەیان هێناوەتەوە لەبارەی پێداگیری لەداواکاری وتێکۆشان بۆ وەرگرتن لەزانایان و گۆیگرتن وڕێزو حورمەت گرتنیان، ئەو چیرۆکانەشیان شایەتن، کە خەتیبی بەغدادی و کەسانی تر لەو بوارەدا باسیان کردووە.

ووتەی حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ): زۆربەی کاتی بێدەنگ دەبوو، گەرقسەی بکردایە قسە بێژان بێدەنگ دەبوون، لەبانگەشەکردن بەشدار نە دەبوو، لەسەر هیچ شتێك مشتومڕی نەدەکرد.[3]

حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) داوای دەکرد قسەکە کەم بکرێت و مشتومڕیشی پێ ناشیرین بوو، لەو فەرموودە دا هاتووە: ((إذا أصبح العبد فإن الأعضاء كلها تكفر اللسان، تقول: اتق الله فينا، فإنما نحن بك، فإذا استقمت استقمنا، وإن اعوججت أعوججنا))،[4] واتە: (کاتێك بەندە ڕۆژدەکاتەوە، هەموولاشە بەزمان دەڵێن: لەبەرامبەر ئێمەدا لەخوا بترسە، چونکە بەتۆوە پابەندین، گەر تۆ ڕاست بیت ئێمەش ڕاست دەبین، گەر لار و چەوتیش بیت، ئێمەش لارو چەوت دەبین). پێشینانیش لەقسەکردندا سەرزەنشتی دەروونی خۆیان دەکرد، چونکە زمان لەئەندامەکانی تر جوڵەی سووك و زیانبەخشترە بەسەربەندە وە، ئەبو بکری صدیق (ﷺ) زمانی خۆی دەگرت و دەیفەرموو:

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(١/ ١٤٦).

٢ ـ المحدث الفاضل للرامهرمزي،لا ٢٠٦، قواعد في التعامل العلماء، عبدالرحمن بن معلا اللويحق، لا ٨٦.

٣ ـ البداية والنهاية(١١/ ١٩٩)

٤ ـ الترمذي، رقم: ٢٤٠٧ حسنه الألباني في الصحيح الجامع (١/ ٥١٣).

ئەمە تاوانەکانی بۆم هێنا،[1] ئەی زمان قسە کۆیلەی تۆیە، گەر لە تۆ دەرچوو تۆ دەبیتە کۆیلەی ئەو، خوا لێپرسینەوە لەگەڵ مرۆڤ دەکات لەسەر هەموو قسەیەکی کە دەیکات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ [ ق : ١٨].

زمان دوو دەردی گەورەی هەیە گەر لەیەکیان ڕزگاربوونی هەبوو لەوەتریان ڕزگاربوونی نابێت، دەردی قسە و دەردی بێدەنگی هەریەکەیان لەکاتی خۆیدا لە ویتر تاوانی زۆرترە، بۆیە کەسی بێدەنگ لەبەرامبەر ڕاستیدا شەیتانێ لاڵە و سەرپێچیکارە، کەسیش ڕاستی نەدرکێنی بەدرۆ قسە بکات شەیتانێکی قسە بێژە و سەرپێچیکاری فەرمانی خوایە، زۆربەی مرۆڤیش لەقسەو بێدەنگیان لادەرن لە نیوان ئەو دوو دەردەیان، ناوەند کارانیش ـ کەسانی ڕێگای ڕاستن ـ زمانیان لەقسەی خراپ وپوچدا بەستووە، لەوەدا قسەدەکەن سودی بۆ ئاخیرەتیان هەبێ، بۆیە نابینی کەسانێکان قسە بکات و بێ سوود بۆی بگەڕێتەوە، سەربای ئەوەی زیانی دوارۆژی تیادا بێت، بەندە لەڕۆژی قیامەتدا چاکەی بەنموونەی چیاکان هەیە، ئەبینێ کەزمانی هەموو وێرانی کردووە، خراپەی نموونەی چیاکانی بۆدێت، ئەبینێ لەزۆر یادکردنی خوا و قسەی باشدا زمانی ئەو خراپەکاریانەی لەنێو بردووە.[2]

قسەکردن و بێدەنگی بەڕەهایی فرمان پێکراو نین، بەڵکو پێویستە لەچاکە دا قسەبکەیت و لەخراپەدا بێدەنگ بیت، پێشینانیش زۆر بێدەنگیان لەبەرامبەر خراپەوە هەڵبژاردووە، چارەی دەرونی خۆیانیان دەکردو ئەوەی پەیوەندی بەوان نەبوایە قسەیان تێدا نەدەکرد.[3] فُضيلي کوڕی عیاض(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموو: حەج و مانەوە لەجیهاد و سەنگەردا سەختتر نیە لەگرتنی زمان، گەر زمانت بەلاوە گرنگ بێ، ئەوە لەپەژارەیەکی سەختتدای، دەڵێ: بەند کردنی زمان بەندیخانەی ئیماندارانە، گەر زمانت بەلاوە گرنگ بێ، ئەوە لەپەژارەیەکی سەختتدای.[4]

---

١ ـ جهاد النفس، لا ٧٦.

٢ ـ الداء والدواء لإبن القيم، لا ٣٧٩.

٣ ـ جهاد النفس، لا ٧٧.

٤ ـ جامع العلوم والحكم.

ـ ووتەی حەسەنی کوڕی علی(ﷺ): گەر دووکاری بهاتایە پێش[1] نەی دەڕوانی کامیان لە حق نزیکترە، بەڵکو دەیڕوانیە ئەوەی نزیکی ئارەزووی یەتی و پێچەوانەی دەکرد:

حسن(ﷺ) سوور بو لەسەر پێچەوانەی ئارەزووکانی(هوی)، هەواش حەزی دەرونە بۆ چێژ وەرگرتن لەو ئارەزووانەی پاڵنەری شەرعیان نیە، [2] هەواو ئارەزووش لەو هۆکارانە دادەنرێت، کە لە پێناویاندا زۆربەی نەتەوەکان پێچەوانەی پێغەمبەرەکانیان کردووە و، گەورەییان نواندووە و، ئەو ڕاستی و ڕوناکیەیان قبوڵ نەکردووە، کەپێغەمبەران (علیهم السلام) بۆ ئەوانیان هێناوە. خوای گەروەش فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلاً كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لا تَهْوَى أَنْفُسُهُمْ فَرِيقاً كَذَّبُوا وَفَرِيقاً يَقْتُلُونَ﴾[ المائدة: ٧٠].

هەروەها خوای گەورە فرمانی بەداودی پێغەمبەری(ﷺ) کردووە، کە پێچەوانەی هەواو ئارەزووی بکەوێت فەرمووی: ﴿ يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾[ص: ٢٦].

إبن تیمیە فەرموویەتی: خودی هەوا و ئارەزوو ئەو خۆشەویستە و توڕەییەی کەلەدەورونیدایەـ بۆی ناگونجێ، خاوەنداری ناکرێت، بەڵکو لەشوێن کەوتندا سەرزەنشت دەکرێ[3]، لەشوێنێکی تردا دەڵێ: تەنیا خۆشەویستی و توڕەیی هەوایە، بەڵام حەڕام ئەوەیە شوێنکەوتنی خۆشەویستی و توڕەییەتی کە لەبەر خوا نیە[4]، چارەسەریش بۆ ئەوکەسەی بە هۆی هەوا و ئارەزووەوە تووشی تاوان دەبێ، پەیوەستکردنی دەرونە بە قورئان و سونەت وشوێنکەوتنی بەرنامەی سەلەفی ساڵح و پەروەردەکردنی دەرونە بە بەردەوامبوون لەسەر ترسان لەخوا و سەرزەنشتکردنی دەروون و بەردەوم لێپرسینەوە

---

١ ـ البداية والنهاية(١١/ ١٩٩)

٢ ـ التعريفات للجرجاني، لا ٢٥٧.

٣ ـ الفتاوى (٢٨/ ١٣١).

٤ ـ هەمان سەرچاوە، لا (٢٨/ ١٣٣).

لەوەی ڕویداوە بـەهۆی جوانیەکانیـەوە لەخـشتە نەچـیٚ، زۆر پرسـیارکردن لـە زانایـان و ئیمانداران و، بۆچون وەرگرتنیان لەبارەی ئەوەی ئەیەویٚ بیکات و دەری بیڕیٚـت، هــەروەها ڕەخساندنی دەرونیش لەوەرگرتنی ئامۆژگاری کەسانیتر و وەرگرتنی بـۆ چـونە ڕاسـتەکان، گەرچی پیٚچەوانەی دەرونیش بیٚ و پەلـە نـەکردن لـەبڕیاردان و کـار دواخـستن ووریـاییبون لەبەرچی ئەوکارانەی زیادەڕەوی و سستی تیادایە، نەفامی و دوژمنایەتی، پیٚویستە مـرۆڤ زۆر بپاڕیٚتەوە و، بۆ لای خوا بگەڕیٚتەوە، بـەوەی لەشـویٚنکەوتنی هـەواو ئـارەزوو فیتنـە دووری بخاتەوەو داوا لە خوا بکات بـۆ ووتنـی قـسەی ڕاسـت لـە تـوڕەیی و ڕەزامەنـدی سەربخات و ئەو دوعایە زۆربکات، کەپیٚغەمبەری خوا(ﷺ)ئومەتەکەی فیٚرکـردووە: داوای قسەی ڕاستت لیٚ دەکەم لەڕەزامەندی و توڕەییدا [1]، پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ((اللهم إني أعوذبك من منكرات الأخلاق والأعمال والأهـواء))[2]، واتـە: (خوایـە گیـان پەنات پیٚ ئەگرم لە خراپیەکانی ڕەوشت و کارو ئارەزووەکان).

٤ـ حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) فەرموویەتی: دروستە گومانی خراپە ببریٚت بەکەسـیٚك ناشیرینی لیٚ بزانریٚ و، بەڵگەی لەسەر بووبیٚ و، دروست نی یە گومانی خراپی پـیٚ بـبریٚ تەنیا بەهۆی گومانەوە، چونکە گومان زۆر درۆ دەکات.[3]

تیگەیشتن لەو چەمك و حیکمەتەی حسن ئەوەیە، کە موسڵمانی ژیر بۆی هەیە گومان ببات بەکەسیٚك، کەحاڵ مامەڵەو ڕەوشت و قسەکانی بزانیٚ بەبەڵگەوە، مرۆڤ هەندیٚ جـار ئەوەی لەدەرونیدایە دەکەویٚتە سەر و زمان ئەترازیٚ، بەسروشتی حاڵیش پاداشت یان سزای کەسـە گومـان لیٚ کراوەکـە لەسـەر ئـەو گومانـە دانامـەزریٚ، بـەڵام ئەوقـسەیەی حسن(ﷺ)ئاگاداربوونە لە نمونەی کەسانیٚك، تاوەکو مرۆڤی موسڵمان نەکەویٚتە تەنگـەژەو کارەساتەوە بەهۆی گومان باشیەکەی بەوکەسانە (کەسە ئارەزووبازەکانن)، هەرکەسیٚکیش مامەڵەی خەلکی بکات و تیٚکـەڵی بکـات مەترسـی متمانـەی لەوکەسـانەی پیٚـشینەی گومان خراپی هەیە ئەزانیٚت بەڵگەی بیٚ متمانەی هەبووە پیٚیان، بەڵام تەنیا گومان بردنی

---

١ ـ النسائي، كتاب السهو باب الدعاء بعد الذكر(٣/٥٥) صححه الألباني.

٢ ـ سنن الترمذي وصححه الألباني،كما في صحيح سنن الترمذي(٣/ ١٨٣).

٣ ـ الشهب اللامعة في السياسة النافعة للمالقي،لا ١٧٣.

خراپ بەموسڵمان بەبێ بەڵگەیەکی بەهێز یان نیشانەیەك ئەوە نابێ موسڵمانی وەها گومانێك ببات، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلا تَجَسَّسُوا وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾[الحجرات: ١٢].

هەندێ لەزانایانیش لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾ ووتویانە: ئەوەیە بەچاکەکاران گومانی خراپ ببرێت، بەڵام خراپەکارو فاسیق بەنموونەی دەرکەوتنی خراپەیان دەکرێ گومانی خراپیان پێ ببرێت. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إياكم والظنَ، فإن الظن أكذبُ الحديثِ))[١]، واتە: (ووریای گومان بن، چونکە گومان بردن لەهەموو شتێك درۆترە).

إبن حجریش گومان بردنی بە موسڵمان بەتاوانە گەورەکانی ناخ (باطن) ناو بردووە، دەڵێ: چونکە بڕیاردانی خراپی لەسەر کەسانی تر تەنیا بە گومانە، شەیتان هانی دەدات بۆ سوك تەماشاکردنی و هەڵنەستان بەئەنجامدانی مافی، زمان درێژکردنە لەئەتکردنی، گشت ئەوانەش لەتاوانە لەناوبەرەکانە، هەرچ کەسێکت بینی گومانی بەخەڵکی دەبرد و بەشوێن دەرخستنی عەیبەکانیاندا دەگەڕا، بزانە ئەوە هۆی پیسی ناخیانە، چونکە موسڵمان بۆ سەلامەتی ناخی بەشوێن پاساودانی چاکە دەگەڕێ و دوو ڕووش لەبەر پیسی ناخی بەشوێن عەیبەکاندا دەگەڕێ[٢]، ئەمەش کورتەیەکە لەسەر ووتەیەکی حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه): دەکرێ گومانی خراپ بەکەسێ ببرێت کاری خراپی لێ دەرکەوتبێ و، بەڵگەی هەبێ و ناکرێت تەنها بەهۆی گومانەوە گومانی خراپی ی پێ بکرێت، چونکە گومان زۆر درۆدەکات.[٣]

٥ـ ووتەی حەسەنی کوڕی عەلی(رضي الله عنه): سوێند بەخوا گەر کۆمەڵێ ڕاوێژی یەکتر بکەن، خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێ[٤]، حسن(رضي الله عنه) خەڵکی هاندەدات و

---

١ ـ البخاري، رقم: ٥١٤٣، مسلم، رقم: ٢٥٦٣.

٢ ـ الزواجر، لا ١١٤.

٣ ـ الشهب الامعة في لسياسة النافعة، لا ١٧٣.

٤ ـ التهذيب الرياسة، وترتيب السياسة للقلعي، لا ١٨٣.

ئامۆژگاریان دەکات لەگشت کاروبارێکدا ڕاوێژ بەیەکتر بەکەن، بۆیە بەرپرسیاری یەکەم (هاوەڵان) ڕاوێژیان بەیەکتر کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) و خەلیفە ڕاشیدیەکان ئەو کارە گرنگەیان ئەنجام داوە، بێگومان حەسەنیش لەئاشتەواییکردنی لەگەڵ معاویەدا(رضي الله عنه) وەکو دواتر باسی دەکەین، ڕاوێژی حسین و عبداللە کوڕی جعفر، کە ئامۆزای بووە و سەرکردەکانی دیکەی دەوڵەتەکەی کردووە.

ڕاوێژ بە یەکێك لەڕێسا شەرعیەکان و گەورەیی بڕیارەکان دادەنرێت، هەرکەسێکیش ـ لەبڕیارەکاندا ـ ڕاوێژ بە زانایان نەکات، ئەوە لەکارخستنی واجبێکە، ئەو کارەش جیاوازی وناکۆکی تێدا نیە.[1] جصاصی حەنەفیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لەتەفسیرکەیدا(أحکام القرآن) سەبارەت بەئایەتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾[الشورى: ٣٨] دەڵێ: ئەو ئایەتە بەڵگەی گەورەیی پایەی ڕاوێژکردنە، لەگەڵ باوەڕو نوێژو کردندا باسکراوە و، بەڵگەیەکە فرمانی کردنمان پێ کراوە.[2] طاهرعاشور دەڵێ: کۆی قسەی جصاص بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەزهەبی حەنەفی ڕاوێژکردن بەواجب دەزانن.[3] نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: هاوەڵانمان جیاوازبونە لەوەی ڕاوێژکردن لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) واجب بووە یان وەکو لەسەر ئێمە سوننەت بووە، ڕاستی ئەوەیە بەلایانەوە واجب بووە، فرمان پێکراو بووە: ﴿شَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ ڕای پەسەند بەلای کۆی زانایانی ئسوڵەوە (ئەمر) بۆ واجبە.[4]

إبن تیمیه(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: ناکرێ کار ڕاپەرینەری موسڵمانان بێ ڕاوێژکردن بێ، چونکە خوای گەورە فرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە (ﷺ) کەڕاوێژی هاوەڵانی بکات، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾[آل عمران: ١٥٩].

---

١ ـ المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز (٣/٣٧٩).

٢ ـ أحكام القران للجصاص(٣/ ٣٨٦).

٣ ـ التحرير والتنوير (٤/ ١٤٩).

٤ ـ شرح النووي على مسلم (٤/٧٦).

بێگومـــان ڕاوێــژکردن یەکێکــە لەپایــەکانی سیـــستەمی ئیـــسلامی یارمەتیـــدەری دروســتکردنی کۆمەڵگــەی ئیــسلامیە، سیــستەمی شــوراش لەبەرحیکمــەتێکی گــەورەو مەبەست گەلێکی زۆر دانراوە، چونکە بەرژەوەندی زۆر و سودی بەنرخی تیادایــە، بــەخێرو فەڕو پیرۆزی بۆسەر ئوممەت و دەوڵەت و کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە لەوانە:

- شوری جۆرێکە لەگفتوگۆی کراوە و لەباشترین شێوازەکانی ووشیارکردنی ڕای گـشتی و ڕونکردنەوەیەتی و پتەو کردنـی هۆکـاری خۆشەویـستی و متمانەیـە لـەنێوان حـاکم و هاولاتیـان فەرمانـدەو ژێردەسـتەو سـەرۆك و سـەرۆکایەتیکراوەکاندا، باشـترین شـێوازی دەسەلاتە بۆ نەهێشتنی گومان و ئەو دەنگۆیانەی لە سایەی داپلۆسین و دەنگە دەنگ بلاو دەبێتەوە.

- بنەماکانی ئیسلام ئەوە دەخوازێ هەموو تاکێك هەسـت بکـات لـەژیانی کۆمەڵگـە وکۆمەڵدا ڕۆڵی گرنگی خۆی هەیە، ڕاوێژکردن بواری بۆ گشت تاکێك دەڕەخسێنێ، تاوەکو بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگە و توانا وبیرو بۆ چون و نیشانەی پێشکەش بکات، کـە لـە توانـا یدایە، هەروەکو لەبەردەم هەموو تاکێکدا بـوار دەڕەخـسێنێ تـاوەکو لـەبارەی کاروبـاری گشتیەوە بۆ چوونی خۆی دەربڕێت.

- شورا باوەشی سۆزو پتەو بەتاکەکانی ئوممـەت دەبەخـشێ، لەشـورادا تـاك هەسـت بەبەهای خودو بیرو مرۆڤایەتیەکەی خـۆی دەکـات و، تـاکی کۆمەڵگـەش هانـدەدا ڕووەو ئیجتیهاد وداهێنان و ڕازیبون وکرانەوەی وزەکان وبەهرە شاراوەکەی ئومەت دەرکەوێ.

- بەڕاستی شوری یارمەتیدرە بۆ چارەسەرکردنی ڕق و کینە شـاراوەکان و ناکۆکیـەکان ناهێڵێ و بەرپرسانی دەوڵەتیش بۆ بەخشین پاڵدەدات و بۆ سیستەم ڕاپەڕاندن و ڕاستگۆیان هاندەدات.

- لەسیستەمی شورادا یادخـستنەوەی ئومەتـە بـەوەی خـاوەن دەسـەلات و هـەروەها یادخستنەوەی سەرۆکی دەوڵەتە بەوەی لەدەسەلاتدا بریکاری ئەوانە.

- لەڕاوێژکردندا بەجێ هێنانی فرمانی خوایە و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایــە(ﷺ)، ئەم تایبەتمەندیەش لەگرنگترین تایبەتمەندیە پێشکەوتووەکانە، ئەوەش گرنگترین هۆکـاری

سەرکەوتنی سیستەمی الشوریە.[1] حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) خەڵکی هاندەدات بۆگرنگی دان بەشوار و جێ بەجێ کردنی، بۆیە دەڵێ: سوێند بەخوا گەرکۆمەڵێك ڕاوێژبکەن خوا باشتریان پێ دەدات لەوەی کۆیانی کردۆتەوە.[2]

٦ـ حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) لەهەندێ ئامۆژگاریەکانی بۆ موسڵمانان دەڵێ: ئەی نەوەی ئادەم لە سنور بەزاندنە حەرامەکانی خوا دەست هەڵگرن دەبنە بەندەیەکی خواویست، ڕازی بە بەوەی خوا بەشی تۆی داوە دەوڵەمەند دەبی و چاکەکار بەتەك ئەوکەسەی دەبێتە هاوسێت ئاشتەوا و سەلامەت دەبو چۆنت پێخۆشە خەڵکی مامەڵەت بکەن تۆش وەها مامەڵە بکە.

بێگومان لەنێوان ئێوە دا کە سانێك هەن سەروەت و سامان زۆر کۆدەکەنەوە و کۆشك و تەلار دروست کەن و ئومێدی دووریان هەیە، کەچی کۆکردنەوەیان پوچە، ئەی نەوەی ئادەم تۆ لەو ڕۆژەی لە دایك بووی بەردەوام تەمەنی خۆت بە فیڕۆ دەدەیت، کەواتە خەریکی چاکەکاری بە بۆ ئەوەی دەوڵەمەند بی، چونکە ئیماندار تێشو بۆ قیامەت کۆ دەکاتەوە، بێ باوەڕیش لە دونیادا چێژ وەردەگرێ[3]، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾[البقرة: ١٩٧].

أـ ئەمەش تەفسیرێکی کورتی ئەو ووتارەی حەسەنە ئەی نەوەی ئادەم لەسنور بەزاندنی خوا دوور بە دەبیتە بەندەیەکی چاکەکار[4]، ئەوەش ئاڕاستە کردنێکە حەسەنی کوڕی عەلی ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد بۆ دووركەوتنەوە لەحەرامەکان، حەسەنی کوڕی علی ئەوکەسەی واز لەحەرامەکان بهێنێ بە بەندەی خواپەرستی دادەنێ، چونکە بەهۆی ئەنجام دانی کاری حەرامەوە مرۆڤ دەکەوێتە بێئاگایی و توشوی تۆڕەیی خواو سزا وەرگرتنی دەبێت، هەروەکو کەوتنە حەرام و بێئاگایی لەگوێڕایەڵیکردنی خوا دوو هۆکاری خراپ و ئازار گەلێکی سەختە لەدونیاو ئاخیرەتدا، إبن القیم دەفەرمووێ: ئەنجامەکانی

١ ـ الشورى بين الأصالة والمعاصرة لعزالدين التميمي، لا( ٣٣، ٣٤).

٢ ـ تهذيب الرياسة وترتيب السياسة، لا ١٨٣.

٣ ـ نور الأبصار، الشبلنجي، لا ١٢١، الحسن بن علي،لا ٢٨.

٤ ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٢١.٤

کەمی سەرکەوتن و بۆچوون و خراپ و شاراوەیی ڕاستی و دڵ بۆگەنی وبیر سستی و کات بەفیڕۆدان و ڕوانینە دەستی خەڵك و دووریی نێوان بەندە و پەروەردگاری و ڕێگریکردنی بەدست هێنانی پاڕانەوە و دڵ ڕەقی و نەمانی فەڕو بەرەکەت لە ڕزق و تەمەن وبێبەشی لەزانست و کردنەبەری بەرگی شەرمەزاری و شەرمەزاربوونی بەردەم دوژمن و دڵتەنگی و تاقیبونەوەیە بەو هاوڕێ خراپانەی دڵ گەندەڵ دەکەن و کات بە فیڕۆ دەدەن و پەژارە زۆری و ژیان سەختی و بارقورسی، گشت ئەوانە بەرهەمی سەرپێچی وبێ ئاگاییە لە بەرامبەر خوا، وەك کشتوکاڵ لەئاو بەبەردێت وسوتانیش بە ئاگر، پێچەوانەی ئەوانەش بەهۆی گوێڕایەڵیکردنی خوا بەرهەم دێن[1]، بۆیە دوورکەوتنەوە لەحەڕام ڕێگەیەکە بۆ گوێڕایەڵیکردنی خوا، لەوەشدا موسڵمان دەبێتەوە بەندەیەکی خواناس، بۆیە حسن فەرموویەتی: نزیکی حەڕامەکان وسنورەکانی خوا مەکەون دەبنە بەندەیەکی خواناس.[2]

ب ـ ڕەزای بە بەوەی خوا پێی بەخشیت دەوڵەمەند دەبی.[3]

حسن (ﷺ) سەبارەت بەڕازیبون قسەدەکات بەوەی خوا بۆ بەندە نوسیویەتی، ڕازیبون بە هۆی دەوڵەمەند بوون بەخوای گەورە واتای ڕازیبونیش لەبەرامبەر ئەوەیە بەندە ڕقی نەبێتەوە لەوەی چی لەقەزاو قەدەری خوا دانراوە و دەبێت.[4]

بەرزترین پلەی ڕازیبون دڵ خۆشی و ئارامی دەروونە بۆ قەزاو قەدەری خوا لەباش و خراپ و باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر یەکێکە لە شەش پایەکانی باوەڕ بەشیرین و تاڵیەوە ئەم ڕازیبونەش لەجوانترین ڕەوشتە ئیمانیەکانە، چونکە دەست گرتنە بە جڵەوی گشت پایەکانی باوەڕەوە، چونکە ڕۆح و ژیانیەتی و ڕۆحی تەوەکول و حەقیقەتەکەیەتی، ڕۆحی دڵنیایی و خۆشەویستی و بەڵگەی ڕاست خۆش ویستنی خۆشەویستەو ڕۆح و بەڵگەی سوپاس گوزارییە.[5]

---

١ ـ الفوائد، لا ٣٢.

٢ ـ الحسن بن علي، لا ٢٨، نور الأبصار، لا ١٢١.

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٢٨.

٤ ـ المفردات للراغب، لا١٩٧.

٥ ـ مدارج السالكين، (٢ / ٢١٨).

ڕازیبون دەرگای ڕەوشت شیرینی لەگەڵ خوا و خەڵکی دەکاتەوە، چونکە ڕەوشت شیرینی لەڕازیبونەوە سەرچاوە دەگرێ و ڕەوشت ناشیرینیش لە توڕەییەوە، هەندێ زاناش ڕازیبونیان بەڕەوشت شیرینی لەگەڵ خوادا ناسیوە، ووتویانە: چونکە لە موڵکی خۆیدا ڕێگری ناڕازیبون و ڕەخنە گرتن و نەهێشتنی زۆر ووتن، ڕەوشت شیرینی لێ دوور دەخاتەوە، هەر شتێکیش خوای گەورە بڕیاری دابێت ئەو بەندەیە بە ناوی ناشرین ناوی نابات، چونکە پێچەوانەی ڕازیبوونە[1]، بۆیە ئەو جۆرەی ڕازیبونە لەزۆر ئایەتدا خوای گەورە بەگرنگیەوە باسی کردووە: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾[التوبة: ١٠٠].

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر بەرزترین پلەکانی باوەڕ بەوپێیەی تەواوی ڕەوشت جوانی تێدایە لەگەڵ خودا، بەندە بەگشت دڵخۆشی و دڵ ئارامیەوە وەری دەگرێ، لەدەرونیشدا هیچ ناخۆشیەك نابینێ لەگشت ئەوخێرو شەڕانەی خوا بڕیاری داوە، بەڵکو بەهاتنی قەزاو قەدەر بەسەریدا ڕەزامەندە، چونکە حیکمەتی خوا دەزانێ و لەشەرع و ڕووداوی گەردونندا ڕەخنە ناگرێ، چونکە ئەزانێ خوای گەورە لەکارو قەزادا دانایەو بۆ بەندەکانی بەچاکە بڕیاریان بۆ دەدات، ئەگەرچی لەدەرونیشیاندا پێچەوانە دەردەکەوێ.

بێگومان باپیری حسن(رضي الله عنه) پێشەوا و نمونەی بەرزە، بۆ ئیمەی ڕونکردۆتەوە، ڕازیبوونی چۆن بووە بەرامبەر تاقیکردنەوەکانی خوا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نمونەی تەواوی مرۆڤی ڕەزامەند بووە لەو ئازارەی لەبانگەواز کردنی بۆ خوا لەمەککە یان تائیف یان لەمەدینەدا چەشتی، ئازاری گەیشتە ئەوپەڕی، کۆمەڵێك هەوڵ درا بۆ تێرۆرکردنی، سەرئەنجام تێدا سەرکەوتوو نەبوون، لەوکەسانەش خۆشبوو، کەهەوڵی تیرۆر کردنیان دا، هەروەها بەسەروەتی کەمیش ڕازی بووە، مرۆڤایەتی نمونەی ڕازیبونی ئەوی نەدیووە، داوای لە خوای کردووە فەرموویەتی: ((اللهم اجعل رزق آل محمداً قوتاً))[2]، لەکاتی لەدەستدانی مناڵەکانی ڕازی بوو بەقەزاو قەدەری خوا، وەك لەکاتی مردنی ئیبراهیمی شیرە خۆرەی خاڵی حسن تەمەنی هەژدەمانگ بوو، لەپیریشدا خواپێ ی بەخشیوە و دوای مردنی کوڕەکانی تریشی لە پێشوودا، ئەوە ڕازیبونی بەقەزاو قەدەری خوا لەدەست نەدا،

---

١ ـ مدارج السالكين، (٢/ ٢٢٠).

٢ ـ البخاري، الرقائق، رقم: ١٠٥٥.

زیاتر دامەزراو بوو، بەڵکو ڕەزامەندی خۆی ڕاگەیاند، ئەوەش ئەنەسی کوڕی مالیك(رضي الله عنه) لەبارەیەوە ڕیوایەتی کردووە: ((إن الدمع تدمع، والقلب تحزن، ولا نقول إلا بما يرضى ربنا، وإنا لفراقك يا إبراهيم لمحزونون)).[1]

واتە: (چاو فرمێسك دەڕێژێ و دڵیش خەفەتبارە، هەرئەوەش دەڵێین: کە پەروەردگارمان پێ ی ڕازیە، ئیمەش بۆ لەدەستدانی تۆ دڵتەنگین ئەی ئیبراهیم).

کەسە نزیکەکانی، کە لەبەردەستدایە بۆ بەرگریکردنی خۆی و بانگەوازەکەی کوژران ناڕازی نەبوو، بەڵکو هات و لەبارەی شێری خواو شێری پێغەمبەری حەمزەی کوڕی عبدالمطلیب مامی پێغەمبەر بوو(ﷺ) لە ئوحوددا بەجۆریکی بێ نموونە شەهید بوو(رضي الله عنه)تەرمەکەشی ئەتك کرا و، کەسێکی بەم جۆرە نەبینیبو پێش ئەو بەو شێوەیە شەهید کرابێت، سنگی شەق کرابوو، تەنیا فەرمووی: ((رحمة الله عليك، إن كنت ما علمتك إلا وصولا للرحم، فعولاً للخيرات والله لو لا حزن من بعدك عليك لسرني أن أتركك حتى يحشرك الله في بطون السباع)).[2]

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو کاروبارێك ئەوپەڕی ڕەزامەندی هەبوو لە بەرامبەر خوادا، هەمیشە پێداگری دەکرد لە پاڕانەو بۆ ئەوەی خوای گەورە ڕازیبون و دامەزراوی پێ ببەخشێ[3]، لەکاتی پاڕانەوە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی دەووت: ((وأسألك الرضا بعد القضاء وبرد العيش بعد الموت، ولذة النظر إلى وجهك، والشوق إلى لقائك، أعوذ بك من ضراء مضرة وفتنة مضلة، اللهم زينا بزينة الإيمان، واجعلنا هداة مهتدين)).[4]

فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی دوعا کردن بۆ بەدەست هێنانی ڕازمەندی خوا تەنها دوعای ڕەزامەندی بۆ خۆی نەدەکرد، بەڵکو بۆ ئوممەتەکەشی دەرکرد، وەك لەم

---

١ ـ مسلم، رقم: ٢٣١٥

٢ ـ تفسير إبن كثير (٢/ ٥٢٢) عزاه إبن كثير الى البزار وقال عند بعد مراده له بنسده هذا اسناده فيه ضعيف، وذكره بنحوه إبن هشام في سيرته(٣/ ١٧١) عن إبن إسحاق مرسلاً.

٣ ـ أخلاق النبي (ﷺ) في القران والسنة (١/ ١٠٠).

٤ ـ سنن النسائي، في السهو (٣/ ٥٥) من حديث عمار بن ياسر إسناده حسن

فەرمووده‌یه بۆمان دەردەكەوێت: هەركەسێ گوێ لە بانگبێژ بوو ووتی: ((أنا أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمداً عبده ورسوله، رضيت بالله رباً وبمحمد (ﷺ) نبياً ورسولاً، وبالإسلام دينا، غفر له ذنبه))[١]، لەم فەرموودەیە تێبینی ئەوە دەكرێ چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم پاڕانەوەیەی بەستۆتەوە بەكارێك، كە ڕۆژانە پێنج جار دووبارە دەبێتەوە، تاوەكو ئەم پاڕانەوەیە و ناوەڕۆكەكەی ڕەخساو بێ لەدەروونی ژنان و پیاوانی ئیمانداردا، هەروەها فەرموویەتی: ((ذات طعم الإيمان من رضي بالله رباً، وبمحمد (ﷺ) نبياً ورسولاً)).[٢]

بێگومان لەو دوو فەرموودەیەدا، گەوریی ڕازیبون لە بەرامبەر خوای گەورەدا ڕوون دەبێتەوە، كە ئەو خوڕەوشتە هۆكاری لێخۆشبوونی تاوانە، و فەرموودەی دوایش شایەتیەدا چێژی باوەڕی تیادایە، چونكە خاوەنی ئەو خوڕەوشتە دەزانێ ئەوەی تووشی هاتووە بۆ هەڵە پێكردنی نیە و، كاری خوا لەكاری خۆی باشترە، بۆیە چاو تێرانە لەخۆشی و ناخۆشیەكانی ئەم ژیانە دا دەژی، لەخۆشی و ناخۆشیدا سوپاسی خوا دەكات، چونكە گشت ئەو كارانە كاری خوان و لەموڵكی خۆیدایە، ئاخۆ چەندە خۆشە بۆ كەسێ ژیانی بەو جۆرە بباتە سەر چی لەوە خۆشترە[٣]؟ حەسەنی كوڕی علی(ﷺ) بەزمانی حاڵ لەسەر ئەم ڕەوشتە سوور بووە: ڕازیبە بەوەی خوا پێتیداوە دەوڵەمەند دەبی.[٤]

ج- وتەی حسن جوان مامەڵەی دراوسێكەت بكە سەلامەت دەبی:

حسن مسوڵمانان هاندەدا جوان مامەڵە لەگەڵ دراوسێ بكەن، چونكە دراوسێ گەورەترین مافی لەسەر دراوسێ یە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ﴾[النساء: ٣٦]. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموویەتی: ((مازال جبريل يوصيني بالجار حتى ظننت أنه سيورث)).[٥]

---

١ ـ مسلم، رقم: ٣٨٦.

ـ ٢الأخلاق النبي(ﷺ) في القران والسنة (١/ ١٠١).

٣ ـ الحسن بن علي، لا ٢٨، نور الأبصار ١٢١.

٤ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٢٨

٥ ـ البخاري، رقم: ٦٠١٥.

ئەم وەسیەت کردنەی جبریل بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئیسلام چەند گرنگی بە دراوسێ داوە لەوانە:

ـ ئازار نەدانی بەقسەو کردار، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەسێ باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێ ئازاری هاوسێکەی نادات))[1]، پێویستە مرۆڤ بەقسەو کردار یان ئاماژە ئازاری دراوسێکەی نەدات، چونکە ئازاردانی دراوسێ بەهەموو شێوەیەك حەرامە.

ـ بەردەوام چاکە کردن لەگەڵ دراوسێدا: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليحسن إلى جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه، ومن كان يؤمن با لله واليوم الآخر، فليقل خيراً أو ليصمت)).[2]

بە ڕوانین بۆئەم گرنگیە گەورەیەی، کە ئیسلام بە دراوسێ ی دەدات پێغەمبەر(ﷺ) نێوان باوەڕبوون بەخوا و ڕۆژی دوایی و چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ پێکەوە پەیوەست کردووە، گەر ئەو ئاڕاستەیەی پێغەمبەر لەگەڵ دراوسێکانماندا لە کۆمەڵگەکانماندا جێ بەجێ بکەین، ئەوە کۆمەڵگەکانمان دەبونە کۆمەڵگە گەلێکی هاوکارو خەڵکەکەش ژیانی خۆشیان دەبردەسەر.

ـ ئارامگرتن لەسەر خراپەی دراوسێ: وەك ووتراویە چاکەکاری دراوسێ، وازهێنانی خراپەنیە لەبەرامبەر دراوسێدا، بەڵکو ئارامگرتنە لەسەر خراپەکەی، بۆیە پێویستە موسڵمان لەسەر خراپەی دراوسێ ئارام بگرێت و بەچاکە وەڵامی بداتەوە، بەوەش دەرگا لەبەردەم خراپەی شەیتان دادەخرێ.

ـ نان پێدانی بەتایبەت گەرهەژار بوو: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ليس المؤمن بالذي يشبع وجاره جائع جنبه))[3]، هەروەها فەرموویەتی: ((يانساء المسلمات لاتحقرن

---

١ ـ البخاري رقم (٦٠١٨)

٢ ـ المستدرك(٤/ ١٦٧) السلسلة الصحيحة، رقم: ١٤٨.

٣ ـ المستدرك (٤/١٦٧) السلسلة الصحيحة رقم: (١٤٨).

جارة لجارتها ولو فرسن شاة)).[1] پێویستە هەموو موسڵمانێ ئاگاداری ئەم ڕەوشتە بەرزە بێ و لەبیری نەکات، چونکە کاریگەریەکی گەورەی لەسەر دراوسێ هەیە، بەڵگەی خاوەنداریکردنی سۆزو بەزەیی و خۆش پەیوەندی نێوان تاکی کۆمەڵگەی موسڵمانە[2]، لەم فەرموودەیەدا سووربون لەسەر بەجێ هێنانی پێداویستی دراوسێیان تێ دەگەین لەبەرگ و خواردن و هتد بەوەی لەتوانای دابێ.

ـ بەشداریکردنی لەخۆشی و ناخۆشیدا: گەر دراوسێکەی بۆنەیەکی خۆشی هەبوو پێویستە سەردانی بکات و، بڕواتە لای و بەشداری خۆشیەکەی بێت و بەووشەی جوان بزەی بخاتە سەر لێوی، گشت ئەوەش لەبنچینە دا مافی موسڵمانە بەسەر برا موسڵمانەکەیەوە، دراوسێش بەومافانە لەپێشترە.

ـ گەر ویستی لەو خانووە باربکات پێش هەموو کەسێ بۆکڕین خانووەکەی بخاتە بەردەست: گەر ویستی ئەو خانووە بەجێ بهێڵێ، پێویستە بۆ فرۆشتن یان کرێ پێش هەموو کەس دراوسێکەی لێ ئاگاردار بکاتەوە، پێغەمبەری(ﷺ) فەرموویەتی: ((من كان له أرض فأراد بيعها فليعرضها على جاره)).[3] ئەمەش بۆ دڵ و ڕازەکان زۆر جوانە، گەر خەڵکیش لەوەدا کەمتەرخەمیان کرد ئەوە دەرگای دوژمنایەتی و شەڕ و کێشە دەکەنەوە.

ـ ڕێگری نەکات دراوسێکەی لەدیواری خۆیدا دار بڕوێنێ، گەر دراوسێکەی پێویستی بوو، پێویستە ڕێگەی بدات و بۆسوود وەرگرتن لێ ی ڕێگری نەکات، بێگومان پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: ((لايمنع جار جاره أن يغرس خشبة في جداره))[4]، پاشان ئەبو هوریرە ووتی: چیە ئەوە ئەبینم لە بەرامبەریدا ڕێگرو بەگلەیین؟ سوێند بەخوا هەر دەیڵێمەوە مادام ئەم قسەیە ئازارتان دەدات.[5] لەم فەرموودەیەدا ئەوە وەردەگیرێت هەر

---

١ ـ مسلم، رقم: ١٠٣٠.

٢ ـ موسوعة الآداب الإسلامية(١/ ٢٩٩).

٣ ـ البخاري، رقم (٢٤٦٣).

٤ـ سنن إبن ماجه، رقم: ٢٤٩٣، صحيح إبن ماجه ٢٠٢٢.

٥ـ موسوعة الآداب الإسلامية(١/ ٣٠١).

یارمەتیێك دراوسێ پێویستی پێ بێت وزیان نەدات، ئەوە ئیسلام هانی ئەو هاوكاریەی دەدات.

ـ گەورەیی ڕێزی دراوسێ وناپاكی لێ نەكردنی: داپۆشینی نهێنی و پاراستنی نامووسی، ئازار نەدانی كەسوكارەكەی، چونكە ناشرنترینی تاوانە گەورەكانە، پێغەمبەر (ﷺ)پرسیاری لێكرا: چ تاوانێ گەورەیە؟ فەرمووی: كوڕەكەت بكوژی لە ترسی ئەوەی لەگەڵتا نان بخوات، پاشان ووتیان، چی تر؟ فەرموویەتی: زینای ژن و ماڵی دراوسێكەت بكەی))[1]، بەڵكو پێویستە نەفس و ماڵ و ناموسی بپارێزی، تادڵنیا بێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: سوێند بەخوا باوەڕی نیە - سێ جار - ئەوكەسەی دراوسێكەی لێ أمین نەبێ واتە: ناپاكی بەرامبەری بكات.[2] بۆیە حەسەنی كوڕی علی(رضي الله عنه) لەوتارو ئامۆژگاریەكاندا ئامۆژگاری خەڵكی كردووە چاكەكاری لەگەڵ دراوسێ بكەن، بۆیە فەرموویەتی: چاكەكاربە لەگەڵ ئەوكەسەی دراوسێتە، سەلامەت دەبی.[3]

ح ـ هاوڕیەتی خەڵك بكە بەو جۆرەی پێت خۆشە خەڵك هاوڕێ یەتیت بكا داد پەروەر دەبی: حسن(رضي الله عنه) موسڵمانان هاندەدات دڵسۆز و دەم پاك بن لەگەڵ خەڵكیدا، دادپەروەرانە تێكەڵیان بن و ستەمیان لێ نەكەن، چونكە ئینساف بوون سیفەتێكی گەورە و پیرۆزە وبەڵگەی دەرونێكی ئارام و ئاسۆ فراوانی و ڕوانینە بۆ ئەنجام گەلێكی دوور، بەگەڕانەوەی مافی خاوەنەكانیش پێناسە دەكرێ، دەركردنی بەدەستانێكی دادگەر و سیاسەتێكی پیرۆز[4]، إبن القیم لە بارەی ئینسافكردن لەگەڵ خەڵكدا دەڵێ: مافیان بدەیت و شتێ كە هی تۆ نیە لێیانی داوا نەكەیت، لە دەرەوەی توانایان داوا كاریت نەبێت، بە جۆرێ مامەڵەیان لەگەڵ بكە، كە پێت خۆشە مامەڵەت لەگەڵدا بكرێ و، وەهاش بڕیار لە بەرژەوەندی و لەدژبدە كەپێت خۆشە بۆتۆی بدەن[5] ئینساف و دادگەری،

---

١ـ مسلم، رقم:٨٦.

٢ـ موسوعة الآداب الإسلامية(١/ ٣٠١).

٣ـ الحسن بن علي، لا ٢٨٦، نور الأبصار، لا ١٢١.

٤ـ الأخلاق بين الطبع و التطبع، لا ٢٢٨.

٥ـ زاد المعاد (٢/ ٤٠٧) بەدەستكاریەوە.

دووانەیەکن ئەنجامەکانیان هیمەت بەرزی لە وەرگرتنی چاکەکان و دوورکەوتنەوەیە لەشتە سووك وڕیسواکارەکان.[1] خوای گەورە فرمانی بەئێمە کردووە بە ئینساف بین و، نەهی لێ کردووین کە لە ڕق وتوڕەیمان لەبێباڕانیش بێ ئینسافی بکەین، چونکە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾[المائدة: ٨].

إبن تيميه (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێ: خوای گەورە نەهی کردووە لەوەی ڕقبونمان لە بێباوەڕانیش وەها بکات بە ئینساف نەبین و دادگەرنەبین، ئاخۆ ڕقبونمان چۆن بێ لەفاسق یان موبتدیع یان تەئویلکارێکی ئەهلی باوەڕ؟ ئەوە شیاوترە، کە دادگەری بەرامبەری بنوێنرێ وستەمی لێ نەکرێ.[2]

إبن كثير (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: واتە ڕەقبون لەکۆمەڵ و نەتەوەیەك وەهاتان لێ نەکات واز لەدادگەری بهێنن، چونکە لەهەموو حاڵەتێکدا دادگەری لەسەر هەموو کەسێ پێویستە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَنْ صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَنْ تَعْتَدُوا﴾[ المائدة: ٢].

ئەبو عوبیدە و فەراءوتویانە: ڕقی کۆمەڵێك واتان لێناکات ڕووەو ستەم سنوری ڕاستی بەجێ بهێڵن[3]، چەندە جوانە مرۆڤ بەئینساف خۆی برازێنێتەوە و، لەسیفەتی خوا پەرستانە (الربانيين) کەتەنیا ڕاستیان دەوێ.[4]

إبن القيم دەڵێ:

| | |
|---|---|
| وتعر من ثوبين من يلبسهما | يلق الردى بمذمة وهـــــوانِ |
| ثوب من الجهل المركب فوقه | ثوب التعصب بئست الثوبـــانِ |
| وتحل بالإنصاف أفخر حـلة | زينت بها الأعطاف والكتفـــانِ |

---

١ـ التوفيق على مهّمات التعريف للمناوي، لا ٦٤.

٢ـ الإستقامة (١/ ٣٨).

٣ـ تفسير القرطبي (٦/ ٤٥).

٤ـ الأخلاق بين الطبع والتطبع، لا ٢٢٩.

واتــە: خـۆت لـەدوو پۆشـاك بپـارێزە کەمایـەی ناشـیرینی وشـەرمەزارین، بـەرگێك لەنەفامیەك کەخاوەنەکەی نازانێ نەفامەو بەرگێکی تریش کەلەسەرووی ئەودایە و بەرگی دەمارگیریەو هەردووبەرگەکەش ناشیرین و نأبوترین بەرگن، خۆت بەئینسافەوە جوان بکـە کەشانازیترین بەرگە وشانۆشکۆی مرۆڤی جوان کردووە.

مُتنبی ووتوویەتی:

ولم تزل قلة الإنصاف قاطعة بين الرجال ولو كان ذوي رحم

واتە: تاوەکو ئێستا کەمێ ئینساف لـە نێـوان خەڵکیـدا هەیـە گەرچـی کەسـی یـەك خزمیش بن.

لە ئینساف کردنی بەندەکان، ئینـسافبونیانە لـەماڵ و مامەڵـەکان و بەڵگـەو بابـەت وقسەکاندا، چونکە خوای گەورە عـەیبی لەوکەسـانە گرتـووە، کـە شـتی خـەڵکی بەکـەم دەزانن و بەتیا چوون و زیانبار هەڕەشەی لێ کردوون، فەرموویـەتی: ﴿وَيْـلٌ لِلْمُطَفِّفِـينَ (١) الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ (٢) وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُـوهُمْ يُخْـسِرُونَ﴾ [المطففـين: ١ـ ٣].

إبن سعد فەرموویـەتی: ئـەو ئایەتـە پـیرۆزە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە پێویـستە مـرۆڤ بەئەندازەی ئەو مالـەی دەیفرۆشـتە خـەڵکی لـەکاتی کـڕین و فرۆشـتن زیـاتر وەرنـەگرێ لەبەرامبەر ئەو شتنەی فرۆشتویەتی لەکاتی کڕین و فرۆشتندا، پێویستە ئەو بەڵگانەش بۆ بەرامبەرەکەی بخاتە ڕوو کە نایزانێ، چۆن ئەڕوانێتـە بەڵگـەی خـۆی ئاوەهـاش بڕوانێتـە بەڵگەی بەرامبەرەکەی، لەو شوێنانەدا ئینسافی مرۆڤ لە دەمارگیری و زۆرداری دەزانـرێ، خاکەراییەکەی لەخۆ بەگـەورە زانیەکـەی، ژیریەکەشـی لەگێلیتیەکـەی جیـا دەبێتـەوە و ئاشکرا دەبێت.[1] ووتەی حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) چەند جوانە: هاوڕێیـەتی و مامەڵـەی خەڵکی بکە بەو جۆرەی حەز دەکەی مامەڵەت لەگەڵدا بکەن، دادپەروەر دەبی.[2]

---

١ـ تفسير إبن سعدي، لا ٩١٥.

٢ـ الحسن بن علي، لا ٢٨.

حسن(ﷺ) کۆمەڵی خەڵکی باس دەکات، کە لە دونیا و جوانیەکەیدا ڕوو چونە، سەرقاڵن بەکۆکردنەوەو دروست کردن و، لەخۆشی هیوا درێژی توشبوونە، مەگەر خوا حەز بکات دەنا حاڵی زۆربەی خەڵکی بەو جۆرەیە، مردن لەناکاو دێت ئەوەی کۆیان کردۆتەوە سودیان پێ ناگەیەنێت بۆیە کردارەکانیان بەفیڕۆ دەڕوات و ماڵەکانیان خاڵی دەبێت، بۆیە حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) خەڵکی ووریا دەکاتەوە لەوەی بەدونیا هەڵ نەخەڵەتێن، بۆ زاهید بوون هانیان دەدات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ اتَّقَوْا فَوْقَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[ البقرة: ٢١٢] قورئانی پیرۆز لەزۆر شوێندا ڕوونی کردۆتەوە، کە دونیا شتێکی کەمە، نابێ مرۆڤ لە بەرامبەر هەوڵدان بەدونیاوە خۆی سەرقاڵ بکات، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ (١) حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ (٢) كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ (٣) ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ (٤) كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ (٥) لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ (٦) ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ (٧) ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾[التكاثر: ١ـ٨].خۆشەویستی دونیاو نازو نیعمەتەکەی لەبەرامبەر داواکردنی ئاخیرەت ئێوەی سەرقاڵ کردووە تا مردنتان بۆ نەیەت و سەردانی گۆرستان و نیشتەجی نەبن واز لەسەرقاڵی دونیا ناهێنن.[1] پێشەوا ئەحمەد(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە عبداللە کوڕی شەخیریەوە ڕیوایەتی کردووە، دەڵێ: گەیشتمە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿ أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ يقول: إبن آدم مالي مالي، وهل لك من مالٍ إلا ما أكلت فأفنيتَ، اولبستَ فأبليت، أو تصدقت فأمضيت)).[2] لەفەرموودەیەکی تر پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يقول العبد مالي مالي، وإنما له من ماله ثلاث: ما أكل فأمضى، أولبس فأبلي، أوتصدق فأمضى، وما سوى ذلك فذاهب وتاركه للناس)).[3] لەئەنەسەوە(ﷺ)پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يهرم إبن آدم وتبقى معه اثنتان: الحرص والأمل)).[4]

---

١ـ معنى الزهد والمقالات وصفة الزاهدين، لأبي سعيد البعري، لا ٩.

٢ـ مسلم، رقم: ٢٩٥٨.

٣ـ مسلم، رقم: ٢٩٥٩.

٤ـ مسلم، رقم: ١٠٤٧ .

ئەحەنەفی کوڕی قەیس کاتێ دەرهەمێکی لەدەست پیاوێکدا بینی ووتی: ئەم دەرهەمە بۆکێیە؟ پیاوەکەش ووتی: بۆمنە، ئەویش فەرمووی: کاتێ بۆ تۆیە لە پاداشتێکدا یان لەبەرسوپاسێ بیبەخشی، پاشان ئەحنەف ئەم شیعرەی شاعیری وتەوە.

أنت للمال إذا أمسكته فإذا انفقته فالمال لـك[1]

واتە: گەر ماڵت کۆکردەوە و نەتبەخشی ئەوە تۆ موڵکی ئەو ماڵ و سەروەتەی، بەلاّم گەر بەخشیت ئەوە سەروەت و ماڵ موڵکی تۆیە. خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾، لەئایەتێکی تر خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى (١٣١) وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لا نَسْأَلُكَ رِزْقاً نَحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى﴾[طه: ١٣١، ١٣٢]. إبن كثير فەرموویەتی: خوای گەورە بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: مەڕوانە ئەوانەی ڕادەبوێرن لەناز و نعمەتەکانی دونیاو خۆشی، بەڵکو گوڵێکی وەریوە و ناز و نیعمەتێکی بەسەر چووە پێیانی تاقی دەکەینەوە و هەندێکیان لە بەرامبەردا کەمێ لە بەندەکانم سوپاس گوزارن، مجاهید لەبارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: ﴿.... أَزْوَاجاً مِنْهُمْ....﴾ واتە: دەوڵەمەندەکان، بێگومان خوا لەوە باشتری بەتۆ بەخشیوە کەبەوانی داوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾، پێغەمبەریش(ﷺ) لەتوانای وەدەست هێنانی نازی دونیادا کەچی زاهیدترین خەڵك بووە هەرچی دەستکەوتوە بەخشیوێتی و هیچی بۆ خۆی نەهێشتۆتەوە، فەرموویەتی: ((إن أخوف ما أخاف عليكم ما يفتح الله من زهرة الدنيا))، ئەوەی لێتان ئەترسم ئەوەیە خوای گەورە لەگوڵی دونیاتان بۆ بکاتەوە، ووتیان گوڵی دونیا چیە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: بەرەکەتەکانی زەویە، قەتادەو سەدی ووتویانە: گوڵی دونیا واتە: جوانی ژیانی دونیا، قەتادە دەڵێ: ((لنفتنهم فيه)) واتە: تاقیتان دەکەمەوە: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ واتە: بە نوێژ ڕاپەڕاندن لەسزای خوا بیان پارێزی و لەکردنیدا ئارامی لەسەر بگرە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ﴾[ التحريم: ٦]. هەروەها

---

١ـ معنى الزهد والمقالات وصفة الزاهدين، لأبي سعيد البحري، لا ٩.

لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ﴾ واتە: ئەگەر نوێژ بەچاکی ئەنجام بدەی ئەوە بەجۆرێك ڕۆزیت بۆدێت خۆشت بەخەیاڵت دا نەهاتیبێ، هەروەك فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً (٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ﴾[ الطلاق: ٢، ٣] بۆیە فەرموویەتی: ﴿لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ﴾، ثوري لەبارەی ئەم ئایەتەوە فەرموویەتی: ﴿لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا﴾، واتە: داوا کاری گەڕان بەدوای ڕزقا ناخەینە سەر شانت، ثابت دەڵێ: پێغەمبەران گەر نارەحەتی و ناخۆشیان توشبوایە پەنایان دەبردە بەر نوێژکردن.[1] لە زەیدی کوڕی ثابتەوە (ﷺ)فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((من كانت الدنيا همه فرق الله عليه أمره وجعل فقره في عينه ولم يأتيه من الدنيا إلا ماكتب له، و من كانت الآخرة نيته جمع له أمره وجعل عيناه في قلبه وأتته الدنيا وهي راغمة)).[2] ئەم ئایەتە: ﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى﴾ واتە: پاشەڕۆژ خۆشی لەدونیا و ئاخیرەتدا بەهەشتە بۆکەسێك لەخوا بترسێ. لە إبن مسعودەوە (ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر حەسیرێك خەوتبوو، شوێنی حەسیرەکە لە شانیدا دیار بوو، کە هەستا لێم دەکردەوە و شێلام، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەت پێ بدابایین شتێکمان بۆ ڕاخستایەی و لەسەری بخەوتبای، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((من و دونیا بۆ یەك نابین وەکو ڕێبوارێکم لە ڕۆژێکی گەرمادا و لە ژێر سێبەری دارێکدا و، پاشان بەجێی دەهێڵم)).[3] هاوەڵان لەسەر ڕێبازی پیغەمبەر(ﷺ) دەڕۆیشتن، زاهیدترین خەڵك بوون لەدونیا، ئارەزوو مەندترین کەس بوون بۆ ئاخیرەت، بەچاوێك ئەیانڕوانیە دونیا، کە فانیە وئاخیرەتیش نەمریە، بۆیە بەقەد سوارێك لەدونیایان کۆدەکردەوە و بەدڵ ئەیانڕوانیە ئاخیرەت، لە دوای ماندو دەرکردنێکی کەم لاشەیان دەیان زانی بە لاشەوە گەشتی دەکەن، لەوەدا زۆر چێژیان وەردەگرت، گشت ئەوانە بەیارمەتی دەری خۆشەویستەکەیان بوو(ﷺ) هەرشتێ ئەو بۆیانی حەزبکردایە ئەوانیش حەزیان پێ دەرکرد، هەرشتێکیش ئەو بۆ ئەمانی ڕق لێبوایە ئەوانیش حەزیان پێنەدەکرد.

---

١ـ معنى الزهد والمقالات وصفة الزاهدين، لا ١١.

٢ـ سنن إبن ماجه، رقم: ٤١٠٥، وصححه الالباني صحيح الجامع ٦٥١٠.

٣ ـ سنن الترمذين رقم ٢٣٧٧ وصححه الألباني، صحيح الجامع رقم (٥٦٦٨).

إبن مسعود(رضي الله عنه) بەتابعیەکانی دەفەرموو: ئێوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر کارو کردەوە ئەنجام دەدەن، بەڵام ئەوان لە ئێوە خێردارتر بوون، بۆ دونیا زاهیدتر و بۆ ئاخیرەتیش مەبەستدارتر بوون، لەتابعیەکاندا هەبوو شەو نوێژو ڕۆژو و پەرستنی لەهاوەڵان (رضي الله عنهم) زیاتر بوو، هاوەڵان بە زوهد و دڵنیایی باری باوەڕداری خۆیان پێش خستبوو پشت بەستنیان بەخوا ڕاستگۆیانە بوو گومانیش لەوەدا نیە هاوەڵان (رضي الله عنهم) لە پێغەمبەروە (ﷺ) زوهدیان وەرگرتبوو پێغەمبەر(ﷺ) دوو مانگ لە هیچ یەك لە ماڵەکانیدا ئاگر نەکراوەتەوە.[1] ووتەی حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه): باوەڕدار کۆدەکاتەوە و بێباوەڕیش چێژ وەردەگرێ و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾[ البقرة: ١٩٧]. بانگەوازە بۆ لەخواترسان و پابەند بوون بە ئاینەکەی، تەقواو لەخوا ترسانیش ئەوەیە، کاربە گوێڕایەڵیکردنی خواو بەڕێنشاندەری خوا بۆ پاداشتی خوا، بۆ دوورکەوتنەوە لەسەر پێچی کردنی خوا لەترسی خوا کاربکەی، داوا کراو لەبەندە ئەوەیە دڵی پەیوەست بکات بەخوای تاکەوەو خۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ خوا بێ، ئارەزووی هەبێ بۆ ئەو ناز و نیعمەتەی بۆ لە خواترسانی داناوە، بەترسان لەتوڕەیی و سەزاو تۆڵە سەندنەوەکانی.

لە خواترسان بەرهەمێکی هەیە، کە هەموو موسڵمانێ پێویستی پێ ی هەیە، لەوانە دەرگای کرانەوەی ڕۆزیە بە جۆرێ بەندە بەبیری دانایەت، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً (٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ﴾[ الطلاق: ٢، ٣]. هەروەها: زانستی سوود بەخش بۆی ئاسان دەبێ، لەم بارەیەوە پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾[ البقرة: ٢٨٢]، هەروەها لەو بەرهەمانە: بەرچاو ڕونیە، لەم بارەیەوە پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿إِنْ تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَاناً﴾[ الأنفال: ٢٩]. هەروەها خۆشەویستی خواو فریشتەکانی و قبولکردنی لەزەویدا، پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾[ آل عمران: ٧٦]، لەئەبو هوریرەوە (رضي الله عنه) ڕیوایەتکراوە پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی: ((إذا أحب الله

---

١ ـ البخاري رقم (٦٥٦٧)، مسلم (٢٩٧٢).

العبد قال لجبريل: قد أحببت فلاناً فأحبه، فيحبه جبريل (عليه السلام) ثم ينادي في أهل السماء، إن الله قد أحب فلانا فأحبوه، فيحبه أهل السماء ثم يوضع له القبول في الأرض)).[1] لەوانەش: سەرکەوتن وپشتیگیری خوا کەتاکە کەسە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾[ البقرە: ١٩٤]، ئەم لەگەڵ دا بوونەش لەگەڵدا بوونە لەسەرخستن و پشتگیری کردن، ئەوەش لەگەڵدا بوونی خوایە بۆ پێغەمبەران و دۆستانی، کە پارێزگاری و پاراستن پێویست دەکات، هەروەکو خوای گەورە بەموسا و هارونی فەرموو: ﴿قَالَ لا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾[ طه: ٤٦]. لە گەڵدا بوونی گشتی نمونەی فەرموودەی خوایە: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ﴾[ الحديد: ٤]، هەروەها: ﴿وَلا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لا يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ﴾[ النساء: ١٠٨] . هەروەها لەگەڵدا بوونی گشتی و وریایی وترسی وچاودێری لەبەندە پێویست دەکات، فەرو بەرەکەتەکانی ئاسمان و زەوی بەدی دەهێنێ، پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُواْ وَاتَّقَواْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ﴾[ الاعراف: ٩٦]. موژدە لەدونیا دا ئەوەیە، کە جگە لە قورئان خوا موژدە بەئیماندارە لەخواترسەکان دەدات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((الرؤيا الصالحة مِنَ الله)).[2] هەروەها فەرموویەتی: ((لم يبقَ من النبوة إلا المبشرات)).[3]

لە أبو ذر(رضي الله عنه) ووتی: ووتم: بەپێغەمبەری خوا(ﷺ)، کەسێ بۆ خوا کردەوە بکات و خەڵکیش خۆشی دەوێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((تلك عاجل بشرى المؤمن))[4]، واتە: ئەوەش خێراکاریە لە موژدەی باوەڕدارە.

لە ئیماندارانمان بینوە، کە خەڵکی لەدونیا ستایشیان کردووە، هەروەها لەو بەرهەمانەش پاراستنە لە فرو فێڵ و پلانی دوژمنان: ﴿وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئاً إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ [آل عمران: ١٢٠]، خوای گەورە ڕێشاندەری

---

١ـ مسلم، كتاب: البرو الصلة، رقم: ٦٩٣٧.

٢ـ البخاري، كتاب: الرؤيا، رقم: ٦٩٨٦.

٣ـ البخاري، رقم: ٦٩٩٠.

٤ـ مسلم، (٤/ ٢٠٣٤).

سەلامەتیان دەکات لەخراپــەی خراپــەکاران و فڕوفێڵــەکانیان، ئــەوەش بــە بــەکارهێنانی ئارامگرتن و لەخواترسان و پشت بەخوا بەستنە، کە دەوری دوژمنانی داوە، چونکە هــیچ هێزو توانایەکیان بەبێ خوا نیە، خوا بیەوێ ئەبێ و نەشیەوێ هیچ ڕونادات.

لەو بەرهەمانەش: پاراستنی نەوە و وەچەیە ئەوەش بەزۆر کردنیان لــەژێر چــاودێری، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافاً خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً﴾[ النساء: ٩]. لــەم ئایەتــە دا ئاماژەیــە بــۆ ڕێنشاندانی موسڵمانان، ئەوانەی دەترسن نەوەکانیان بەجێ بهێڵن و لەکاروباریان دەترســن تــاوەکو بکەونــە ژێــر چــاودێری خــواوە، لــەم هەستەشــدا هەڕەشــەیە لــە لەدەســتدانی منداڵەکانیان گەر لەخوا ترسیان لەدەستدا، ئاماژەشــە، کــە لــە خــوا ترســین بنــچینەیەو لقەکان دەپارێزێ، پیاوە چاکەکانیش نەوەکانیان دەپارێزرێن: ﴿وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا وَكَانَ أَبوهُمَا صَالِحاً﴾[ الكهــف: ٨٢]، هــەردوو غولامەکەی بەپیرۆزی باوکیان لەدەروون وسەروەتیان پارێزران.[1] لەو بەرهەمانەش: هــۆی قبوڵکردنی ئەوکارانەیە، کەبەختەوەری بەندەی تیادایە لە دونیا و ئاخیرەتــدا، پــەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾[ المائــدە: ٢٧] هــەروەها: هــۆی ڕزگــار بوونــە لەسزای دونیا، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّـا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَـى عَلَـى الْهُدَى فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٧) وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾[ فصلت: ١٧ـ١٨ ] لە وانەش: سڕینەوەی هەڵەکانە، کــە هۆکــاری ڕزگاربونــە لــە دۆزەخ و پاداشتی گەورەیە، هۆکــاری ســەرکەوتنە گەیــشتنە بــە بەهەشــت، پــەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَـهُ أَجْراً﴾[ الطـلاق: ٥] . هــەروەها لەو بەرهەمانەش: بەمیراتگرتنی بەهەشتە، چونکە شــیاو تــرین خــەڵکین بــۆ بەهەشــت و خواش هەربۆ ئەوکەسانەی داناوە، کەخاوەن ئــەو پلــە بــەرزەن، پــەروەردگار دەفــەرمووێ: ﴿تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِـنْ عِبَادِنَـا مَـنْ كَـانَ تَقِيّـاً﴾[ مــریم: ٦٣] . ئــەوان میراتگــری شــەرعی بەهەشــتی خــوان، بــەپێ ی ناچــن بــۆ بەهەشــت، بــەڵکو بەســواری دەڕۆن وەك

---

١ـ تفسير القران العظيم (١/ ٣٢٩).

پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾[ق: ٣١] بۆیە حسن(ﷺ) موسڵمانان بۆ لەخوا ترسین (تقوی) هان دەدات، بە پێداگربوونی لەوەی موسڵمانان لەدونیا و ئاخیرەتدا ئەم بەرهەمانە بەدەست بخەن، بۆیە فەرموویەتی: باوەڕدار تۆیشوو کۆدەکاو بێباوەڕیش چێژ وەردەگرێ.[1] ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾ [البقرە: ١٩٧].

---

١ـ الحسن بن علي لا٢٨٧، نور البصار، لا ١٢١.

# جیٚ باسی سیٚ یەم

## گرنگترین کەسایەتیەکانی خیلافەتی حەسەنی کوڕی علی

ئەو باردۆخەی دوای کۆچی دوایی ئەمیری ئیمانداران علی کوڕی ئەبو تالیب هات سەخت و ئالۆز بوون، چونکە جەنگ لەگەڵ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا مابوو، لەو دۆخەشدا خەڵکی کوفە بەیعەتی خەلیفایەتیان بە حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه)دا لە ساڵی ٤٠ك ـ ٦٦٠ ز بۆیە حسن (رضي الله عنه) کاتی لەبەردەستدا نەبوو گۆڕانکاری یەکی زۆری ئیداری یان والیەکان بگۆڕیٚ، بۆیە کار ڕاپەڕێنەکانی باوکی ڕاسپارد، کە لە ولایەتەکانی خۆیاندا بن، جگە لەکوفە کەموغیرەی کوڕی نوفەل بوو[1]، دوای ئەوەی بۆ معاویە کەوتە ڕیٚ لەجیاتی والیە پێشووەکەی، کە هانی کوڕی النخعی بوو[2]، لەمەدائین سعدی کوڕی مەسعودی سەقەفی هەر بەکار ڕاپەڕاندن بەردەوام بوو[3]، لە لایەن خەلیفە علی کوڕی ئەبی تالیب(رضي الله عنه) هەر والی ئەو شارە بوو[4]، حسن لە خەلیفەیەتیەکەیدا لەوێدا هێشتنەوەی و ئەویش پلە ئیداریەکەی خۆی ڕادەپەڕاند، تا کۆتایی سەردەمی حەسەنی کوڕی علی (رضي الله عنه) و دەست هەڵگرتنی بۆ معاویە هەر لەوشارەدا بوو.

سەبارەت بە بەصرەش ئەوە لەهەندیٚ گێڕانەوەکاندا هاتووە، بەوەی عبداللە کوڕی عباس لەلایەن علی کوڕی ئەبو تالیبی خەلیفەوە (رضي الله عنه)کرا بە والی ئەوشارە بۆ مەبەستی بەستنی ئاشتەوایی لەگەڵ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان لەو شارە دا مایەوە، پاشان بەوازهێنان لەسیاسەت و یەك لابونەوە بۆ زانست و فێرکردن ڕووی کردە مەککەی پیرۆز بصرەی بەجیٚ هێشت[5]، ویلایەتی فارسیش بۆ زیادی کوڕی سوفیان بوو.[6] علی (رضي الله عنه)

---

١ـ التبيين في أنساب القرشيين، لا( ٨٠، ٨١).

٢ـ تاريخ خليفة بن خياط، نقلاً عن الحسن بن علي، فتيخان، لا ٨٥.

٣ ـ أنساب الاشراف (٥/٢١٤، نهاية الارب (٢/٢٦٦).

٤ـ التاريخ الكبير للبخاري(٤/ ٥٠).

٥ـ الحلة السيراء للقضاعي، نقلاً عن الحسن بن علي، لا ٨٦.

٦ـ الحسن بن علي، لا ٨٦.

بۆ تەمبیکردنی هەندێ لە هەڵگەڕاوەکان ناردیە فارس و ئەویش توانی لەناویان ببات[1]، پاشان کردیە والی فارس و تابەستنی ئاشتەوایی لەگەڵ معاویە ولایەتەکەی بەردەوام بوو.[2] حسن (ﷺ) هەمان ئەوکار ڕاپەڕێنەرانەی هێشتەوە، کە علی کوڕی ئەبو تالیب(ﷺ)دایانی نابوو، عوبدڵلای کوڕی ئەبو ڕافیعی بە نوسەر[3]، شورەیحی کوڕی حارسی بە حاکمی کوفە هێشتەوە[4]، موعەقەلی کوڕی قەیسی ڕیاحیش بەڕاپەڕینەری پۆلیسی مایەوە.[5]

گرنگترین کەسێتییەکانی سەردەمی خیلافەتی حسینی کوڕی علی بوو(ﷺ) بۆیە بەپشتیوانی خواش بەشێکی (کتێبێکی) تایبەتی بۆ تەرخان دەکەین، هەروەها گرنگترین کەسەکانی تری سەردەمەکەی قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەی خەزرەجی و عبیداللە کوڕی عبد المطلیبی هاشمی و عبداللە کوڕی جعفری ئەبو تالیب، بە پێویستیشی ئەزانم ئەم سێ کەسەی دواتر بناسێنم.

## یەکەم: قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە(ﷺ):

قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەی کوڕی دولەیمی کوڕی حاریسە کوڕی ئەبو خوزەیمەی کوڕی ثعلبەی کوڕی تەریفی کوڕی خەزرەجی کوڕی ساعیدە ی کوڕی کەعب، ئەمیری موجاهید، أبو عبداللە گەورەی خەزرەج و کوڕی هاوڕێی پێغەمبەری خوا(ﷺ)[6]، لە گەورە هاوەڵان و یەکێك بوو لەگەورە و بەڕێزانی عەرەب، لەجەنگا لە گەڵ فریاکەوتە و ئازایەتییدا خاوەن بۆ چوون و پلان بوو، بەبێ هیچ زۆر لێ کردنێك گەورەی هۆزەکەی بوو[7]، لە بارەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) چەند فەرموودەیەکی هەیە، لەوانە لە ئەبو لەیلاوە کەدەڵێ: سەهلی کوڕی حونەیف و قەیسی کوڕی سعد لەقادسیەدا

---

١ـ الحسن بن علي، لا ٨٦.

٢ـ مروج الذهب (٣/ ١٥)، الحسن بن علي، لا ٨٦.

٣ـ محاضرة الأبرار، لإبن العربي (١/ ٦٦)، الحسن بن علي، لا ٨٧.

٤ـ مختصر التأريخ لإبن الكمازروني، لا ٨٠.

٥ـ نهاية الأرب(٥/ ٢٢٣).

٦ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ١٠٢).

٧ـ أسد الغابة (٤/٤٥٠).

دانیشتبوون، تەرمێکیان بەلادا تێپەڕ کرا ئەوانیش هەستا نەسەر پێ، ووترا: ئەم تەرمە موسڵمان نەبوو، هەردووکیان وتیان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەرمێکی بەلادا تێ پەڕکرا هەستایە سەرپێ، ووتیان تەرمی جوولەکەیە، فەرمووی: بۆ مرۆڤ نیە؟ [1] لەم فەرموودەیەدا ئەوە دەردەکەوێ پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزی مرۆڤەکانی گرتووە، لەو ڕووەی کەمرۆڤە گەرچی هەر ئاینێکی هەبێ.

لە ئەبو عمارەوە ئەویش لەقەیسی کوڕی سعدەوە دەڵێ: پێش ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرزبێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردین عاشوڕا بە ڕۆژوو بین، کاتێکیش ڕەمەزان فەرز بوو، بۆ عاشوڕا نەفەرمانی پێ کردین نە ڕێگری کردین، ئێمەش عاشوڕا بە ڕۆژوو دەبوین. [2]

ئەنەسیش لێیەوە ڕیوایەتی کردووە، سەعلەبەی أبو مالیك و ئەبو مەیسەرە و عبدالرحمانی کوڕی ئەبو لەیلا و عوروەو [3] عبداللە کوڕی مالیکی جەیشانی و ئەبو عەمارەی هەمەدانی ومەیمونی کوڕی ئەبو شەبیب و عەریبی کوڕی حومەیدی هەمەدانی و وەلیدی کوڕی عەبدەو، خەڵکانیکی تر [4] قەیسی کوڕی سعد لەکوفە و شام و میسردا بەناوبانگ بووە [5]، پیاویکی باڵا بەرزی جوان بووە، گەر سواری گوێدرێژ بووایە قاچی دەگەیشتە سەر زەوی. [6]

دایکی ئامۆزای باوکی بووە، ناوی فەکیهە ی کچی عوبیدی کوڕی دولەیم بووە، [7] شوێنی وپایەی لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو گەورەی ئەمیری جەیش بووە، لەهەندێ لە جەنگەکانیشدا ئاڵاکەی پێغەمبەری(ﷺ) هەڵگرتووە ولەسەر سەدەقە داینا‌وە [8] و

---

١ـ البخاري، رقم: ١٣١٢.

٢ـ مسند أحمد(٣/ ٤٢٢).

٣ـ ا لإصابة(٥/ ٣٦٠).

٤ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ١٠٢).

٥ـ هەمان سەرچاوە.

٦ ـ الإصابة(٥/ ٣١٦).

٧ـ هەمان سەرچاوە.

٨ـ البداية والنهاية (١١/ ٣٥٤).

لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامادەی جەنگ و ڕووداوەکان بووە، لەهەندێ سریەدا بەشداربووە، لەوانە:

### ١ـ سریەی کوڕی جەڕاح (رضي الله عنه) بۆ سیف البحر.

سریەی کوڕی ئەبو عوبیدە (رضي الله عنه) بۆ سیف البحرو درێژەدان بەسیاسەتی سەربازی پێغەمبەر(ﷺ) دادەنرێت لەلاوازکردن و گەمارۆدانی ئابوری قورەیش بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، پێغەمبەریش(ﷺ) بەسێ سەد سوارەوە ئەبو عوبیدەی کوڕی جەڕاحی بۆ کەنار دەریا نارد، تاوەکو ڕێگری قوڕیش بکەن کاتێك کە بەڕێوە بوون، تویشوویان نەما، ئەبو عوبیدەش فرمانیدا سوپا نان بدرێ و توێشوو کۆکرایەوە، ئەندازەی توێشووی هەموو ڕۆژێکیان کەمبوو، تا لە کۆتاییدا گەیشتە ئەوەی هەریەکەیان دەنکە خورمایەکیان بەرکەوێ، سەربازەکان سەختی هەڵوێستیان بۆ دەرکەوت و بەدڵخۆشیەوە ئەم کارەیان قبوڵکرد، بەشدار بوون لەو پلانەی فەرماندەکەی بۆیانی دەکرد لەخۆگرتنەوە بەخواردنی یەك دەنکە خورما، زۆربەی کات وەها مانەوە و ئەوە حاڵیان بوو.[1] جابر (رضي الله عنه)یەکێك بوو لە ئەندامانی ئەو سریەیە دەڵێ: وەکو منداڵ ئەو خورمایەمان ئەمژی و، پاشان ئاومان دەخواردەوە، ئەو ڕۆژە تا شەو بەسمان بوو.[2] وەهبی کوڕی کیسانیش لە جابری(رضي الله عنه) پرسی: خورمایەك چی کارێ دەکات؟ ئەویش فەرمووی: کە خورمایەکە نەما ئەوجا زانیمان چیمان لەدەستتداوە[3] ئەو سوپایە ناچار بوو گەڵای وەریوو بخوا[4] ئەم سوپایەش بەسوپای گەڵای وەریو ناسرا (جیش الخبط).[5] ئەو هەڵوێستە زۆرکاریکردە سەر قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە(رضي الله عنه)یەکێك بوو لەسەربازەکانی ئەو سریەیە وسێ ووشتری بۆ سوپاکە سەربڕی، پاشان سێ ووشتری تر، پاشان سێ ووشتری تر، پاشان ئەبا

---

١ـ السرايا والبعوث النبوية، لا ١١٨.

٢ ـ شرح النووي على مسلم (١٣/ ٨٤).

٣ـ فتح الباري(٨/ ٧٧).

٤ـ شرح النووي (١٣/ ٨٤).

٥ ـ فتح الباري(٨/ ٧٨).

عوبیده، ڕێگری کردوو نەیهێشت[1] ئەو سەخاوەتی و جوامێریەی قەیسی کوڕی سعد ئەنجامیداوە لە (تأريخ إبن عساكر)دا هاتووە، لەداودی کوڕی قەیس و ئیبراهیمی کوڕی محمدی ئەنصار و خاریجەی کوڕی حاریسەوە، ووتیان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبا عوبیدەی بەسریەیەکی سێ سەد پیاوی کۆچەر و ئەنصاری تیادابوو بۆکەناری دەریا نارد، مانەوە تا ڕوبەڕووی برسێتیەکی سەخت بوونەوە، قەیسی کوڕی سعد ووتی: لێرەدا کێ ووشترێکم بداتێ و لەمەدینەدا بارێ خورمای پێ دەدەم، قەیس کابرایەکی جوهەنی بینی و پێی ووت: جوهەنیەکە ووتی: سوێند بەخوا ناتناسم، تۆکێی؟

ووتی: کوڕی سعدی کوڕی عوبادەی کوڕی دولەیم، ئەویش پێنج ووشتری پێ فرۆشت هەر ووشترێك بەبارێ خورما، دەشتەکیەکە مەرجی لەسەر دانا، کە خورمای بنەماڵەی (دولەیم بێ) قەیسیش فەرمووی: باشە، ووتی: با ئەنصاریەك شایەتیت بۆ بدات و کۆچەرێکیان لەگەڵدا بوو، قەیس ووتی: هەرکەسێ حەزبکەی با بەشایەت بێ، ئەوەی شایەتی دا عمری کوڕی خەتاب بوو، عمر فەرمووی: شایەتی چی بدەم؟ ئەمە قەرزارە و ماڵی نیە وماڵ و سەروەت هی باوکێتی، قەرزدەرەکە ووتی: سوێند بەخوا قەیس لەبارێ خورما دا ستەم بەباوکی ناکات، ڕوویەکی جوان و پیرۆزی بینی.. .. قەیس ووشترەکانی لە سێ شوێندا و هەر ڕۆژە و دانەیەکیانی سەربڕی، تا ئەمیرەکەی لەسەربڕینی ووشتری تردا ڕێگیری لێ کرد ووتوتی: ئەتەوێ باری قەرزت قورس بکەیت و هیچ سەروەتێکت نیە[2].

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە... ئەبو عوبیدەهات و عمری لەگەڵدا بوو، ووتی: ناهێڵم سەربڕێت، ئەتەوێ خۆت بە هۆی قەرزداری لەناوبەریبەیت؟ قەیس ووتی: ئەی ئەبو عوبیدە ئەبینی أبو ثابت قەرزی خەڵك ئەبژێرێ و دەیخاتە سەرخۆی، بەبارێ خورما موجاهیدانی ڕێگەی خوا لەبرسێتی ڕزگاردەکات و من لە ناو دەبات، خەریك بوو ئەبو عوبیدە لەبڕیارەکەی پاشگەزبێتەوە، بەڵام عمر پێداگری کردووە ئەویش ڕێگری کرد، دوو

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ تاريخ إبن عساكر(٥٢/ ٢٨٠).

ووشتر مایەوە قەیس نێوەڕۆ هێنایە مەدینەوە و بەسعد گەیش، ووتی: چیت بۆ برسێتی کۆمەڵەکە کرد؟ فەرمووی سەرمبڕی، ووتی: پێکات، ئینجا چی؟ ووتی: باوکم قەرزی کەسانی دوور لەئەستۆدەگرێ، و ئەمجاتە ئەستۆ و خواردن ئەداتە برسیان و بەرامبەر من وانابێ، ووتی: ئەوە چوار باخ بۆ تۆ کە ئەوەی خوارەوەی پەنجا باری تێدایە.[1]

بەدەویەکەش لە گەڵ قەیسدا ڕۆیشت وبارەکەی پێدا و پۆشاکی پێدا، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەعرابیەکە دەڵێ: سوێند بەخوا نموونەی باوکتم لەدەست نەدا باوکت یەکێکە لەگەورەی هۆزەکەت و ئەمیرەکەت ڕێگری لە من کرد کە بیفرۆشم، ووتم: بۆ چی؟ ووتی: سەروەت ومالی نیە، کاتێك ڕەچەڵەکی خۆتت باسکرد ناسیتم و زانیم ڕەوشتت بەرزەو قەرزەکەم پێدای، لەم چیرۆکەشدا بەهاو وانە گەلێکی زۆر فێرە دەبین لەوانەش:

أ ـ ئارامگرتن بۆ بانگەواز کاران، لەبەر ئەوەی بەناڕەحەتی زۆر گەورەدا تێپەڕ ئەبن.

ب ـ گرنگیدان پەروەردەکردنی منداڵەکان لەسەر سەخاوەتی و ڕەوشت جوانی، ئەوەش لەپەروەردکردنی سعد بۆ قەیسی کوڕی و پێدانی ماڵی زۆر بۆ ئەوەی لە ڕێگەی پیاوەتی و سەخاوەتیدا بی بەخشێ.

ج ـ گرنگیدان بە سەروەت و سامان بۆ بەندەی چاك، چونکە گەر سعد سەروەتێکی زۆری نە بوایەو ئەوە قەیس نەیدە توانی لەچارەسەرکردنی کێشەی برسێتیدا یارمەتیدەربێ.

قەیسی کوڕی سعد دەیووت: ((اللهم هَب لي حمداً ومجداً لا مجداً إلا بفعالٍ ولا فعالٍ إلا بمالٍ اللهم لا يصلحني القليل)).[2]

## ٢ـ لەفەتحی مەکەدا:

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتە مەککەوە و عەمامەیەکە ڕەشی بێ ئیحرامی لەبەربوو [1] کاتێك بینی کەخوای گەورە بەو فەتحە ڕێزی لێناوە ولەبەرخوا سەری نواند وسکی بەڕانیەوە نووساند، چویە مەککە و سورەتی فەتحی دەخوێند و [2] بە هەستکردن بەنیعمەتی فەتح و سەرکەوتنی گەورە [3] کاتێك بەڕزگارکراوی چووە مەککە کە نێوجەرگەی دوورگەی عەرەب و سەنتەری ڕوحی وسیاسی ئەو دوورگەیەیە بوو، هەموو دروشمەکانی دادگەری و یەکسانی و خاکەرایی و ملکەچ بوونی بەرزکردەوە، جگە لەئوسامەی کوڕی زەید کە کوڕی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچ نەوەیەکی بەنی هاشم وگەورەکانی قورەیش بەداوی نە ڕۆیشتن لە مەکەوە [4] ئەوکاتە بەیانی ڕۆژی جومعە بوو کەبیستی ڕەمەزان بوو سالّی هەشتی کۆچی [5]، بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) سور بوو لەسەر ئەوەی بەرەی ناوخۆی مەککە لەکاتی چونە ژوورەوەی لەڕۆژی فەتحدا ئارام بێت، بۆیەکاتێك قسەکەی سعدی کوڕی عوبادەی پێگەیشت بەرامبەر أبوسوفیان ووتبوی: ئەم ڕۆ ڕۆژی تۆلّە سەندنەوەیە، ڕۆژی حەلاّلکردنی کەعبەیە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (ئەمڕۆ ڕۆژێکە خوا کەعبەی تێدابەرز ڕادەگرێت، ڕۆژێکە کەعبەی تێدا دادەپۆشرێ) [6] ئالاّکەشی لەسعدی کوڕی عوبادەوە وەرگرت و دایە دەست قەیسی کوڕیەوە، بەومامەڵەیە جوانەش نەیهێشت ئەگەری جەنگی دوولایەنە دروست بێت، لەو کاتەدا وروژان ڕوی نەدا، ئەنصاریەکانیش نەوروژان، پێغەمبەری (ﷺ) ئالاّکەی لەئەنصاریەك وەرگرت و بیداتە کۆچەرێك، لەئەنصاریەك وەریبگرێ وبیداتە ئەنصارێکی تر، بەلّکو لەئەنصاریەك وەریگرتو دایە دەست کوڕەکەی، سروشتی مرۆڤیشە وایە ڕازی نابێ کەسیتر جگە لەکوڕەکەی لەو بەڕێزتربێت، [7]، لەوڕوداوەشدا دانایی پێغەمبەری (ﷺ) دەردەکەوێت

---

١ـ مسلم، رقم: ١٣٥٨.

٢ـ البخاري، رقم: ٤٢٨١، كتاب: المغازي.

٣ـ صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة، لا ٣٩٦.

٤ـ البخاري، رقم: ٢٤٢٨٩.

٥ـ السيرة النبوية لإبن الحسن النبوي، لا ٣٣٧.

٦ـ البخاري، كتاب المغازي، (١٠٨/٥)، رقم: ٤٢٨٠.

٧ـ قيادة الرسول السياسة والعسكرية، لا ١٩٦.

لەچۆنێتی ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و شێوازی مامەڵکردنی لەگەڵ دەرونی مرۆڤەکان، نەیهێشت هەڵەکەی سعد تێپەڕبێ و لەهەمان کاتیشدا ڕەچاوی دەرونی کرد، بۆیە هەڵەی سعدی ڕاستکردەوەو ئالآکەی دایە دەست کوڕەکەیەوە.

### ٣ـ لەسەردەمی أبوبکری سەدیق(ﷺ):

ژن و ژنخوازی خزمایەتی نێوان أبوبکر و قەیسی کوڕی عوبادە زۆر بەهێزبوو، قەیس (ﷺ) قەریبەی کچی ئەبو عەتیقی خوشکی أبو بکری سدیقی مارە کرد[١]، إبن عبدالبریش لە ڕیوایەتی کردوە وتوویەتی: سعدی کوڕی عوبادە مرد و ژنەکەی سکێکی بوو سعد پێ نەزانی، سعد لەو کاتەدا لەمەدینە دەرچوو سەروەتەکەی لەنێو منداڵەکانیدا دابەشکرد، کە منالّەکە لەدایك بوو سعد مردبوو، أبو بکرو عمر(ﷺ) لەو بارەوە قسەیان لەگەڵ قەیسدا کرد کەمنالّەکەش بەشی هەیە لەوسەروەتەدا، قەیس ووتی: بەشەکەی من بۆ ئەو منداڵە و ئەوبەشکردنەی باوکم کردوویەتی نایگۆڕمەوە - ڕیوایەتێکی ڕاست ومتمانە دارە[٢]، ئەم ڕیوایەتە ڕاستەش ئەو ڕیوایەتە پوچ وبێناوەڕۆکە هەڵدەوەشێنێتەوە کەدراوەتە پاڵ گەورەی ئەنصاریەکان بەوەی کاریکردووە بۆ پەرتە وازەکردنی ڕێزی موسڵمانان ورقبونەوەی لەوشتانەی ببەخشرێ بۆ سەرکەوتن وجیهاد و دەستگرۆ کردنی موهاجیران و تانەدان لەئیسلامبوونی بەوقسەیەی دراوەتە پاڵ سعدی کوڕی عوبادە بەوەی دەڵێ: بەیعەتنان پێ ناکەم تا تیرەکەم بەئێوەنەگرم وشمشێرەکەم ڕانەوشێنم، بە نوێژیان نوێژی نەکردەوە و ناو کۆمەڵەکە یانش نەبووە لەگەڵتاندا حەجی نەکردووە، تا أبو بکر مردووە[٣] ئەم ڕیوایەتە پوچەش بۆ تانەوزەبردان لەیەکبوونی موهاجیران و ئەنصاریەکان و برایەتیە ڕاستگۆیەکانیان بەکارهێنراوە، بۆیە ڕاویەکە هەوەسبازەو هەواڵێکی هیچەو متمانەدارنیە[٤] بەتایبەت لەبابەتە خیلافیەکاندا، ڕاوی لوتی کوڕی یەحیا أبومونخنەفی پەڕاوێز خراوە، جگە لەشیعەکەس پشت بەگێڕانەوەکانی نابەستێت، بەپێ ی قسەی إبن

---

١ـ البداية والنهاية (١١/٣٥٥).

٢ـ الإستيعاب(٣/ ١٢٨٩).

٣ـ تاريخ الطبري(٤/ ٤٢).

٤ـ ميزان الأعتدال في نقد الرجال(٣/ ٢٩٩٢).

القیم بەیەکێك لەگەورە مێژوو نوسانی شیعە دادەنرێت[1]، بۆیە زۆر نەماوەتەوە بۆشام ڕۆیشتووەو لەحوراندا مردووە[2] ڕیوایەتێکی صەحیحیش ڕوونیدەکاتەوە بەوەی سعدی کوڕی عوبادە لەخیلافەتی أبوبکری سەیقدا وەفاتی کردووە وەکو باسمانکرد، هەروەها سعدی کوڕی عوبادە (ﷺ) بە کرداری بەیعەتی خەلیفەیی بەأبوبکر داوە لەدوای ئەوگفتوگۆیەی کە لەسەقیفەی بەنی ساعد بەیعەت درا بە أبو بکر، ئامۆزاکەشی کەبەشیری کوڕی سعدی ئەنصاری بووە یەکەمین کەسێك بووە لەکۆبونەوەی سەقیفەدا بەیعەتی بە أبوبکر داوە و ڕیوایەتە صحیحەکانیش هیچ تەنگەژەیەکیان نە نەسەلماندوە جێ ی مەترسی بووبێت، هیچ پەرتە وازەکیشان نەسەلماندووە کە لە نێوان پالێوراوانی خیلافەت دروست بوبێت وەك ئەوەی هەندێ لە کتێبە مێژوویەکان گومانیان بردووە، بەڵکو برایەتی ئیسلامی وەك خۆی مایەوە، ڕیوایەتەصحیحەکان ئەوەئەیسەلمێنن، کە زیاتر توندو تۆڵتر بووە.

ڕیوایەتە صەحیحەکانیش هیچ پیلانێکیان نەسەلماندووەکە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)[3] بۆ قۆرغکردنەوەی دەسەڵات لەنێوان أبوبکرو عمرو أبوعوبیدەدا ڕوویدابێ، ئەوان لەهەموو کەسێ لەخواترس بوون لەوەی ئەوجۆرە کارو کردەوانە ئەنجام بدەن[4]، هەندێ مێژوونوسی هەوەسبازیش هەوڵیانداوە نیشانی بدەن، کە گەورەی بەڕێز أبو قەیسی ئەنصاری خزرجی مەدینەیی، جوامێرو گەورەی خەزرەج[5]، سعدی کوڕی عوبادە (ﷺ) بکەنە ململانێکاری (موهاجیرین) و بۆ خیلافەت خراپ هەوڵی دابێ وپیلانی بۆ کە گێڕابێ و بۆپێ گەیشتنی هەموو شێوازەکانی پەرتەوازەکردنی نێو موسڵمانانی بەکارهێناوە.

---

١ـ مرويات ابي مخنف في تاريخ الطبري: د. يحيى ليحيى،لا ( ٤٥ ، ٤٦).

٢ ـ سير اعلام النبلاء(١/ ٢٧٧) نیسنادەکەی ئەوپەڕی لاوازە، چونکە واقیدە پەراۆنرخراووبێ متمانە بە و محمدی کوڕی سالح ئەلتەمار ڕاستگۆیەوە هەڵە یکردووە وزوربەیری کوڕی مونزریش زانراو نیە

٣ ـ استخلاف أبوبكر ـ جمال عبدالهادي، لا( ٥٠، ٥١، ٥٣).

٤ ـ أبو بكر الصديق، للصلابي، لا ١٤٤.

٥ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٢٧٠).

ئەو پیاوە باوکی قەیس ـ گەر بگەڕێنەوە مێژووەکەی و هەڵوێستی لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ببینین ئەوە مێژووەکەی ئەیخاتە ناو ئەو پیاوە هەڵبژاردە پاکانەی کە بۆ دونیا پەژارەیان نەبووە، لەپەیمانی عەقەبەی دووەمدا جوامێرو هەڵبژاردە بووە تاوەکو قورەیش لەنزیك مەککەدا گرتوویانە و دەستیان بەگەردنیەوە بەستۆتەوە و بەدیلی بردوویانەتە مەککە، تاوەکو جوبەیری کوڕی مەتعەمی کوڕی عەدی کەلەمەدینەدا نزیك و هاوسێیان بوو لەدەستیانی ڕزگارکرد، جوبەیر یەکێك بوو سەخی و سەخاوەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوشایەتیەی بۆداوە، پێغەمبەر خوا(ﷺ) ـ دوای خوا ـ پشتی بەخۆی وسعدی کوڕی موعاز بەستووە لەجەنگی خەندەقدا ڕاوێژی پێکردوون کەسێ یەکی بەرهەمی شاری مەدینە بدەنە عەینیەی کوڕی حصن الفزاری و وەڵامی هەردوو سعدیش بەڵگەی باوەڕداری و تەواوی گیانفیدایی بوو.[1]

بۆیە هەڵوێستەکانی سعد بەناوبانگ بوو، ئەم هاوەڵە پەیابەرزەی خاوەن ڕابردووی شکۆدار لەخزمەتکردنی ئیسلام و هاوڕێیەتی کردنی ڕاستگۆیانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناسەلمێ وناکرێ لەکۆبونەوەی سەقیفەدا دەمارگیری نەفامی زیندوو کردبێتەوە، تاوەکو لەتاریکی و وتەمو موژی ئەوپەرتەوازییەدا پایەی خیلافەت بەدەست بگرێ، هەروەها نەسەلماوە و ڕاستیش نیە ئەو ڕیوایەتەی لەهەندێ سەرچاوەدا هاتووە بەوەی ـ دوای بەیعەت پێدانەوە أبو بکر ـ نوێژی ئەوانی لەگەڵ ئەوان نەکردووە و لەگەڵیندا کیاندا حەجی نەکردبێ[2]، وەکو ئەوەی سعدی کوڕی عوبادە (ﷺ) لەکۆمەڵەی موسڵمانان جیا بوو وبێتەوە[3] ئەوەش ڕیوایەتێکی پوچ و درۆیەکی ئاشکرایە.

لە ڕیوایەتە صەحیحەکاندا کاتێك أبو بکر لە ڕۆژی سەقیفە وتاری داوە و گەورەیی ئەنصاری باس کردووە سعد بەیعتی پێداوە، أبوبکر فەرمووی: بێگومان ئەزانم پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر خەڵکی دۆڵێك بگرن و ئەنصاریش دۆڵێك بگرێتە بەر ئەچمە

---

١ ـ الإستعاب في معرفة الأصحاب (٢/ ٥٩٤).

٢ ـ الخلافة والخلفاء الراشيدين، سالم البهنساوي، لا ٤٨.

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٤٩.

دۆڵـی ئەنـصارەوە))[1]، پاشـان بەبەڵگەیـەکی تـەواوە بـەبیری سـعدی هێناوەتـەوە و فەرموویەتی: بێگومان ئـەزانی ئـەی سـعد کـەتۆش دانـشتبووی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمووی: قورەیش ڕاپەڕێنەری ئەم ئاینەن بۆیە چاکەی خەڵکی چاکەی ئەوانەو خراپەشیان خراپەیانە)) سعد فەرمووی: ڕاستتکرد ئێمە وەزیر و ئێوەش ئەمیرن[2] بۆیە یەك یـەك بـۆ بەیعەتتدان چوونە پێشەوەو سعدیش بەیعـەتی دا[3] بـەوەش بەیعەتـدانی سـعدی کـوڕی عوبادە ئەسەلمێنێ و بەوەش کۆدەنگی ئەنصار لەسەر بەیعەتدان بەأبو بکر بۆ خەلیفایـەتی ئەسەلمی و هیچ واتە یەکیش بۆ برەودان ڕیوایەتی پوچ و بێ ناوەڕۆك نامێنێتـەوە، بـەڵکو ئەبێتە پێچەوانەی واقیع و تۆمەتێکی ترسناك کە کاری پەرتەوازەکردنی ڕیزی موسڵمانانە بە تانـەدان لـە ئیـسلام وحاشـاکردنی لەسـەرکەوتن و جیهـاد کـردن دەسـتگرۆکردنی موجاهیدکاران بدرێتە پاڵ گەورەی ئەنصار، ڕوونیشمان کردەوەکە ئیـسنادەکەی ئەوپـەڕی لاوازە و پێچەوانەی ژیانی سعدی کوڕی عوبادەیـە و ئەوبەیعەتـەی کـە لەگوێڕایـەڵیکردن لەگەردنی خۆی نابوو، بەو گەورەییانەی لەبارەیەوە ڕیوایەتـەوە سـعد مرۆڤێکـی ڕەخـساو بووە[4] سعد وەسیەتێکی هەیە کەتیایدا وەسیەتی کوڕەکەی کردووە تێـدا هـاتووە: کـوڕە شیرینەکەم وسیەتێکت بۆ دەکەم لەبەری کە، ئەگەر لەبەری نەکەی ئەوە تۆ بۆ غەیری ئـەو وەسیەتە لەناو چووتری، گەر دەست نوێژت شۆرد دەست نوێژەکەت باش بشۆ، پاشان وەکو کەسێکی خوا حافیزکار نوێژبکە کە ئیتر ناگەڕێیتەوە، بێ ئومێـدی لەخـەڵکی نیـشان بدە ئەوە دەوڵەمەندیە، وورپابە پێداویستیەکانت لەوان داوا بکەی، چـونکە ئەوانەهـەژاری ئامادەبوون وورپابە لەهەموو نەتوانرێ عوزری بۆ بهێندرێتەوە.[5]

## ٤ـ لەسەردەمی علی(رضي الله عنه)دا:

---

١ ـ البخاري، كتاب: التمنى، رقم: ٧٢٤٤.

٢ـ السلسلة الصحيحة، رقم: ١١٥٦، مسند احمد، رقم: ١٨.

٣ـ الأنصار في العصر الراشدي، لا ١٠٢، تاريخ الطبري(٣/ ٢٢٣).

٤ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٠٢، ١٠٣.

٥ـ تأريخ إبن عساكر(٢٢/ ١٨١).

عثمان(رضي الله عنه) شەهید کرا، محمدی کوڕی أبوحەنیفە والیەتی مصری داگیر کردبوو کە عثمان دانی پێ نەنابوو، تاوەکو معاویە سوپایەکی ناردە سەرمیسر و محمدی کوڕی أبو حەنیفەی گرت و پاشان بەندیکرد و کوشتی[1] ڕیوایەت کراوە کەعلی محمدی کوڕی ئەبو حەنیفەی لەسەر مصر دانەناوە، بەس وەکو خۆی هێشتوتیەوە تا کاتێ کوژراوەو ئینجا علی حوسەینی کوڕی سعدی ئەنصاری کردۆتە والی مصر[2] علی(رضي الله عنه) پێی فەرموو: کردومیەتە والی مصرو بکەوە ڕێ، بۆ خۆئامادەکردن متمانەدارەکانت کۆبکەرەوە، ئەوەی حەزدەکەی هاوەڵت بن بالەگەڵتدا بڕۆن و سەربازت هەیە تا بۆ دوژمنت ترسناك بیت و بۆ دۆست و والیەتەکەشت گرنگ بیت، ئەگەر خوا حەزی کردوو گەیشتیە جێ بۆ چاکەکاری چاکەکار بە و بۆ خراپە کاریش لەسەریان توندبە تا چاك دەبن و سۆزت بەرامبەر گشتی و تایبەتی خەڵك هەبێت، چونکە هاوەڵیتیکردن و چاك بوون خۆشەویستیەو چاکەیە.[3]

بێگومان کاتێك بەرەو میسر ڕۆیشت لەزۆر حاڵەتدا ووریایی و مامەڵە جوانی قەیس دەرکەوتووە کۆمەڵێکی تیدابوو لەکوشتنی عثماندا زۆر تورە بوون، کۆمەڵکیشیان لەکوشتنیا بەشدار بوون، کۆمەڵێ سواری خەڵکی میسر پێش ئەوەی بچیتە میسرەوە پێی گەیشتن و و پیان ووت تۆ کێیت؟ ووتی: من تۆڵەسێنی عثمانم بەشوێن ئەوانەدا دەگەڕێم کە بۆی هاتوون و بۆ خوا سەریدەخەم، ووتیان تۆ کێ ی ؟ ووتی: من قیسی کوڕی سعدم، ووتیان بڕۆ ئەویش ڕۆیشت تا ڕۆیشتە میسر، ئەو هەڵوێستەی قەیس توانا داری کرد. لەوەی بڕواتە میسر، پاشان ڕای گەیاند کە بۆتە ئەمیری میسر، پێدەچێت گەر بۆ سەربازە سوارەکان ئاشکرای بکردایە ئەمیرە، ڕێگەیان پێ نەدایە بچێتە ناو میسر، هەروەکو لەبەرامبەر ئەوانەدا ئەو ڕووداوە دروست دەبوون کە علی بۆ والیەتی کردنی شام دەیناردن، سەربازەکانی شامیش گەر بیان زانی بایە بۆ والیەتی شام هاتوون ئەوە لەچونە ناو شامەوە ڕێگری ئەو والیە تازانەیان دەکرد.[4]

---

١ـ ولاة مصر للكندي، لا ٤٢، ٤٣، الولاية على البلدان (٢/ ٩).

٢ـ ولاة مصر، لا ٤٤، النجوم الزاهرة (١/ ٩٤).

٣ـ الكامل في تأريخ (٢/ ٣٥٤).

٤ـ الولاية على البلدان (٢/١٠)، نقلا عن نهاية الأرب في تأريخ العرب، للنويري.

کاتێکیش قەیسی کوڕی سعد گەیشتە فسطاط و چوە سەر مینبەر بۆ ووتاری خەڵکی میسر داو نوسراوێکی علی کوڕی ئەبو تالیبی(ﷺ) بەسەر دا خوێندنەوە داوای بەیعەتی دانی کرد بۆ علی [1] لەوێدا خەڵکی میسر بەسەر دوو کۆمەڵە دا دابەش بوو ن کۆمەڵێکی بەیعەتیان بەعلی دا وەکو والی، کۆمەڵێکیش هیچیان نەکرد، قەیسی کوڕی سعدیش دانابوو لەگەڵ ئەوکەسانەی بەیعەتیان دا ئەوانەش کەبەیعەتیان نەدا، بۆیە بۆ بەیعەتدان زۆری لیَ نەکردن وبەحاڵی خۆیانەوە هێشتنی [2] بەوەشەوە نەیهێشت بەڵکو لەشوێنی گۆشە گیر بونیانیشیان شتی بۆ ناردن و کۆمەڵە خەڵکانیش ڕێزی لیَ نان و چاکە کاری لەگەڵیاندا کرد [3]، ئەومامەڵە جوانەش یارمەتی دەری بوو لەوەی پێکدادان لەنێوانیان دا دروست نەبیَ، پاشان یارمەتیدەری ئارامبونەوەی بارودۆخی میسر بوو، تاقەیس توانی کاروبارەکانی ڕێکبخات و ئەمیرەکانی دابەشکردو خەراجی ڕێکخست وپیاوانی پۆلیسی دیاریکرد [4]، بەو جۆرەش توانی ولایەتی میسر ڕێکخات و هەموولایەك ڕەزامەندبکات [5] قەیسی کوڕی سعد لەو شوێنەدا وای لیَهات قورساییەك و مەترسیەکی سەربازی هەبیَ بەسەر معاویەی کوڕی أبو سوفیان لەشامدا، لەبەر نزیکی میسریش لەشام و ڕێکخستنەکەی قەیس لەمیسرو ئەوناوبانگەی قەیسی لەووریایی ترسی معاویە لەجولانەوە سەربازیەکانی لەدەرەوەی میسر، نامەی بۆ قەیسی کوڕی سعد نارد وهەڕەشەی لیَ ئەکرد و لەهەمان کاتدا پەیوەندی پێوەکرد هەوڵی لەخشتە بردنی دا، وەلامەکانی قەیسش لەبەرامبەر ئەونامانەدا وەلام گەلێکی ژیرانە بوو، بەجۆریَ معاویە نەیدەتوانی هەڵویستی قەیس تیَ بگات وئەوکارەی تێبگات کەمەبەستی بوو، لەوەشدا نامەی زۆریش لەنێوانیاندا ئاڵ وگۆرکرا. [6]

---

١ـ تهذيب التأريخ دمشق(٤/ ٣٩).

٢ـ ولاة مصر، لا ٤٤.

٣ ـ هەمان سەرچاوە.

٤ ـ الولاية على البلدان (٢/ ١١)، النجوم الزاهرة(١/ ٩٨).

٥ـ الولاية على البلدان(٢/ ١١).

٦ـ الكامل (٢/ ٣٥٥)، الولاية على البلدان(٢/ ١١).

ڕیوایەتە شیعەکانیش بڵاوبونەتەوە کەنامەکانی نێوان معاویە و قەیسی کوڕی سعد یان بڵاو کردۆتەوە کە ئەبو موخنەف لەکتێبەکانی مێژوودا باسیکردووە درۆ و پوچ وناراستە، کەپیاوانی (جرح وتعدیل) بە لاوازیان دناوە، لەسایەی (متن) ی ئەوگێڕانەوە پوچەشدا شتی سەیرهەیە، دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەیە:

علی(ﷺ) ووتاری بۆ خەڵکی میسر دا لەگەڵ قەیسی کوڕی سعد دا تیایدا هاتووە: (پاشان دوای هەردووکیان والیەك هاتوو شتی تیادا دەرکەوت و ئومەتیش قسەیان لەسەر هەبوو پاشان حەزیان پێ نەما ولایانبرد)، ئەمەش واتای ئەوەیە ئەوکەسانەی عثمانیان(ﷺ) شەهید کرد پیاوانی ئومەت بوون و ئومەتیش بە کوشتنی عثمان ئەو خراپەکاریەی گۆڕی لەوقسەیە بێتاوانە و قسەی ئەونیە، ئەو ئەیزانی ئەوانەی عثمانیان کوشت خراپەکارانی خەڵکین و کوشتنشی ستەم بوو، قسەکانیش بەڵگەی ئەوڕاستیەن و لەوانەش ئەوەیەکە إبن عەساکر ئەیگێڕێتەوە کە محمدی کوڕی حەنەفی ووتوویەتی: هیچ کات نەمبیستووە علی بەخراپە باسی عثمان بکات[1] حاکم و إبن عساکر تەخریجیان کردووە، علی (ﷺ) دەڵێ: (خوایە گیان بێتاوانی خۆم لەخوێنی عثمان ئەخەمەلات، ڕۆژی کوژرانی عثمان عەقڵم هەڵچوو ڕقیشم لەخۆم بوویەوە، بۆیەیعەتدانیش هاتنە لام ووتم سوێند بەخوا شەرم لەخوا ئەکەم بەیعەتی کۆمەڵێ قبوڵبکەم کە پیاوێکیان کوشت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەیەوە فەرموویەتی: ((ألا تستحي ممن تستحي منه الملائكة))، واتە: شەرم ناکەی لەکەسێ فریشتان لێ ی شەرم دەکەن، منیش شەرم ئەکەم بەیعەت وەربگرم و عثمانیش بەکوژراوی لەسەرزەوی بێت و نەنێژرابێ، ئەوانیش بڵاوەیانکردو کاتێکیش نێژرا خەڵکی گەڕانەوە و داوای بەیعەت پێدانیان کرد، منیش ووتم: خوایە گیان داوای بەزەییت لێ ئەکەم لەوەی داوام لێ دەکرێ، پاشان توانام هاتوە بەیعەتم قبوڵکرد، کاتێك ووتیان: ئەمیری ئیمانداران وەك ئەوە وا بوو دڵم دەرچێ[2]، حسن و حوسەینی (ﷺ) بۆ پارێزگاری کردن لەعثمان (ﷺ) نارد، ووتەکانیشی لەو بارەدا زۆرە

---

١ـ تأريخ إبن عساكر ترجمة عثمان، لا ٣٩٥.

٢ـ المستدرك (٢/ ٣٥٥)صحيح على شرط الشيخين.

و[1] لـەکتێبی ((تیـسر الکـریم المنـان في سـیرة أمـیر المـؤمنین عثمـان بـن عفـان))[2]دا کۆمکردنەوە.

ب- وتەی قەیسی کوڕی سعد: (ئەی خەڵکینـە وەك بـزانن دوای پێغەمبـەر (ﷺ) بـە باشترین کەس بەیعەتمان داوە)، ئەوەش قسەیەکی ڕەتکراوە، چونکە لە پێشتر بـوونی أبـو بکر و عمر (ڕەزای خویان لیٚ بێت) بەسەر هاوەڵانی تر و بەسەر عەلی دا (ﷺ) سەلماوە و خودی علی ئەوەی ئاشکرا کردووە و هیچ یەکێك لە هاوەڵان و کەسانی تری ئەو سەردەمە گومانیان لەو لەپێشتر بوونە نیە و خستنەپاڵی ئەو قسەیە بۆ قەیسی کوڕی سعد (ﷺ) و هاوەڵانی تر ڕاست نیە و تەنها باس و خواسی شیعەکانی دواییینە، [3] إبـن تەیمیـە دەڵـێ: شیعەکانی سەرەتا هەموویان لەپێشتربوونی أبو بکر و عمر یەکدەنگن، [4] بەڵگـەی فـەزڵ وگەورەی أبو بکر و عمر زۆرە، لەوانە ئەوەیە کە إبن عمر(ﷺ) ئەیگێڕێتـەوە:- خـەڵکی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) أبو بکرمان هەڵبـژارد پاشـان عمـری کـوڕی خـەتاب و پاشـان عثمانی کوڕی عەفان، [5] فەرموودە لەو بارەوە زۆر و ئاشکرایە و هـەروەکو لـە ڕیوایەتـە صـحیحەکانی پێـشوودا دەرکـەوت کـە معاویـە داوای بگـوژانی عثمـانی لـە ئـەمیری ئیمانداران کرد و علی ئەمیری ئیماندارانیش گرنگی پیٚ نەدا.

د- نامەی معاویە بۆ قەیسی کوڕی سعد: تێیدا ئاماژەکردنی بـەوە کـردەوە علـی لـە کوشتنی عثماندا بەشدار بووە، ڕاست نیە و ناگونجێـت نامـەی لـەو جـۆرە لـە معاویـەوە دەرچووبێت، چونکە وەکو پێشووتر باسمان کرد علی لـەوەدا بێتـاوان بـوو بێتاوانیەکەشـی ئاشکرا بوو، معاویەش (ﷺ) لەوەدا بێئاگا نەبوو چی جای ئەوە بۆ قەیـسی کـوڕی سـعد (ﷺ) بنووسێت، ئەمەش محمدی کوڕی سیرینی گەورە تـابیعی و لەوانـەی هاوسـەردەمی ئەو کۆمەڵگەیە بووە دەڵیٚ: کە عثمان کوژرا نەمبینی لـە کوشـتنیدا کـە علـی تاوانبـار

---

١ـ مرویات أبي مخنف د. یحی الیحیی، لا ٢١١.

٢ ـ عثمان بن عفان للصلابي، لا ٤٠٧، ٤٠٩.

٣ ـ مرویات أبي مخنف في تاریخ الطبري، لا ٢١٢.

٤ ـ مرویات أبي مخنف في تاریخ الطبري، لا ٢١٢.

٤ ـ منهاج السنة (١/١١١).

٥ ـ البخاري رقم (٣٦٩٧).

بکات،[1] هەروەها دەڵێ: عثمان لە ڕۆژێکدا کوژرا کەماڵەکەی پاسەوانی هەبوو، لەوانە عبدالله کوڕی عمر و حەسەنی کوڕی علی کە شمشێرەکەی لەگەردندا بوو، بەڵام عثمان نەیهێشت بیکوژن[2] إبن أبو شیبه تەخریجی کردووە، ڕاویەکانیش متمانە پێکراون کە لە لایەن محمدی کوڕی حەنەفیەوە کەعلی دەڵێ: خوای گەورە لەدەشتایی و چیا و ووشکایی و دەریادا نەفرەتی لەبکوژانی عثمان کردووە[3]، لەم واتایەشدا دەقە صحیحەکان زۆرن[4] کەدووپاتی ناوبانگی ڕقی علی (ﷺ) دەکەنەوە لەکوشتنی عثماندا.[5]

هـ - ئەو تۆمەتاتەی کە ڕیوایەتکراون بەوەی معاویە لەکوشتنی عثماندا ئەنصاری تۆمەتبارکردووە، ئەوە لەمعاویە ناوەشێتەوە وخۆی ئەیزانی ئەوکەسانەی بۆ بەرگریکردن ڕاپەڕین هەموو یان ئەنصاری بوون، إبن سعد بە (سندێکی صحیح) تەخریجی کردووە کە زەیدی کوڕی سابت(ﷺ) هاتۆتە لای عثمان(ﷺ)گەمارۆ دراو بوو، دەڵێ: ئەنصاریەکان لەبەر دەرگان ودەڵێن: گەربتەوێ ئەوە دووجار ئەبینە پشتوانانی خوا، دەڵێ: عثمان(ﷺ) ووتی: بۆکوشتن نامەوێ و ڕازی نیم[6].

و- ئەوەی ڕیوایەتکراوە کە معاویە لەسەر زمانی قەیسی کوڕی سابت نامەی نووسیبێ، ئەوەش لەو درۆیانەیە ناچێتە عەقڵەوە کە معاویە شتی وەهای نووسیبێ، چونکە عەرەب درۆیان بەناشرین ترین ئەو سیفەتانە دادەنا کەپیاوی بەڕێزی نابووت ئەکرد، ئەمەش قسەی ئەبو سوفیانە ڕۆژگارێك کەلەسەر بێباوەڕی بوو، ئەوەی بوخاری لەچیرۆکی پرسیارکردنی هیرقەل لەبارەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ڕیوایەتی کردوە ئەبو سوفیان دەڵێ: سوێند بەخوا گەر لەبەر ئابڕو و کاریگەری درۆ نەبوایە بەسەرمەوە، ئەوە لەبارەیەوە درۆم بەدەمەوە دەکرد[7]، ئەوە پێگە و شوێنی درۆ بوو بەلای عەرەبەوە، بەلای

---

١ ـ تأريخ إبن عساكر ترجمة عثمان، لا ٣٩٥، مرويات أبي مخنف، لا ٢١٢.

٢ـ هەمان سەرچاوە، لا ٣٥٠.

٣ ـ المصنف(١٥/٢٦٨).

٤ ـ تاريخ إبن عساكر ترجمة عثمان، لا ٣٩٥.

٥ـ مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري،لا ٢١٣.

٦ ـ الطبقات (٣/٧٠) سنده صحيح.

٧ ـ البخاري، رقم: ٧.

موسڵمانانەوە خراپترو ناشیرینتر بووە خوێنەریش نالێ: ئەمە فڕوفێڵە و جەنگیش فڕوفێڵە، چونکە فڕوفێڵ درۆنیە، هەروەکو لەقسەی عەرەبدا ناشیرینترین درۆ دیاربووە، معاویەش (رضي الله عنه) بەڕێزترە تاوەکو کاری لەو جۆرە بکات[1].

ز- ڕیوایەتکردنی ئەونامە زۆرانەی نێوان قەیس و معاویە و علی(رضي الله عنه) بەو ڕێز بەندی و وردییەوە، گومان و دوودڵی ئەخاتە دڵی خوێنەر، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەزانین و گەڕان بەباسەکانیدا و ئەوانەش کە ڕیوایەتیان کردوە.

دکتۆر(یحی الیحی) دەڵێ: والیەتی قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە(رضي الله عنه) لە میسر لەلایەن ئەمیری ئیمانداران علی کوڕی ئەبو تاڵیب (رضي الله عنه) کۆدەنگی لەسەرە و[2] گشت ئەوانەی باسی قەیسیان کردووە ئەوباسەدورودرێژانەیان باس نەکردووە[3] واتە: ئەو باسانەی کەأبوموخنەف لەگێڕانەوەکانیاندا باسیکردووە تەنانەت مێژوونوسە متمانەدارەکانی میسریش ئەوەیان باس نەکردووە[4]ئەوەش ئەو ڕیوایەتەی ئەبو موخنەف دوای کورتکردنەوەیەك لە تەبەریەوە وەرگیراوە لەهەریەك لە إبن ئەسیر و إبن کەسیر و إبن خەلدون وإبن تەغری بەردی و بە کورتی لەو مێژوونووسانەوە وەرگیراوە.[5]

هەروەها کیندیش لە عبدالکریم ئەلحاریسەوە تەخریجی کردووە کەدەڵێ: کاتێك پێگەی قەیس بەسەر معاویەدا قوس بوو، معاویە بۆ هەندێ نەوەی ئومەیەی نووسیوەکە لەمەدینەدا بوون: قەیسی کوڕی سعد خوا خێری پێداوە وپاداشتی بدات و ئەو هەواڵە بشارنەوە، چونکە ئەترسم کە کە پەیوەندیمان بەعلی بگات و ئەو علی لەکاری لابەرێت، تا هەندێ لە گەورەکانی عێراق و مەدینە بە عەلیان وت: قەیس لابەرە و کەسێکی تری لە جێگە دابنێ، علی ووتی: لەنێو بچن کاری وەهاناکات وبهێڵن، ووتیان: ئەبو لایبەری وەکو جاران نەماوە، هەر وازیان نەهێنا تا نامەیەکی بۆ نووسی: پێویستە بگەڕێتەوە

---

١ ـ مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري، لا ٢١٤.

٢ ـ تاريخ خليفة، لا ٢٠١، فتوح مصر، لا ٢٧٤، سير أعلام النبلاء(١٢/٣).

٣ـ طبقات إبن سعد(٥٢/٦)،تاريخ بغداد(١٧٧/١)، سير أعلام النبلاء(١٠٢/٣).

٤ ـ النجوم الزاهرة (٩٧/١)، البداية والنهاية (٧/ ٢٥١).

٥ ـ مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري، لا ٢١٠.

نزیکی خۆم، یەکێکی تر بخەرەشوێنی خۆت و بۆلای خۆم بەرێ بکەوە[1]، ئـەو ڕیوایەتـەش دکتۆر ئەلیحی لەکتێبەکەیـدا (القیم مرویـات أبـي مخنـف في تـأريخ الطـبري) بارسـەنگی کردووە دەڵێ:

- گێڕانەوەی میسریەکی متمانە پێکراوە و لەکەسانیتریش بەولاّتی خۆی شارەزاترە.

- مێژوو نوسێکی میسری تەخریجی کردووە.

- لەشتی نامۆ و سەیر دووریان گرتووە.

- دەقەکەی لەتەك ژیانی ئەوپیاوانە ئەگونجێ.

- ڕاڕایی علیم ڕوونکردەوە لەلابردنی قەیس تا ئەوکاتەی خەڵکی زۆریان پێ هێناو لای خۆی هێشتەوە، سەرکردەش وەهایە لەکاتی ناخۆشیدا لە تاقیکردنەوە دا سەرکردە ئازاکان لەبیرناکات[2].

بەوشێوەیە خەڵکانێك بۆ تێکدانی نێـوان علـی وقـەیس دەسـتیان تـێ وەردا تـاوەکو لاییدات، لەکۆتایشدا هەندێ ڕاوێژکاری علی داوایان لەعلی کرد قەیس لە والیاتی لابدات و ئەو دەنگۆیانەیان بەڕاست زانی کەلەبارەی قەیسەوە ئـەوترا و لەلابردنیـشدا پێـداگریان کرد، بۆیە علی بۆی نووسی: پێویستمە لەنزیکی خۆمدا بی وکەسـێ بخـەرە شـوێنەکەوتوو بەڕێکەوە[3]، ئەونامەیەش لەجێ ی لادانی قەیس بوو لەوالیاتی میسر، بەپێ ی زۆربـەی ڕیوایەتەکانیش علی ئەشتەری نەخەعی لەجێگەی قەیسدا داناوە[4] ئەشتەر پـێش ئـەوەی بۆ میسر بەڕێکەوێ علی پـێ ی گەیـشتووە وباسـی خـەڵك میـسر و سروشـتی میـسری بۆکردوو، دەڵێ: لەتۆ زیاتر کەسی نیە خوا ڕەحمت پێ بکـات، منـیش گـەر ئامۆژگاریـت نەکەم بۆ چوونی خۆتت بۆبەسە لەوەی بەلاتـەوە گرنگـە پـشت بـەخوا ببەسـتە و تونـدی بەنەرمونیانی تێکەڵ بکە، گەرنەرمی پێویست وباشتر بوو نەرم بە، کاتێکیش توندی چارە

---

١ ـ ولاه مصر، لا (٤٥، ٤٦)، و مەدائینسێ تیادایەو ڕاستگۆیە و پیاوەکانی تریش متمانە دارن تەنیا نەوەنەبێ(مرسل).

٢ ـ مرويات أبی مخنف فی تاريخ الطبري، لا ٢١٠

٣ ـ ولاه مصر، لا ٤٥ ـ ٤٦

٤ ـ فتوح البلدان، لا ٢٢٩، الولاية علی البلدان(١٢/٢).

بوو توند بە[1] ئەشتەریش بەهاوەڵیتی کۆمەڵە کەسانێکی بۆ میسر بەڕێکەوتن، بەڵام کە گەیشتە دەوروبەری دەریای قولزوم ـ دەریای سوور، مرد پێش ئەوەی بچێتە میسر، ووتراوە: کەهەنگوێنی ژەهراوی پێدراوە ومردووە، خەڵکانی خەراج کۆکەرەوەش تۆمەتبارکراون بەوەی بە هەڵنانی موعاوەیە ژەهریان پێ داوە[2] ئەوتۆمەتەش کەئاراستەی معاویە کراوە لەوەی کەبەژەهر کوشتنی ئەشتەر ڕاستینە و إبن کەسیر و[3] ئیبن خلدونیش [4] ئەوتۆمەتەیان دور خستۆتەوە، دکتۆر یحی ئەلیەحیاش هەمان ڕێگا و بەرنامەی ئەوانی گرتۆتە بەر[5]، بەوشێوەیە ئەشتەر پێش ئەوەی بچێتە سەرکاری خۆی مرد، لەتەك ئەوەشدا سەرچاوەکان وەکو یەکێ لەوالیەکانی علی کوڕی ئەبو تاڵیب لەبارەیەوە قسەیان لەسەر کردووە، کە دوای محمدی کوڕی ئەبو بکر بووەتە والی [6] محمدی کوڕی أبوبکریش پێشئەوەی قەیسی کوڕی سعد والی یەکەم میسر بەجێ بهێڵێ ئەو بەمیسر گەیشتووە، ووتووێژێکیش لەنێوان قەیسی کوڕی سعد و محمدی کوڕی أبوبکردا ڕوویانداوە و قەیس چەند ئامۆژگاریەکی محمدی کردووە، بەتایبەت ئەوەی تایبەت بێت بەو خەڵکەی لەکوشتنی عثماندا توڕەن، ئەوانەی کەدواتر کە بەیعەتیان بەعلی نەدا، قەیس ووتی: ئەی أبو قاسم کەلەلایەن ئەمیری ئیماندارانەوە هاتووی لابردنیشم ڕێگری ناکات لەوەی ئامۆژگاری تۆ وو ئەویش بکەم، من لەوئیشەی تۆ بۆی هاتووی بەرچاو ڕوونم، واز لەو کەسانە و ئەوانەش بهێنە ئەچنە پاڵیان ـ مەبەستی ئەوکەسانەیە بەیعەتیان بەعلی نەداوە لەو بۆ چوونەی هەیانە ئەگەر هاتنە لات ڕێزیان بگرە گەر هاتنە پشتت و نەهاتنە ژێر دەسەڵاتت بەشوێنیاندا مەگەڕێ، بەپێی ژیریان مامەڵەیان بکە ئەگەر توانیت سەردانی نەخۆش بکەیت و ئامادەی ناشتنی تەرم بیت و ئەنجامی بدە لێت کەم

---

١ ـ النجوم الزاهرة(١٠٣/١).

٢ ـ النجوم الزاهرة (١٠٤/١)، سير أعلام النبلاء (٣٤/٤).

٣ـ البداية والنهاية (٨/ ٣٠٣).

٤ـ تأريخ إبن خلدون (١١٢/٤).

٥ ـ مرويات أبي مخنف، لا ٢٢٤.

٦ـ النجوم الزاهرة (١٠٦/١).

ناکاتەوە[1] پاشان قەیس گەڕایەوە مەدینەو دواتر لەکوفەدا بەئەمیری ئیمانداران علی (رضي الله عنه) گەیشت و ئامادەی ((جەنگی صەفین)) بوو لەو ڕۆژەشدا ئەیووت:

هذا اللواء الذي كنا نحف بــــه     مع النبي وجبريل لنا مــدد

ماضرّ من كانت الأنصار عيبته     ان لايكون له من غيرهم أحد

قومٌ إذا حاربوا طالت أكفُهُــــم     بالمشرفية حتى يفتح البــلدُ

لەگەڵ علی ئەمیری ئیمانداراندا مایەوە هەتا کوژرا، لەگەڵ حسن و لەپێشەویدا بوو بۆی لای معاویە ڕۆیشتن، ـ هەروەکو دواتریش بەپشتیوانی خوا باسی دێ ـ کاتێکیش حسن بەیعەتی بەمعاویە دا، قەیس بەشداری ئەو بەیعەتە نەبوو، ئینجا گەڕایەوە مەدینە[2] بۆ پەرستن یەکلابویەوە[3].

٥ـ ووتەی قەیس: شتێ ناگەڕێنینەوەکە بەخشیبێتمان:[4]

لە موسای کوڕی ئەبی عیساوە کە پیاوێك سی هەزاری لەقەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە بەقەرز وەرگرت، کاتێك کەپارەکەی بۆگەڕاندەوە قەیس بەوەرگرتنەوەی ڕازی نەبوو ووتی: ئێمە شتێ ناگەڕێنینەوە کە بەخشیبێتمان.[5]

٦ـ ووتەی قەیس: پرسیاری لە پیرێژنەکە کرد جوانی وەڵامداوە .[6]

پیرێژنێك هاتەلای قەیسی کوڕی عوبادەو قەیس ئەیناسی، قەیس پێ ی ووت: چۆنی؟ پیرێژنەکە ووتی: سوپاس بۆ خوا، خوا باشت بۆ بێنێ مشکێ لەماڵمدا نیە بگەڕێ، ووتی: پرسیارم کرد جوانت وەڵام داوە، دەبێ ماڵەکەت پڕ بەمشك بکەم، فەرمانیدا دانەوێڵەیەکی زۆری پێدا و لەگەڵ ڕۆنی زەیت و هەر پێداویستیەك کە ویستی بۆی بێنێ و

---

١ ـ تاريخ إبن عساكر (١٠٦/٢٢).

٢ـ أسد الغابة (٤٥٢/٤).

٣ ـ الإستيعاب (٣/ ١٢٩٠).

٤ ـ هەمان سەرچاوە، (١٢٩١/٣).

٥ ـ هەمان سەرچاوە، (٣/ ١٢٩١).

٦ ـ تاريخ دمشق(٢٨٦/٥٢).

پیرێژنەکەش چوو[1]، إبن عبدوالبیر ئەو چیرۆکەی گێڕاوەتەوە دەڵێ: چیرۆکێکی صەحیحە و بەناوبانگە.[2]

## ٧ـ حاڵی ئەوپیاوەی کەقەیس ئومێدی ئەخواست وەکو ئەو کاری بکردایە:[3]

قەیسی کوڕی سعد دەڵێ: خۆزگەم ئەخواست حاڵی ئەو پیاوەم هەبوایە کەبینیم، ڕۆیشتین بەرەو شام وگەیشتینە شوێنێکی ئاوەدانی ووتمان: بالابدەنیە ئەو ماڵە ژنێکی تیادایە، زۆری پێنەچوو پیاوێك لەڕاودا هاتەوە بەژنەکەی ووت ئەو پیاوانەکێن؟ ژنەکەی ووتی: کۆمەڵێکن لایانداوەتە ماڵەکەت، ئەویش ووشترێکی هێناو لەپاژنەی داو پاشان ووتی: بۆ ئێوەیە بیبەن ووتی: سەریببڕن، ئێمەش سەرمانبڕی، بۆسبەینێ دانەیەکی تری هێنا و لەپاژنەی دا و وتی: سەریبڕن، ووتی: سەرمانبڕی ئێمەش وتمان: گۆشتی دوێنیمان وەکو خۆی وایە، ووتی: خواردنی ڕابردوو نادەین بەمیوانمان، بەهاوڕێکانم وت: گەر لای ئەم پیاوە بمێننەوە وشترێکی نامێنێ بابڕۆین، بەهاوڕێکەم ووت: چیت پێیە لەپارە کۆیکەرەوە ئەویش ووتی: تەنیا چوار سەد دەرهەمم پێیە، ووتم: لەگەڵ عەباکەمدا بیدە ژنەکەی و شتەکانمان کۆکردەوە ووتمان: بابڕۆین، پارەکانمان بەژنەکەدا، پاشان ڕۆیشتین، زۆرمان پێنەچوو تەماشامان کرد کەسێك هات، ووتم: ئەوەکێیە؟ ووتیان نازانیین کە نزیك بۆوە تەماشامان کرد پیاوێکە بەسەر ئەسپێکەوە تیروکەوانەکی ڕاکێشاوە، تەماشامان کرد ئەوکەسەیە کەچاکەی لەگەڵماندا کرد، ووتم ئێمە پارەمان پێدا، نزیك بووە ووتی: ئەمە شتەکانتانە بیبەن، ووتم: سوێند بەخوا چی ئەبینم، هەرچیمان پێبو کۆمانکردەوە، ووتی: سوێند بەخواناڕۆم تاوەکو وەرینەگرنەوە نەڕۆن، ووتمان: وەریناگرین ووتی: سوێند بەخوا یان بەم تیرو کەوانە کەستان ناهێڵم یان ئەیبەن، ووتی: ئێمەش هەڵمانگرت و ئەویش ڕۆیشت و ووتی: ئیمە میوانداری نافرۆشین[4].

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ الإستیعاب(٣/ ١٢٩٢).

٣ ـ تاریخ دمشق (٥٢/ ٢٨٥).

٤ـ هەمان سەرچاوە، (٥٢/ ٢٨٥).

٨ ـ سەخی ترین خەڵکی کێیە؟ قەیسی کوڕی سعدە یان عبداللە کوڕی جعفر یان عرابە الاوسی:

بەراوردی سێ سەخی کرا، پیاوێك ووتی: سەخی ترین خەڵك عبداللە کوڕی جعفری کوڕی ئەبو تالیبە پیاوێکی تر وتی سەخی ترین خەڵکی سەردەممان قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەیە، یەکێکی تریش ووتی: سەخی ترین خەڵکی عرابە الأوسی یە، زۆر پێداگریان کردو زۆریان ووت و لەپاڵ کەعبەدا دەگیان بەرزبۆوە، پیاوێکیش پێیانی ووت: بێگومان زۆرتان ووت: تەنیا ئەوەتان بۆماوەتەوە هەریەکەتان بڕواتە لای ئەوکەسەی زۆر بەسەخی دای ئەنێت و داوای شتی لێ بکات و بڕوانێ کەچی پێ ئەبەخشێ و دواتر بڕیار ئەدەین، ئەوەی باسی عبداللە کوڕی جعفری کرد هەستا و ڕۆیشت و بەعبداللە گەیشت لەوکاتەی پێ ی هەڵبڕی تاسواری ووشترەکەی بێت و بانگی کرد: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەویش ووتی: بلێ حەزت بەهەرچی هەیە، ووتی: ڕێبوارم وپارەو خواردنم لێ بڕاوە، ووتی: دابەزی و ووتی: پێت بخەرە ئێرەوە بچۆرە سەر ئەم ووشترە وچی لەجانتاکەداهەیە بیبە و دەست لەشمشێرەکە مەدە، چونکە لەشمشێرەکانی علی کوڕی ئەبو تالیبە، ووتی: ووشترەکەو جانتاکەی هێنا کەچوار هەزار دیناری تێدا بوو، گەورەترین و بەڕێزترینیان شمشێرەکەبوو، ئەو پیاوەش کەباسی قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەی کرد ڕۆیشت و نەیبینی و گەڕایەوە، چونکە جاریەکە پێ ی وتبوو: قەیس خەوتووە و چی پێویستیەکت هەیە؟ ووتی: ڕێبوارم و پێداویستیم لێ بڕاوە، جاریەکەش ووتبوی هەر کەهەستا پێداویستەکەت ئاسان جێ بەجێ دەبێ، ئەمەش کیسەیەکەو حەوت سەد دیناری تێدایە وئەمرۆ جگەلەو پارەیە هیچی تری تیادانیە و بڕۆ شوێنی ووشترەکان ووشترێکی باش و کۆیلەیەکیش ببە وئیشی خۆت ڕاپەڕێنە، قەیس کە هەستا و جاریەکە ڕوودوای بۆ گێڕایەوە ئازادی کردو پێ ی ووت: ئاگادرامت بکردایەتەوە تالەشتەکانی ماڵەکەم زیاترم پێ بدایە، نەوەك ئەوەی پێتداوە بەشی نەکات و هیچی بۆچارەنەکات، ئەوەش کەباسی عرابە الاوسی کرد بۆ لای عرابە کەوتەڕێ و لەکاتێکا پێ ی گەیشت عرابە بەمەبەستی نوێژ لەماڵ دەرچوو دووکۆیلە ڕێگەیان نیشان دەدا، چونکە عرابە چاوی لەدەست دابوو، ووتی: ئەی عرابە، ووتی: چیت دەوێ بفەرموو، ووتی: ڕێبوارم لێم بڕاوە، ئەویش وازی لەدوو کۆیلەکە هێنا و بەدەستی ڕاستی دای لەسەردەستی چەپی و پاشان ووتی: ئای

سوێند بەخوا عرابە سەروەتی نەماوە، بەڵام ئەم دووانە ببە کەئازادیشن، ئەتەوێ بیانبەو پاشان بۆدەرککردنی ڕێگا دیواری گرت، ووتی: هەردووکیان هێنا، خەڵکی بڕیاریاندا کە إبن جعفر بەسەروەتێکی زۆر سەخاوەتی کردە، گەرچی حاشاناکرێ شمشێرەکە باشترین بووە، قەیسیش یەکێکە لەسەخاوەتەکانی کە کۆیلەیەکەی بێ زانیاری ئەوسەروتەکەی بەخشیوە و کەزانیوێتی دەستخۆشی لێکردووە وئازادی کردووە، کۆدەنگیش بوون لەسەر ئەوەی سەخی ترین ئەوسێ کەسە عرابە الاوسی، چونکە هەرئەوەی هەبووە کەبەخشیوێتی[1] بەهای ئەوسەردەمە ڕۆشنە کێبرکێ بووە لەسەخاوەتی و کرداری چاکەدا.

٩- ئەو باسەی دراوەتە پاڵ قەیس ناسەلمێ:

قەیسەر ناردی بۆلای معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان کەشەڕواڵی درێژترین پیاوی عەرەبی بۆ بنێرێ، ئەویش بە قەیسی کوڕی سعدی ووتوە: پێویستیمان بەشەرواڵەکەی تۆهەیە، وتی: هەستایە سەرپێ و چوویەپاڵ و ئینجا شەڕواڵەکەی خستە بەردەم معاویەو معاویەش ووتی: بەڕەحمەت بی، بۆ وەها؟ نەدەبوو بچویتایە ماڵ و ئینجا بۆمانت بناردبایە؟ قەیس ووتی:

أردت بها كي يعلم النـــاس أنها — سراويل قيس والوفود شهـــود

وأن لايقولو غاب قيس وهـــذه — ســـراويل عادي نمتـــه ثـمود

وإني من الحي اليماني لسيـــدُ — وما الناس إلا سيد ومســـود

فكدهم بمثلي إن مثلي عـــليهم — شديدٌ وخلقي في الرجال مديـــد

پوختە: واتا بۆیە نەچوومە ماڵ و هەر لێرەدا شەرواڵەکەم داکەند تاوەکو ئامادە بووان و شاندی میوان شایەت بن کە شەرواڵی قەیسە نەك شەرواڵی مرۆڤێکی عاد.

وتی: معاویە فرمانیکردە درێژترین پیاوی سوپا وشەڕواڵەکەی خستە سەر لوتی کەوە نەزەری، ووتی: معاویە داوای شەڕواڵەکەی کرد وکاتێك هێنرا قەیس پێ ی ووت: ئەمە بەرگەت لەبەردا کەنێ، معاویەش ووتی:

---

١ـ تاريخ دمشق(٥٢/ ٢٨٦).

أما قريش فأقوام مسرولـــة والیثربیون أصحاب التبابـــين

قەیسیش ووتی:

تلك الیهود التی یعنی ببلدتنا كما قريش هم أهل السخاخين[1]

لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە قەیسەر بۆ معاویەی نوسیووە: دوو پیاوم ناردۆتە لات: یەكێكیان بەهێزترین پیاوی وڵاتەكەمە ئەوی تـریش درێـژترین پیـاوی زەوی منـە، پاشـا لەكۆندا لەو جۆرە ئیشانەی حەز پێبووە، تـۆش لـەوڵاتی خۆتـدا دووكەسـیان بـۆ دەربكـە بەرەنگاری و بەرامبـەریان بـێ، گـەر پیاوەكـانی تـۆ بردیانـەوە ئـەوە سـەروەت و دیلـی موسڵمانان و چی و چیت بۆ ئەنێرم، گەر پیاوانی منیش سەركەوتن ئـەوە كاتێـك نامـەی قەیسەر بە معاویە گەیشتوو بەلایەوە گرنگ بووە و ڕاوێژی بە یاریدەرەكانی كـردووە پێـی وترا: بۆ پاڵەوانەكە محمدی كوڕی حەنەفیە یان عبداللە كوڕی زوبێر بۆ لەزەویـدانی دیـاری بكە، ووتی: محمدی كوڕی علـی ئامـادەكرا و ڕۆمـیش ئامـادەبوو باسـیكرد كـە چـی لێ داواكراوە و بۆچی هاتووە، محمدیش بەڕۆمێكەی ووت: چیت ئـەوێ؟ ووتـی: هەریەكـەمان دادەنیشێ و دەستی ئەخاتە سـەرهاوڕێكەی، هـەر كەسـێك هاوڕێكـەی لەشـوێنی خـۆی هەڵكەند یان بەرزیكردەوە ئەوە بردویەتیەوە، هەركەسێ نەیتوانی وژێركەوت ئەوە دۆڕاوە، محمدیش ووتی: ئەمە بۆ تۆ، كامان بـۆ دانیـشتن دەسـت پـێ بكـەن، ئـەویش ووتـی: تـۆ داِبنیشە، دانیشت و دەستی پێدا، زۆری نەخایەند لەزەوی هـەڵیبڕی و بـەرزیكردەوە ودای بەزەویدا، بۆیە معاویە و موسڵمانە ئامادە بووەكان دڵخۆش بوون.

معاویە بەقەیس ورۆمیە درێژەكەی ووت: درێژی خۆتان پێـشان بـدەن، قـەیس ووتـی: شـەڕواڵم داكـەنم ئـەو (علوجـە) لـەپێی بكـات، نێـوان مـن و ئـەو زۆر ڕوونـە، پاشـان شەڕواڵەكەی داكەندو توڕیدایەلای ڕۆمیەكە و لەپێ ی كرد، شەڕواڵەكە گەیـشتە مـەمكی و هەندێكیش لەزەوی دەخشا، خەڵكیش بەوە زۆر خۆشحاڵ بوون، ئەنـصاریش هاتنـە لای قەیس ووتیان لەبەردەم معاویەدا خۆت نزم پێشانداوە، بۆنەگەڕایتەوە ماڵ و شـەڕواڵەكەت بۆ بناردایە، ئەویش ووتی:

١ ـ تاریخ دمشق(٥٢/ ٢٩٣، ٢٩٤).

أردت لكيما نعلم النــاس إنهــا | سراويل قيس والوفود شهـــــود
--- | ---
وأن لايقولوا غاب قيس هـــذه | سراويل عادي نمته ثمـــــــــود
وإني من القوم الثمانين سيـــد | ومالناس إلا سيدو مـــســــود
وفضلي في الناس أصلي ووالدي | وباع به أعلو الرجال مـــــــديدٍ[1]

مەبەستی ئـەوەبووە بۆیـە وایکـردووە کەخـەڵکی بـزانن شـەڕواڵێکی قەیـسە نـەوەك بەڕۆیشتنەوەی بۆماڵ وابزان شەڕواڵی خەڵکانی عادبێت و قـەیس ناردبێتی.ئـەبو عمـری کوڕی عبدالبرحافزی ئەندەلوسی بەناوبانگ دەڵێ: ئەوهەواڵـەی کەشـەڕواڵی لای معاویـە داکەنـدبێ درۆ و هەڵبەسـتراو و بـێ پاڵپـشتە و لەخورەوشـتی قـەیس و جـوامێری و پایەبەرزیەکەی هاوشێوەی نیە و تەنیا چیرۆکی هەڵبەستراو و شیعرێکی ساختەیە.[2]

١٠ـ لە کاتی ڕودانی ئاژاوە لەکێ بو لەژیرەکانی عەرەب:

قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە لەنێو خەڵکدا خاوەن بۆ چوون بوو، إبن شـەهابیش دەڵێ: لەوکاتەی ئاژاوە ڕوویدا ژیرەکانی عەرەب پێنج بوون، لەپلانەکانیانـدا پێـان ئـەوترا خاوەن بۆ چوونی عەرەب: معاویەی کوڕی أبوسوفیان و عـەمری کـوڕی عـاص و قەیـسی کوڕی سعد و موغیرەی کوڕی شوعبە و موهاجیرەکان: عبداللە کوڕی بودەیلی خـوزاعی و قەیس و إبن بودەیل لەگەڵ علی بوون(ﷺ) و موغیرەش لەتایف و دەورو بـەری گۆشـەگیر بوو تا هەردوولا بڕیاریان دا لە (أذەرح) کۆببنەوە[3] قەیس ئەیووت: گەر ئیسلام نەبووایـە فێڵی وەهام دەکرد عەرەب چاری نەکردایە[4].

١١ـ حەزمان دەکرد بەسەروەتی خۆمان ڕێشێکمان بۆ قەیس بکڕبوایە:[5]

---

١ـ تاريخ دمشق(٥٢/ ٢٩٢).

٢ ـ الإستعياب(١٢٩٣/٣).

٣ـ تاريخ دمشق(٥٢/ ٢٨٨).

٤ـ هەمان سەرچاوە(٢٨٧/٥٢).

٥ ـ الأستعياب (١٢٩٢/٣).

زۆربەیری کوڕی بەکار باسی کردوە قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەو عبدالله کـوڕی زوبەیرو شورەیحی قازی، ڕیـشیان نـەبووە، جگـە لەزوبـەیریش باسـیانکردووە کەئەنـصار ووتوویانە: حەزمان کرد بەسەروەتەکەمان ڕیشمان بۆقەیسی کوڕی سعد بکڕیبایـە، لەگـەڵ ئەوەشدا قەیس(ﷺ) جوان بووە.[1]

١٢ـ ووتەی قەیس: بۆچی سەردانیکارم کەمە؟

قەیسی کوڕی سعد بە نەوەد هەزارماڵێکی بەمعاویە فرۆشت، بانگکاریش لە مەدینـە بانگیدا کەهەرکەسێ قەرزی ئەوێ بابچێتە ماڵی سعد، چل یان حەفتا هـەزاری بەقـەرزدا ئەو دوای مایەوە، هەروەها چەکێکی لەسەر ئەو کەسانە نووسی کە قـەرزی پێـدابوو، کـە نەخۆش کەوت سەردانیکاری کـەم بـوو، بەخێزانەکـەی ووت: کـە قەریبـەی کـچی ئـەبو قوحافەی خوشکی أبو بکربوو، ووتی: ئەی قەریبە بۆچی سەردانیکارم کەمـە؟ ووتـی: تـۆ قەرزت بەسەریانەوە هەیە بۆیە سەردانت ناکـەن، چـەکی خۆیـان بـۆ بگەڕێنـەوە تـاوەکو سەردانت بکەن.[2]

لە ڕیوایەتی تردا هاتووە، قەیس نەخۆش کـەوتووە و سـەردانیکاری کـەم بـووە پـێ ووتراوە کە قەرزارەکان لەبەرقەرزەکەت لەشەرمدا سەردانت ناکـەن، ئـەویش فـەرمانی دایە جاڕدەر جاڕبدات هەرکەسێ قەرزی قەیسی کوڕی سعدی بەسـەرەوەیە قەرزەکـەی بـۆ خۆی و قەیس نایەوێ، ئینجا خەڵکی دەوریان لێدا بە جۆرێك خۆیان بۆ ئەکوتا.[3]

١٣ـ قەیسی کوڕی سعد لەگەشتەکانیدا نانی خەڵکی دەدات:

قەیسی کـوڕی سـعد لەگەشـتەکانیدا لەگـەڵ پێغەمبـەردا(ﷺ) نـانی خـەڵکی دەدا، سفرەیەکی هەبوو لەدەوریدا کۆدەبوونـەوە، ووتـراوە: لەگـشت ڕۆژێکـدا جاڕئـەدرا: بـڕۆن بۆگۆشت و نانە پلاو خواردن.[4]

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (٣/١٢٩٢).

٢ ـ تاریخ دمشق(٥٢/ ٢٨٤).

٣ ـ الإستعیاب (٣/١٢٩٣).

٤ـ تاریخ دمشق(٥٢/٢٨٣).

### ١٤ـ ئەو باسەی نێوان قەیس و معاویە (رضي الله عنه) ڕاست نیە:

معایە بەقەیسی کوڕی سعدی ووتوە: تۆیەکێکی لەئەحبارەکانی جولەکە گەر دەرکەوی ئەتکوژین و تۆش لەئێمە بالآتربی دوژمنایەتیت ئەکەین، ئەویش دەڵێ: تۆ و باوکت لەبتەکانی نەفامین و بەزۆر هاتنە نێو ئیسلامەوە و بەفشە و (خۆشیەوە) دەرچوون[١] ئەم باسە (منقطع) ەو مونقەتعیش لەجۆرەکانی (ضعیف)ە.

### ١٥ـ کۆچی دوایی قەیسی کوڕی سعد(رضي الله عنه):

لەکۆتاییەکانی خیلافەتی معاویەدا کۆچی دوایی کردووە، خەلیفەی کوڕی خەیاط[٢] وذهبی[٣]یش ئەو بۆ چوونەیان هەیەو، إبن حبانیش دەڵێ: کەلەساڵی ٨٥ کۆچی و لەخیلافەتی عبدالمەلیك دا کۆچی دوایی کردووە[٤] إبن حەجەریش لەگەڵ خەلیفە و ذەهەبیش هاودەنگن[٥] و إبن عبدالبر دەڵێ.. . قەیس چویەوە مەدینە لەسەر پەرستن بەردەوام بوو تاوەکو لەشەستی کۆچی کۆچی دوایی کرد تیایدا، ووتراویشە: پەنجا ونۆساڵ و لەکۆتایی خیلافەتی معاویەدا بووە، پیاوێکی درێژ و بێ موو بووە.

### دووەم: عبیداللە کوڕی عباس کوڕی عبدالمطلب هاشمی: أبو محمد.

عبیداللە کوڕی هاشمی کوڕی عبدالمطلب هاشمی، ئامۆزای پێغەمبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم)[٦] دایکیشی أم الفضل لوبابەی کوڕ برای کچی حاریسی کوڕی حوزنی کوڕی بوجەیری کوڕی هوزمی کوڕی روەیبەی کوڕی عبداللە کوڕی هیلالی کوڕی عامیری کوڕی صەعصەعە[٧] و برای عبداللە و کەسیرو فەزڵ و قوسەم و مەعبەدو تەمامە.[٨]

---

١ـ سیر اعلام النبلاء(٣/١١١).

٢ ـ الإصابة (٥/٣٦١).

٣ ـ سیر اعلام النبلاء (٣/١١٢).

٤ـ الإصابة (٥/٣٦١).

٥ ـ هەمان سەرچاوە (٥/٣٦١).

٦ ـ الطبقات تحقيق السلمي (١/٢١٤) سير أعلام النبلاء (٣/٤١٢).

٧ـ الطبقات تحقيق السلمي(١/ ٢١٤).

٨ ـ سیر اعلام النبلاء (٣/٥١٣).

١)منالّ و ژنەکانی:

عبیداللە ی کوڕی عباس چەند کوڕو منالّێکی هەبوو: محمد بەویشەوە کونیەی وەرگرت، فرعەش دایکی بوو[١] کە کچی قوتنی کوڕی حارسی کوڕی حوزنی کوڕی بوجەیری کوڕی هیلالی کوڕی عامیرە. عباس [٢] وعالیەی کە علی کوڕی عبداللە کوڕی عباسی کوڕی عبدالمطلب خواستی و محمدی کوڕی علی لیّ ی لەدایك بوو، بابە و أم محمد و دایکی کە عەمرەی کچی عەریبی حەمیری بوو[٣] عبدالرحمن و (قثم) کە أم حەکیمی کچی قارظی کوڕی خالیدی کینانی دایکی بوو[٤] عبداللە و جعفر و (أم کلثوم)و عەمرە و أم عباس و دایکیشیان أم وەلەد بوو[٥].

٢)تەمەن و بینینی پێغەمبەری خوا(ﷺ):

عبیداللە کوڕی عباس بەسالّیّ لە عبدللە کوڕی عباس بچوکتربوو [٦] پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد ئەو دوانزە سالاّن بووە، پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینیوە و فەرمودەشی لیّ بیستووە[٧]، وتراوە کە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینوە و فەرموودەشی لیّ بیستوە لە سونەتی نسائیدا فەرموودەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەوەوە وەرگرتووە: کە غمیصاءیان رمیصاءهاتووەتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) شکایەتی لە مێردەکەی کردووە کە پەیوەندی یەکەی ڕاپەڕینیّ، ئەویش ووتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) درۆ ئەکا پەیوەندی لەگەلّدا هەیە، بەلاّم دەیەویّ بگەڕێتەوە لای مێردە یەکەمەی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لیس ذلك حتى تذقي عسیلته))[٨]، ئەمەش لەڕێگەی هەشیم و بەهەمان سەنەدەوە ڕیوایەتکراوە ڕاویەکانیش متمانە پێکراون، بەلاّم ڕوون نیە کە

---

١ ـ الطبقات تحقيق السلمي(١/ ٢١٢).

٢ـ هەمان سەرچاوە(١/٢١٢).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(١/٢١٣).

٤ ـ هەمان سەرچاوە(١/٢١٣).

٥ـ نسب قريش، لا ٣١، الطبقات (١/ ٢١٤).

٦ ـ الإستيعاب(٣/ ١٠٠٩).

٧ ـ الطبقات تحقيق السلمي(١/ ٢١٤).

٨ ـ سنن النسائي (٦/ ١٤٨) لە ڕێنووسدا لەعبيداللە وە بۆ عبداللە وە گۆڕاوە.

عبیداللە چیرۆکەکەی بینیبیّ[1] هەیسەمیش لە (المجمع) دا[2] بەکورتی لەبارەی عبیـداللە و فەزڵی کوڕی عباسەوە هێناویەتی و دەڵێ: أبـو یعلـی ڕیوایـەتی کـردوە و پیاوەکانیـشی ڕاستگۆن[3] ذهبی لەسونەنی نسائیدا لەبارەیەوە دەڵـێ بـەوەی (مرسـل)ە [4]، لەعبداللـە کوڕی و عطاء وإبن سیرین وسولەیمانی کوڕی یەسار و ئەوانی تـریش لەبارەیـەوە قـسەیان کردووە، عبیداللە ئەمیرو گەورە وسەخی و سوپاسکراوە بووە.[5]

أ ـ پێغەمبەری خوا عبداللە و عبیداللە و کەسیری کوڕی عباسی وەسف کردووە.

لە عبداللە کوڕی حارسەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی عبداللە و عبیداللە و کەسیری کوڕی عباسی کردو پاشان ئەفەرمووێ: ((هەرکەسـێ بـەرەو لام ڕابکـات و ئـەوە ئەوەی بـۆ ئـەبو، ئـەوانیش ڕایانـدەکردەلای و ئەکەوتنـە سەرپـشت وسـینگی و ئـەویش ماچیانی ئەکردوو بەخۆیەوە ئەیگوشین.[6]

ب ـ عبیداللە بەلای عباسەوە لە قثم خۆشەویستتربوو.

عبداللە کوڕی جعفر دەڵێ: من (قـثم) و عبیداللە ی هەردوو کوڕی عباس منداڵ بـوین و یاریمان دەکرد، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەسـەروڵاخێکەوە تێپـەری ووتـی: ئەمـەم بـۆ بەرزبکەنەوە، ئەوانیش لەبەرامبەریدا منیان بەرزکردەوە، بە (قـثم)ی ووت: ((ئەمـەم بـۆ بەرز بکەرەوە)) بەرزی کردەوە و لە پشتی منەوە سواری کرد و فەرمووی عبیداللە بـە لای عباسەوە لە قثم خۆشەویستترە، پێغەمبەریش (ﷺ) لەمامی شـەرمینەکرد کـە (قـثم)ی هەڵگرت و عبیداللە واز لێ هێنا.[7]

٣)دانانی عبیداللە بەوالی یەمەن لەلایەن علی (رضي الله عنه) ئەمیری ئیماندارانەوە:

---

١ ـ مسند احمد (١/٢١٤)، رجاله ثلقات (ڕوون نیە کە عبیداللە ئەو چیرۆکەی بینیبێ).

٢ ـ المجمع (٤/ ٣٤٠) رواه أبو يعلى، ورجاله رجال لصحيح.

٣ـ سير أعلام النبلاء(٣/٥١٣).

٤ـ هەمان سەرچاوە(٣/٥١٣).

٥ـ هەمان سەرچاوە.

٦ ـ مسند أحمد (١/ ٤٥٩)، رقم: ١٨٣٦.

٧ـ تاريخ دمشق (٣٥٣/٣٩) الطبقات، تحقيق السلمي(٢/ ١٤)، إسناده حسن.

علی کوڕی ئەبو تالێب گەورەی ئیماندارن (رضي الله عنه) عبیداللە کوڕی عباسی بەوالی یەمەن دانا و ڕایسپارد کە کاروباری حەج ڕێکبخات، ئەویش لەساڵی سی و شەش و سی حەوتدا حەجی بەخەڵکی کرد، کاتێکیش ساڵی سی و هەشت هات و هەروەها هەناردیە یەمەن و معاویەش لەو ساڵەدا یەزیدی کوڕی شجرة الرُهاوی نارد تاوەکو کاروباری حەج ڕێکبخات، هەردووکیان کۆبونەوە تاوەکو کار ڕاپەڕاندن بەو بدرێ، ڕێك نەکەوتن و لە ئەنجامدا ڕێك کەوتن لەسەرئەوەی شەیبەی کوڕی عثمان ئەنجامی بدات.

لەم باسەدا کەسانی مێژوو نووس (أهل السير) جیاوازن، هەندێکیان دایان ناوە کەسە هەڵبژاردراوە کەی نێوانیان قثم کوڕی عباس بووبێ، خەلیفەش ووتوویەتی: لەساڵی چلدا معاویە (بسر بن أرطاة العامري) بۆ یەمەن ناردووە، لەم کاتەدا عبیداللە ی کوڕی عباسیش والی یەمەن بووە، هەرلەوێشدا ماوەتەوە تا شەهیدکردنی علی (رضي الله عنه).[1]

٤ـ (بسر بن أرطاة العامري) وڕاستی چیرۆکی کوژرانی هەردووکوڕەکەی عبیداللە:

هەندێ کتێبەکانی مێژوو باس لەوە دەکەن کە عبدالرحمن و (قثم) ی کوڕی عبیداللە ی کوڕی عباس بسری کوڕی ئەبو ئەرتەئە لە یەمەندا کوشتووینی: هەروەها هەندێ پشتیوانانی علی(رضي الله عنه) لەوێدا کوشتووە وئینجا گەڕاوەتەوە شام و پێشتریش ئەمیری ئیمانداران جاریەی کوڕی قودامەی سعدی ناردووەو هەمان کاری (بسر)ی ئەنجامداوەو هەندێ لەخۆشەویستانی عثمانی لەیەمەندا کووشتووە.[2]

إبن کثیر دەڵێ: ئەم هەواڵە لای مێژوو نوسانەوە بەناوبانگە و لەبارەی صەحیحیەوە قسەم هەیە[3]، گومانیش نیە کە کوشتنی بێتاوانان لەو قۆناغە و تارۆژگاری بەسرەو (صفین) ڕوی نەداوە تا هەڵاسیانی جەنگی هەردوولایەنیش، کەواتە چۆن لەقۆناغی ئاگربەستدا منداڵ و ژن و بێتاوانان ئەکوژرێ، کەواتە ناکرێ ئەونەریتە دژەی نەریت و

١ـ الإستعياب (٣/ ١٠٠٩).

٢ـ تاريخ الطبري(٦/ ٥٥).

٣ ـ البداية والنهاية (٧/٣٣٤).

بەهای ئاینی موسڵمانان قبوڵ بکرێت[1]، هەروەکو گێڕانەوەی کوشتنی هەردوومناڵ بەلای (بسربن أبي ارطاة)ەوە، إبن سعد لەڕێگەی واقیدیەوە ڕیوایەتکراوە کە کەسێکی (متروك)ە — بێ بنەما و متمانەیە - و(طبري) یش لەمێژووەکەیدا باسیکردووە[2]، لەزیاد البکائیەوە ئەویش لە (عوانە) ڕیوایەتکراوە کە دەڵێ: معاویە ناردوویەتی... ئەوەش (ئیسنادێکی منقطع)ە و پاڵپشتێکی دابڕاوە بەو پێیەی لەبارەی عەوانەی کوڕی حەکەمی ئەخباریەوە قسە و باس هەیە.[3]

إبن عبدالبر لە (الإستعیاب)دا[4] چیرۆکی کوشتنی کوڕی عبیداللە ی کوڕی عباسی لەلایەن(بسر) لەڕێگای هیشامی کەلبی و ئەویش لەلایەن ئەبو موخنەفە وەکەهەردووکیان بێ متمانەن (تروك) وەرگرتووە[5]، لەبارەی هیشامی کوڕی سائیبی کەلبیشەوە لەزیادەڕەویکردنی لەشیعەیەتیدایە کۆدەنگن، ئەحمەد دەفەرمووێ: کێ لەبارەیەوە دەگێڕێتەوە؟ گومان نابەم کەسێ لێیەوە قسە بگێڕێتەوە، (دار القطنی)) یش دەڵێ: کە(مترك)ە[6]، إبن حیبانیش دەڵێ: لەشیعەیەتیدا توند بووە[7] إبن عەساکیریش دەڵێ: ڕافیزیەکی بێ متمانەیە[8]، زەهەبیش دەڵێ: ڕافیزە ڕەچەڵەکە.[9] ئەبو موخنەف، لوتی کوڕی یرحیا، إبن عەدی لەبارەیەوە ووتوویەتی: شیعەیەکی هەڵبەستکارو خاوەن چیرۆکانە[10]، إبن تەیمیەش لەڕیزی شیعە دایناوە و لەبارەوە ووتوویەتی: پەراوێز خراوێکی درۆزنە (متروك كذاب)[11]، مێژوو نوسی متمانە پێکراویش خلیفەی بن خیاط چی

---

١ ـ الإنصاف، د. حامد، لا ٥٧٥.

٢ـ تاريخ الطبري، (١٣٩/٥)، الطبقات، تحقيق السلمي(٢١٣/١).

٣ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(٢١٣/١).

٤ ـ الإستعياب(٨٩/١).

٥ـ الطبقات، تحقيق السلمي(٢١٣/١).

٦ـ المجروحين لإبن حبان (٩١/٣)، تذكرة الحفاظ(٢٤٣/١).

٧ ـ المجروحين لإبن حبان (٩١/٣).

٨ ـ سير أعلام النبلاء (١٠/ ١٠٢).

٩ ـ تذكرة الحفاظ (١/ ٣٤٣).

١٠ـ الكامل في ضعفاء الرجال(٦/ ٢١١٠).

١١ ـ منهاج السنة (٥/ ٨٢).

لەمێژووەکەی (تأريخ)[1] لە (طبقات)[2]ە کەیدا باسی نەکردووە کە (بسر) لەیەمەن یان لەحیجازدا لایەنگری علی کوشتبێ، بەڵکو باسی ناردنی ئەکات لەلایەن معاويە بۆ دەستگرتنە سەر یەمەن و حیجاز، هەروەها بوخاری لە (الکبیر) و [3] و حاکم لە (المستدرك)[4] دا وەهایان نەوتووە، هیچ کاتێکیش کوشتنی هەردوو کوڕەکەی عبیداللە لەیەمەندا لەلایەن (بسر بن أبي أرطاة)ەوە ڕاست نیە، خەڵکی شام دەبینن کە (بسری کوڕی أبو أرطاة) لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستویەتی و یەکێك بووە لەو کەسانەی عمری کوڕی خەتاب وەکو پشتیوان بۆ عەمری کوڕی عاص ناردوویەتی بۆ فەتحی میسر، بەپێ ی جیاوازیش لەوەدا ووتویانە: چوار کەس بوونە: زوبەیر و عمری کوڕی وەهب و خاریجەی کوڕی حوزافە و بوسری کوڕی ئەرتەئە، زۆربەش دەڵێن: زوبەیر ومقداد و عومەیری کوڕی وەهب، خاریجەی کوڕی حوزافە کە دڵنیایی تیادا هەیە[5] بسری کوڕی ئەرتەئە دوو فەرموودەی لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) ڕیوایەت کردوە، یەکێکیان: ((لاتقطع الأيدى في المغازي))[6] واتە: لەجەنگدا دەست نابڕدرێت.

دووەمیش: لە پاڕانەوە دا: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((اللهم أحسن عاقبتنا فى الأمور كلها، وأجرنا من خزي الدنيا وعذاب الأخرة))[7]، واتە: خوایە گیان لەگشت کاروبارەکاندا ئەنجامە کانمان باش بکەیت و لەشەرمەزاری دونیاو سزای ئاخیرەت بەدورمان بگریت))، لەبەرامبەر ئەم لێکۆڵینەوە پوختەدا کوژرانی هەردووکوڕی عبیداللە لەسەردەستی (سبر بن ارطأة) ڕاست نیە، و ئەو شیعرەش کە لە کتێبەکانی مێژوو و ئەدەبدا ئەیدەنە پاڵ عائیشەی کچی عەبدڵلای دایکی دوو منداڵەکە هیچ کات ڕاست نیە کە دەڵێ:

ها من أحسن بإبنيّ اللذين هما    كالدرتين تشظى عنهما الصّدق

---

١ ـ تاريخ خليفة، لا ١٩٨.

٢ ـ طبقات إبن خياط، لا ٢٧.

٣ـ التاريخ الكبير في البخاري(٢/ ١٢٣).

٤ ـ المستدرك (٥٣/٥٩١).

٥ ـ الإستعياب(١/٨٨).

٦ ـ مسند أحمد (٤/ ١٨١)، الحديث صحيح.

٧ـ مسند أحمد٤/١٨١/ الحديث صحيح.

ها من أحسن بإبنيّ اللذين هــما  سمعي و عقلي فقلبي اليوم فختطف

حدّثتُ بسراً وما صدقَتُ مازعموا  من ميلهم ومن الأثم الذي اقترفوا

أنحى على ودجي إبني مرهـــفة  مشحوذة وكذلك الإثم يُقتـــــرفُ

وەهای دائەنێن کە تووشی ڕاڕای و دەرون پەشێوی هاتووە ولــەو وەرزەدا دادەنیــشت و شیعری ئەوتەوە و تفی لیّ ئەکرد.[1]

هەروەها ئەو شـیعرەش کەدراوەتـە پـاڵ عبیـدالله کـوڕی عباسـەوە هـیچ ڕاسـتیەکی تیادانیــە، مێژوونوسـان گێڕاویانەتــەوە کــە عبیــدالله چــووەتەلای معاویــە لەســەردەمی خیلافەتەکەیدا و دوای قسە کردنێك عبیدالله ی کوڕی عباس ووتوویەتی:

يابن صخر وإبن حربِ تبيَــن  من تقسيون بعبد المطلـــــب

من إذا رأت قريش وجهـــه  عظموا المرء وخرّوا للركـــب

صاحب الفيل وساقي زمزم  ثمت الفدية رأس في العـــرب

وهدى آخرنا آخركـــــــم  فيه الملك لكم أجرى الحقــب

إن بُسراً قتل إبنيَّ ومـــا  بين بُسر وبني فهرنســــــب

فاقتل العبد بفرضى هاشم  إن هذا من بواء العجـــــب

إجعل الفضة فينا ذهبــاً  ونضار القوم فينا ماغـــرب

لايقر العين الإستقبل مـــن  سبّب القتل وللقتل ســـــب

ذاك ماذاك إبن حرب إنـــه  قُطب الشّر وللشّر قطـــــب[2]

هەروەها وایان داناوە کە معاویە(رضي الله عنه) بەم بەیتانە وەڵامی دابێتەوە:

إن بُسراً قتل إبنيك عــــلى  غير جُرمٍ قاطعاً منك النسبُ

١ ـ الإستعياب (٨٩/١).

٢ ـ تاريخ دمشق (٣٩/ ٣٥٤/ ٣٥٥).

أنزل اللهُ ببسرٍ بأســـــــــــــه	وعلى بسر من الله الغضــــبُ

أضرب العبد على يافوضـــــه	ضربة تذهب منه ماذهــــــب

في مقيل الدهر من ضعف بـه	ليس هذا من مناف بعجـــــب[1]

٥) ووتەی عـبیداللە: سوێند بەخوا ئەو لە ئێمە سەخیترە و ئێمە تەنها هەندێ لـە سەروەتەمان پێداوە و ئەویش سەخی تربووە لە خـۆی و منالەکـەی لەخۆگرتـەوە بـۆ ئێمە:[2]

عبیداللە ی کوڕی عباس بـۆ گەشـتێکی دەرچـوو خزمەتکارێکیـشی لەلەگەڵـدا بـوو، لەرێگـەدابووە مـاڵێکی ئـەعرابیان لیّ دەرکـەوتووە و بەخزمەتکارەکـەی ووتـووە: گـەر ببوینایەتە میوان لەم ماڵەدا بماینایەوە؟ ووتی: ڕۆیشت، عبیدللە پیاوێکی جـوان و قـسە خۆش بوو، کاتێکیش ئەعرابیەکە ئەوی بینـی ڕێـزی گـرتن و بەژنەکـەی ووت: پیـاوێکی بەرێزە و لایداداوەتە لای ئێمە وئەعرابیەکە هێنانیـە مـاڵ، پاشـان ئیعرابیەکـە هاتـەلای ژنەکەی و وتی: چێشتی ئێوارەمان هەیە بۆ میوانەکەمان؟ ئـەویش ووتـی: هیـچمان نیـە تەنیا ئەم مەڕە نەبیّ کەشیری منداڵەکەت ئەدات و ژیانی بەووەوە بەندە، ووتـی: پێویـستە سەریبڕم، ژنەکەی ووتی: کچەکەت ئـەکوژی؟ ووتـی: ئەگـەر! وتـی: پاشـان هـەردووکیان مەڕەکەو چەقۆکەیان بردو ئەیوت:

ياجارتي لا توقظي البنيُة	إن توقظيها تنتحب عليه

وتنزعُ الشفرة من يديّه[3]

پاشان مەڕەکەی سەربڕی و خـواردنی لیّ ئامـادەکردو پاشـان چێـشتەکەی هێنایـەلای عبیداللە و خزمەتکارەکەی، خواردنیان خواردو عبیـداللە گـویّ ی لەقـسەی ئەعرابیەکـەو گفتو گۆی خێزانەکەی بوو کە پێشتر ڕوویاندا، کە بەیانی بویەوە بەخزمەتکارەکـەی ووت: هیچت پێیە؟ ووتی: بەڵیّ پێنج سەد دینار لەخەرجیمان زیادە: ووتی: بیدەرە ئەعرابیەکـە،

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (٣٩/ ٣٥٥)

٢ ـ أسد الغابة (٣/٥٤٣).

٣ـ أسد الغابة (٣/ ٥٤٣).

ئەویش ووتی: سوبحان الله! پێنج سەد دیناری ئەدەیتێ و مەڕێکی بۆت سەربڕیوەکە نرخەکەی پێنج دیناره؟ ووتی لەباردایکت چووبایەی! سوێند بەخوا لەئێمە سەختیرە، ئیمە تەنیا هەندێك لەوسەروەتەی دەدەێنێ کەهەمانە، ئەوسەخاوەتی وریزی لێ گرتین و بەخوێنی خۆی و منداڵەکەی بۆ ئێمە لەخۆی گرتەوە، ئەوتریێ: ئەو ڕووداوە بەمعاویە گەیشتووە ئەویش دەڵێ: الله چی دوریکە عبیدالله ؟ لەچی سپییایەك دەرچووەو؟ لەچ ژیانێك هەڵکەوتووە؟[1] ڕیواتی یەکێك دا هاتووە کە عبیدالله مامۆستایی سەخاوەتیە، سوێند بەخوا وەها بووە هەروەکو (الحطیئة)) ووتوویەتی:

أولئك قوم إن بنوا أحسنوا البنيا　وإن عهدوا أوفوا إن عُقدوا شدوا

وإن كانت النعمى عليهم جزوابها　وإن أنعموا لا كدروها ولاكدوا[2]

٦ـ لە نێوان عبیدالله ی کوڕی جعفر و حەسەنی کوڕی علی و عبیدالله ی کوڕی عباسدا (رضي الله عنه):

أبو الزناد دەڵێ: ووتراوە: کام لەم سێ کەسە سەختی ترە: عبدالله کوڕی جعفر، حەسەنی کوڕی علی، یان عبیدالله ی کوڕی عباس؟ وترا: کەسمان نەبینوە وەکو حسن زۆر بەخشیبێ، کەسیشمان نەبینیوە وەکو عبدالله کوڕی جعفر زۆر و کەمی بەخشیبێت و هیچ کات بەلای ماڵی عبیدالله ی کوڕی عباسدا تێپەڕ نەبووە و خۆراکی پاراوی نەبووبێت بەوەش ناوبراوە قەساوەخانەکەی کوڕی عباس، ووتراوە: ووشتر کەمبۆتەوە تا نرخەکەی گەشتۆتە پانزە دینار و لەو سەربڕینەشدا عبدالله کوڕی جعفر لۆمەی کردووە و ئەویش دەڵێ: سوێند بەخوا لەسەربڕین وازناهێنم.[3]

٧) میوان گەلێك بەبێ مەوعید دانان سەردانی ماڵی عبیدالله یان کرد:

پیاوێك لەمەدینەدا وویستی وزیان لەعبیدالله کوڕی عباسی کوڕی عبدالمطلب بدات، بۆیە هاتەلای گەورەکانی شاری مەدینەو ووتی: عبیدالله کوڕی عباس وتوویەتی:

---

١ ـ أسد الغابة (٣/ ٥٤٣).

٢ ـ تاريخ دمشق (٢٧/ ٣٦٠).

٣ـ تاريخ دمشق(٣٥٧/٣٩)، الطبقات (٢٣/٢) إسناده ضعيف.

بامیوانی من بن، خەلکیش ڕۆیشتن تا ماڵی عبیداللە پڕ خەڵك بوو، عبیداللە نەیزانی هۆی هاتنی چیە و هاتنی خەڵك بۆ چیە، ووترا: هەوالّدەرت هاتووە کە خەڵکی لای تۆ نان بخۆن، ئەویش زانی کەسەکە چی مەبەستە، بۆیە بڕیاریدا کە دەرگا دابخرێت بۆ جۆرەها میوەو هەنگوین و مۆز ناردارییە بازاڕو بەخواردنی میوەوە سەرقاڵیانی کرد و خواردن برژێنرا و سورکرایەوە و لەمیوە خواردن نەبوونەوە خواردن هێنرا، عبیداللە ووتی: هەرکاتێ بویستری ئەم خواردنە ئامادە دەبێ؟ ووتیان بەڵێ، ئەویش ووتی: خەمم نیە هەرکەسێ بێتەماڵم.[١]

٨) ئافرەتێك کەکەسی بۆنەمایەوە:

ئافرەتێك لەساڵێکی نەهامەتیدا هاتە بەسرەو دووکوڕی لەگەڵدا بوو، ساڵێکی بەسەر تێپەڕنەبوو هەردووکیان مردن و ناشتیانی و لە لەنێوان گۆڕەکانیاندا دانیشت و ووتی:

فلله عيناني اللذان نراهمـــا — قريبين منّي والمزار بعيـــد

هما تركا عينّي لاماء فيهمـــا — وشكّا سواد القلب، فهو عميـد

مقيمان بالبيداء لايبرحانهـــا — ولايسأ لان الرّكب: أين يريـــد؟

پێ ی ووترا: گەر بچویتایە لای عبیداللە کوڕی عباس و باسی خۆتت بۆبکردایە، ئەویش چووە لای و پێ ووت: ئەی کوڕی مامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من بێکەس بووم کەسم نی یەتابمپارێزی ولای عەشیرەتێکیش دەست گرۆم بکات، منیش بەشوێن تکاکارو ئومێد پێکراو و بەخشەرێك دا ئەگەڕێم و بۆلای تۆ نێردراوم، یەك لەو سێ شتانەم بۆ بکە: یان گیرسانەوە، یان هاوکاری و یان گەڕاندنەوەم بۆلای کەس و کارم، عبیداللە ش فەرموی: گشت ئەو داواکاریانەت بۆ هەیە.[٢]

٩) جوانی و فیقە و و سەخاوەتی لەماڵی عباسدا:

---

١ ـ تاریخ دمشق(٣٩/ ٣٥٧).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٣٩/٣٥٨).

أبو العباس أحمد الطبري المكي، لەکتێبەکەدا (تراجم آل بيت رسول الله(ﷺ) ذخائر العقبى في مناقب ذوي القربى)، باس ئەکا....کە وتراوە: هەرکەسێ جوانی و (فقه) وسەخاوەتی ئەوێ بابڕوانێتە ماڵی عباس، جوانی بۆ فەزل فقه بۆ عبداللە و سەخاوەتیش بۆ عبیداللە.[1]

١٠) خێری دونیاو ئاخیرەت لەماڵی إبن عباسدایە:

هەرکەسێ دونیاو ئاخیرەتی دەوێ بابڕوانێتە ماڵی عباسی کوڕی عەبدلموتەلیب؟

ئەعرابیەك چوە ماڵی عباسی کوڕی عەبد لموتەلیب و لەپاڵ ئەوماڵەدا عبداللە کوڕێ عباس بوو، کە هەرشتێکی لێ پاشگەز دەبوویەوە، لەو شانی تریەوە عبیداللە کوڕی عباس بوو کەهەرکەسێ بڕوایشتایەتە ماڵیەوە نانی دەدا[2]، لە موسعەبی کوڕی عبداللە وە کە دەڵێ: هەندێ زانستخواز ووتویانە: عبداللە زانستی دەبەخشی، عبیداللە خواردنی دەبەخشی.[3]

١١) حەکیمی تەنگژەکان و سەرچاوەی بەخشندەیی:

عبداللە کوڕی عباس بە حەکیمی تەنگژەکان و عبیداللە بە چاوگی بەخشندەیی ناسرابوو، هەموو ڕۆژێ نانی دەبەخشی، باوکی پێی وتووە: کوڕی شیرینم چیە بەیانیان خواردن ئەبەخشی و ئێواران نایەبەخشی؟ نانی بەیانیت دا ئێوارنیش بیدە، بۆیە عبیداللە بەغولامێکی خۆی ووتوە: کوڕی شیرینم بەیانیان و ئێواران سەربڕە .[4]

١٢) ئەو شیعرەی لەبارەی سەخاوەتیەکەتیەکەیەوە ووتراوە:

معاویە دەیوت عبیداللە کوڕی عباس قورەیشی فێری سەخاوەتی کرد، عبداللە سەخیترین کەس بو لە عەرەب بۆیە شاعیرێکی قورەیش دەڵێ:

وعلّمها عبيد الله مالم        تكن تأتيه من شيم الكرام

---

١ ـ ذخائر العقبى، لا ٣٩٤.

٢ ـ تاريخ دمشق(٣٩/ ٣٥٦).

٣ ـ هەمان سەرچاوە (٣٩/ ٣٥٦).

٤ ـ تاريخ دمشق (٣٩/ ٣٥٦)، الإصابة (٤/ ٣٣١).

ووِرثها مكارم ثابتات نفى عنها بها لوم اللئـــام
وصية هاشم وبني أبيه قصي والهمام بن الهمـــــام[1]

١٣) بەرِۆژووبونەکەی لە رِۆژی عەرەفەدا:

لە عبـدالله کـورِی عبـاس کـەرِۆژی عەرەفـە عبیـدالله ی بـرای بـۆ چێـشت خـواردن بانگیکردووە، ئەویش دەڵێ: بەرِۆژوم ئەویش دەڵێ: ئێوە پێـشەوان و چـاوتان لێ دەکـرێ، پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بینـوە لـەم رِۆژەدا بـۆ شـیرخواردنەوە دەعـوەتکراوە و شـیری خواردۆتەوە.[2]

١٤) زانستخوازیەکەی:

بە عبیدالله کورِی عباس ووتراوە: بۆ بە شوێن زنست دا ئەگەرِێی؟ ئەویش دەڵـێ: کـە خۆشی و چالاك بوو چێژی منە و گەرکەوتمە خەمەوە دڵدەرەوەیە.[3]

١٥) چاکەکەی بەرامبەر پیرێژنەو سێ کورِەکەی:

عبیدالله کورِی عباس بەنزیك پیرێژنێکدا تێدەپەرِێ کە سـێ کـورِی هـەبوو، ئـەویش رِێزی لێ گرتن و عـبیدالله ویستی بارقورسیان چاك بکات و چاکەیان لەبەرامبـەردا ئـەنجام بدات، کاتێك لەخوار دانیشتنەکەی عـبیدالله وە دانیشت، ووتـی: نەهاتوومـە لای ئێـوە و دایکتان کە پێتان نـاخۆش بێـت، ووتیـان کەواتـە چیە ؟ ووتـی: حـەزمکرد باردۆختـان چاکبکەم و یارمەتیتان بدەم، ووتیان ئەم دیاردەیە دەگمەنە یارمەتی یـان سـواڵکردن یـان پاداشتی کارێکی کۆنە، ئەویش ووتی: هیچ شتێ لەوانە نیە، بەڵکو ئەم شەو لای ئێوە لام داوە حەزمکرد ئەوەی خوا پێی خۆش بێت بەشێکی لەسەروەتەکەم ببەخشم، ووتیان: ئەمە چیە؟ ئەوەی بۆ خوا پێ ی خۆشە و خوای خۆشەوێ بۆ ئێمە پێ ی خۆش نیە، گەر ئێمەش بۆ ویمان بو نزم و نەبونەبێ و گەر تۆش مەبەسـتت خـوابێ بیـدەی بەکەسـێ شـیاو ئـەوە لەچاکەکاریەکەت سوپاسکراو دەبیت، عبیدالله دەهەزار درهەم وبیـست ووشـتری پێـدان و

١ ـ تاريخ دمشق (٣٩/٣٥٥).
٢ ـ الإصابة (٤/٣٣١) سنده صحيح.
٣ـ الإصابة (٤/ ٣٣٢)، تاريخ دمشق(٣٩/ ٣٦٤).

بارهەڵگرەکانیشی کردە ئێسترو ووڵاخ، ووتیشی: لەعەرەب و عەجەمدا کەسم نەبینیوە لەم پیرێژنەو کوڕەکانی بچێت و شیاوتربێت. پیرێژنەکەش بەکوڕەکانی خۆی ووت: هەریەکەتان شیعرێ لە بەرێزی پیاوە بەرێزەدا بهۆنێتەوە:

کوڕە گەورەکەی ووتی:

شهدتُ عليك بطيب الكـــلام وطيب الفعال وطيب الخير

ناوەڕاستین ووتی:

تبرعتَ بالجود قبل لسؤال فعال كريم عظيم الخـــطر

بچووکەکەش ووتی:

وحق لمن كان ذا فعلــــة بأن يسترق رقاب البـــــــشر

پیرێژنەکەش ووتی:

فعمرك الله من ماجد وُوُقيت سؤال ردى والحـــــــدر[1]

١٦) مردنی:

لەدیاری کردنی ساڵی مردنی دا قسە و بۆچونەکان جیاوازن: بخاری[2] وفسوی[3] دەڵێن: لەسەردەمی معاویەدا(ﷺ) مردووە[4](خليفة)[5] و کەسانی تریش ووتویانە: ساڵی پەنجاو هەشت کۆچی دوایی کردووە[6] أبو عبيد و أبو حسان الزيـادي ووتویانە هەشتاو حەوت کۆچی دوایی کردووە [7]، ووتویانە لەڕۆژگاری یەزیدا کۆچی کردووە وڕای زۆرینە ئەوەیە مردنەکەی لەمەدینەدا بووە، ووتراویشە لەیەمەندا بووە بەڵام لەمەدینە ڕاسترە.[8]

---

١ ـ الإصابة (٤/ ٣٣٢)، تاريخ دمشق(٣٩/٣٦٤).

٢ ـ البخاري في تأريخه الصغير، لا ٧٣.

٣ـ المعرفة والتاريخ (٣/٣٢٢).

٤ ـ تاريخ الإسلام، حوادث سنة٨١ ـ ١٠٠ ه، لا ١٤٧.

٥ ـ في تاريخه،لا ٢٢٥.

٦ ـ تاريخ الإسلام، حوادث سنة ٨١ ـ١٠٠ه، لا ١٤٧.

٧ ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٤٧.

٨ ـ أسد الغابة(٣/ ٥٤٤).

لەمردنی براکانی عبیداللە دا بۆدڵە زیندووەکان پەندو ئامۆژگاری و یادەوەری هەیە، عبیداللە کوڕی عباس لە(طائف) نێژراوە و (معبد) لەئەفریقیا شەهید بووە و (قثم) لەسەمەرقەند شەهید بووە[1] عبیداللە لەمەدینەدا و هەموویان نەوەی یەك باوك و دایکن، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[ لقمان: ٣٤].

## سیٚ یەم: عبداللە کوڕی جعفری کوڕی ئەبو تاڵیبی هاشمی:

ناوی عبداللە کوڕی جعفری کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشمی گەورەی جیهانە، أبو جعفری قورەیشی هاشمی، لە حەبەشە لەدایك بووەلەمەدینەدا گیرساوەتەوە، سەخی کوڕی سەخی دوباڵ(ذوالجناحین)ە.[2] دایکیشی ناوی ئەسمائی کچی عومەیسی خەسعەمیە کچی مەیمونەی حاریسە لەدایکیەوە، عبداللە کوڕی جعفری لەحەبەشەدا بوە، یەکەمین کوڕیەتی کە لەنێو منداڵە موسڵمانەکاندا لە دایك بووە[3]، لەوێشدا محمدو عون لەدایك بووە دوای ئەوەی ئەسماعبداللە بووە نەجاشیش کوڕێکی بووە وناردویەتی بەشوێن جعفردا کە کوڕەکەت ناو ناوە چی ؟ ووتی: عبداللە نەجاشیش کوڕەکەی ناونا عبداللە، ئەسمای کچی عومەیس وەریگرت تابڕینەوە خۆی شیری پێدا بە لەگەڵ شیرەکەی عبداللە کوڕی جعفرو بەوەش ئەسماعلەو پایەی لایان هەبوو، هەرکەسیٚ لەحەبەشیەکان موسڵمان بوایە دەهاتەلای ئەسماعئەویش فێری ئەکردن.[4]

دوای شەهید بوونی جعفریش ئەسماعشووی بە أبوبکر کرد و محمدی لیٚ بو پاشان علی مارەی کرد و یحیای لیٚ بوو[5] لەدایکیشەوە[6] محمدی کوڕی أبو بکر و یەحیای کوڕی علی

---

١ ـ تاريخ دمشق(٣٩/ ٣٥٠).

٢ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٤٥٦).

٣ ـ الإصابة (٤/ ٣٦).

٤ ـ الطبقات للسلمى (٢/ ٧).

٥ ـ الإصابة (٤/ ٣٧).

٦ ـ اسد الغابة (١٩٩/٣).

برای عبدللە کوڕی جعفرن، عبداللە کوڕی جعفریش بەکۆتا کەسی بنەماڵەی هاشم دادنرێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش وەفاتکردنی بینیبێتی.[1]

١.ژن منالەکانی:

عبداللە کوڕی جعفر، جعفری ئەکبەری بوو هەر بەویش نازناوی وەرگرت، (الأمیة) دایکێتی و (أم عمرو) ئەناسرا کەکچی خراش ئەلعبسیە[2] بوو، علی و عەونی ئەکبەر ومحمد و أم کەلسومیش زینەبی کچی علی کچی ئەبو تالیب داکیان بووکەکچی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).[3]

حسین و عەون وعەونی بچوکیش کە لەگەڵ حوسەینی کوڕی عەلیدا کوژراوە ولە پاش خۆی نەوەی نەما[4] دایکی جومانەی کچی مەسیبی کوڕی نەجبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەوفی نەوەی فەزارەبوو[5] أبو بکر و عبیداللە و موحەممەدیش، خوصائی کچی خەمسەفەی کچی ثقفی کوڕی عابدینی کوڕی حارسی تەیمولای سەعلەبەی کوڕی بکری کوڕی وائل بووە[6] سالحیش کەکەسی لە دوانە جێ نەما.

یەحیاو هارونیش پاشماوەیان نەبووە، موساو جعفریش هەروەها دایکی محمدیش دایکیان لەیلای کچی مەسعودی کوڕی خالید بوو، حەمید و حەسەنیش أم ولد دایکیان بوو، جعفر و أبو سەعید أم حەسەنی کچی کعبی کوڕی عبداللە کوڕی أبوبکری کوڕی کیلابی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عامری کوڕی (صعصە) بوو[7]. معاویە و ئیسحاق و (قثم) کەسیان لە پاش نەما، أم عەونیش دایکی زۆر منداڵ بوو.[8]

---

١ ـ البدایة والنهایة (١٢/ ٣٠٠).

٢ ـ الطبقات الکبری (٦/٢) تحقیق السلمی.

٣ ـ هەمان سەرچاوە

٤ـ هەمان سەرچاوە.

٥ ـ هەمان سەرچاوە.

٦ـ هەمان سەرچاوە.

٧ـ هەمان سەرچاوە.

٨ ـ هەمان سەرچاوە.

٢. هاتنی جعفری کوڕی ئەبو تاڵیب بەخێزانیەوە لەحەبەشەوە بۆمەدینە:

جعفری کوڕی ئەبو تاڵیب لەگەڵ کۆچەرانی حەبەشە لەڕۆژی فەتحی خەیبەردا لەگەڵ ئەسمائی خێزانی و عبداللە و عەونی و محمدی کوڕانی هاتن بە هاتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر خۆشحاڵ بوو، پێغەمبەری پەیامی بۆ نەجاشی نارد کە بیان گەڕێنێتەوە ئەویش خستینیە دوو کەشتی و گەڕانەویان کەوتە ڕۆژی فەتحی خەیبەرەوە، لەهاتنی جعفردا ئەبو موسای ئەشعەری و ئەشعەریەکانی تر هاوەڵێتیان کردووە، لەئەبو موسا ئەشعەریەوە (رضي الله عنه): دەرکەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێمان گەیشت وئێمەش لەیەمەن بوین، بۆیە بەکۆچەری بۆلای پێغەمبەری خوا دەرچوین و دووبرام لەگەڵدا بوو کەمن بچوکترینیان بوم یەکێیان ئەبو بوردە بوو، ئەویتریش ئەبو ڕەهم بوو، وتراوە: چەند کەسێك بووین، بەڵام وتوویەتی پەنجا و سێ یان چەنجا و دوو پیاوی هۆزەکەمان بووین، کەشتیەکەمان هاتەلای نەجاشی لەحەبەشەو جعفری کوڕی ئەبو تاڵیبیش ڕازی بووبەوەی هەمووومان لەو کەشتیەدا بین، هەموومان سەرکەوتین، گەیشتین بەپێغەمبەریش (ﷺ)لەکاتی فەتحی خەیبەردا بوو.[1]

٣.ئەی خەڵکی ئەم کەشتیە دووکۆچتان (هیجرەت)هەیە:

لەئەبو موساوە: خەڵکانێك هەبوو ئەیانوت لەهیجرەتدا پێش ئێوە کەوتوون، ئەسمائی کچی عەمیس چووەلای حەفسەی خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سەردانی کە بۆ لای نەجاشی کۆچی کردبوو عمریش هاتەلای حەفسەو ئەسمائی لەگەڵ بوو، کە ئەسمائی بینی ووتی: ئەم ئافرەتە کێیە؟ ئەسماء وتی: کچی عمریس، عمری وتی: ئەمە حەبەشیە؟ ئەمە دەریایە؟ ووتی: بەڵێ: عمر وتی: ئێمە بەهیجرەت لەئێوە پێشکەوتین و ئێمەش شیاوترن بە پێغەمبەری خوا، ئەسمائیش توڕەبوو ووتی: نەخێر سوێند بەخوا، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا بوون وبرسیانی تێر ئەکرد و نەفامتانی تەمبێ ئەکرد، ئێمەش لە پێناوی خوا وپێغەمبەری خواو لەزەوی ڕەق و زبری حەبەشە بووین، سوێند بەخوا نان و ئاو ناخۆمەوە تائەوەی ووتت بە پێغەمبەری خوا نەڵێم و لێ نەپرسم، سوێند بەخوا درۆناکەم و

---

١ـ البخاري، كتاب: المغازي، رقم: ٤٢٣٠، ٤٢٣١، معين السيرة، لا ٢٥٣

زیاتری ناخەمەسەر، کاتێك بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت و وتی: ئاوەهـا و ئاوەهـا.
پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((کەس لـەئێوە زیـاتر بـۆمن لەپێـشتر نیـە و خـۆی و هاوڕێکانی یەك هیجرەتیان هەیە و ئێـوەش ـ خـەڵکانی کەشتی دوو هیجرەتتـان هەیـە [1]،ئەسمائی دایکی عبدالله کوڕی جعفریش ئەو موژدەیەی پێـدرا ئـەویش بـە ئەنـدامانی کەشـتیەکەی ووت[2] هـەروەکو وتـوتی: ئەهاتنـە لام و لـەبارەی ئەوباسـەوە پـسیارن لێ ئەکردن، لەدونیادا هیچ شتێ ئەوندەی ئەو مژدەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دڵخۆشـی نـە دەکردن [3] پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) دوای ڕاوێـژکردنی بـەهاوەڵانی (ڕەزای خویـان لێ بێت) بەشداری فەتحی خەیبەریان کردبوو[4] لەدەسکەوتەکانی خەیبەردا بەشی دان.

٤.شەهید بوونی جعفری کوڕی ئەبو تاڵیب لە موئتەدا:

یەحیای کوڕی ئەبو یەعلاوە وتی: بیستم عبدالله کـوڕی جعفـری ئـەیووت: لەبیرمـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەلای دایکم و هەواڵی باوکمی پێدا، من ئەمڕوانیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش دەستی بەسەرمن و براکەم دا ئەهێنایەوە و چـاوەکانی پـڕ فرمێـسك بوو دەرپەڕێن و کەوتنە سەر ڕیشی، پاشان فـەرمووی: ((خوایـەگیان جعفـر بـۆ باشـترین پاداشت هەنگاوینا لـە نەوەکەشـیا باشـترین شـتی لێ بـەجێ بهێڵـە کـە لەنـەوەی هـیچ بەندەیەکی تردا نەبێ)) پاشان فەرمووی: ئەی ئەسماء موژدەت بدەمێ؟ ئەسماءوتی: بـەڵێ دایك و باوکم بەفیدات بێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش فەرمووی: ((خوا دووباڵی بەجعفرداوە و لەبەهەشتدا پێان دەفڕێ)) ئەسماء ووتی: دایك وبـاوکم بەفیـدات بـێ ئـەی پێغەمبەری خوا خەڵکی لەوەدا ئاگاردار بکە، پێغەمبەری خواش(ﷺ) هەستا و دەسـتی گرتم و دەستی بەسەرمدا هێنا تاگەیشتە سـەر مینبـەرو لەبەرامبـەری خـۆی و لەپایـەی خوارەوەدا دابنیشاندم و خەفەتی پێـوە دیـاربوو، قـسەی کـردوو فـەرمووی: ... ((جعفـر شەهید بوو، خـواش دووبـاڵی پێـداوە لەبەهەشـتدا پێـان دەفـڕێ))، پاشـان پێغەمبـەری خوا(ﷺ) دابەزی و چوەماڵی خۆی و لەگەڵ خۆیدا بردمـی، فرمـانی پـێ کـردن چێـشت

---

١ ـ البخاري،كتاب المغازي، رقم: ٤٢٣١.

٢ ـ فقه السيرة للغضبان، لا ٥٣٥.

٣ ـ مسلم، رقم: ٢٥٠٢، ٢٥٠٣.

٤ ـ الصراع مع اليهود لأبي فارس(٣/ ٩٦).

دروست بکەن وبۆخێزانەکەمان چێشت کراو ناردی بەشوێن براکەمدا ولای پێغەمبەری خوا (ﷺ) چێشمان خواردو، سوێند بەخوا خواردنێکی خۆش و پیرۆز بوو، سەلمانی خزمەتکاری جۆی هاڕی و پاشان پاکی کردووە ئامادەیکرد...ئینجا من و براکەم لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نانمان خوارد[1]

٥.لەمڕۆ بەدوا بۆ براکەم مەگرین:

عبداللە کوڕی جعفر دەڵێ: دوای سێ ڕۆژ لەهەواڵی کوژرانی جعفر پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە لایان و فەرمووی: ((لەمڕۆ بەدواوە بۆ براکەم مەگرین))، پاشا ن فەرمووی: ((برازاکانم بۆ بهێنن)) ئێمەیان هێناو سەرمان گڤ بوو، فەرمووی: محمد لە ئەبو تالیبی ماممان ئەچێت، عبداللە ش لەخوڕەوشتی بەمن ئەچێت ((پاشان دەستی گرتم ودەستی هێنایە بە قژمدا و، پاشان فەرمووی: ((اللهم اخلف جعفرا في أهله، وبارك لعبدالله في صفقته)) ووتی: پاشان دایکمان هات و باسی هەتیویمانی کرد، پێغەمبەریش فەرمووی: ((لەهەژاریان ئەترسی و منیش لەدونیا و ئاخیرەتدا خاوەنیانم)).[2]

٦.پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیخاتە سەرولاخەکەی:

عبداللە کوڕی جعفروتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەر لەگەشتێك بهاتایەوە منالانی بنەماڵەی ئەخستە سەر ولاخەکەی، ووتی: لەگەشتێکدا هاتەوە پێشکەوتم وگەشتمە لای و لەنێو دەستی خۆیدا دانیشاندم و گەیشتە یەکێك لە دووکوڕەکەی فاتیمە ـ حسن بوو، یان حوسەین ـ لەپشتی خۆی سواریکردو ووتی: بەسێ نەفەری و لەسەر ولاخەکەی چوینە مەدینەوە.[3]

٧. پێغەمبەر بۆی پاڕایەوە (ﷺ):

لە(عمرو بن حريث): کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای عبداللە کوڕی جعفردا تێپەڕبووە کە عبداللە لەگەڵ منالاندا یاریکردووە و فەرموویەتی: خوایەگیان لەبەیعەتدانەکەیدا

---

١ـ الطبقات تحقيق السلمي (٢/٨) إسناده ضعيف جدا، و له شواهد.

٢ ـ مسند أحمد (١/ ٢٠٤) لەڕێگەی وهب بن جرير و ئوويش لەباوەکیەوە بەسەنەدەوە بە هێزیشەوە.

٣ ـ مسلم، رقم: ٢٤٢٨.

بەرەکەت بە عبداللە بدە [1]، لەعبداللە کوڕی جعفریشەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ جار دەستی بەسەریدا هێناوە و فەرموویەتی ((اللهم اخلف جعفراً في ولده)).[2]

### ٨. باسکردنی بەیعەتدانی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ):

لە هیشامی کوڕی عوروە ئەویش لەباوکیەوە:عبداللـە کـوڕی زوبـێر وعبداللـە کـوڕی جعفر بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا کەحەوت ساڵان بـوون، پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) کـەبینیانی بـزەی کـردووە دەسـتی خـستە دەسـتیان وئـەوانیش بەیعـەتیان دا [3] ڕاستیش ئەوەیە کە عبداللە کوڕی زوبێر ساڵی (الهجرة) لە دایك بوە.[4]

### ٩.هاوڕێیەتیکردن و بەسەرکرنەوەی پێغەمبەری خوا بۆ کوڕانی جعفر:

جابری کوڕی عبداللە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەئەسمای کچی (عمـیس)ی ووت: لاشەی برازکانم چیانە؟ هیچ پێویستەکیان هەیە کەوای لێ هاتووە؟

ئـەویش ووتـی: نـا، بـەڵام چـاوکاریان لێ دەکـا ئـەیانپارێزم؟ پێغەمبـەریش (ﷺ) فەرمووی: دوعایان بۆ ئەخوێنم کە تووشی نەخۆشی نەبن.

### ١٠. ئەسماء شتێکی فێرکردم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی فەرموو بوو کاتێ لە ناخۆشیدا بی:

لە عبداللە کوڕی جعفر دەڵێ: ((دایکم ئەسمائی کچی عومەیس شـتێکی فێرکـردم کـە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە کاتی ناخۆشیدا بڵێ: ((الله الله انی لا اشـرك بـە شیئاً)) لە شکایەتی وشترەکە بۆ پێغەمبەری خـوا (ﷺ): لـە عبـداللە کـوڕی جعفـرەوە: ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) لە پشتی خۆی سواری کردم و کارێکی بۆ باس کردم کە بـۆ هـیچ کەسێکی باس نەکەم و پێغەمبەر (ﷺ) حەزی دەکرد ئەوە پێداویـستەدا شـاراوەبێ و دار خوارما بوو ئەمە یەزیدی کوڕی هارون لەم فەرموودەدا زیادی کردووە ڕۆژێك پێغەمبـەری

---

١ ـ سیر أعلام النبلاء(٣/ ٤٥٣) مجمع الزوائد (٩/ ٢٨٦) رجالهاثقات.

٢ ـ مسند أحمد (١/ ٢٠٤) لەڕێگەی وهب بن جرير و ئوویش لەباوەکیەوە بەسەندەوە بە هێزیشەوە.

٣ ـ المستدرك (٣/ ٥٦٦ ـ ٥٦٧). ئیسماعیل کوڕی عباس لەسەندەوە یدا هەی لاوازە و خەڵکی شارەکەی نیە.

٤ـ الإصابة (٤/٣٨).

خوا(ﷺ) چوه باخێکی ئەنصاریەکان و ووشتریکی تیادا بوو دەنگی لێوە هات و چاوی کزکردبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی هێنایە پشت گویچکەکانیدا ئەویش ئارام بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی (کێ خاوەن ئەم ووشترە یە((گەنجێکی ئەنصاری هات ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا هی منە (ﷺ)، پێغەمبەر فەرمووی: لەخوا بترسە و بەرامبەر ئەم ئاژەڵە کە خواپێتی داوە شکایەتت لێ ئەکات کە ماندووی ئەکەی برسی ئەکەی[1] لە کاتی مردنی پێغەمبەردا(ﷺ) تەمەنی دەساڵان بووە[2] بەهۆی هاوڕییەتیکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمودەی گێڕاوەتەوە لەئەسمائی کچی عومەیسی دایکی و علی کوڕی ئەبو تالیبی مامی و کوڕانیشی لێیان گێڕاوەتەوە، وەکو ئیسحاق ومعاویەو محمدی کوڕی علی کوڕی حوسەین و سعدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوف وعبدالله کوڕی مولیکە وعبدالله شەدادی کوڕی هاد و شەعبی و عباسی کوڕی سەهلی کوڕی سعد و مورەقی عیجیلی وخالید کوڕی سارە و محمدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو ڕافعی فیهمی.[3]

### ١٢. سلام کردنی إبن عمر لەعبدالله کوڕی جعفر:

شەعبی دەڵێ: إبن عمر گەر سەلامی لە عبدالله کوڕی جعفر بکردایە ئەیفەرموو (السلام علیك) ئەی کوڕی خاوەن دووباڵ (یا إبن ذي الجناحین).[4]

### ١٣. علی ئەمیری ئیمانداران (رضي الله عنه)سوربو بۆ فێرکردنی عبدالله کوڕی جعفر:

لە عبدالله کوڕی شەدادەوە کە علی بە عبدالله کوڕی جعفری وتووە(رضي الله عنه): چەند ووشەیەکت فێربکەم کە کە حسن و حوسینم فێر نەکردووە، گەر بۆشتێ لەخوا داواتکردو سەرکەوتنت وویست ئەوەبڵێ: ((لا إله إلا الله وحده لاشرك له العلى العظم، لا إله إلا هو

---

١ ـ الطبقات تحقيق السلمي (١١/٢) إسناده ضعيف

٢ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(٢/ ١٣/ ١٤) إسناده صحيح.

٣ ـ الإصابة(٤/ ٣٧).

٤ ـ تاريخ دمشق (١٦٩/٢٩).

وحده لاشريك له الحليم الكريم))،[1] هەندێ جاریش عبدالله کوڕی جعفر هاوەڵێتی علی (ﷺ) مامی کردووە و لەوڕۆژی (صفین)دا یەکێك بووە لەئەمیرەکانی.[2]

## هەواڵی بەخشندەیی و سەخاوەتیەکەی:

عبداللە کوڕی جعفر سەخی و زیرەك و نەرم نیان و داوێن پاك و بەدەریاری بەخشندەیی ناسرابو[3] جەمسەری سەخاوەتی پێ ئەوترا[4] ئەوتریٚ لەئیسلامدا لەسەردەمی خۆیدا لەو سەخی تر نەبووە، ووتویانە: سەخیەکانی عەرەب لەئیسلامدا دەکەس بوونە: سەخیترین خەڵکانی حیجاز عبدالله کوڕی جعفر و عبیدالله کوڕی عباسی کوڕی عبدالمطلب و سعیدی کوڕی عاص ناسراو بوون، سەخیەکانی کوفەش، عتاب کوڕی وەرقای نەوەی ڕەباحی کوڕی یەربوع و ئەسمائی کوڕی خارجەی کوڕی حصن الفزاری عکرمەی کوڕی ڕەبعی فەیازی نەوەی تەیمولاّی کوڕی ثعلبة، سەخیەکانی بەسرە: عمروی کوڕی تەڵحەی تەڵحات و عبیدالله کوڕی أبو بکر، سەخیەکانی شام: خالیدی کوڕی عبدالله کوڕی خالیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی أبوالعاسی نەوەی ئومیەی کوڕی عبدالشمس، گشت ئەوانە لە عبدالله کوڕی جعفر سەخی وبەخشندە تر نەبوون، هیچ موسڵمانێك لەسەخاوەتیدا بەو نەگەیشتووە، لەوەشدا لۆمە کراوە و ووتوویەتی: خوا بۆمی کردۆتە نەریت و بۆ خەلکیشم بەنەریت کردووە، ئەترسم ئەو سەخاوەتیە بپچڕێنم و خواش لێمی ببڕێت،[5] لە علی کوڕی حوسین و ئەویش لە حوسینەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: عبداللە کوڕی جعفر سەخاوەتی فێرکردین[6]، ئەوەش بۆ خاکەرایی حسین (ﷺ) ئەگەڕێتەوە ئەگینا خۆی و حەسەنی برای لەسەخاوەتی و بەخشندەییدا دەستی بالاّیان هەبووە، ئەمەی خوارەوەش باسی سەخاوەتی و بەخشندەیی عبدالله کوڕی جعفرە.

---

١ ـ الطبقات للسلمي (٢/ ١٦) إسناده صحيح.

٢ ـ الإصابة (٤/ ٣٧).

٣ ـ الإستعاب (٣/٨٨١).

٤ ـ الإصابة (٤/ ٣٧).

٥ ـ الإستيعاب (٣/٨٨١).

٦ ـ تأريخ دمشق (٢٩/ ١٨٧).

١.هیچمان نیه بتدەینێ بەڵکو بچۆره لای کوڕی جعفر:

گێڕاویانەتـەوه کەلـەکاتی وەرزدا لەمەدینـه ئەعرابیـەك چـۆتەلای مـەروان وداوای یارمەتی لێ کردووه، ئەویش ووتوویەتی: هیچمان نیه بتدەینێ بـەڵکو بـچوره لای کـوڕی جعفر، ئەعرابیەکەش چوویەلای إبن جعفر و تەماشا باری ولآخـی کـردووه، وشمـشێرەکەی بینوه و عبدالله لەدەرگا هاتەدەرو ئەعرابیەکه ئەیوت:

أبو جعفر أهل بيت نبـــــوة    صلاتهم للمسلمين طهـــور

أبا جعفر ظن الأمير بمالـــــه    وأنت على مافي يديك أمير

أبا جعفر يإبن الشهيد الذي لـه    جناحان في أعلى الجنان يطير

أبا جعفر مامثلك اليوم أرتـجي    فلا تتركني بالغــلاة أدور[1]

ئەویش ووتـی: ئـەی ئـەعرابیی ئـەو ووشـتره و بـاره ببـه، ووریاشـبه لـه شمـشێرەکه نەخەڵەتێنرێ، چونکه بەهەزار دینار کریومه.[2]

٢.ئەوەمان بەخشیوه کە لەنێو ئەچێ و سوپاسمان پێ ئەبەخشێ و پیاهەڵدان ئەمێنێتەوه:

شاعیریك مەدحی کردوه ئەویش ووشتریك و ئەسپێك و بـەرگ و دینـار و دەرهـەمی پێداوه، پێ ی ووتراوه: ئەم شتانه بەو ڕەشه ئـەدەی؟ ئـەویش ووتوویـەتی: گـەر شێوەی ڕەشبێ خۆ قژی سپیه بەوەی ووتی: زیاتری شیاوه ئەومان پێـداوه کـەنامێنێ و ئـەویش سوپاسی پێ بەخشین که ئەمێنێتەوه، ووتراوه کەئەم هەواڵـه لـه عبداللـه کـوڕی جعفـر لەتەك عبیدالله کوڕی قەیسی الرقیات،[3] ڕوویداوه، لەشیعرەشی کـه بۆعبداللـه کـوڕی جعفردا دەڵێ:

١ـ تاريخ الإسلام، حوادث ووفيات (١، ٨٠، لا ٣١).

٢ ـ سير أعلام النبلاء (٣/ ٤٥٩).

٣ ـ الإستيعاب (٣/ ٨٨٢) باسکراوه کەعبدالله ناوبووه.

وماكنت إلا كالأغربن جعفر رأي المال لايبقى فابقى له ذكراً[١]

هەروەها لە عبداللە دا دەڵێ:

نفدت بيَ الشهباء نحو إبن جعفـــر سواءٌ عليها ليلُها ونهارُهـــــــا
يزور أمراً قد يعلم الله أنــــــــه تجود له كفٌّ قليل غرارُهـــــــــا
فوالله لولا أن تزورإبن جعـــفـــر لكان قليلاً في دمشق قرارهـــــــا
أتيتك أثني بالذي أنت أهلـــــه عليك كما أثنى على الروض جارُهـا
ذكرتك إذا فاض الفرات بأرضنا وجللّ أعلا الرّقتين بحارهُـــــــــــا
فإن متّ لم يوصل صديق ولم تقـم طريقُ من المعروف أنت منارهـــا[٢]

موصعب کوڕی عبداللە ووتی: عبدالمیکی کوڕی مەڕوان ووتی: لەنێوبـچێ ئـەی إبـن قەیس ناترسی کە لە ئیبو جعفردا دەڵێ: أتت رجلاً قـد يعلـم الله أنـه يجـود لـة كـفّ قليـل غرارها

بۆ نەت ووت: خەڵکی ئەزانن و نەتوتایە خوا ئەزانێ، إبن قەیسش دەڵێ: سوێند بەخوا خواحافیریکردووە و ئەویش فێری بووە خەڵکیش ئەیزانن و فێریـان کـردووە، [٣] شمـاخ بـن ضراریش لەمەدحی عبداللە کوڕی جعفردا دەڵێ:

إنك ياإبن جعفر نعم الفتــــى ونعم مأوى طارق إذا أتـــــى
ورُبَّ ضيف طرق الحّي سُرى صادف زاداً و حديثاً ماشتهى[٤]

ئەعرابیەك هاتۆتەلای عبداللە کوڕی جعفر نەخۆش بوو وتی:

كم لوعةً للندى وكم قلـــــق للجود والمكرمات من قلقـــكْ
ألبسك الله منه عافـــــــية في نومك المعتري وفي أرقــــِكْ

١ ـ الإصابة (٤/ ٣٨).

٢ ـ الإصابة (٤/ ٣٨).

٣ ـ تاريخ دمشق (٢٩/ ١٨٥).

٤ ـ الإصابة (٤/٣٩).

أخرج من جسمك السُّقام كما      أخرج ذمّ الفعال من عنقك

ئەویش سەد هەزار دیناری پێداوە.[1]

ڕۆژێك عبدالله کوڕی جعفر لە گەشتێکدا بو بەلای کۆمەڵە هەرزەکارێك تێپەڕی و یەکێکیان پێ ووتوە:

أقول له حين ألفيته      عليك السلام أبا جعفر

عبدالله وەستا ووتی: عليك السلام ورحمه الله و وتی:

وهذي ثيابي قد أخلقت      وقد عقّني زمن منكر

عبدالله ووتی: ئەم بەرگەم ببە ئەویش ووتی:

فأنت كريم بني هاشم      وفي البيت منها الذي يذكر

ووتی: ئەی برازا ئەوە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ)[2]، پیاوێك نامەیەکی بۆ عبدالله کوڕی جعفر نوسی خستیە نێو ئەو سەرینەی لەسەری ئەخەوت و عبدالله سەرینەکەی هەڵگەڕانەوەو پارچە نوسراوەکەی خوێندەوە و خستیەوە شوێنەکەی خۆی و کیسەیەکی پێنج هەزار دیناری خستە شوێنەکەی و پیاوەکەش هاتەوەو عبدالله پێ فەرموو: سەرینەکە لابەرە و بڕوانە شتێکی لەژێردایە وببە، پیاوەکەش کیسەکەی بردو ئەیوت:

زاد معروفك عندي عظيماً      أنه عندك مستور حقير

تتناساه كأنه لم تأته      وهو عند الله مشهور كبير[3]

### ٣. قەرزەکانی نێوان عبدالله کوڕی زوبێر و عبدالله کوڕی جعفر:

عبدالله کوڕی جعفر سلفەی هەزار هەزاری لە زوبێر وەرگرت، کاتێك زوبێر مرد إبن زوبێر بە عبدالله کوڕی جعفری ووت: لەنوسراوەکەی باوکمدا بینیومە هەزار هەزار دەرهەمی بە قەرز پێتداوە، ووتی ڕاست ئەکات هەرچ کاتێ بتەوێ وەریبگرە، دوایی پێ

١ ـ تاريخ دمشق (٢٩/ ١٩٤).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٢٩/ ١٩٩).

٣ ـ تاريخ دمشق (٢٩/ ١٨٩).

ی گەیشت ووتی: تۆپارەت بەسەرەوە هەیە بۆناییەی، ووتی: بۆ خۆیەتی ووتی: نامەوێ[1]، (ذهبي) دەڵێ: ئەم گێڕانەوەیە ئەوپەڕی سەخاوەتی إبن جعفرمان پێ شارەزا دەکات[2]، لە گێڕانەوەکەی إبن عەساکیردا هاتووە کاتێك عبدالله کوڕی زوبێر بەعبدالله کوڕی جعفر ووتی: ئەوەم ناوێ، إبن جعفر ووتی: سەرپشکبە حەزت کرد بیبە و پێشت ناخۆشبوو ئەوە با قسەی خۆت بێ، گەر نەتەوێت ئەوە لەماڵەکەیم پێ بفرۆشە، ئەویش ووتی: پێتی ئەفرۆشم، بەڵام کۆیدەکەمەوە، کۆیکردەوە و پاشان ماڵەکەی هێنا و ووتی: حەزئەکەم کەسمان لەگەڵدا نەبێ، ووتی: بابڕۆین و ڕۆیشتن و دایانە کەسێك هیچ ماڵی نەبووە عبدالله بەغولامەکەی ووت: شوێنی نوێژەکەم بۆ پاك بکەوە، ئەویش پاکیکردەوە ئینجا دووڕکات نوێژی و دو سجدەی درێژ بردو ئەپاڕایەوە، کاتێك پاڕانەوەکەی تەواو کرد، بەغولامەکەی ووت، شوێنی سوجدەکەم بۆ هەڵکەنە، ئەویش هەڵیکەندو بوەکانی یەك إبن زوبێریش پێ ووت بۆم بگێڕەوە، ئەوەیش ووتی دوعاکەم خوایە قەبوڵی کرد نایگێرمەوە بۆت تاوای لێهات ئەوەی لێوەرگرت بوو زیاتر بوو لەوەی لەدەستی إبن زوبێر دابوو.[3]

٤. گەر خوا پەیمانی نیعمەتی ئاخیرەتی پێداوین ئەوە تۆنیعمەتی دونیات پێخیراکردین:[4]

لەمحمدی کوڕی عبدالله کوڕی ئەبو مەلیکەوە، ئەویش لەباوکیەوە، ئەویش لەباپیریەوە، إبن عمار - ئەوکات زانای حیجاز بوو - چۆتەلای نخاس جاریەیەك نارەزایی دەبڕی، ئەویش جاریەیەکی تری خستۆتە بەردەم کە نرخەکەی لەو زیاتربوو، ڕوومەتی زۆر جوان بووە، بۆیەدڵی چۆتە سەر و بەکارێکی گەورەی زانیوە، نەخاسیش بینیویەتی بۆیە نرخەکەی لێ دوور خستۆتەوە زیادی کردووە، عطاء و طاوس و مجاهد چوونە لای و سەرزەنشتیان کردووە، وەڵامی ئەویش ئەوەبووە ووتی:

یلومنی فیك أقوام أجالسهم      فما أبالي أطار اللوم أم وقعا

---

١ ـ تاریخ الإسلام، حوادث ووفیات (١/ ٨٠، لا ٤٣١).

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٤٣١.

٣ ـ تاریخ دمشق (٢٩/ ١٨٧).

٤ ـ سیر أعلام النبلاء (٣/ ٤٦١).

هەواڵەکە بە عبداللە کوڕی جعفر گەیشت و ئەویش ناردی بەشوێن خاوەن جارییەکە و بە چل هەزار درهەم لێی کڕی و فرمانی کرد جارییەکە بڕازێنریتەوە، جارییە ڕازێنرایەوە، هاتە مەدینەو خەڵکی هاتن سەلامیان لێکرد، خەڵکی حیجاز هاتن ووتیان چیە ئەوە نابینن إبن ئەبو عمار سەردانی بکات؟ هەواڵ بەشێخ دراو هاتەلای کاتێ ویستی هەڵسێ داینشاندن إبن جعفر پێ ی ووت: فلانە ئافرەت خۆشەویستیەکەی لەکوێیدایە، چی پێت کرد، ووتی: لەگۆشت و خوێن و مۆخ و دەمارو ئیسقانمدایە، وتی: گەر بیبینی ئەیناسیتەوە ؟ ووتی: بە فیدات بم بەردەوام وێنەی لەچاومدایە، ووتی: سوێند بەخوا لەوکاتەی بووم بەخاوەنی ئەو جاریە نەم بینیوە، ئەی جارییە بیبەدەرە، جاریە بردیەدەرێ لەجوانی و ڕازاوەییدا شەوقی دەداوە، ووتی: ئەمە خۆیەتی؟ ئەویش ئەیوت:

هي التي هام في قلبي من تذكرها والنفس مشغولة أيضًا بذكراها

ووتی: ئیتر هی خۆتەو بیبەوە، خوا بەرەکەتی بخاتێ، ئەویش ووتی: بەفیدات بم گەورەییەکت بە سەرمنەوە ئەنجامداوە تەنها خوا ئەوگەورەییە ئەنجام دەدات، کاتێك ڕۆیشت و جارییەکەی برد بەغولامەکەی ووت: ئەی غولام سەد هەزار درهەمی بدێ، تاوەکو نەك گرنگی پێبدا و جارییەکەش دڵی نەچێتە سەر، إبن أبو عمارە لەخۆشیاندا گریا و پاشان ووتی: ((الله أعلم حيث يجعل رسالته))، ((سوێند بەخوا بەفیدات ئەبم، گەر خواپەیمانی نازونیعمەتی ئاخیرەتی پێداوین ئەوە نازونیعمەتی دونیات زوتر پێ ئەدا. [1]

٥.لەسەخاوەتیدا تەنیا (شيخ العذرى) بەسەرماندا زاڵ بووە:

لە بودەیحی خزمەتکاری عبداللە کوڕی جعفر کە دەڵێ: لەگەڵ عبداللە کوڕی جعفر دا لەهەندێ گەشتەکانی دەرچووم و لامانەدایە لای خێوەتێك، خاوەن خێوەتەکە پیاوێکی نەوەی (عذرە) بوو، ووتی: ئیمە لەوێدا بووین ئەعرابییەك ووشترەکەی هێنا وەستا لەسەرمان پاشان ووتی ئەی هۆز چەقۆیەکم بدەنێ، چەقۆیەکمان پێداو بریندار کرد ووتی: ئیتر خۆتانی پێوە سەرقاڵ بکەن، ڕۆژی دوایی گەورەی (عذرە) هات و وشترێکی تری هێنا و وتی: چەقۆیەکم بدەنێ ئێمەش ووتمان: گۆشتمان زۆرە ووتی: لای من وگۆشتی دوێنێ

---

١ ـ تاريخ دمشق (٢٩/ ١٩٥).

بخۆن! چەقۆیەکم بدەنێ، ڕۆژی سێیەمیش ماینەوە گەورەی (عذره) ووشترێکی تری هێناو تاوەکو لەسەرمان وەستا وتی: ئەی هۆز چەقۆیەکم بدەنێ، ئێمەش ووتمان: گۆشتمان هەیە تۆ چ دەکەی؟ ووتی لەپاڵی مندا گۆشتی دوێنێ بخۆن! بۆ ئەوەندە سەرزەنشتکارن، چەقۆیەکم بدەنێ، چەقۆمان پێداو ئینجا ووتی خۆتان پێوە سەرقاڵ بکەن، ووتی: بۆ ڕۆیشتن خۆمان ئامادەکردووە إبن جعفر بەجاریەکەی ووت: چییت پێیە؟ ووتی: باڵەیەك بەرگ و چوارسەد دینار، ووتی: باشە بۆ گەورەی (عذره) بیبە، ئەویش بردی، جاریەکە ڕۆیشتە خیوەتەکە، ئەویش ووتی: دیارییەکە بیبە بۆ إبن جعفر ئێمە هۆزێکین لەسەر میوانداری کرێ وەرناگرین، هاتە لای إبن جعفر بۆی باسکرد کە چی بووە، ئەویش ووتی: بۆی ببە گەروەرێگرت باشە ئەگەرنا فڕێی بدە پێش خیوەتەکە، ئەویش گەڕاندیەوە ووتی: خوا بەرەکەت بخاتە ماڵت، بڕۆ ئێمە هۆزێکین کرێ لەمیوانە وەرناگرین، سوێند بەخوا گەر گەورەکەم بتان بینێ ئازارتان دەدات، ووتی: باڵەکەو پارەکەی فڕێدایە بەردەرگای خێوەتەکە و ڕۆیشتن، زۆر نەڕۆیشتن تاکەسێك لەدوورەوە دەرکەوت، کە نزیبووە تەماشامانکرد گەورەی (عذره) و باڵە و شتەکانی پێیە بۆی فڕێ داین پاشان پشتی تێکردین و ڕۆیشت و لە ئاوڕی دایەوە تەماشی دەکردین إبن جعفریش ووتی: کەس لەسەخاوەتی بەسەرماندا زاڵ نەبووە، (شیخ العذري) نەبێ.[1]

٦.لەمە سەیرترم نەبیستووە:

عبدالله کوڕی جعفر بۆ بەجێهینانی حەج دەرچوو، لەهەندێ ڕێگە بەسەر وڵاخەکەی قورس بو، گەیشتە ژنە ئەعرابیەك کە لەبەردەم دەرگای خێوەتەکە دانیشتبوو، لەوڵاخەی دابەزیو چاوەڕێ هاوەڵەکەی کرد، ژنەکە کاتێ بینی دابەزی هەستا و بەرەو لای ڕۆیشت وتی: وەرە ماڵی ئێمە خوا لەماڵی چاکەکاراندا داتبنێت، إبن جعفر لەقسەزانی ژنەکە سەرسوڕما، بۆدەرگای خێوەتەکە ڕۆیشت و ئەویش جێگەیەکی بۆ هێناو لەسەری دانیشت و ئینجا ڕۆیشتە پشت خیوەتەکە و بزنێکی سەربڕی و إبن جعفر هەستی نەکرد، کە هاوڕێکانی هاتن و إبن جعفریان بینی ئەوانیش لایاندا لای و نانیان خواردوو ماندوبونیان

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٢٩/ ١٩٠).

دەرچووحەسایەوە، عبداللە ووتی: ئەمڕۆ پێویستمان بە خـواردنی ئێـوە نیـە، کەویـستیان بڕۆن خزمەتکارەکەی بانگ کرد ووتی: خەرجیمان هیچ ماوە؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: چـەندە؟ ووتی: هەزار دینارمان پێماوە، ووتـی: پێـنج سـەد دینـاری بـدەیێ و ئـەویتر لای خـۆت هەڵبگرە، ئەویش پارەکەی بەژنەکەدا و ژنەکـەش ئامـادە نـەبوو ئـەو پارەیـە وەربگـرێ، عبداللە هەرقسەی بۆ دەکردوو ئـەویش ئـەیوت: چ دەکـەی؟ سـوێند بـەخوا شـەرمەزاری مێردەکەم دەبم حەزناکەم، عبداللە زۆرتکـای لێکـردوو تـاوەریگرت، ئـەوانیش ڕۆیـشتن و زۆری پێنەچوو تا ئەعرابیەك بە ووشترێکەوە بە دیارکەوت، عبداللە ووتـی: ئاگـاردارکراوە ئـەبینم گـەر هەنـدێکتان بگەڕێنـەوە لای و بیزانـێ ئـەمانگاتێ، هەنـدێ لـەهاوڕێکانی گەڕانەوەلای و تانزیکی دابـەزین، کاتـێ ئافرەتـە ئەعرابیەکـە پیاوەکـەی بینـی هەسـتا ئەیووت: باوك و دایکم بەفیدات بێت:

| | |
|---|---|
| توسّمته لما رأيت مهابـــــــــة | عليته فقلت: المرء من آل هاشـــم |
| وإلا فمن آل المرار فإنهـــــــم | ملوكُ ملوكٍ من ملوك أعاظـــــم |
| فقمت إلى عنزبقيت أعنـــــــز | فأذبحها فعل امرئٍ غيرنـــــــا دم[1] |
| يعوّضني منها غنان و لم يكـــن | يساوي لُحيم العنز خمس دراهـــم |

دینارەکـانی پیـشاندا و چـیرۆکەکەی بـۆ گێڕایـەوە، ئـەویش ووتـی: سـوێند بـەخوا تۆمیوانداری باش نیت، چاکەکانت بەپارە فرۆشتووە؟ ژنەکە ووتی سوێند بە خـوا قـەبوڵم نەکردووە ڕەتمکردۆتەوە، ووتی: لەشەرمەزاری ترسایت؟ سوارەکان بۆ کوێ چـوون؟ ئـەویش ڕێگای ڕۆیشتنی پێشاندا، ئەو پیاوەش وەدەر کـەوت کـە عبـداللە نـاردبووی، بەژنەکـەی ووت: ئەسپەکەم بۆ ئامادە بکە، وتی: بۆ چیدەکەی؟ وتی: تـا بەسـوارەکان بگـەم و بیسان دەمـەوە، گـەر چـاکەمیان دایـەوە بـاش ئەگـەرنا جـەنگیان لەگـەڵ دەکـەم، ژنەکـەش بەهاوڕێکەی عبداللە ووت: بۆ خوا داوات لیدەکەم چی ویـست ئـەنجامی بـدەن، زلەیـەکی لەژنەکەیداو ووتی: پـەنات بـردە بەسـوککردنی چـاکە کـاری؟ سـواری ئەسـپەکەی بـوو، تیرەکەشی گرتە دەست و سواری ئەسپەکەی بوو، ئـەو پیـاوەش لەگەڵیـدا کەوتـە ڕێ کـە

---

١ ـ تاريخ دمشق(٢٩/ ١٩٢).

عبدالله ناردبوی پێ ی دەوت: وابزانم بە سوارەکان ناگەیت، ئەویش ئەیوت: سوێند بـەخوا دەیانگەمێ گەر لەهەرکوێ یەك بن، پیاوەکە کەزانی لەقـسەی خـۆی وازنـاهینێ، ووتـی: بەیارمەتیت من وا دەچمە لای سوارەکان و هەواڵی تۆیان بۆ دەگێڕمەوە، پیاوەکە ڕۆیـشت و إبن جعفری تێگەیاند و چیرۆکەکەی بـۆ باسـکرد، عبـدالله ووتـی بێگومـان لەخراپـە و نائومێدی ووریایە کە، إبـن جعفـر سـەلامی لەپیاوەکـە کـرد و باشـەی ئافرەتەکـەی بـۆ باسکردوو هەرقسەی بۆ دەکرد و لێ دەپرسی، ئەعرابیەکە ڕازی نەبوو پارەکەی گەڕاندەوە، عبدالله کە ئەوەی بینی ووتی بابڕوانینن بزانین چی پێ یە، حەزناکـەین شـتێکمان دابیتـێ بۆمان بگێڕیتەوە، ئەویش هەستا و کەناری گرت و دوورکات نوێژی کـرد، پاشـان سـواری ئەسپەکە بوو تیرو کەوانەکەی دەرهێنا، عبدالله پێ ووت ئەو دوورەکـات نوێـژە چـی بـوو کردت؟ ئەویش ووتی ڕاوێژی پەروەردگارم کرد بۆ جەنگ کردنتان، عبدالله ووتی: عـەزمت لەسەر چی بۆ دروست بوو؟ ئەویش ووتی: عەقڵی بۆ وەرگرتم یان پـارەی خۆتـان ئەبەنـەوە یان چاکەی خۆمانمان بۆ ئەگێڕنەوە، عبـدالله ش ووتـی: هـەروا دەکـەین و فرمـانی کـرد پارەکانیان وەرگرت ئینجا ئەعرابیەکە ڕۆیشت، عبدالله پێ ی ووت: خواردنـت نـەدەینێ؟ ووتی: ئاوەدانی نزیکە پێویستیم پێ نی یە؟ عبدالله ووتـی: بـەلێ: ووتـی: چـیە؟ ووتـی: ژنەکە باسی خراپ مامەڵەییت دەکات، ئەعرابیەکە پێکـەنی و ڕۆیـشت، عبـدالله کـوڕی جعفر دواتر ڕۆیشتەلای یەزیدی کوڕی معاویە و ئەوڕوداوەی بۆ گێڕایەوە، یەزیدیش ووتـی لەمە سەیرترم نەبیستووە.[1]

٧. خوای گەورە زیادەڕۆیانی (مسرفین)ی خۆش ناوێ:

ئافرەتێك بە مریشکێکی پێ بەستاوەوە هاتە لای عبدالله کوڕی جعفر ووتی: باوکم بـە فیدات بێ، ئەم مریشکەم زۆر لەدڵما شیرینە و هێلکەکەی ئەخۆم و ئـەقیرێنی و ئەمـەوێ لەبەرزترین شوێندا بینێژم، سوێند بەخوا لەزەویدا شوێنێك نیە لەسـکی تـۆ پیرۆزتـر بـێ، ئەویش وتی: لێ ی وەربگرن ئەوەنـدە گـەنم و ئەوەنـدە خورمـاو درهـەمی بـدەنێ، شـتی

١ ـ تاریخ دمشق(١٩٣/٢٩).

زۆرئامادەکرا، کە ئەوشتانەی بینی، ووتی: باوکم بەفیدات بێ خوا خۆشی بەو کەوانە نیـە زیادە ڕەوی دەکەن.[1]

٨. بێبازاری کەلوپەل بازاڕی مەدینەدا:

پیاوێکی خەڵکی بەسرە شەکری هێنایـە مەدینـە و شـەکرەکەی بـازاڕی نـەبوو، ئـەو ڕووداوە بۆ عبدالله باسکرا و ئەویش فرمـانیکرد بەرپرسـی کانگاکـەی بیکـڕێ و بـەخۆڕا بیداتە خەڵکی، لە گێڕانەوەیەکیـشدا هـاتووە کـەوا بـە پیاوەکـەیان ووتـووە: بـڕۆرە لای عبدالله، ئەویش ڕۆیشتە لای عـبدالله کـوڕی جعفـر وهـەمووی لێ کـڕی عبـدالله ووتـی: هەرکەسێ ئەیەوێ بیبات، پیاوەکەش دەڵێ: منیش لەگـەڵ ئـەو خەڵکـەدا شـەکر ببـەم؟ ئەویش ووتی: بۆ خۆت هەڵبگرە.[2]

٩. بەخشینی ئەو سەروەتەی لەلایەن یەزیدی کوڕی معاویەوە پێ ی گەیشت:

یەزیدی کوڕی معاویە سەروەتێکی زۆری بەدیاری بۆ عبدالله کـوڕی جعفـر نـاردبوو، ئەویش بەسەر خەڵکی مەدینەدا دابەشیکردبوو، هیچی نەبردەوەماڵەکەی خۆی و لەوەشدا عوبەیدی کوڕی قەیسی روقیات دەڵێ:

وما كنت إلا كا لأغر بن جعفر    رأى المال لايبقى فأبقى له ذكراً[3]

کاتێك عبدالله کوڕی جعفر چوەلای یەزید، یەزید فرمانی دووهـەزار هـەزاری پێـدابوو (ذهبی)[4] لەسەر ئەوە دەڵـێ: ئـەوە زۆر نیـە، دیاریـەکی پادشـای دونیایـە بـۆ کەسـێ لەوشیاو ترە بۆ خیلافەت.[5]

١٠. ئەعرابیەك بۆ عبدالله کوڕی جعفر دەپاڕێتەوە:

---

١ ـ تاريخ الإسلام (٦١/ ٨٠)، لا (٤٣١ ـ ٤٣٢).

٢ـ تاريخ دمشق(٢٩/ ١٩٣).

٣ الإصابة (٤/ ٣٨). ـ

٤ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٤٥٧).

٥ـ هةمان سةرضاوة.

ئەعرابیەك بە عبداللـە كـوڕی جعفـری ووت: خـوای گـەورە بـە ناخۆشـیەك تاقیـت نەكاتەوەنـەتوانی ئـام بگریـت لەبەرامبەریـدا، نـازو نیعمـەتێكت پێببەخـشێ سوپاسـت لەبەرابەریدا پێ نەكرێ. [1]

١١. ئەو ماڵەیە پێیەوە سەخی بووم:

عبدالله كوڕی جعفر بینـرا لەدەرهەمێكـدا گیربـوو، پـێ ی ووتـرا، تـۆ لەسـەروەت و ساماندا ئاوها و ئاوها سەخیت و بـۆ درهـەمێك ئـەم كێـشمە كێـشمە؟ ئـەویش ووتـی: ئەوەماڵمە پییەوە سەخی بووم و ئەمەش عەقڵمە پێیەوە چروك بووم. [2]

١٢. ئەمە پیاوێكە ویستی خەڵكی چروكن بن و، چاكەی باراند:

لەزانستخوازان گێڕاویانەتەوە كە عبداللّه كوڕی جعفر ئەم شیعرەی ووتەوە:

إنَّ الصنيعة لاتكون ضيعة　　　　حتى يُصاب بها طريق المقنع

محمدی كوڕی عبدالله مەهرانیش ووتی: ئـەم پیـاوە ویـستی خـەڵكی چـروك بكـات و بارانی چاكەی باراند، بۆیە گەر شوێنێكی گرتەوە باشبوو ئـەوە ئـەو شـوێنەیە كـە خـۆت ئەتەوێ، گەر نا بۆلای خۆت ئەگەڕێتەوە. [3]

١٣. بەخشندە ئەو كەسەیە چاكە دەست پێ دەكات:

عبدالله كوڕی جعفر (ذي الجناحين) دەڵێ: بەخشندەو سەخی ئەو كەسـە نیـە كـە دوای داواكردن ئەبەخشێ، چونكە ئەو كەسەی ڕووی داواكارەكەی شەرمەزار ناكـات گـەورەترە و بەخشندە ئەو كەسەیە پێش داواكردن ببەخشێ. [4]

١٤. ئێمە لەچاكەكاریدا نرخ وپاداشت وەرناگرین:

---

١ـ تاريخ دمشق(٢٩/ ٢٠١).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ هەمان سەرچاوە(٢٩/ ٢٠٠).

کارزانێکی ڕەشپێستە قسەی لەگەڵ إبن جعفردا کرد کە لە پێداویستیەکدا لەگەڵ ئەمیری ئیمانداران عەلیدا قەسە بکا، ئەویش قسەی تیادا کرد و پێیدا چل هەزاری بۆ نارد، ووتویانە: کارزانەکە پارەکەی بۆ ناردۆتەوە ئەمیش بەو کەسەی ووت: کە لەنێوانیدا بووە کە ئەهلی بەیت چاکە نافرۆشن [1] لەگێڕانەوەیەکی تریشدا ئێمە لەسەرچاکەکاری نرخ وەرناگرین. [2]

۱۵. لەماڵەکەیدا خۆی و خەڵکی هاوبەشن:

بەمعاویەی کوڕی عبدالله کوڕی جعفر ووترا: چی بەبەخشندەیی عبدالله کوڕی جعفر دەگات؟ ئەویش ووتی: خۆی و خەڵکی لەو ماڵەیدا هاوبەش بونە، هەرکەسێ داوای بکردایە پێی دەبەخشی، هەرکەسێ دیاری بدابایە دیاری داوەتەوە کەپێویستی بوایە نەیدەشاردەوەو هەڵی نەدەگرت [3]

سەردانی معاویەو عبدالملك دەکرد، زۆر بەڕێزو سەخی شیاوی پێشەوایەتیکردنی بوو [4] پەیوەندی لەگەڵ معاویەدا تایبەتی و بەهێزبوو، تەنانەت یەکێك لەکوڕەکانیشی ناوناوە معاویە، لەئەبانی کوڕی تەغەلوبسەوە کە ووتی: بۆمان باسکراوە کە عبدالله کوڕی جعفر چووە لای معاویە و هەموو ساڵێك سەردانێکی هەبووە و هەزار هەزار دەرهەمی پێداوە و پێویستی خۆی لێ وەرگرتووە. [5]

کتێبەکانی ئەدەب و مێژوو ڕیوایەت گەلێکیان لەنێوان معاویە و إبن جعفردا باسکردووە کەناسەلمێن و زۆرن، لەوانە ئەوباسەی کە یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی دینار ڕیوایەتی کردوە: جارێك عبدالله کوڕی جعفر شەوێك لەکۆشکی (خضراء) [6] لای معاویە بوو لەدیمەشق نامەیەکی لە حوسینی کوڕی عەلیەوە بۆ معاویە هات و معاویەی خستە پەژارەوە و دای بەزەویدا و پاشان ووتی: کێ لە کوڕی إبن توراب لۆمەم ئەکات، سوێند

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(٢٩/ ١٨٦).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(١٨٧/٢٩).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(٢٩/ ١٩٨).

٤ ـ سير أعلام النبلاء(٤٥٨/٣).

٥ـ هەمان سەرچاوە (٤٥٩/٣).

٦ ـ کۆشکی معاویە بوو لەدیمەشق

بەخوا بمەوێ وەها و وەهای پێ دەکەم، عبدالله کوڕی جعفریش وەڵامی دایەوە هەستا ڕۆیشت و منیش لە نێوانیاندا قۆخ بووم، سواری ئەسپەکەی بوو هەر ئەوەشەوە ڕووەو مەدینە کەوتەڕێ، معاویەش بەبێتاقەتی و پەژارەوە چوویە لای خێزانەکەی، کە[1] کچی (قرظة) بو، ووتی: ئەمشەو چۆن مامەڵەی إبن جعفرم کرد چیم بەئامۆزکەی ووت، لەکاتێکدا إبن جعفر ئێمەی خۆشەوێ، ژنەکەشی ووتی: سوێند بەخوا ناشیرین ترین کارت ئەنجامداوە، شەو بێزار بووهەر باسی کردەوەکەی خۆی دەکردو بیری لێ دەکردەوە تابەیانی نەخەوت، ئینجا هەستا دەستنوێژی شۆرد ووتی: سوێند بەخوا جگە لە خۆم کەس لەجێگەکەی ووریای ناکاتەوە، بۆلای ڕۆیشت و چوویە ژوورەکەی سەیر دەکا نەماوەو لەبارەیەوە پرسی و پێ ی ووترا: ئەوکات لای تۆ ڕۆیشت بۆ مەدینە کەوتەڕێ، ئەویش بە شوێنیدا ناردی و ووتی: پێ ی بگەن و بیگەڕێننەوە گەر ڕۆیشتبێتەوە ماڵی خۆشیەوە، ئەوانیش پێ ی گەیشتن و گەڕاندیانەوە، معاویەش بەرامبەر ئەوشەوە وتی هەرشتێ تۆ لەڕێگە بینوتە و موڵکی منە پێشکەشی تۆی ئەکەم، ووتراوە ووشتر مەڕێکی زۆری موعاوییەی بینووە هەمووی پێداوە و ئەویش هیچی لەدڵدانەماوە.

ئەم باسە بەڕاست نازانرێ، چونکە ئیسنادەکەی لاوازە و (منقط)ە، چونکە یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی دینار ئەالسعدی، شیخی واقیدی بوو نەزانراوە (مجهول)ە، [2] ئەم شوێنەوارەش بۆ نموونەیە، کتێبەکانی مێژوو ئەدەب تۆمارکرا و گەلێکی شیعری نێوان معاویەو عبدالله کوڕی جعفر ئەگێڕنەوە، لەوانە: لەیونسی کوڕی مەیسەری کوڕی حولەبس دەڵێ: بە معاویەگەیشتووە کە عبدالله کوڕی جعفر تووشی لاوازی هاتووە و ئەویش دووبەیتە شیعری بۆ عبدالله نوسیوە:

| | |
|---|---|
| لمال المرء يصلحه فيغني | مفاقر أعفّ من القنُوع |
| يسد به نوائب تعتريـــه | مِنَ الأيام كالنّهر الشروع |

ئەویش نامەی بۆ دەنوسێ کەزیادەڕەو نەبێ و لەگەشتکردن ڕێگیری دەکات و لەوەدا عەیبی لێ ئەگرێ عبدالله کوڕی جعفر وەڵامی داوەتەوە:

---

١ ـ فاختەی کچی قرظتی کوڕی عەمری کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدولەناف بووە.

٢ ـ هەمان سەرچاوە(١٩/٢).

سلى الطارق المعتر يا أم خالـــد إذا ما أتاني بين ناري ومَجـــزري

أأبسط و جهي أنه أول القـــــرى وأبذك معروفي بهم دون مُنكـري

وقد أشتري عرضي بمالي وما عسى أخوك إذا ماضيّع العرض يشتري

يؤدي إلى الليل إتيان ماجِـــــــدٍ كريم و مالي سارح مال مقـــتر

معاويەش بەو نوسراوەی سەری سوڕدەمێنێ ئـەوە چـل هـەزار دینـاری یارمـەتی بـۆ دەنێرێ بۆ دانەوەی قەرزەکانیدا.[١]

ـ جعفر و بیستنی گۆرانی:

زۆر لە کتێبەکانی مێـژوو ئـەدەب بیـستنی گـۆرانی و سـەرقاڵبونی بەجاریەکانـەوە دەدەنە پاڵ عبدالله کوڕی جعفر، ئەو باسانەش ڕاست و سەلماونین، بەڵکو گێڕانەوە گەلێکی لاوازن، إبن عەساکیر ڕیوایەتێکی درێـژی لـە کۆمـەڵێ لەگـەورەکانی قورەیـشی خـەڵکی مەدینە گێڕاوەتەوە کەووتویانە و تیایدا باسی چیرۆکی عمـارەی گۆرانیبێـژیان کـردوە کـە زۆر شەیدای بووە[٢]

إبن کەسیریش چیرۆکەکەی بە (صیغە)ی و تراوە (قیل) باسکردووە.[٣]

أبو عمر بن عبدالبر دەڵێ:....ئەوترێت.......بیستنی گۆرانی بەلاوە ئاسایی بـووە[٤]، زەهەبی لەباسەکەیدا هیچ سەنەدێکی باس نەکردووە کە پشتی پێ ببەسترێت،[٥] کۆمەڵە قسەیەکی بێ جەڵەو لەغاوە و هەندێکی هـەر لـە بنـچینەدا گومـانی تێدایـە و ناکرێـت ملکەچی بم بەوەی عبدالله کوڕی جعفر گوێبیستی گـۆرانی جاریـەکان بوبێـت و چـیرۆکی خۆشەویستی هەبوبێ وەکو ڕیوایەتەکان وایدادەنێن.

مردنی عبدالله کوڕی جعفر:

---

١ ـ تاریخ دمشق (٢٩/ ٢٠٠).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٢٩/ ١٩٥).

٣ ـ البداية والنهاية(١٢/١/٣٠١).

٤ ـ الإستيعاب(٣/٨٨١).

٥ ـ سير أعلام النبلاء(٣/٤٦٢).

عبدالله کوڕی جعفر ساڵی هەشتای کۆچی وەفاتی کردووە کە ساڵی لافاوە ڕامالڕاوەکە بوو، کە لەمەککەدا ڕویداوە، بۆیە ناونراوە ڕامالـەر، چونکە بەهەرشتیێ گەیشتبێ ڕایماڵیوەو حەجاجی نێو مەککە وشترەکانی هەڵگرتووە، پیاوان و ژنانیش کەسیێ نەبووە ڕزگاریان بکات و ئاو گەیشتۆتە ((حجون)) کە چیایەکە لەسەرووی مەکە و زۆر کەسی نوقوم کردووە، ووتراوە بەرز بۆتەوە خەریك بووە کەعبە دابپۆشێ.[1]

ووتراویشە ساڵی هەشتا و چوار یان هەشتا و پێنج بووەو تەمەنی هەشتا ساڵ بووە، إبن عبدالبر ساڵی مردنی لە ٨٠ی کۆچی بە ڕاست زانیوە و (أبان بن عثمان) نوێژی لەسەرکردووە کە ئەو کاتە ئەمیری مەدینە بووە [2] لەسەردەمی عبدلملك کوڕی مەرواندا و دووبەیتە شعریش لەسەر گۆڕەکەی دانراوە کەتیایدا هاتووە.

مقیم إلی ان یبعث الله خلقه  لقاؤك لایُرجی وأنت قریبٌ

تزید بلّی في کل یوم ولیلة  وتُنسی کما تُبلی وأنت حبیبُ[3]

---

١ـ البدایة والنهایة(١٢/ ٢٩٦).

٢ ـ الإستیعاب(٣/٨٨١).

٣ ـ (١٩٥/٢٩).

# جیٚ باسی چوارەم

## ئاشتەوایی حەسەنی کوڕی علی لەگەڵ معاویەدا(ﷺ):

بەیعەتێکی گشتی بەحسن درا(ﷺ) و ئەمیرەکانی باوکی و گشت ئەو خەڵکەش بەیعەتیان پێدا کە بەیعەتیان بەعلی (ﷺ) دابوو، وەکو خەلیفە دەسەڵاتی گرتە دەست و کارەکانی ڕێکخست و ئەمیرەکان و سەربازەکانی بەڕێوە برد، بەخشینی دابە سەربازەکان وە بەوەش ڕەزامەندی بەدەست خست[1] لە توانای داهەبوو جەنگێکی سەخت دژبە مەعاویە بەرپابکات و کەسیەتیە بلیمەتەکەشی لەڕوی سیاسی و سەربازی و ئەخلاقی و ئاینیشەوە لەپاڵ هۆکار گەلێکی تردا هۆکاری یامەتیدەری بەرپاکردنی جەنگێکی بوو دژبە معاویە، وەکو قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە و حاتەمی کوڕی عەدی طائی و ئەوسەرکردە موسڵمانەی تریش کە توانایەکی سەرکردایەتی زۆریان هەبووە، یەکخستنی ئومەت و ئارەزوو کردن بۆ لای خواو بەکەم گرتنی دەسەڵاتی دونیا و پارستنی خوێنی موسڵمانان ئەو هۆکارانەی تر کە دواتر بەدرێژی باسی لێوە دەکەین حسن حەزی بە ئاشتی دەکرد.

بێگومان حەسەنی کوڕی علی سەرکردایەتی ئەو پڕۆژە چاکسازییەی کرد کە یەکخستنی ئومەتی خستەوە جلەوی هەڵوێستەکەش لەپاڵ خۆی و پشتیوانەکاندا بوو، بەسەربازیەکەی بەهێزبوو، هەروەکو لە ڕیوایەتەکەی بوخاریدا هاتووە و عەمری کوڕی عاصیش ئەوەی دەربریوە کە دەڵێ: من ڕێزگەلێکی سەربازان وا ئەبینم هەموو تیایدا لە نێو بچن[2]، حەسەنی کوڕی علی ووتی: ئێسك و پروسكی عەرەبم لەدەستدا بووە جەنگی ئەو کەسەیان بکردایە جەنگم بکات و ئاشتەوایی ئەو کەسەیان دەکرد ئاشتەوایم بکردایە[3]، گەر بەرەی حسن بە هێز نەبوایە ئەوە معاویە(ﷺ) بەووتوێژو ڕێکەوتنە لەسەر مەرج و دەستەبەریەکان نا چارنە دەبوو، بەڵام زانینی لاوازی بەرەی حسن و

---

١ ـ تاريخ العراق في ضل حكم الأموي، لا ٦٧، مقاتل الطالبين، لا ٥٥.

٢ ـ البخاري، كتاب، الصلح ٢٧٠٤.

٣ ـ المستدرك(٣/ ١٧٠). صحيح على شرط الشيخين.

لێکبونەوەی هێزەکەی و چونە کوفە وە بێ ئەوەی خۆی بـۆ وتوێـژی ڕێکـەوتنی کەسـێیان لەمەرج و داواکاریـەکانی دەسـتەبەرداری بکـات و بالادەسـتی معاویـەش لەسـەر حـسن بەهۆی ئەمیرەکانەوە ئایا حسن لەبەر ئەو هۆکارە ئاشتەوایی لەگەڵ معاویە کرد؟ [1] إبـن تیمیە لە مناهج السنەدا دەڵێ: حسن بەوانەی لەگە لێدا بووە توانیویەتی جـەنگ لەگـەڵ معاویە بکات، گەرچی کەمتربێ لەو کەسانەی جەنگی دژەکانیـان دەکـرد لـەپاڵ معاویـە دابـوون، بـەڵام حـسن خورەوشـتێکی گـەورە کردیـە هـۆی نەهێـشتنی پەرتـەوازەیی و یەکخستنی موسڵمانان[2] بەڕاستی ئاشتەوایی حسن لەگەڵ مەعاویـەدا (ﷺ) بـە یـەکێ لەروداوە گەورەکانی مێژووی ئومەتی ئیسلامی دەژمێردرێ، لەڕەخساندنی ئەو ڕووداوە بۆ ئەوپایەیە چەند هۆکارێك یارمەتیدەرە بوون، لەوانە:

١)بەوەی نیشانەیەك بووە لەنیشانەکانی پێغەمبەریەتی.

٢)بەرهەمی ئەو ئاشتەواییە پاراستنی خوێنی موسڵمانان و یەکخستنیان بـوو لەسـەر یەك پێشەوا دوای ساڵانێکی زۆر لە پەرتەوازەیی.

٣)حسن (ﷺ) یەکەم خەلیفە بوو بەویستی خۆی وبەهیچ گوشارێك ولەپێگەی هێزەوە نەك لاوازی و لەپێناو موسڵماناندا لەپلەی خۆی دەستی هەڵگرت.

حسن(ﷺ) کۆتا خەلیفەی قۆناغی پێغەمبەریەتی بوو، بەو هۆکارە و ئەوانـەی تـریش کتێبەکانی عەقیدەو سونەو مێژوو و ئەدەب و سەرچاوەکانی تر پڕە لە باسی ئاشـتەوایی حسن لەگەڵ مەعاویەدا(ﷺ)، خوێنەری ئەو سەرچـاوانەو لـەوەش (تـأريخ طـبري) ئـەوە تێبنی زۆرێك گێڕانەوەو دژکاری ئەبینێ چەند تێکەڵێکی کراوەو ڕوداوکان لەیـەك ئەچـن، هۆکاری ئەوانەش: ڕێکخستنی زەمەنی ڕووداوەکان چاونەکراوە، سەرباری ئـەوەی مـاوەی ڕەوتی ڕووداوەکان بۆ تێگەیشتنی ڕوداوەکە زۆر گرنگـە [3] بـرای بـەڕێزیش دکتـۆر خالـد الغیـث هـەوڵێکی زۆری داوە لـە توێژینـەوەی ئـەو سەرچـاوانە و دەرکردنـی گێڕانـەوەی

---

١ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، بطاينة (٦٠، ٦١).

٢ ـ منهاج السنة(٤/ ٥٣٦)، دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦١.

٣ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، لا ١٢٥.

ڕاستیەکان و، لەڕوداوەکانی ئاشتەواییدا ڕێزبەندیەکی جوانی داناوە سودی وەرگرتوە لەو گێڕانەوە لاوازانەی لەگەڵ گێڕانەوەی ڕاستیەکاندا گونجاوە - بەپێ ی ئەو بەنامەیەی کەلە پەیام بە ناوبانگ و زارناوەکەیدا ڕونی کردۆتەوە لە (مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري) لە پێناو تەواو کردنی تەواوی ڕووداوەکەدا[1]، بێگومان منیش لە و ڕێزبەندیە جوانەکەی بۆ بەڕێوەچونی ئەو ئاشتەواییە سوودم وەرگرتووە.

## - گرنگترین قۆناغەکانی ئاشتەوایی(الصلح):

### قۆناغی یەکەم:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوعای بۆ حسن کردووە بۆ ئەوەی خوای گەورە بیکاتە ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵەی گەورەی موسڵمانان، ئەو دوعایە بوو کەحسن (رضي الله عنه) خستە سەر پێ تاوەکو بەمتمانەوە ئاشتەوایی بکات[2]، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەم کوڕەی من گەورەییەو بەڵکو خوابیکاتە ئاشتەوایی نێو دووکۆمەڵی موسڵمانان))،[3] ئاماژەکردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی حەسەنی کوڕی علی بەوەی خوای گەورە دەیکاتەهۆکاری ئاشتەوایی نێوان دووکۆمەڵەی موسڵمانان تەنیا ئاگاردار کردنەوەیە کە حسن و موسڵمانان بیستویانە وەکو ئاگاردارییەکانی تر و بە ڕاستیان زانیوە، بەڵکو ووشەی ئاراستەیە بۆ پێشەوایەتی حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) لەئاڕاستە مامەڵەو بەرنامەی ژیاندا، بێگومان تیایدا سەلماوە و بەسەر هەستیا زاڵبوە و تێکەڵ بە گۆشت و خوێنی بەوە وەکو وەسێتی پێغەمبەر داینـاوە ـــ کەپێغەمبەرو باپیری بوو ـ خۆشی لەچاوی و ڕەوتیا بینیوە، وەکو ئامانجێکی ژیان وەکو ڕەوشتێکی بڵند لەداهاتوویدا پێیەوە پابەندبووە.

شوێنەورای ئەو موژدەو ئاگاردارکردنەوەیە لە هەموو جوڵەو وەستانێکیدا دەرکەوت، تەنانەت لەقسەکردنیشی لەگەڵ ئەو باوکە گەورەیەیدا کەوەك خۆشەویستی منالە و چاکەکارن بۆ باوکە مەزنەکانیان هەبوو ئەوانەی خوای گەورە بەهرەو جوامێری پێدان،

---

١ - هەمان سەرچاوە، لا ١٢٥.

٢ - هەمان سەرچاوە، لا ١٦٢٥.

٣ - البخاري، رقم: ٧١٠٩.

لەخەڵکی زیاتر بەموژدە و هاوەڵێتیەی پێغەمبەر شارەزاتر بوو، زانا و دانایانە گەورەی ڕادەگرت، لەدوای کوژرانی عثمان ئاماژەی کردە علي کوڕی ئەبو تالیبی باوکی بەوەی لەخەڵکی دوور بکەوێتەوە تاکێشەی نێو عەرەب نەمێنێ وپێ ی ووت گەر لەکونی بزنە مژەکەش بێ دەرت ئەهێنن و بەیعەتت پێ دەدەن گەر خۆتیشیان پشاننەدەی، کاتێکیش علي وویستی جەنگی خەڵکی شام بکات و خۆی ئامادە دەکرد و لەمەدینە دەرچو تاوەکو بجەنگێ، حەسەنی کوڕی علي(ﷺ) هاتە لای و ووتی: باوکە گیان لەم کارە دەست هەڵبگرە، چونکە خوێنی موسڵمانانی تێدا دەڕژێ و جیاوازیان دەکەوێتە نێوانەوە[1]، بەڵام علي وازی نەهێنا لەوەی حسن ئاماژەی پێکرد و خەڵکی بەجێ نەهێشت و لەو ئاشوبەیەدا تا فرمان بەچاکە نەکا وڕێگیری لەخراپە نەکات و شوێنی خۆی و ماف بۆ خاوەن ماف نەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، علي لەو بۆ چونەیدا پێکابووی، بەڕاستی موعجیزەی پێغەمبەر دەرکەوت و بەپەرەروەردە کردنی حەسەنی کوڕی علي لەسەر پەروەردەیەکی ئیسلامی ڕەبانیە بەلوتکەی خۆی گەیشت، بەوەی ئەم حەسەنە پێشەوایەکی گەورەیەو، گەورەنیە بەهۆی زۆرداری و خوێنڕێژی و بەفیڕۆدانی سەروەت وپیرۆزییەکان، بەڵکو پێشەواو گەورەیە لەپاراستنی خوێنی موسڵمانان و نەهێشتنی ڕق وکینەکان، گەیشتە لوتکەی پێشەوایەتی، ئەوگەورەیی و پێشەوا یەتیەی کە ئەوکەسەی لە بەدەست گرتنیدا بیر لە هێز دەکاتەوە پێ ی ناگات.

حسن لەگەڵ معاویەدا ئاشت بوویەوە لەکاتێکدا هەزاران کەسی لەدەوردا بوو لەوانەی شمشێریان لەنێو دەستدا بوو، بەڵام زۆر زۆریشیان دڵسۆزو بەئەمەك بوون، حسن نەیویست لەپێناو خۆیدا دڵۆپێك خوێن بڕێژرێ و سەرۆکایەتیکردنی ئەو قومار بازیەی کە خوێن ووێرانە و سەر شۆڕکاری و جنێو فرۆشی لەگەڵدایە، خاوەنەکەشی دەگاتە تووڕەیی خوا و نەفرەتی مێژوو، تەنانەت بۆ سوربوون لەسەر گەورەیی و دەسەڵات و هەڵپەدان لەدونیا شەپۆڵی خوێنی مرۆڤایەتی بەدرێژایی سەردەمەکان ڕژێنراوە؟!![2] بەراستی حسن زاهید بوو لەدونیا و پادشایی و سەرۆکاتیەتیدا، گەر بیویستایە ساڵ گەلێك جەنگ بلێسەی

---

١ ـ البداية والنهاية(٧/ ٢٢٩ ـ ٢٣٠) نقلاً عن مرتضى للنووي، لا ١٩٨.

٢ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٩٤.

ده‌دا، به‌ڵام ئه‌و چاوه‌ڕێی ڕۆژی ئاخیره‌تی ده‌کرد وپاراستنی خوێنی ئومه‌تی محمد (ﷺ) به‌لاوه مه‌به‌ست بوو، حه‌سه‌نی به‌سریش ده‌ڵێ: کاتێك حسن بۆ خۆی نه‌یهێشت دلۆپێك خوێن برێژرێ[1] به‌ئاشکرا ڕایگه‌یاندو شانازی ده‌کرد که ئامۆژگاری پێغه‌مبه‌رو ڕه‌وتی په‌روه‌رده‌یی خوایی جێ به‌جێکردووه، [2] خوای گه‌وره به‌حسن ئاشته‌وایی خسته نێوان خه‌ڵکی عێراق و گشت ئوممه‌ته‌وه، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) چاکخوازی کردووه به‌یه‌کێك له‌گه‌وره‌ییه‌کانی حسن، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش که حسن وازی له‌خیلافه‌ت هێنا و دایه معاویه، گه‌ر جه‌نگ فرمان پێکراوبووایه به‌بێ وازهێنان له خیلافه‌ت و ئاشته‌وایی‌کردنی معاویه، ئه‌وه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) مه‌دحی نه‌ده‌کرد له ده‌ست هه‌ڵگرتن له ده‌سه‌ڵات و خیلافه‌ت و شیاوتر واز لێ نه‌هێنێت، به‌ڵکو زانێویه‌تی ئه‌وه‌ی حسن کردویه‌تی ئه‌وکاره‌یه که‌خوا و پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی حه‌زی پێ ده‌کات نه‌ك کوشتار. [3]

## قۆناغی دووه‌م:

مه‌رجی ئه‌وبه‌یعه‌ته‌ی که‌حسن (ﷺ) داینا وه‌کو بنه‌مایه‌ك تابه‌یعه‌تی خه‌ڵکی قبوڵبکات، ئه‌و مه‌رجه‌بوو که ده‌قی گرتبوو له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئاشته‌وایی هه‌رکه‌سێ بکه‌ن که‌داوای ئاشته‌وایی ده‌کات و دژایه‌تی ئه‌و که‌سه بکه‌ن که ئه‌و دوژمنایه‌تی ده‌کات. [4] مه‌یمونی کوڕی مه‌هرانه‌وه ده‌ڵێ: حه‌سه‌نی کوڕی علی دوای علی به دووبه‌یعه‌ت به‌یعه‌تی له‌خه‌ڵکی عێراقی وه‌رگرتووه: له‌سه‌ر ئه‌میری کردن و به‌یعه‌تی وه‌رگرتووه له‌وه‌ی چوومه هه‌ر ڕێکه‌وتنێکه‌وه له‌گه‌ڵدا بن و ڕازیبن به‌هه‌رشتێ ئه‌و پێ ی ڕازیبێ[5] له ڕیوایه‌تێکی تریش هاتوه خالیدی کوڕی(مضّرب) هوه ده‌ڵێ: گوێم لێ بوو حه‌سه‌نی کوڕی علی ده‌یووت: سوێند به‌خوا به‌یعه‌تیان لێ وه‌رناگرم تاقسه‌یه‌کم هه‌یه قبوڵی نه‌که‌ن، ووتیان چ

---

١ ـ دلائل النبوة للبيهقي (٦/ ٤٤٣) الدوحة النبوية الشريفة، لا٩٥.

٢ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٩٥.

٣ـ الفتاوى(٢٨/ ٣٠٠).

٤ ـ مرويات خلافة معاوية فر تاريخ الطبري، لا ١٥٦.

٥ ـ الطبقات، تحقيق السُلمي (١/٣١٧،٣١٦). إسناده حسن.

قسەیەك ؟ووتی: ئاشتەوایی لەگەڵ ئەوکەسەی ئاشتەوایی لەگەڵدا ئەکەم و جەنگی ئەوکەسە بکەن کە جەنگی لەگەڵدا دەکەم.[1]

لە وڕیوایە ئەوە وەردەگیرێ کە حسن(رضي الله عنه) لە بەخەلیفە بوونی وویستی ئاشتەوایی هەبووە، ئەوەش بەجێ هێنانی ئاماژەکەی پێغەمبەرە(ﷺ)، [2] حسن (رضي الله عنه) بەمەرجێ بەیعەتی عێراقیەکانی قەبوڵکرد بەوەی ئاشتی و بواری گفتوگۆ و کار لەسەر کردن هەیە تەنها ویستی ئاشتی تیایدا نیە بەسەر جەنگەوە ئەو هەردووکی پێکەوە کۆکردۆتەوە، گەرچی داوای ئاشتی کردووە، ئەوەش بەڵگەی ئەو هەڵکەوتوویە و جوان سەرکردەیی ئەوبووە ولەکاروبارەکان شارەزا بووە، هەروەها حسن(رضي الله عنه) بۆ خیلافەت چووەتە پێشەوە لەبەرئەوەی لەخیلافەتدا بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانانی تێدا بووە.

### قۆناغی سێیەم:

ڕووداني هەوڵی سەرەتایی تیرۆرکردنی حسن(رضي الله عنه) دوای ئەوەی نیەتی ئاشتەوایی لەگەڵ معاویە دا (رضي الله عنه) دەرکەوت، ئەم هەوڵەش لەوەیە دوای کەمێك لەبەخەلیفە بوونیدا بێت، ئەو هەوڵانە بوو کە ڕیوایەتەکانی خوارەوە ئاماژەی بۆ دەکەن: ئەو ڕیوایەتەی إبن سعد لە (طبقات) ە کەیداو لەرێگەی ئەبو جەمیلە وە تەخریجی کردوە[3] کاتێك حەسەنی کوڕی (رضي الله عنه) لەسەروبەندی کوژرانی عەلیدا کرایە خەلیفە لە نوێژدا بوو پیاوێك هاتە سەری و بەخەنجەر لێیدا (حصین بن عبدالرحسن السلمی) وای داناوە کە ئەو کەسەی پێی گەیشتووە بە خەنجەر لێ ی داوە پیاوێکی نەوەی ئەسەد بووە حەسەنیش لەسوجدەدابووە، (حصین) دەڵێ: حسن پیاوەکەی نەبینوە و وتراو کەلێدانەکە بەرسمتی کەوتووە و چەند مانگێك بەهۆیەوە نەخۆش کەوتووە و پاشان باش بووە، ئینجا چۆتە سەرمینبەر و دانیشتووەو دەڵێ: ئەی خەڵکی عیراق لەبەرامبەرماندا لە خوا بترسن ئێمە میوان و ئەمیری ێوەین و ئال وبەیتین ئەوانەی خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ

---

١ ـ هتمان سترضاوة(١/٣٨٧،٣٨٦). إسناده صحيح.

٢ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، لا ١١١.

٣ ـ ميسرة بن يعقوب، أبو جميلة الطهوي الكوفي ذكره إبن حبان في ثقاته(٥/ ٤٢٧).

اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيراً﴾[الأحزاب: ٣٣]، بەردەوام ئەوەی دەوتەوە: تا گریانی دەرکەوەت [١].

## قۆناغی چوارەم:

دەرچونی حسن(رضي الله عنه) بەسوپای عێراقەوە لەکوفەوە بۆ مەدانین و ناردنی هێزی لێدانی سوپاکەی (الشرطة الخميس) بەسەرکردایەتی قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە [٢] بۆ مەسکەن.

إبن سعد لە (طبقات)ەکەیدا ئاماژەی کردۆتە ئەو ڕیواتەی لەڕێگەی (الشعبی) یەوە (تخرجی)ی کردووە دەڵێ: خەڵکی عێراق دوای علی کوڕی ئەبو تالیب بەیعەتیان دابەحەسەنی کوڕی علی و پاشان بە حەسەنیان وت: بڕۆ گیان ئەوانەی لەخواو پێغەمبەرەکەی یاخی بوون و خراپەی گەورەیان کرد و کاروباری خەلکیان بەزۆر داگیرکردووە، ئێمەش ئومێدمان هەیە خوا لە دژیاندا توانادارت بکات، بۆیە حسن سوپایەکی نارده شام و قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەش بوویەسەر گەورەیان و دوانزه هەزار بوون و بە(شرطة الخميس) ناسراون. [٣]

لە ڕیوایەتەکەی پێشودا دەردەکەوێت کە خەڵکی عێراق بوون حەسەنیان پاڵدا بۆ دەرچون لە کوشتاری خەڵکی شام بێ ئەوەی حسن لەو حەزی لەو دەرچونە هەبێ، ئەوکارەش إبن کەسیر بەرەحمەت بێ ئاماژەی بۆ کردووە دەڵێ: حسن نیەتی نەبووە یەك کەسیکیش بکوژێ، بەڵام ناچاریان کردو کۆمەڵێ بێ وێنە کۆبونەتەوە و حەسەنی کوڕی عەلیش فرمانی کردۆتە قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە بەسوپایەکی دوانزە هەزاریەوە دەربچێت بۆ شام، کاتێك بەمەدائین گەیشت لەوێدا دابەزی، حسن ژێریەکی گەورەی دەرخست و بەڵگەی ئاسۆ فراوانی و بەرچاو ڕوونی بوو، سەرەتا ویستی ئاشتی دەرخست لەگەڵ معاویەو نەیویست ڕووبەڕووی خەڵکی عێراق ببێتەوە، دەسەلاتەکە بە معاویە بدات، بۆیە ویستی ڕاستگۆیی خۆی بۆیان دەربخات، سەلامەتی خۆی دەربخات لە

---

١ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٢٣).

٢ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/٣٢١).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(١/٣١٩، ٣٢١)، ئیسنادی کێشەی تیادا نیە.

ڕۆیشتنی بۆ لای معاویە،[1] دەرچوونی حەسەنی کوڕی عەلیش لەکوفەوە بۆ مەدائین وەك دکتۆر خالید الغیث تەئکیدی لەسەر کردووە لە مانگی سەفەری ساڵی دواتری بووە، واتا ٤١ك.[2]

## قۆناغی پێنجەم:

دەورچوونی معاویە(ﷺ) لەشامەوە ڕوەو عێراق دوای گەیشتنی حسن بەسوپاکەیەوە لەکوفەوە بۆ مەدائین، إبن سعد لە (طبقات)ەکەیدا دەڵێ: معاویە لەشام دەرچوو بەمەبەستی گەیشتنە حسن و تالە دێ ی (جسر منیح) لایدا[3]، هەروەها دەڵێ: لەجیسرەوە بۆ مەسکەن کەوتە ڕێ لەماوەی پێنج ڕۆژدا، ڕۆژە شەشەم چوە مسکن[4]، دەچونی معاویە درەنگ بوو، ئەوەش بەهۆی درەنگ بیستنی دەرچونی حسن بەسوپاکەیەوە بوو، معاویە لەئەنجامی هەوڵی ئەو تیرۆرکارییەی کە لەلایەن برك بن عبداللە التمیمی خەواریجەوە ڕوبەڕوی بویەوە سەخت بریندار بوو، معاویە بۆ نوێژی بەیانی دەرچوو ویسترا تیرۆر بکرێ، ئەو هەوڵە بوو کە لەبەیانی هەمان ڕۆژدا بوو علی(ﷺ) تیادا تیرۆرکرا، کەبەیانی ڕۆژی جومعەی حەڤدەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٠ی کۆچی بوو، بەپێ ڕیواتە صەحیحەکان،[5] خەلالیش ئاماژەبە سەختی بریندار بونی معاویە دەکات و دەڵێ: ئێمە لەگەشتێکدا لەتەك گەڵ سعد بوین و دابەزیم لەگەڵی ڕۆیشتم سوپاسی خوام کرد و باسی گەورەییم کرد ووتم: معاویە خراپ لێیدراوە وابزانم کوژراوەخەڵکیش[6] کەسانی شوراو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەکوژن بۆ خوا تکات لێدەکەم گەر کارێکیان بگریتە دەست یان ڕێزەکانیان پەرتەوازەبکەی یان بۆ لەنێو چوون بانگیان بکەی، ئەویش سوپاسی خوای کرد وپاشان ووتی: سوێند بەخوا ڕێزەکانیان پەرتەوازە ناکەم و بۆ

---

١ ـ العالم الإسلامي في العصر الأموي، د. عبد الشافعي محمد، لا ١٠١.

٢ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، لا ١٣٠.

٣ ـ جسر منح دێیەکە لە دوورگەی فورات، الطبقات السلمي(١/ ٣٢١).

٤ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٢٣).

٥ ـ البداية والنهاية(١١/١٣١).

٦ ـ مەبەست بە خەواریجەکانە.

کارێکی له نێوبەریش بانگیان ناکەم، بەجێیان ناهێڵم تا شمشێرێکم بۆ نەهێنن و بڵێن: ئەی سعد ئەمە باوەڕدارە وازی لێ بێنە و ئەمەش بێباوەڕە بیکوژە [1]، لەکاتێکدا حسن لە مەدائین بوو، یەکێك لەخەڵکی عێراق هاواریکرد قەیس کوژرا، لەوەدا پەشێوی لەسوپادا بڵاو بوویەوە و سروشتی ناجێگری و بێ ئارامی بۆ خەڵکی عێراق گەڕایەوە، دەستیان کردە ستەمکاری و تالآبردنی سوپای حسن و خواردن و کەل و پەلەکەیان دزی و لە حەسیر و نەعلەکەی پێشیدا ڕیقابەتیان کرد، لەحەسەنیان داو بریندایان کرد، لێرەوەشەوە ڕوداوێك ڕوویدا کەبەڵگەیەکی گەورە بوو، والی مەدائین سعدی کوڕی مەسعودی سەقەفی بوو کەعلی دایناببوو، برازاکەی هاتەلای کە موختاری کوڕی أبو عبدی کوڕی مەسعود بوو، ووتی: دەوڵەمەندی و گەورەییت ئەوەی؟ وتی: چۆن؟ وتی: حسن ببەستەوە و بیدەیتە دەست معاویە، مامی پێ ی ووت: نەفرەتی خوات لێبێت، کوڕی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ببەستمەوە، تۆخراپترین پیاوی [2]، حسن کاتێ کاری دۆستەکانی بینی دڵنیا بوو کەسودیان نیە و سەرکەوتن لەسەر دەستیان نایەتەدی، لەسەرەتاشدا هەر ئەو باوەڕەی هەبوو[3]، ئەو کارە پاڵی پێوەنا کە هەنگاو گەلێکی فراوان ببڕێ وزیاتر لەئاشتەوایی نزیك ببێتەوە.

## قۆناغی شەشەم:

گۆڕینەوەی نامە لەنێوان حسن و معاویە ئاشتەوایش کەوتەنێوانیانەوە ڕەزای خوایان لێ بێت، بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە صحیحەکەیدا ئەوساتە ناسکانەی مێژووی ئومەتی ئیسلامی تۆمارکردووە، کە هەردووکۆمەڵ بەیەك گەیشتوون، کۆمەڵی خەڵکی شام و کۆمەڵی خەڵکی عێراق، ئەو ڕیوایەتەی لەحەسەنی بەسریەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: سوێند بە خوا کە حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) بەکەتیبە گەلێك ڕووبەڕووی معاویە بووەوە نمونەی چیابوون، عمروی کوڕی عاصی ووتی: سوێند بەخوا ئەم کۆمەڵانە هەموو دەکوژرێن، معاویە پێ ووت: سوێند بەخوا هەردوولا باشترین پیاوانی تێدایە، ئەی عمرو،

---

١ ـ السنة للخلال تحقيق د. الزهراني، لا ٤٧٤، ٤٧٥، إسناده صحيح.

٢ـ تاريخ الطبري(١٥٩/٥) نقلاً عن العالم الإسلامي في العصر الأموي، لا ١٠١.

٣ـ العالم الإسلامي في العصر الأموي لا: (١٠١) .

گەر ئەم کۆمەڵ ئەو کۆمەڵ بکوژێ و ئەو کۆمەڵ ئەم کۆمەڵ بکوژێ، کێ کاروباری خەڵکی بەڕێوە ببات، کێ ئاگاری لەماڵ و ئافرەتیان بێت، بۆیە دووپیاوی قوڕەیشی نەوەی عبدالشمس ناردە لایان کە عبدالرحمن کوڕی سەمرە و عبدالله کوڕی عامری کوڕی کریز بوون و ووتی: بڕۆنە لای حسن ئەوانیش ڕۆیشتنەلای و قسەیان لەگەڵ دا کردو حەسەنی کوڕی علی پێ ی ووتن: ئێمەی کوڕانی عبدالمطلب لەم کارەدا زیانمان بەرکەوت و ئومەتیش لەو خوێندا تلایەوە، ئەوانیش ووتیان: معاویە بەڵێنی وەهاو وەهای پێداوی، حەزدەکات بتبینێت، ئەویش ووتی کێ کەفالەتی معاویەم بۆ دەکات[1]، ووتیان: ئێمە کەفالەتی معاویەت بۆ دەکەین، [2] ئەویش صولحی لەگەڵ کرد، حەسەنی بەسریش دەڵێ: بێگومان لە أبوبکرم بیست ئەیوت: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی لەسەرمیمبەر و حەسەنی کوڕی علی لەگەڵدا بوو جارێ ڕووی دەکردە خەڵك وجارێ ڕووی دەکردە حسن و دەیفەرموو: ((ان إبني هذا سيد، ولعل الله يصلح به بين فئتين عظيمتين من المسلمين))، ((ئەم کوڕەم سەیدە؛ خوای گەورە دەیکاتە هۆکار بۆ ئاشتەوایی نێوان دووکۆمەڵەی گەورەی موسڵمانان)).[3]

إبن حجر (رحمه الله) لەبارەی سودەکانی صولح دەڵێ:

١. سودی ئەم چیرۆکە یەکێکە نیشانەیە کە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ).

٢. جوامێری حەسەنی کوڕی علی دەرەکەوێت، کە لەبەر بێ هێزی وازی لەدەسەڵات نەهێنا، بەڵکو لەبەر پاداشتی لای خوا وازی لەدەسەڵات هێنا، بۆ ئەوەی پاراستنی خوێنی موسڵمانانی بۆ دەستەبەر بێت، بۆیە بەرژەوەندی ئایین و بەرژەوەندی ئومەتی ڕەچاوکرد.

---

١ ـ الفتح(١٣/ ٧٠).

٢ ـ هەمان سەرچاوە.

٣ ـ البخاري، رقم: ٧١٠٩.

٣. ڕەددانەوەی خەواریج بووە ئەوانەی علی و هاوەڵەکانی و معاویەو هاوەڵەکانیان بەبێباوەڕ دەزانی، بە شایەتیدانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەردووکۆمەڵەکە، بەوەی موسڵمانن.

٤. گەورەیی وپیرۆزی چاکەکاری نێو خەڵکی تێدایە، بە تایبەت لە پاراستنی خوێنی موسڵمانان.

٥. بەڵگەی دڵسۆزی معاویەیە بۆ ئەو خەڵکانەی لە ژێر دەستی دان و قوەتی بیرکرنەوەیەتی لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت سەیرکردنی ئەنجامەکانی.

٦. دەکرێت کەسی باش خیلافەت ڕاپەڕێنێ، ئەگەر باشتریش هەبێ، چونکە حسن و معاویە هەردووکیان خیلافەت یان بەڕێوە بردوە، سعدی کوڕی وەقاص و سعدی کوڕی زەیدیش لەژێیاندا بوون و لە بەشدارانی بەدر بوون.

٧. دەکرێ خەلیفە خۆی دەست لەخیلافەت هەڵبگرێ، ئەگەرچاکەی موسڵمانانی تیادا بینی و بەرامبەر پارە دەست لەپلە و وەزیفەی ئاینی و دونیا ییەکان هەڵبگرێ و لەوەدا پارەوەرگرێ و بیبەخشێ، لە دوای هاتنەدی مەرجەکان بەوەی دەست هەڵگرتن باشترو لە پێشترە، بەو مەرجەی لەبەرژەوەندی گشتیدا بێ [1]، هەروەها إبن سعد لەبارەی ئەو ئاشتەواییە دا ڕیوایەتتیکی باسکردووە کە لەڕیوایەتەکەی بوخاری گرنگی کەمتر نیە و بەتەواوکەری ئەوەی بوخاری دادەنرێت ولە عمروی کوڕی دینار ڕیوایەتکراوە [2] کەمعاویە ئەیزانی حسن لەخەڵکی زیاتر ڕقی لە پەشێویە، بۆیە کاتێک علی کۆچی دوایی کرد، نوێنەری نارده لای حسن و بەنهێنی نێوان خۆی و حەسەنی باشکرد و معاویە بەڵێنی بەحسن دا کەلەدوای خۆی حسن بکات، خەلیفە گەر هاتوو حسن لەدونیادا مابێ [3]، عبدللە کوڕی جعفر دەڵێ: لای حسن دانیشتبووم وویستم هەستم، ئەویش بەرگەکەی ڕاکیشام ووتی: من بۆچونێکم بۆ دروست بووە حەزەکەم لەگەڵماندا بیت، ووتم: ئەو بۆچوونە چیە؟ ووتی: گەیشتووم بەو بڕیارەی بگەڕێمەوە مەدینە و لەوێدا نیشتەجێ ببم و

---

١ـ فتح الباري (١٣/ ٧١،٧٢).

٢ ـ عمر بن دينار المكي الجمحي مولاهم، ثقة ثبت، مِنَ الطبقة الرابعة مات ١٢٦ه اخرج له السنة التقريب، لا: ٤٢١.

٣ ـ واتادوای خۆی بۆ خەلیفە بپاڵورێ کاتێکیش تەماشای مەرجەکانی ئاشتەوایی ئەکەین بە پشتوانی خوا ڕونەبێتە وەکو ئەوبارەی سەقامێگیر بوو ئەوە بە خەلیفە دوای معاویە بە ڕاوێژی نێو موسڵمانانە

بۆ معاویە دەست لە خیلافەت هەڵبگرم، چونکە لەوە بووە پەشێوی درێژی کێشاو خوێن ڕێژراو پەیوەندی وخزمایەتی پچڕا، عبدللە کوڕی جعفر ووتی: خوا لەبەرامبەر ئومەتی محمد پاداشتت بداتەوە، منیش هاوڕام لە گەڵت لەو بۆچونەت، بۆیە حسن ووتی: حسینم بۆ بانگ بکەن، ناردی بەشوێن حسین و هێنایان، ووتی: براکەم من بەبڕیارێك گەیشتووم حەزئەکەم هاوبۆچوونم بی، وتی: چیە؟ ئەوەی کە عبدللە کوڕی جعفر ووت حسینی ووت، حسین ووتی: ئەتپارێزم بەخوا گەر علی لە گۆڕەکەیدا بەدرۆبخەیتەوە ومعاویە بەڕاست دابنێی، حسن وتی سوێند بە خوا هەرکارێك من ویستبم تۆ سەر پێچیت کردووم بۆلای غەیری خۆم، سوێند بەخوا دەمویست بتخەمە خانویەك و دەرگات لەسەر داخەم ئیشی خۆم تەواودەکەم، کە حسین توڕەیی حەسەنی بینی، ووتی: تۆ کوڕەگەورەی علی و جێ نشینی ئەوی، ئێمەش فرمانمان پێ کراوە شوێن کەوتەبین، ئەوەی ئەتەوێ بیکە[١] لەڕیوایەتەکانی بوخاری و إبن سعد تێبینی دەکرێ هاودەنگن لەسەر ئەوەی معاویە (رضي الله عنه) خاوەنی دەسپێشخەر بووە لەپەیوەندیکردن بەحسن(رضي الله عنه)و ئاشتەواویی خستە بەردەمی.[٢]

کێ دەستپێشخەربووە بۆ ئاشتی حسن یان معاویە؟

لێرەدا خوێنەر دەپرسێ: کێ دەستپێشخەری کردووە بۆ ئاشتی، ئایە حسن بووە (رضي الله عنه) کەفەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بارەیەوە هاتووە، کەخەریك بو لەهەوڵی سەرەتادا بەهۆی مەرەجی بەیعەت وەرگرتنەکەی خستە سەرخەڵکی خەریك بوو تێرۆر بکرێ کە لەو مەرجەشدا ویستی ئاشتەوایی معاویەی هەبوو، یان معاویە (رضي الله عنه)دەستپێشخەری کردووە؟ وەڵامەکەش ئەوەیە: ویستی ئاشتەوایی لەهەردوولا دا هەبووە، حسن (رضي الله عنه) بۆ ئەو ئاشتیە تیکۆشاوە و لەساتەکانی یەکەمی بەیعەت وەرگرتندا پلانی بۆ داڕشتووە و پاشان معاویە هاتووە دەستپێشخەریەکەی حەسەنی تەواو کردووە، بۆیە کاری بارسەنگی هەوڵی سەرکەوتنیش بۆ حەسەنە.

---

١ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٣١، ٣٣٠).

٢ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، لا١٣٨.

## قۆناغی حەوتەم:

### هەوڵێکی دیکەی تیرۆرکردنی حسن(رضي الله عنه):

دوای سەرکەوتنی وتویژەکانی ئاشتی نێوان حسن و معاویە(رضي الله عنه)، حسن (رضي الله عنه) هەوڵیدا شوێنێکەوتوانی ئەو صولحە قبوڵ بکەن، بۆیە هەستا وتارێکی دان تاوەکو ئاشتەوایی نێوان خۆی و معاویەیان بۆ ڕونبکاتەوە، خەریك بوو وتاری دەدا هەندێ لەسەربازەکانی بە مەبەستی کوشتنی هێرشیان کردە سەر، بەڵام خوای گەورە ڕزگاری کرد وەك چۆن پێشتر لەهەوڵی لەو شێوەیەدا ڕزگاریکرد، (بلاذري) باسی ئەو ووتارەی کردوە کە حسن بۆ شوێنێکەوتوانی داوە، هەروەها هەوڵی کوشتنەکەی گێڕاوەتەوە دەڵێ: ئومێدەوارم باشترین ئامۆژکاریکەری دروستکراوی بم، هیچ ڕق و کینەیەکم لەکەس نەبووە، ئەوەی لەکۆمەڵدا ڕقتان لێیە باشترە بۆتان لەو پەرتەوازەیەی پێتان خۆشە، بۆیە من تێڕوانینی من لە تێڕوانینتان باشترە، بۆیە پێچەوانەی فرمانم نەکەن و ڕەتم مەکەنەوە، خوا لەمن و ئێوەش خۆش بێت، خەڵکی تەماشای یەکتریان کرد ووتیان: سوێند بەخوا خۆی ئامادە کردوە بۆ صولح لەگەڵ معاویەو، لاوازی نواندو، بۆیە چوونەسەری و بەرگەکەیان بەتاڵان برد، پاشان عبدالرحمن کوڕی عبدالله کوڕی ئەبو جەعالی ئەزدی عەباکەی لەبەردا کەند، بەس شمشێرەکەی پێوە مایەوە وسواری وەڵاخەکەی بوو، خەڵکی دەورەیان لێدا، هەندێکیان بەلاوازیان ئەوتەوە هەندەکەی تریش خەڵکیان دورخستەوەو نەیاندەهێشت نزیکی بکەونەوە، پیاوێکی نەوەی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە نەوەی (نضربن قعین) حارث بن ثعلبة بن داود بن أسد، کە (الجراح بن سنان[1] پێ دەوت و بۆچوونی خەواریجەکانی (مظام ساباط)ی هەبوو،[2] لە (مظلم) دا چاوەڕێی ئەکرد، حەسەنی بینی لەو ڵاخەکەی نزیك بوویەوە و ڕەشمەی وەڵاخەکەی گرت وئاسنێکی تیژی دەرهێنا و وتی: ئەی حسن چۆن باوکت شیرکی کرد تۆش شیرکت کرد، بەچۆقەکە دای لەڕانی و شەقی کرد، وەخت بو برینداریەکەی بگاتە ئێسقان و حسن دای بەنێوچەوانی

---

١ ـ الجراح بن سنان الأسدي، لەخراپەدا پێشینەی هەبوو، لەوکەسانە بوو هتانیان بە سعدی کوڕی وقاص(رضي الله عنه) کرد لە ڕۆژگاری خیلافەتی عمردا بۆ لادانی لە کوفەدا هەوڵیان ئەدا، سعدیش لە دژیان وەستا یەوە، ئەنجامییان خراپ بوو الطبري (١٤١/٤).

٢ـ سباط شوێنێکی ڕۆخی ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلەیە، (مظلم) شوێنێکە لەوێدا، معجم البلدان (١٦٦/٣، ١٥٢/٥).

و عبدالله  کوڕی (فضل البطائي)یش ئاسنەکەی لە دەست کردەوە و (ظبیـات إبـن عمـارة التميمي)یش[1] لوتی گرت و بەشمشێر دای بـە نێـو چـەوانی تـامرد، حەسـەنیش هێنـرا مەدائینەوە.... پاشانیش سعدی کوڕی مەسعود پزیشکی بۆ حسن هێنا و چاودێری ئەکرد تا چاك بووەیەوە بردیە (أبيض المدائن) [2]، لەو ووتارەی حسن ئەوە دەخرێتـە ڕوو، بـەلای (بلاذری و ئە بـی حەنیفە)ی دەینەوەریە پێش ئاشتەواوی معاویـەو حـسن هـاتووە، بـەڵام ئـەوەی ڕیوایەتەکـەی بوخـاری هـاتووە لەوەسـفی سـوپاکەی حـسن، ئـەوە دەردەکـەوێت کەسوپای حسن بەهێز بووە و سوپای عێراق لەباشـترین بـاری مـادی و مەعنەوەیـدا بـوو سوپای عێراق بەرامبەر بە سوپای شام وەستابێ، ئەوەی لـە واقیعـەوە نزیـك بـێ ئەوەیـە وتاری حسن لە سەربازگەکەی خۆی دوای بە یەك گەیشتنی هەردوو سـوپای عێـراق وشـام بووە و دوای ڕوودانی ئاشتی نێوان حسن و معاویەیە[3] ئەمەش سەرباری ئەوەی وتارەکەی حسن دەروازەو دەستپێك بوو بۆ هەوڵدانەی شوێنکەوتووانی بەوەی ئاشتەوایی نێوان خـۆی و معاویە هاتۆتەدی، ئەم گێڕانەوەیەی خوارەوەش ڕونـی دەکاتـەوە: إبـن سـعد لەڕێگـەی ڕەیاحی کوڕی حارسەوە تەخریجی کردووە [4]، کە حەسەنی کوڕی علی دوای وەفـاتی علـی (ﷺ) هەستاو سوپاسی خوای کردوو پاشـان فـەرمووی: بەڕاسـتی هـەموو ئـەوەی دێـت نزیکە، فرمانی خواش دێتە دی گەرچی خەڵکیش حەزی پێنەکـەن، سـوێند بـەخوا حـەزم نەکردووە هیچ کارێکی ئومەتی محمد بگرمە دەسـت کەتیایـدا دڵۆپێـك خـوێن بڕێـژرێت، بێگومان دەزانم چەند زیانم لێدەدات، بۆیە گوێبیستی گەورەتان بن[5] ئـەوترێت کـە: ئـەم ڕیوایەتە لە کوفەدا ووتراوە نەك لەمەدائیندا، وەڵامی ئەوەش ئەوەیە: کە ئەحمەدی کـوڕی حەنبەل هەمان ئەم ڕیوایەتەی لەڕێگەی ڕەیـاحی کـوڕی حارسـەوە بەئینـسادیکی ڕاسـت تخریج کردووە [6] تیایدا هاتووە: کە خەڵکی لەمەدائینـدا لـە لای حەسـەنی کـوڕی علـی

---

١ ـ (ظبيات بن عمارة) لەعەلی گێڕاویتەوە و لەتابیعیەکانی کوفە بووە، ئەم بۆچونەش.

٢ ـ بەکۆشکی سپی ئەناسراو ئەکەوتە سەرکەناری ڕۆژهەڵاتی ڕوباری دیجلەوە، الروض المعطار، ل٩٧.

٣ ـ أنساب الأشراق للبلاذري مخطوطة نقلاً عن مرويات خلافة معاوية، ل ١٤٢.

٤ـ مرويات خلافة معاوية (ﷺ)، ل ١٤٢.

٥ ـ رياح بن الحارث النخفي ثقة، التقريب، ل: ٢١١.

٦ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣١٧).

کۆبونەوە [1]... پاشان پاشماوەی ڕیوایەتەکەی إبن سعدی باسکردووە، گەر چی وتراوە ئەووتارەی لەمەدائین داوە [2]، بەلام بەڕاستی دوای ئاشتەوایی حسن لەگەڵ معاویە ئەم وتارە دراوە، هەروەها إبن سعد لەڕێگەی هیلالی کوڕی خەبابەوە[3] تخریج کراوە دەڵێ: ئەی خەڵکی عێراق ئێوە لەسێ شتدا منتان سەرسوڕماوکرد: کوشتنی باوکم، بریندارکردنم و تالانکردنم، یان ووتی: عەباکەتان لەشان داکەندم، ئێوەش بەیعەتان پێدام ئاشتەوایی هەرکەس بکەن کەئاشتەوایی لەگەڵ بکەم و جەنگی هەرکەس بکەن جەنگی لەگەڵ بکەم، منیش بەیعەتم بەمعاویە دا، بۆئەوەی ئێوەش گوێبیست و گوێرایەڵی بن، پاشان دابەزی و چووە کۆشکەوە. [4]

## ١. هەڵوێستی (شرطة الخميس) لەئاشتیدا:

سەبارەت بەهەڵوێستی (شرطة الخميس) لەو ئاشتیەدا ـ پێشەنگی سوپای عێراق بوون بۆ مەسکەن. ئەوە حاکم لە (أبی الغريف)ەوە [5] تخریجی کردوە دەڵێ: لەپێشەوەی حەسەنی کوڕی عەلیدا بووین، بەدوانزە هەزارەوە، شمشێرەکانمان لەتیژیدا بۆ کوشتنی خەڵکی شام دڵۆپەخوێنی لێ دەتکا و أبوو العمرطة گەورەمان بوو. [6]

کاتێك ئاشتەوایی حەسەنی کوڕی علی لەگەڵ معاویەمان پێگەیشت وەك ئەوە وابوو لە توڕەییدا پشتمان شکابێ، کاتێکیش حەسنی کوڕی علی هاتەکوفە، پیاوێ لە ئێمەکە ئەبا عامر سوفیان بن الليلی پێ ئەوترا[7] هەستاو ووتی: السلام علیك ئەی سەر شۆرکەری ئیمانداران، حەسەنیش پێ ووت ئەی باوکی عامر وا مەڵێ، ئیماندارانم سەرشۆرنەکردووە، بەڵکو حەزم نەکرد لەداواکردنی پادشتایەتیدا بیانکوژم[8] وەها

---

١ ـ فضائل الصحابة (٢/ ٧٧٣).

٢ ـ هەمان سترضاوة(٢/٧٧٣)إسناد صحيح.

٣ ـ هلال بن خباب العبدي، صدوق، التقريب، ٥٧٥.

٤ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٢٤).

٥ ـ عبيد الله بن خليفة الحمدانی المردي، صدوق، رمي بالتشيع، التقريب ٣٧٠.

٦ـ ناوی عومری کوڕی یەزیدی کندیە، لەبزوتنەوەکەی حجر بن عدی لەساڵی ٥١ك.

٧ ـ لەوکەسانە بوو کەبەدوای خوێنی حوسەیندا بەشدارای موختاری سەقەفیانکرد ٦٦ك.

٨ ـ المستدرك (٣/١٧٥).

دەردەکەوێت کە أبو العمروطة، گەر ئەمیری کۆمەڵێکی سوپای خەمیس بووبێت و (أبو الغریف) یان تیادا بووە، چونکە سەلماوە کە سوپای خەمیس قەیسی کوڕی سعد (رضي الله عنه) سەرکردایەتی کردووە و ڕیوایەتە صحیحەکانیش باسی بوونی عبیداللە ی کوڕی عباس ناکەن کە سەرکردایەتی سوپای خەمیسی کردبێ، ئەوەش گومان لەبوونی عبیداللە کوڕی عباس ئەکات کە لەو ماوەیەدا لەعێراق بووبێ[1] هەروەها ئاوڕ بەلای ئەو ڕیوایەتە هیچ و پوچانەی نادرێتەوە، کەوا دادەنێن عبیداللە لەبەرامبەری بەرتیلی معاویەدا خیانەتی لەحسن کردووە.

قەیسی کوڕی سعد ڕاڕا بوو لە چوونە نێو ئەو ئاشتەوایە و دورکەوتەوە، پاشان خوا دڵی فراوان کردەوە و بەشداری ئاشتەوایی کرد و بەیعەتی بەمعاویەدا(رضي الله عنه)، لەگێڕانەوەکانی دواتریشدا ڕونکردنەوەی هەڵوێستی قەیس هەیە، کە هەواڵی ئاشتەوایی پێگەیشتوە، إبن حجر لەڕێگەی حەبیبی کوڕی ئەبو سابتەوە، [2] ڕیوایەتی کردوە کە دەڵێ: حسن بۆ بەیعەتدان چوو بەلای معاویە، ئینجا حسن بۆ قەیسی کوڕی سعد ئەو هەواڵەی نووسی و ناردی، قەیسی کوڕی سعدیش بە کۆمەڵەکەی ووت: ئەی خەڵکینە دوو هەواڵتان بۆ هاتووە، پێویستیشە یەکێکیان هەڵبژێرن: چوونە نێو ئاژاوەوە یان کوشتار لەگەڵ جگە لە ئیمامدا، خەڵکی ووتیان ئەوە چیە؟ ووتی حەسەنی کوڕی علی بەیعەتی بەمعاویەداوە.[3]

ڕیوایەتی پێشوو ئاماژە بە خێرا بەشداری بوونی بەشێکی گەورەی (شرطة الخمیس) بۆ نێو ئەو ئاشتەواییەدەکات، کە هەواڵی ڕودانی ئاشتی نێوان حسن و معاویەیان بیست (رضي الله عنه)، بەلام باس لەوە ناکات کە قەیسی کوڕی سعدی سەرکردەیان چوبێتە ئەم ئاشتیەوە، إبن کەسیریش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئاماژەی بەم قسەیە کردووە، حەسەنی کوڕی علی نوێنەری نارده لای قەیسی کوڕی سعدی ئەمیر کەبیستی و گوێڕایەڵ بێ، قەیسی کوڕی سعدیش ڕەتیکردەوە کە گوێڕلی بکات لە گوێڕایەڵی کردنی هەردووکیان

---

١ـ مرویات خلافة معاویة في تاریخ الطبري، لا ١١٤.

٢ ـ حبیب بن أبي ثابت بن دینار الأسدي، التقریب ١٥٠.

٣ ـ المطالب العلیة (٣١٧/٤ ـ ٣١٩) هذا الإسناد صحیح.

دەرچوو، پاشان پاشگەزبویەوەو بەیعەتی بەمعاویەی دا [1]، هەروەها إبن أبی شیبە لەبارەی هەڵوێستی قەیسی کوڕی سعد(رضي الله عنه) و شوێنکەوتەکانی لە (شرطة الخميس) باس کردووە لەو ئاشتەوایەیەدا وتوویەتی، لەلایەن هیشامی کوڕی عوروە و ئەویش لەباوکیەوە دەڵێ: قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە لەگەڵ حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) لە پێشەوەی سوپا بوو، پێنج هەزار سەربازی کە لەگەڵدا بوو، دوای مردنی علی کوڕی أبو تالیب(رضي الله عنه) سەریان تاشی و بەیعەتیان لەسەر مردن پێدا، کە حسن بەیعەتی بە معاویەدا، قەیس ڕەتی کردەوە بەشداری ئەو بەیعەتەبکات، بەهاوڕێکانی ووت: چۆنتان ئەوێ؟ ئەتانەوێ ئەو جەنگە بکەین تامردن؟ یان ئەمانتان بۆ وەردەگرم، ووتیان: ئەمانمان بۆ وەرگرە، ئەویش بەڵێنی چی و چی بۆ وەرگرتن کەبەهیچ شتێ سزانەدرێن و خۆشی کەسێ بێ لەوان و هیچ شتێکی تایبەتیشی بۆ خۆی وەرنەگرت، کاتێکیش ڕوەو مەدینە ڕۆیشت هەموو ڕۆژی بەچکە ووشترێکی بۆسەرئەبڕین کەیشتن. [2] لەڕیوایەتی پێشودا ـ لەپێشخستن و دواخستنی ماوەی ڕوداوەکان ئاماژەیە بۆ ژمارەی ئەوکەسانەی لە (شرطة الخميس) کەلە کۆی دوانزە هەزار کەس شوێن قەیسی کوڕی سعد کەوتبوون. [3]

## ٢. هەڵوێستی ئەمیرەکانی علی (رضي الله عنه) لە بەرامبەر ئەو ئاشتیەدا:

هەولوێستی ئەمیرەکانی علی (رضي الله عنه) بەرامبەر جیاواز بوو، هەندێکیان پێشوازیان لێ دەکرد، هەندێکی تریش حەزیان بەئاشتی نەبوو، ئەمەی خوارەوە ڕونکردنەوەی ئەو هەولوێستانەیە:

أ ـ هەولوێست وەرگرتن و بە باشدانان، لەپێشی ئەوانیش عبدالله کوڕی جعفری کوڕی ئەبو تالیب بوو(رضي الله عنه).

ب ـ هەولوێستی ڕەتکردنەوە پاشان قەبولکردن، لەپێشی ئەوانیش قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادە(رضي الله عنه) وزیاد بن أبیه.

---

١ ـ البداية والنهاية(٨/ ١٦).

٢ ـ هەمان سەرچاوە (١٦/٨).

٣ ـ مصنف إبن أبي شيبة(٤٧٢/٧).

ج ـ کۆمەڵی سێ یەمیش چونە ناو ئەو ئاشتیەواییەوەو حەزیشیان پێ نەبوو، ئەوکەسانەش دوو بەش بوون.

ـ بەشێکان ڕەئیان وابو تەنیا تایبەتە بە ماوەی ژیانی حەسەنەوە (رضي الله عنه)، حجری کوڕی عدی(رضي الله عنه) نوێنەری ئەو کەسانە بوو.

ـ بەشێکی تریش ڕەئیان وابو کە پەیوەستە بەماوەی ژیانی حسن و معاویەوە (رضي الله عنه)یان مردنی ئەوی دواتریان، حوسەینی کوڕی عەلیش(رضي الله عنه)نوێنەری ئەو کۆمەڵەیە بوو.

## قۆناغی هەشتەم:

حەسەنی کوڕی علی وازی لەخیلافەت هێنا و کاروباری دایە دەست معاویە (رضي الله عنه)، دوای ئەوەی خوای گەورە حەسەنی کوڕی علی لەوفیتنیە ڕزگار کرد کە لەسەر بازگەکەی ڕویدا مەدائینی بەجێهێشت و بۆ کوفە بەڕێکەوت، (بلاذري) لەبارەی ڕۆیشتنی حسن بۆ کوفە دەڵێ: ووتویانە کاتێك حسن ویستویەتی لە مەدائینەوە بڕوات بۆ کوفە، إبن عامر[1] و إبن سەمرە[2] هاتنە لای و نوسراوی ئاشتیان بۆ هێنا، لەونامەیەدا معاویە بەڵێنی هەموو شتێکی پێدا بوو کە حسن بیەوێت، ئەویش لەوتارەکەیدا ووتی: دەکرێ ڕقتان لەشتێك بێت و خوای گەورەش خێری زۆری تیدا بڕێژێ و بەرەو کوفە بەڕێکەوت،[3] دوای ئەوەش معاویە(رضي الله عنه) لەمەسکەنەوە بەرو نەخیلە[4] بەڕێکەوت، لەوەشدا(بلاذري) دەڵێ: معاویە لەمەسکەنەوە بەروە کوفە کەوتەرێ و لەنێوان نەخیلەو دارالرزق[5] لایدا، پاشان حسن (رضي الله عنه) لەکوفەوە بەرەو نەخیلە کەوتەرێ بۆئەوەی پێشوازی لە معاویە بکات(رضي الله عنه) و کاروباری بداتە دەست، لەمجالد[6] و ئەویش لە شەعبیەوە[7] دەڵێ:

---

١ ـ عبدالله ی کوڕی عامر بووە(رضي الله عنه).

٢ ـ عبدالرحمنی کوڕی سەمرە بوو.

٣ ـ أنساب الأشراف مخطوط ٤٤٧ نقلاً عن مرويات معاوية، لا ١٥٠.

٤ ـ نەخیلە: شوێنێکی نزیکی کوفەیە بەڕووی شامدا، معجم البلدان (٥/ ٢٧٨).

٥ ـ أنساب الأشراف نقلاً عن معاوية، لا ١٥٠.

٦ ـ مجالد بن سعيد الهمزاني ـ قستی لستۃ.

٧ ـ عامر الشعبی متمانة ثێکراوة.

حەسەنی کوڕی عـەلیم(ﷺ) لەنەخیلـە بـی کـە لەگـەڵ معاویـە(ﷺ) صـولحی کـردوو، معاویەش دەڵێ: کەواتـە هەسـتا و خـەڵکی تـێ بگەیەنـە کـە خیلافـەتت بـەمن داوە، سوفیانیش دەڵێ: خەڵکی ئاگاداربکەرەوە کە ئەم کاروبارەت بەمن داوە، ئەویش هەسـتاو چویە سەمینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کـرد و شـەعەبی دەڵـێ: منـیش ئەمبیـست پاشان فەرمووی: بەڕاستی باشترین ژیریەك لەخواترسانە، گێلترین گێلیش خراپەکاریە، ئەم خیلافەتەش کەمن و معاویە لەسەری جیاواز بووین مافی منەو لە بەرژەوەندی ئوممـەت و پاراستنی خۆییان بەوم داوە، یان ئەو بەمن شـیاوترەو منـیش پێمـداوە:﴿ وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾[الأنبياء:١١١]، هەروەها ئەو ڕیوایەتەی إبن سعد[١] و حاکم[٢] وأبـو نعـیم الأصـفهاني[٣] بیهقـی[٤] وإبـن عبـدالبر[٥]وەك ڕیوایـەتی لـە رشـەعبیەوە گێڕاویەتەوە، هەروەها ڕیوایـەتی ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەلیش لـە ڕێگـەی ئەنـەس إبـن سیرینەوە تەخریجی کردووە و دەڵێ: حەسەنی کوڕی علی ڕۆژێ لەگەڵ لەگەڵ معاویە قسەی کردووە وتویەتی: ((لەنێوان جابلص[٦]جابلق پیاوێك هەیە)) منـیش بەباشـی دەزانم نێـوان ئومەتی محمد(ﷺ) باش بکەم و خۆشم مافدارم بەوان، بەڵام بەیعەتمان بە معاویـە کـردووە و نازانم لەوەیە فیتنە بێ بۆ ئێوە. [٧] لەڕێوایەتی إبن سـعدو لـە ڕێگـەی عـەمری کـوڕی دینارەوە هاتووە:.. .حسن ووتویەتی: ئـەی خەڵکینـە، یەکـەمین کەسـێك بـووم ڕقـم لـە دەسەڵات وەرگـرتن بـوو، منـیش کۆتاییەکـەیم چـاك کـرد بـۆ خـاوەن مافێـك کەلـەمن مافدارترەو مافم بۆ گەڕاندەوە، یان مافێکە کردومەتە ئاشتەوایی بۆ ئومەتی محمد، تـۆش ئەی معاویە خوای گەورە ئـەم خیلافەتـەی پێـداوی بـۆ چـاکەیەك دەزانـی تیاتدایـە یـان خراپەیەك کە تیایدایە وتاقیت دەکاتەوە، (منیش نازانم یـان فیتنـە یەکـە بـۆ ئێـوە یـان

---

١ ـ الطبقات، تحقيق السلمي (٣٢٩/١).

٢ ـ المستدرك (١٧٥/٣).

٣ ـ حلية الأولياء (٣٧/٢).

٤ ـ دلائل النبوة (٤٤٤/٦).

٥ ـ الأستيعاب (٣٨٨/١ ـ ٣٨٩).

٦ ـ جابلص و جابلق دووشارن، يەكێكيان لە رۆژهەلآت و ئەويتريان لە رۆژئاواية.

٧ ـ فضائل الصحابة (٧٦٩/٢) إسناده صحيح.

خۆشیه)) پاشان دابەزی، بەڵام ئەو ڕیوایەتە کەئاماژە دەکات بەوەی عمروی کوڕی عـاص وأبو الأعور السلمي بە معاویەویەیان ووتوە: گەر فەرمانتکردایە حسن چوبایە سـەرمیبەر و ناڕوون و تروکی قسەی ئەکرد و خەڵکیش لێی ئەڕەوینەوە، معاویـەش دەڵـێ: وانەکـەن سوێند بەخوا پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینوە زمان و دەمی مژیوە، زمانێکیش تروك نـابێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژیبێتی، ئەوانیش لە معاویە بێزاربوون، بۆیـە حەسـەنیش چـویە سەرمینبەرو سوپاس وستایـشی خـوایکردووە....)) ئـەم ڕیوایەتـە لـە ڕووی ئیسنادەوە (باطلـة)، چـونکە ئیـسنادەکەی (ضـعیف) و مەتنەکەشـە (منکـر)ە[1] و معاویـەش ئەوەنەبووە توانای ڕەوانبێژی و ووتاربێژیەکەی حەسەنی نەزانیبێت.

لە ڕیوایەتەکەی (بلاذری) هاتووە کـە حـسن لەگـەڵ قـەیس چـووە لای معاویـە بـۆ بەیعەت دان، لە جورەیری کوڕی حازمشەوە دەڵێ: بیـستم محمـدی کـوڕی سـیرین دەیـوت: کاتێ حسن بەیعەتی بە معاویە دا، حسن سواربوو بـۆ چـونە نێـو سـەربازگەی و قەیـسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەشی لەپشتەوەی خۆی سـوارکردبوو، کـە چـونە سـەربازگەکەوە خەڵکی ووتیان: قەیس هات، قەیس هات، قـەیس هـات، کـە چـونە لای معاویـە حـسن بەیعەتی پێدا، و پاشان بە قەیسی ووت: بەیعەت بدە، قەیـسیش بەدەسـتی وت: ئاوەهـا، دەستێ بۆ معاویە بەرزنەکردەوەو معاویەش لەسـەرتەختی خـۆی بـوو، معاویـەش نزیـك بویەوە و دەستی بەدەستی قەیسدا هێناو، جورەیری کوڕی حازم دەڵێ: محمدی کوڕی سیرین بـۆی گێڕاینەتـەوە، وایکـرد پێبکـەنێ و قەیـسیش پیـاوێکی توانـاداربوو،[2] بەدەسـت هەڵگرتنی حەسەنی کوڕی علـی لـە خیلافـەت وبەیعەتـدانی بـە معاویـە (ﷺ) مـاوەی خیلافەتی پێغەمبەرێتی بەتەواوی کۆتایی پـێ دێـت کـە سـی سـاڵە و بەڵگـەش لـەوەدا فەرموودەی پێغەمبـەری خوایـە(ﷺ) کـە خیلافـەت سـی سـاڵە، پاشـان خـوای گـەورە پادشایەتی ئەهێنێ،[3] فەرموویەتی: ((الخلافة في أمتي ثلاثون سنة، ملـك بعـد ذلـك))،

---

١ ـ الطبقات، تحقيق السلمي (٣٢٥/١) إسناده ضعيف ومتنه منكراً.

٢ ـ أنساب الأشراف نقلاً عن مرويات خلافة معاوية، لا ١٥٤، إسناده صحيح.

٣ـ سنن ابي داود ومع شرح عون المعبود (٢٥٩/١٢) صحيح سنن ابي داود الألباني (٣/ ٨٧٩).

(خیلافەت لەئومەتەکەمدا سی ساڵە، پاش ئەوە پادشایەتیە))[1] إبـن کەسـیریش لەسـەر ئەو فەرموودەیە قسەی کردوەو دەڵێ: بە خیلافەتی حسن ئەو سی ساڵە تەواو بوو، دەست هەڵگرتنیشی لەخیلافەت بۆ معاویە لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چل و یەك، تەواوکاری سی ساڵە لەمردنی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، چونکە لەڕەبیعی یەکەمی ساڵی یـانزەی کۆچـی پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد، ئەوەش بەڵگەکانی پێغەمبەرە(ﷺ)[2] وەبەوەش حەسـەنی کوڕی علی پێنجەمین خەلیفەی ڕاشیدینە.[3]

## ـ گرنگی هۆکارو پاڵنەرەکانی ئاشتی:

هۆکارو پاڵنەرە جۆربە جۆرکان هەبوون بۆ ئەوەی حەسەنی ئـەمیری ئیمانـداران صـوڵح لەگەڵ معاویە(رضي الله عنه)بکات، لەوانەش:

### یەکەم: ئارەزووی پاداشت لای خوای گەورەو ویستی باشکردنی ئومەت :

حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) کاتێك نەفیری حضرمی ووتی: خەڵکی دەڵێن: تۆ خیلافەتت ئەوێت، وەڵامی دایـەوە و ووتـی: ئێـسك و پروسـکی عـەرەبم لەدەسـتدابوو، ئاشـتەوایی هەرکەسێکیان ئەکرد ئاشتەواییم بکردایە، جەنگی هەرکەسێکیشیان ئەکرد کە من جەنگم بکردایە، لەبەر ڕەزامەندی خوا دەستم لەخیلافەت هەڵگرت[4]، لەو وتارەشدا کە تیایدا بۆ معاویـە خیلافـەتی بەجێهێـشت، ووتـی: گـەر مـافی منـیش بێـت ئـەوە لەبەرژەوەنـدی ئەومیللەتە وازی لێ دەهێنم[5]، بێگومان حسن وویـستی ڕازیبـونی خـوای هـەبوو، بۆیـە ئامادە بو و پێداگیریکر، چونکە صوڵح لەئیسلامدا شوێنی گەورەییە، یەکێکە لە پیرۆزترین ڕەوشتە کۆمەڵایەتیەکان، لەبەر ئەوەی بەهۆیەوە جیاوازی ونـاکۆکی نـامێنێ، کەلـەڕووی مادی یان کۆمەڵایەتیەوە لەنێوان کارڕاپەڕێنەراندا دروست بێت و بە هۆیەوە خۆشەویستی

---

١ ـ سنن الترمذي مع شرحها تحفة الأحوذي(٦/ ٣٩٥ ـ ٣٩٧) وقال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح.

٢ ـ البداية والنهاية (٦/٨).

٣ ـ ماثر الأناقة(١/١٠٥)، للقلقشندي (١/٥٠)مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، لا ١٥٥.

٤ ـ البداية والنهاية(١١/٢٠٦).

٥ ـ المعجم الكبير للطبراني(٣/٢٦) إسناده حسن.

وبرایەتی دەگەڕێتەوە نێو ئەو کەسانەی ناکۆك بون، لەبەرئەوەی هەردوولایەنی ناکۆك ڕەزای ئەکات و دەماری ناکۆکی ئەبڕێ، بۆیە صولح یەکێکە لە گەورەترین داخوازییە شەرعیەکانە بۆ بەدیهێنانی برایەتی، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[ الحجرات: ١٠] تەنها برایەتیە ململانێ و ناکۆکی نێوانیان ناهێڵێ، بۆیە قورئان زۆرگرنگی صولح داوە فرمانی و پێکردوە، موژدە بەشوێنکەوتوانی دەدات.

١. فرمان کردن بەچاکسازی:

لەقورئانی پیرۆزدا هاتوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾[الأنفال:١]. هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٩) إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[الحجرات: ٩، ١٠] لەم ئایەتەدا دەبینین خوای گەورە فرمانی بەبەندەکانی کردووە کە پەیوەندی نێوان خۆیان باش بکەن لەو برایەتیەی لەنێوانیان دایە، هەروەکو خوای گەورە لەئایەتی سورەتی حجرات بەڕاشکاوی ئاماژەی پێکردووە:﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ....﴾[ الحجرات: ١٠]ئەبینین ئەم ئایەتەی هۆی فرمانکردن بە چاککردنی نێوان ئیماندارانی بەسیغەی (قصر) ڕونکردۆتەوە کە حاڵ وباریانی لە حاڵی برایەتیدا کورت کردۆتەوە، پتەو کردنی نێوموسڵمانان ئەو ڕەچەڵەکەی لەنێوانیاندایەو بۆیەك بنچینە دەگەڕێتەوە، ئەویش بنچینەی سەرچاوەی باوەڕە کەسەرچاوەی مانەوەی هەمیشەییە لەبەهەشتدا، بۆیە ڕستەی: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ ئاماژەیە بۆ بوونی پێویستی ئاشتی و چاکە خوازی نێوان ئیمانداران، لەم فرمانە قورئانیانە دەزانین کە چاکخوازی نێوان خەڵکی قسەی زیادنیە، بەڵکو فرمانێکی خوایی و ئەرکە لەسەر ئەوکەسانەی توانایان بەسەردا هەیە، تاکو برایەتی ئیمانداران نێو ئیمانداران بەهێز بکەن، لەگەڵ هاوکاریکردن لەسەر چاکەکاری و

خواپەرستی و فرمانکردن بەچاکەو ڕێگریکردن لەخراپە، خوای گەورە لەئایەتەکانی قورئان فرمانی پێ کردووە وڕوونیشە کەئەوئەرکە شەرعیانە لە پەیوەندیە کۆمەڵاتیەکانیاندا ئەرکە بەسەر ئیماندارانەوە، بەچاکەکاری نێو موسڵمانان و خەڵکی بەگشتی هەڵسن، بۆئەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی بەبرایەتی و خۆشەویستی بەڕێوە بچێت[1]، ئەوکارانەش پاڵنەری حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) بوون بۆ هەوڵدان بۆ چاکخوازی و ئاشتەوایی.

## ٢. ویستی هەستان بەچاکسازی:

خوای گەورە هەستان بەچاکسازی پاداشتی گەورەی داناوە کە ئەنجامدەرەکەی بەدەستی دەهێنێ لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلاحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً ﴾[النساء: ١١٤]پەیمانی لێخۆشبوون و سۆزیشی بەئەنجامدەرانی داوە، هەروەك دەفەرموویێ: ﴿وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِنْ تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً﴾[النساء: ١٢٩] لەم ئایەتەدا ئاماژەدەکات بۆ لێخۆشبونی خوای گەورە[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ خَافَ مِنْ مُوصٍ جَنَفاً أَوْ إِثْماً فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[ البقرة:١٨٢] لەم ئاماژەی تێدایە بۆ لێبوردن و ڕەحمەتی خوای گەورە بۆ چاکە خوازی، ئەویش بەڵگەیەی ڕەتکردنەوەی تاوان و سڕینەوەی بەهەردووسیفەتی لێبوردن وڕەحمەتە، ئەوەش ئاماژەیەکی گەورەو پیرۆزە[3] خوای گەورە وەسفی خۆی کردووە:﴿إِنَّا لا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ﴾[الأعراف:١٧٠].

## ٣. ئاماژەدان بە ئاشتەوایی و هەڵسوڕێنەرانی:

دوبارەبوونەوەی ئەو موژدەیە بەڵگەی گەورەیی شوێنی ئاشتی و چاکسازی یە لە نێو خەڵك لای خوای گەورە، بۆیە پاداشتی هەڵسوڕێنەری ئاشتی ئەو پاداشتە گەورەو

---

١ ـ أخلاق النبي في القرآن والسنة(٢/ ٩٧١).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٩٧١/٢).

٣ـ هەمان سەرچاوە.

مەزنەیە، فەرمایشتی خوای گەورەش بەڵگەیەکی ترە: ﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾، [النساء:١٢٨] وەسفکردنی ئاشتیش بەچاکە بەڵگەی پایە بەرزیەتی لای خوای گەورە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری گەورەی چاکەکاری و ئاشتەوایی نێو خەڵك، بەڵگەی ڕەوشت پیرۆزی کارپێکەرنیانە، بۆیە دیارترین ئەخلاقی پێغەمبەران بووە سەلامی خوایان لێ بێ، هەروەکو خوای گەورە لەسەر زمانی شوعەیب فەرموویەتی: ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْأِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾[ هود:٨٨] هەروەکو لەسەرزمانی موسا بۆ هارونی برای دەڵێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى لِأَخِيهِ هَارُونَ اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ﴾[ الأعراف:١٤٢] بەڵگەی ئایەتەکانی تر، ئاشتەوایی نمونەی ئەو دووئایەتە گشتیەدا، ئاشتەوای دونیاو ئاخیرەت لە خۆدەگرێ، هەروەها ئاشتەوایی نێوان خەڵکیش لە خۆدەگرێت کەلە کێشە و ململانێ ی بێبەش نیە [1]، ئەو داوا ومەبەستە قورئانیە پیرۆزەش پاڵنەری حەسەنی کوڕی علی بووە بۆ ئاشتی و هەنگاوەکانی پێغەمبەری باپیری (ﷺ) گرتۆتە بەر لەپێداگیری لەئاشتی و ئاشتەوایی، ڕۆژێکیان هەواڵی پێ گەیشت کە خەڵکی قوباعەرامبەر بە یەکتر وەستاونەتەوە بۆ کوشتن، پێغەمبەریش فەرمووی: بابڕۆین و ئاشتەوایی بخەینە نێوانیانەوە [2]، لەبەرگرنگی و گەورەیی ئاشتی لە نێو خەڵکیدا ئیسلام ڕێگەی داوە، درۆی تیایدا بکرێ، گەر هاتوو ئامانج لەو درۆیە ئاشتەوایی نێو دووناکۆك بێ، بێگومان پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((لیس الكذب الذي يصلح بين الناس فينمي خيراً أو يقول خيراً))، ((ئەکەسە درۆزن نیە کە ئاشتەوایی نێوان خەڵکی ئەکات و گەشەی پێ ئەدا یان چاکەیەك دەڵێ)) [3]، ئەورێگەدانەش لەبەرگەورەیی و ترسی ناکۆکی موسڵمانانە و خراپ بوونە لەگەڵ یەکدا، هەوەرك پێغەمبەر(ﷺ) ڕونیکردۆتەوە: ((إياكم والسوء الذات البين فإنها الحالقة))، ((ووریابن لە خراپبوونی پەیوەندیتان چونکە ڕامالەرە)) [4]، واتە: ئەو ڕەوشتەیە

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ البخاري، كتاب: الصلح، رقم: ٢٦٩٠.

٣ ـ أخلاق النبي في ضوء القران والسنة(٢/٩٧٩).

٤ ـ سنن الترمذي، رقم: ٢٥٠٨، قال عنه الترمذي صحيح غريب من هذا الوجه.

که پێویسته نەهێڵێت مەبەستی ئەوەیە کە سیفەتێکی خراپە و ئایین لـەنێوەبات هـەروەك چـۆن گـوێزان مووڵادەبـات[1] پێغەمبـەرە خـوا(ﷺ) ڕونیکردۆتـەوە کـە ئاشـتەوایی چ پاداشتێکی گەورەەی هەیە: ((ئایـە هـەواڵتان بـدەمێ کـە چ شـتێ پلـەی لەپلـەی ڕۆژوو سەدەقە زیـاترە؟)) ووتیـان: بـەڵی ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: ((چاکە و ئاشـتەوایی نێوانتـان و خـارپبوونی نێوانتـان))[2]، بۆیـە ئومێـد و ئـاواتی گـەورەی لـە ڕەچەڵەکی پیرۆزیدا لە دوای وەفاتی لە حەسەنی کـچەزای ڕوودەدات، لـەم فەرموویـەدەی لەأبوبکر (ﷺ) ڕیوایەتکراوە دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوام بینـی (ﷺ) لەسـەر مینبـەر و حەسەنی لەشانەوەیدا بوو، جارێ ڕویدەرکردە خەڵکی و جارێ ڕووی دەکـردە لای حـسن و دەیفەرموو: ((ئەم کوڕەم سەیدەو هیوام وایە خوای گەورە بیکاتە هـۆی ئاشـتەوایی نێـوان دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵمانان))،[3] بۆیە حەزی حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) لەپاداشت و وویستی بۆچاکسازی و ئاشتی پاڵیدا بۆئەوئاشتیە پیرۆزە.

## دووەم: ئەم کوڕەم سەیدەو ئومێدم وایە خوابیکاتە مایەی ئاشتەوایی نێوان دووکۆمەڵەی گەورەلە موسڵمانان:

پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆئاشتەوایی نێوان دووکۆمەڵی گەورەی موسـڵمانان، پاڵنەری حـسن بـوو بـۆ پـلان دانـان و خـۆ ئامـادەکردنی بـۆ ئاشـتی و زاڵبـون بەسـەر تەنگەژەکانی دێتەڕێگەی، بێگومان ئەوفەرموودەیە ووشەی ئاراسـتە و پێـشەنگی حـسن بوو، لەئاراستەو مامەڵەو بەرنامەی ژیانیدا و، لەدەرونیـدا گیرسـایەوە و بەسەرهەسـت و سۆزیدا زاڵ و تێکەڵ بەخوێن و گۆشتیشی بوو، لە ڕێگەی ئـەو ئاراسـتەیەوە قۆناغـەکانی بەشـکردووە و لەئەنجامەکەشـەی دڵنیـابوو، بێگومـان فـەرمووەی پێغەمبـەر پاڵنـەر و هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ پاڵدانی حسن ڕووەو ئاشتی.

---

١ـ جامع الأصول لإبن الأثير(٦/٦٦٨).

٢ ـ سنن الترمذي، رقم: ٢٥٠٩، وقال الترمذي حديث صحيح.

٣ ـ البخاري، رقم: ٧١٠٩.

## سێ یەم: پاراستنی خوێنی موسڵمانان:

حسن فەرمووی: ترسام لە قیامەت داحەفتا هەزاریان زیاتر یان کەمتر بێت و خوێنیان لێ بچۆڕێ و شکات لای خوا بکەن کە لەچیدا خوێنیان ڕژێنرا[1]؟ هەروەها فەرموویەتی: بێگومان بڕیارو فەرمانی خوا دێتە دی گەرچی خەڵکیش پێیان ناخۆش بێ، حەزم نەکردووە کاروباری ئومەتی محمد بگرمە دەست و تیایدا دڵۆپێ خوێن بڕیژرێ، زانیومە چەندە زیانم لێ دەدات بەر لەوەی قازانجی بۆم هەبێ[2]، لەووتارەش کە دەستبەرداری خیلافەت بوو بۆ معاویە فەرموویەتی: گەر مافی منیش بێت کە بۆ معاویە بەجێم هێشتوە ئەوا بۆ ئاشتەوایی ئەم ئومەتەو پاراستنی خوێنیان[3]، لەووتەکەی حسندا (رضي الله عنه) زۆر ترسانی لەخوا تێ بینی دەکرێ، ئەو ترسەی کە بۆ ئاشتی پاڵیدا، خوای گەورەش ستایشی پێغەمبەرانی (علیهم السلام) و دڵسۆزانی بە لەخواترسان ئەکات:﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَباً وَرَهَباً وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾[الأنبياء:٩٠]، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ﴾[الرعد:٢١] ترسی لەخوا مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ زانست و دوورکەوتنەوەی لەهەواو ئارەزوەکان ودڵڕەنجێنێ لە ڕووکردنە لای دونیا و بانگی دەکا ڕووە ودەست هەڵگرتنی لەدونیای لەخشتەبەر، بەبێ قسەی دەرون کە کاریگەری نیە لەوازهێنان لەکارە سەرپێچکاریەکان وکردنی گوێڕایەڵیەکان، حسن لە نزیکبونەوەی لەخواو ترسی لێ پێچینەوەی خوا لەقیامەت لەبەرامبەر ڕژانی خوێنی موسڵمانان ئەیویست خوێنی موسڵمانان بپارێزێت، گەرچی گەیاندیەوازهێنان لە خیلافەت، بەڵام پاڵنەرێك بوو ڕوەو ئاشتی، چونکە حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) مەترسی خوێن ڕژانی نێو موسڵمانانی ئەزانی، چونکە ئەوە مەترسیترین ئەو کارانەیە کە قەوارەی مرۆڤایەتی لەرزۆك دەکات، بۆیە حەرامە و هەڕەشەی لەسەر کراوە، زۆرێك لە دەقی قورئان و فەرموودەدا سزاکەی دیاری کراوە، کوشتن یەکەم شتێکە لە ڕۆژی قیامەتدا مرۆڤەکانی لەسەر دادگایی دەکرێ، ئەوەش بەڵگەی گەورەی کوشتنی مرۆڤ و ستەمکردنە لە پیرۆزی مرۆڤ، بوخاریش لە

---

١ ـ البداية والنهاية(١١/٢٠٦).

٢ ـ تاريخ دمشق(١٤/٨٩).

٣ ـ المعجم الكبير للطبراني (٣/٢٦) إسناده حسن.

عبدالله کوڕی مەسعودەوە(ﷺ) گێڕاوەیەتیەوە کە فەرموویەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((یەکەمین دادگاییکردنی خەڵکی لەسەرخوێنە))[1] بۆیە خوێن ڕشتن لە ڕۆژی قیامەتدا مەترسیەکی گەورەیە، کارکردن لەدونیاشدا بۆ پاراستنی یەکێکە لەمەبەستە شەرعیەکان((المقاصد الشرعیه))، بۆیە حسن پێداگر بوو لەئاشتی بەمەبەستی پاراستنی خوێنی موسڵمانان، ئەو شریعەتە ئیسلامیەی حسن تێ ی گەیشتبوو گرنگیەکی تەواوی بە پاراستنی خوێنی موسڵمانان داوە، بۆیە ئەو بڕیارەی داوە کە بەرژەوەندی بۆ هەیە وئەوەشی لاداوە کەبۆی خراپە، ئەوەش لەزۆر پاراستن دایەو دورخستنەوەی دەستدرێژیە لەبەرامبەری، چونکە بەڕووبەڕونەوەی دەرونەکان لەبەرامبەر تیا چووندا ئەوکەسە لەدەست ئەچێ کەبڕیارە خوابپەرستێ وبەو تیاچونەش ئەبێتە مایەی تیاچوونی ئایین، مەبەستی بەودەرونانەش کە ئیسلام گرنگی بەپاراستنی داوە دەرونەکانی پارێزراوە بە ئیسلام و جزیەیان بە ئەمانەوە[2]، بۆیە کەلەلایەن بەرهەڵستکارانی ئاشتیەوە بەحسن ووتراوە: ئەی نەنگی (عار)ی ئیمانداران، ئەویش دەڵێ: نەنگی و عاری و شەرمەزاری لەئاگرباشترە (للعارخير من النار) [3]، لەگێڕانەوەکەی إبن سعد هاتووە: من لەبەرامبەر ئاگری دۆزەخدا شەرمەزاریم هەڵبژاردووە،[4] تێ بینی دەکەین کە حسن گفتوگۆلەگەڵ شوێنکەوتەکانی دەکا و پاڵنەرەکانی ڕونەکاتەوە، هەوڵی قایلکردنیان دەدات، لەوکەسانە نەبوو حەزی لە سەرکردایەتی هەبێ، غەمی ئەوەی بێ گوێگرانی چی داوادەکەن، بەپێی بۆچون و تێگەیشتنی ڕاستەقینەی لە کاروبارەکان قسەی دەکرد و دووردەکەوتەوە لەوەی بەخەڵکی کاریگەر بێت، چونکە هەنگاوەکان ڕووەو ڕەزامەندی خوا وبەرژەوەندی موسڵمانانە، ئەمەش وانەیەکی گەورەیە بۆ زۆرێك لەسەرکردە ئیسلامیەکان لەوەی سەرکردە ئەوکەسەیە کەزۆربەی خەڵکی سەرکردایەتی ئەکات و بەرزیان دەکاتەوە ڕووەو ئامانجەکانیان، لەباردۆخی حەسەنیدا سەرکردەکان لەم نێوانانەن:

أ- ئەوەی جەماوەر داوای دەکات.

---

١ ـ البخاري، كتاب: الديات، رقم: ٦٨٦٤.

٢ ـ روضة الطالبين (١٤٨/٩) مقاصد الشريعة لليوبي٢١١.

٣ ـ تاريخ دمشق (٨٨/١٤).

٤ ـ الطبقات، تحقيق السلمي (٣٢٩/١)، إسنادەکەی زۆر لاوازە.

ب- ئەوەی گرنگی نادات وەلامی کەس نادات.

ت- کاری ڕاست و بالاکردی جەماوەر، ئەبینین حەسەنی کوڕی علی ڕێگەی سێ یەمی هەڵبژاردووە، کە کاری چاکەو وڕاست و بەرزکردنەوەی جەماوەرە و ڕووەو ئەو ئامانجە پیرۆزانەیە کەوێنەی کێشاوە، بۆیە هەستاوە بە پێشکەشکردنی بۆ چونێکی ڕوون وهەنگاوگەلێکی جێ بەجێکاری بەپێ ی قۆناغ و ڕەخساندن و دانانی مەرجەکان و زاڵ بون بەسەر تەنگەژەکان، گرنگی بەتێگەیاندنی جیاوازکارانی داوە تا لەبۆچونی خۆی تیان بگەێنێ.

## چوارەم: پێداگیری کردنی لەسەر یەکبونی ئومەت:

حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) لەیەکێك لەقۆناغەکانی ئاشتیدا ووتاری بۆ خەڵك دەداو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، من کینەم لەهیچ کەسێك لە موسڵمانان نیە، چۆن بۆخۆم ئەڕوانم و بیردەکەمەوە ئاوەهاش بۆ ئێوە بیردەکەمەوە، بۆچوونێکم هەیەو ڕەتی مەکەنەوە بەروومدا، ئەوەی لەکۆمەڵ ڕقتان لێەتی باشترە لەوەی لەپەرتەوازەییدا حەزتان لێەتی.[1] بەپشتوانی خوا ئەو یەکخستنە هاتەدی، پاشان حسن سوربوو لەسەر یەکخستنی ئومەت کە مەبەستێکی گەورەیە، بەمەبەستی پاراستنی خوێنی موسڵمان و دورکەوتنەوە لەخراپەکاری گەورو دەستی لەخیلافەت هەڵگرت، ئەوەش مەبەستی گەورەیە و خیلافەتی واز لێ هێنا، کە مانەوەی واتای بەردەوام بوونە لە فیتنە و خوێن ڕێژی و پەیوەندنی پچڕان، بەپشتیوانی خوا بەوازهێنانی لەشتێکی پوچی دونیا یەکبوونی ئومەت هاتە دی، تاوەکو ئەو ساڵە بەساڵی کۆمەڵ (عام الجماعە) ناسرا،[2] ئەوەش بەڵگەی تێگەیشتنی حەسەنە لەڕەچاوکردنی ئەنجامی هەڵسوکەوتەکان، ئەوتێگەیشتنەش ڕواڵەتەکانی لەقورئان دایە، خوای گەورە بڕیاری لەسەرئەنجام و دیمەنەکانی داوە، نمونەی ئەوەش:

١. ڕێگیرکردن لە جنێودان بە موشریکان.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْواً بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ [الأنعام: ١٠٨] سەرەڕای ئەوەی سوککردنی خوای موشریکان کارێکی ڕێگە

---

١ ـ الأخبار الطوال، لا ٢٠٠ .

٢ ـ إعتبار المآلات ومراعات نتائج التصرفات، لا ١٦٧.

پێدراوە، لەوەی سەرشۆڕی و هیچ و بەتاڵی و سەرخستنی ڕاستی تێدایە، بەڵام خوای کاربەجێ ڕوانینی خۆی لەم ئامانجە نزیکە، بەڵکو ڕوانیویەتە ئەنجامی ئەوکارە ڕەوایە و ئەو شوێنەوارە ناڕەواییەی لێەوە دروستە بێ، پاشان بڕیاری داوە خوای هاوەڵدانەران سووك و جنێو نەدرێ تا نەبێتە پاسەونەدان (سد الرزیعة) لەجنێودان بەخوا وەکو تۆڵەسەندنەوەی خوای خۆیان و سەرخستنی گومڕاییان، چونکە ئەوبەرژەوەندییەی کە لەجنێودان بەخواکەیان دێتەدی زۆرکەمتر لەو خراپییەی جنێوبەخوای گەورە بدەن، گەر(مفسدە) لەسەر بەرژەوەندی (مصلحە) زیاتر بوو، ئەوە لادانی ئەو خراپەییە پێش وەرگرتنی بەرژەوەندیەکە ئەکەوێ ((قُدِّمَ دَرْءُ المفسدةِ على جلب المصلحة)).[1]

۲. ڕێگیرکردن لەدەنگ بەرزکردنەوەی قورئان خوێندن لەنوێژدا:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾، [الإسراء: ۱۱۰] خوای گەورە ڕێگری لەخۆشەویستی خۆی محمد (ﷺ)) کرد لەنوێژ دەنگ بەرزبکاتەوە، نەك موشریکان گوێبیستی خوێندنەوەی قورئانەکە بن و ووایان لێ بکات جنێو بەخواو دین و قورئانەکەی بدەن[2]، إبن عباس لە (سبب نزول) ئەم ئایەتەدا دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك لەمەکە خۆی شاردبۆوە کافران کاتێك قورئانیان ببیستایە جنێویان بە قورئان و ئەوکەسەش دەدا کەدایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەر (ﷺ)، بۆیە خوای گەور بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ﴾، واتە خوێندنەوەت بەرزمەکەوە، چونکە هوشریکان ئەیبستن و جنێوی پێ دەدەن، ﴿وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا﴾، لەبەرامبەر ڕقکارانت کە نایبیستن، ﴿وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾.[3]

۳. خضرو نوقمکردنی کەشتیەکە:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْباً﴾[ الکهف: ۷۹]دەستدرێژی کردنە

---

۱ ـ هەمان سەرچاوە، لا ۱۲٤.

۲ ـ اعتبار المالآت، لا ۱۲٥.

۳ ـ أسباب النزول للواحدي، لا( ۲۲۳،۲۲٤).

سەرموڵکی کەسانیتر بەناڕەوا لەو کـارە قەدەغەکراوانەیـە کەلەئیسلامدا قەدەغـەکراوە، بـەڵام ئـەبینین خـضر ئـارەزووی نـوقمکردنی کەشـتیەکە ئـەکات کـە لەڕواڵەتـدا عەیبدارکردنێتی زیان گەیاندنەبەخاوەنەکەی، کاتێکیش موسا(علیه السلام) لـەو کـارەدا بەرپەرچی دایەوە فرمانی مامەڵەی جوانی دابەرانبەر بـەخاوەن کەشـتێەکە کـە بـێ کـرێ سواریان کردبوو، بۆی ڕوونکردەوە کە ئـەم خراپەیـە تـەنیا بـۆ دوورخـستنەوەی خراپـە و مفسەدەیەکی ترە، ئەویش داگیرکردنی کەشتیە کە بوو، چونکە پادشایەك هەیە و کەشتیە بێ عەیبەکان بەزۆری زۆرداری ئەبات، گومانیش نیە کردنـی زیانێـك یەکـسەر چارەسـەر دەبو، ئەگەر لادانی خراپیەکی گەورەی تێدابێ و، بـەکارێکی جـوان و باشـیش دادەنـرێ، شەریعەتیش دەروانێ و تێ بینی ئەنجامـەکان ولادانـی خراپیـە گـەورەکراوەکانی داهـاتوو ئەکات، خراپەی نقوکردنی کەشتیەکەو عەیبدارکردنی دەکرێ بەچاککردن فریـای بکـەوێ، بەڵام گەر کەشتیەکە برا، ئەوەلە هێنانەوەیدا ئومێدێك نیە.

٤. هەڵبژاردنی بچوکترین خراپە لە نێوان دوو خراپە، لەوانە نەکوشتنی دوو ڕووان، لە جابر کوری عبدالله(رضي الله عنه)، ووتوویەتی: لەغەزداربووین موهاجیرێك لەگـەڵ ئەنـصاریەك بوویە دەمەقالەیان وئەنصاریەکە ووتی: ئەی ئەنصاریەکان، موهاجیرەکەش هـاواری کـرد: ئەی موهاجیران، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هاوارانەی بیست و فەرمووی: ئـەوە چـیە؟ ووتیـان: موهاجیرێك قسەی بە ئەنصاریەك ووتوە ئەنصاریەکەش هـاواری بـۆ ئەنـصارەکان بـردووە موهاجرەکەش بۆ موهاجرین، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ((لـەوکارە دەسـت هـەڵبگرن ئاژاوە و پەشێویە)) جابر ووتی: لەهاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە ئەنصارەکان زۆربـوون پاشان موهاجیرین زیاتر بوونەوە، عبدالله کوڕی ئوبەیش ووتی: چـیە وەهایـانکرد زۆربـن؟ سوێند بەخوا گەر گەڕاینەوە مەدینە گەورو بەڕێزەکان لاوازەکان دەردەکەین، عمری کـوڕی خەتابیش(رضي الله عنه) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگـەم بـدە لـە گـەردنی ئـەم دووڕووە بـدەم پێغەمبەریش فەرمووی: ((وازی لێ بهێنە تاوەکو خەڵکی نـەڵێن محمـد هاوڕێکـانی خـۆی دەکوژێ))[1] کوشتنی دووڕوان وڕیشەکێشکردنیان و پاککردنەوەیان لەوەی خراپە بخەنـەوە

١ ـ البخاري،كتاب: التفسير، رقم: ٤٩٠٥.

لەڕواڵەتدا بەرژەوەندی موسڵمانی تێدایە، بەڵام لەبەرئەوەی متمانە بەموسڵمانان کەم ئەبێتەوە لەنێو خەڵکیدا ئەوترێت کە محمد هاودینانی خۆی دەکوژێت، بەڵام چاوداخستن لە کوشتنیان ئەبێتە بەرژەوەندیەکی باڵاتر لەبەرژەوندیەکەی تر کە ڕیشەکێشکردنیانە، سەرەڕای ئەوەی مانەوەی دووڕوان زیانی هەیە و هیچ ژیریەکیش ئەوە ڕەتناکاتەوە، بەڵام مانەوەیان لەو حاڵەتەدا باشترە، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاری لادانی خراپەیەکی گەورەی دابە خراپەیەکی بچووك[1]، هەروەها لەبەرچاوڕونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەڕەچاوکردنی ئەنجامی هەڵس و کەوتەکان و، وازهێنانی بوو لە نوێکردنەوەی کەعبە و خستنە سەر قەواعیدەکەی ئیبراهیم بوو (عليه السلام)، لەفەرموودەدا هاتووە لەدایکی ئیمانداڕانەوە عائیشە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی فەرمووم: ((لولا حداثة عهد قومك بالكفر، لنقضت الكعبة وجعلتها على أساس ابراهيم، فإن قريشاً حين بنت البيت استقصرت، ولجعلت لها خلفاً))، ((گەر قەومەکەت سەردەمیان بەبێباوەڕی نزیك نەبوایە، ئەوە کەعبەم سەرلەنوێ ئەهێنایەوە سەربناغەکەی ئیبراهیم[2]، لەبەرئەوەی کەعبەی پیرۆز گلێنەو دڵی موسڵمانانە و هەڵهاتنی مێژووی لانکەی پێغەمبەری سەرەتایە، بنچینەیەوایە لەسەر ئەوبناغەیە بمێنێتەوەکە پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) دایاننـاوە و بەجێیان هێناوە، بەڵام قورەیش کەلەسەردەمی نەفامیدا ویستیان کەعبە دووبارە نوێ بکەنەوە پارەی تەواو ولاخەکانیان نەبوو بونیاتەکەی دوبارەبکەنەوە، توانایان نەما و بەوشێوەیە ماوەیەوە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا بوو(ﷺ) دەرونی پێغەمبەریش تامەزرۆ بوو بۆتەواو کردنی ئەو کەم وکوڕیانەی لە سەروەتی قوڕەیشدا هەبوو، بەڵام وازی لەو بەرژەوەندیە بەدیهاتووە هێنا لەگەڕاندنەوەی بونیاتی کەعبە لەسەر ئەو بناغەیەی خۆی کە ئیبراهیم(عليه السلام) دانیابوو، لەترسی لەرزۆك بوونی ڕێزی کەعبە لەدڵان وڕاکردنی موسڵمانان لەئیسلام بەو بۆچونەی کە ئەوکارە بویریەکە بەرامبەر بەکەعبە لەدڵان و شکاندنی پیرۆزیەکەیەتی[3]، حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) تێگەیشتنی

---

١ ـ اعتبار المآلات، لا (١٣٨ ـ ١٣٩).

٢ـ البخاري، كتاب: الحج، رقم: ١٥٨٥.

٣ ـ رسالة الألفة بين المسلمين، لإبن تيمية، لا ٢٧.

قوڵی هەبوو بۆ ڕەچاوکردنی مامەڵە و هەلس و کەوتی کات و، ئەنجامی سروشتی پەروەردەبوونی بە قورئانی پیرۆز و سونەتی گەورەی پێغەمبەران، تێگەیشتوو بووبە مەبەستەشەرعیەکان (المقاصد الشرعیه) و تواناداربوو لەچەسپاندنی نێوان شەریعەت و ئەو واقیعەکرداریەی کە ئەوتێیدا دەژیا، ئیجتهادەکانی دەگمەن بوو، لەسیاسەتی شەرعیدا ئاسۆیەکی جوانی خستە نێو موسڵمانان، لە بەدەستهێنانی یەکبوونی ئوممەت و یەکخستنی ڕیزەکانی و هێزوگەڕاندنەوەی ڕۆڵە شارستانیەتەکەی، ئەم تێگەیشتنە وردو قوڵەش ئێمە لەژیانی ئیستاماندا زۆر پێویستمان بەتێگەیشتن و کارپێکردنێتی، بۆیە حەسەنی کوڕی علی بنچینەیەکی گەورەی بنچینەکانی ئیسلامیمان فێردەکات، کە پارێزگاریکردنی کۆمەڵە، دەستگرتنە بەئاینی خواوە پەرتەوازە نەکردنە ـ کەگەورەترین بنچینەکانی ئیسلامە ـ ئەوەیە خوای گەورە لەقورئانەکەیدا وەستێی پێکردووە، پێغەمبەریش(ﷺ) هەروەها عمر، بۆیە حەسەنی کوڕی علی هەستاوە بەدژایەتی کردنی پەرتەوازەیی و دووبەرەکی و بەئاراستە قورئانیە ئامانجدارەکان کاری کردووە بۆ یەکخستنی ئوممەت، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ (١٠٣) وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٤) وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٠٥) يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ [آل عمرا:١٠٣، ١٠٦]

## پێنجەم ـ کوژرانی ئەمیری ئیماندارن علی (ﷺ):

ئەوهۆکارانەی حەسەنی کوڕی علی ئەمیری ئیماندارانی بۆئاشتی پاڵدا، کوژرانی باوکی بوو، بێگومان کوژرانی بۆشاییەکی گەورەی خستە بەرەی عێراق و تیرۆرکردنەکەشی کاریگەری خستە دەرونی حەسەنەوە(ﷺ)، کوژرانەکەی دووناخۆشی گەورەی بەجێ هێشت، ئەم پێشەوا مەزنە بەبێ هیچ تاوانێك کوژرا و خەواریجیش ڕەچاوی گەورەییەکەیان لە ئیسلامدا نەکردووە، ئەو خزمەتە گەورانەشی کە بۆ ئیسلام پێشکەشی

کرد، بێگومان ژیانی ئەو کەڵە پیاوە پڕبەهاو پەندو کارکردن بوو لەکاتی جێ بەجێکردنی حوکمە شەرعیەکان لەئاستی گەل و دەوڵەتدا، علی(ﷺ) مامۆستایەك بوو لەمامۆستایەکانی ئیسلام و ڕووناکی و جیاکەرەوەی حەق و باتڵ بوو، بۆیە سروشتی بوو موسڵمانان بەلەدەست دانی کاریگەر بن و هەست بەو بۆشاییە گەروەیە بکەن کە جێی هێشت، بێگومان کوژرانەکەی نەهامەتی یەکی گەورەبوو بۆ موسڵمانان و خەمی پێدان، فرمێسك بەچاوانیاندا ئەباری، و زمانیان بەستایش و سۆزو بوو بۆ علی(ﷺ)، کوژرانی هۆکارێك بوو بۆئەوەی خەڵکی عێراق لای حسن پێویست نەبن، کەچی ئاژاوەو تەماح لەخشتە یانی بردبوو، لەڕێگەی ڕاست لایاندا بوو، جگە لەو دڵسۆزە ڕاستگۆیانەی بۆئاین و جێ نیشنە مەزنە کۆچکردووەکەیان(ﷺ)، بێگومان کوژرانەکەی لێدانێکی بەهێزبوو سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدی ڕوبەڕوی بویەوەو لە هۆکارانەی نەمانی بوو لەدواتردا.

## شەشەم: کەسێتی معاویە(ﷺ):

خیلافەت لەلایەن حەسەنی کوڕی عەلیەوە بۆ معاویە لەگەڵ ئەوەی زیاتر لەچل هەزار کەس بەیعەتی مردنیان پێ دابووە، ئەوە گەر معاویە شیاوی ئەو خیلافەتە نەبوایە ئەوا ئەو دەسەڵاتەی پێ نەدەداو جەنگی لەگەڵ ئەکرد[1] معاویە(ﷺ) لەبەر بێ کەسی سەرکردایەتی خەڵکی شامی نەدەکردوە، بۆیە مێژوو نوسەکان گەورەییەکی زۆری ئەم هاوەڵە پایە بەرزە دەگێڕنەوە، ئەمەی خوارەوەش هەندێ نمونەیەتی:

### ١. نمونەی قورئانی پیرۆز:

معاویە بەشداری غەزووی حونەین کردووە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْزَلَ جُنُوداً لَمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ [التوبة: ٢٦] معاویەش (ﷺ) یەکێکە لەوانەی بەشداری غەزووی حونەین کردوە، لەو ئیماندارانە بوو کە لەگەڵ پێغەمبەردا خوای گەروە ئارامی و خۆڕاگری و سەکینەتی بۆ داباراندن.[2]

---

١ ـ الناهية عن طعن أمير المؤمنين معاوية، لا ٥٧.

٢ ـ مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري، خالد الغيث، لا ٢٣.

٢.نمونەی فەرموودە:

دوعای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ معاویە، لەو پاڕانەوەیەش: ((اللّهم اجعله هادياً مهدياً واهد به))[١]، هەروەها فەرموویەتی: ((اللهم علم معاوية الكتاب والحساب وقه العذاب))،[٢] پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((أول جيش من أمتي يغزون البحر قد أوجبوا))، ((یەکەمین سوپایەکی ئومەتەکەم جەنگی دەریا دەکەن خوالێیان خۆش بووە))،[٣] أم حەرامیش دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لەگەڵیانم فەرمووی: ((یەکەمین سوپای ئومەتەکەم غەزوی شاری قەیسەر دەکەن خوا لێیان خۆشبووە)) ووتم: ـ واتە أم حرام ـ منیشیان تێدایە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی نەخێر[٤]، (المهلب)[٥]یش دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا جوامێریەکە بۆ معاویەیە چونکە یەکەمین کەسێك بوو جەنگی دەریای کرد.[٦]

٣.تێڕوانینی زانایان بۆ معاویە(رضي الله عنه):

أ-عبداللە کوڕی عباس بە إبن عباس ووترا: قسەت چیە لەبارەی معاویەی ئەمیری ئیمانداران کە خیلافەتی کردەیەك لایەنە، ووتی: ئەو فەقیهە.[٧]

- ستایشی عبداللە کوڕی مبارك:

ب - عبداللە کوڕی موبارەك دەڵێ:

معاویە لای ئێمە بەڕێزو دیار بوو، هەرکەسێکیان ببینایە بەخراپە باسیکردایەو بۆی بڕوانایە ئەوە بەتاوانبار بەرامبەر بەهاوەڵان تاوانبارمان دەکرد.[٨]

---

١ ـ صحيح سنن الترمذي للألباني(٣/٢٣٦).

٢ ـ موارد الظمآن(٧/٢٤٩) إسناده حسن.

٣ ـ فتح الباري(٦/١٢١).

٤ ـ البخاري، رقم: ٢٩٢٤.

٥ ـ المهلب بن أحمد الأندلسي، مصنف شرح صحيح البخاري،: ٤٣٥ ه مردووة.

٦ ـ فتح الباري (٦/١٢٠).

٧ ـ الفتح الباري(٧/ ١٣٠).

٨ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٢٨.

ج ـ ستایشی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

لەپێشەوا ئەحمەد(بە ڕەحمەت بێت) پرسیار کرا، خوا ڕەحمت پێکا چی دەڵێ لەو کەسەی دەڵێ: ناڵێم معاویە نووسەری وەحیە و ناشڵێم خۆشەویستی ئیماندارانی کردووە، چونکە بەشمشێر دەسەلاتی گرتۆتەدەست؟ [1] أبو عبدالله دەڵێ ئەوە قسەیەکی خراپ و ناشیرینە، لەوانەوە لەگەڵیاندا دامەنیشن، بۆ خەڵکیش کاروباریان ڕوندەکەینەوە. [2]

ح ـ ستایشکردنی معاویە(رضي الله عنه) لەلایەن قازی (إبن العربی)یەوە.

إبن العربی لەبارەی ئەو خو ڕەوشتانەوە قسەیەکردووە کە لە معاویە(رضي الله عنه) هەبوە: هەستانی بە پارێزگاری کردنی و پاراستنی سنور و چاککردنەوەی سەربازان و سەرکەوتنە سەر دوژمن [3] محب الدين الخطيب لەسەر ئەو دەقە زیادی کردووە دەڵێ: گرنگی و پەرۆشی معاویە لەوەدا هەڕەشەی لە پادشای ڕۆمی کردووە کەلەگەرمەی جەنگی لەگەڵ عەلیدا بوو لە (صفين) دا، پێ ی گەیشتووە پادشای ڕۆم بەهێزێکی زۆرەوە لەسنور نزیك بۆتەوە [4] لەوەشدا إبن کەسیر دەڵێ: پادشای ڕۆم دوای ئەوەی معاویە ترساندی و تێکیشکاند تەماعی کردبووە معاویە، کاتێك پادشای ڕۆم معاویەی بینی سەرقاڵی جەنگە لەگەڵ علی بەهاوڕێیەتی بەهێزێکی زۆرەوە نزیك بوویەوە و تەماحی کردە ئەو خاکەی لە ژێردەستی معاویەدابوو، معاویەش نامەیەکی بۆ نارد تێیدا نووسی: سوێند بەخوا ئەگەر دەست هەڵنەگریت و نەگەڕێتەوە وڵاتی خۆت، ئەوە خۆم و ئامۆزاکەم ئاشت دەبینەوە و دەدەین بەسەرتاو لە هەمووولاتدا دەرت دەکەین و زەویت لەسەر تەسك دەکەینەوە، لەوەوە پادشای ڕۆم ترساو نوێنەری بۆ ئاگربەست نارد. [5]

هـ- ستایشی إبن تەیمیە بۆ معاویە (رضي الله عنه):

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، ٢٨.

٢ ـ السنة للخلال، تحقيق عطية الزهراني(٢/٤٣٤).

٣ ـ العواصم من القواصم، لا ٢١٠، ٢١١.

٤ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٣١.

٥ ـ البداية وانهاية(٨/١١٩).

إبن تەیمیە لەو بارەیەوە دەڵێ: بە (التواتر) لە بارەی معاویەوە سەلماوە، ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو فەرمان کردنی بە کەسانی تر فەرمانی بە معاویە کردووەن لەگەڵیدا جیهادی کردووە، لە نووسینەوەی وەحیدا ئەمینی پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) و لەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) تاوانباری نەکردووە، عمری کوڕی خەتابیش کە باش پیاوی ناسیووە کردوویەتی بە والی، خوای گەورەش حەقی خستبووە سەر زاری و لە ولایەتەکەیدا تاوانباری نەکردووە.[1]

و ـ ستایشی إبن کثیر بۆ معاویە (رضي الله عنه).

إبن کەسیر لەبارەیەوە دەڵێ: موسڵمانان لەساڵی چل و یەکدا لەبەیعەتی کۆبونەوە.. .. لەوماوەیەدا هەتا ئەوساڵەی کەتیادا کۆچی دوایی کرد لەو کار و جیهاد لە وڵاتی دوژمن و بەرزکردنەوەی ووشەی خوادا وازی نەهینا، لەهەمووولایەکی زەویەوە دەسکەوتی بۆ ئەهات و موسڵمانان و لەگەڵیدا لەحەسانەوەو دادو لێبوردندا دەژیان[2]، و بێ فیزو سەرکردەو گەورە بوو لەنێو خەڵکی و بەخشندەو دادگەر بوو[3]، هەروەها لەبارەیەوە دەڵێ: ژیانیان جوان و لێبوردە و داپۆشەربوو، خوا بەزەیی پێدابێتەوە.[4]

٤. معاویە فەرموودەی ڕیوایەت کردووە:

معاویە(رضي الله عنه) بە یەکێ لەوکەسانە دەژمێردرێت کەڕێزی گێڕانەوەی فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگرتووە، هۆکاری ئەوەش هاوڕێیەتیکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە لە دوای فەتحی مەکە و ژن و ژنخوازیەتی و نوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە، معاویە سەدو سی وشەش فەرموودەی پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، بوخاری و مسلم لەسەر چوارفەرموودەیەکدەنگن، بوخاری چوارەمیانی داناوە موسلیمیش پێنج[5]، ژیانی معاویە (رضي الله عنه) لەگەڵ ژێردەستانی ولایەتەکایدا لەباشترین ژیانی والیەکان بووە، وەهای کردووە

---

١ ـ الفتاوى (٤/٤٧٢)، سير أعلام النبلاء (٣/١٢٩).

٢ ـ أفر إبن أبي الدنيا، وأبو بكر بن أبي عاصم تضيفاً في حلم معاوية.

٣ ـ البداية والنهاية(٨/ ١١٨).

٤ ـ هەمان سەرچاوە(٨/١٢٦).

٥ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، ٢٣.

خەڵكی خۆشیان بوێ، لەفەرمودەشدا لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕدراوەتەوە (صحیح)ە کەفەرموویەتی: (خیار أئمتكم_ حكامكم_ الذين تحبونهم، ويحبونكم وتصلون عليهم ويصلون عليكم، وشرأئمتكم الذين تبغيضونهم، ويغضونكم، تعلنونهم ويلعنونكم) باشترین دەسەڵاتدارەکانتان ئەوانەتان کە خۆشیانتان ئەوێ و ئەوانیش ئێوەیان خۆشەوێ ودوعایان بۆ دەکەن و ئەوانیش دوعاتان بۆ دەکەن، پەیوەندیتان لەگەڵ یەکدا بەهێزە، خراپترین دەسەڵاتداریشتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانە و ئەوانیش ڕقیان لە ئێوەیە، نەفرەتیان لێ دەکەن و نەفرەتتان لێ دەکەن.[1]

**٥.ووتەی ئەمیری ئیمانداران علی کوڕی ئەبو تاڵیب لەبارەی والیەتەکەیەوە:**

لە(سفيان بن الليل) ەوە دڵێ: کاتێك حەسەنی کوڕی علی لەکوفەوە بۆ مەدینە بەڕێکەوت بە حسنم ووت: ئەی سەرشۆڕکەری ئیمانداران، حسن ووتی: وەها مەڵێ: من بیستم باوکم ئەیووت: شەووڕۆژ ناڕوا تا معاویە دەگاتە دەسەڵات، منیش زانیم کەفرمانی خوا هاتۆتەدی و حەزم نەکرد لە نێوان من و ئەودا خوێنی موسڵمانان برێژرێ[2]، لەگێڕانەوەیەك لە عەلیەوە(ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: ڕقتان لە ئەمیرێتی معاویە نەبێ، سوێند بەخوا گەر لەدەستی بدەن ئەوە سەرانێك ئەبینن وەکو گوژاڵکە لەماندوویەتیدا دێتەدەر[3]، ئەوەش کۆمەڵە (أثر)ێکە بەڵگەی بەهێزی معاویە دەردەخات لە بەڕێوەبردنی ئیماندران دا شێوازی معاویە لەوتوێژکردن وەمامەڵە کردن لەگەڵ حسندا بەشداریەکی هاوبەشی دۆزیەوە لە گەیشتنە چاکسازیدا، گەر چی ئەندازیاری کرداری پرۆژەی ئاشتبونەوە (الصلح) حەسەنی کوڕی علی بوو، بەڵام کەسیەتی معاویە و ئاسۆ فراوانی و دڵ فراوانیەکەی و ئەو نەرمڕەویەی دەریخست، یامەتیدەری سەرکەوتنی ئاشتی بوو، معاویە(ﷺ) ڕێزی حەسەنی ئەگرت گەورەیی ئەهلی بەیتی ئەگێڕایەوە باسی ئەکرد، ئەوەش بەڵگەی خستنە ڕوی ماف و ڕاستیە لەتەك ئەو ململانێی و ناکۆکیەی کە پێشتر

---

١ ـ مسلم، کتاب: الإمارة، رقم: ٦٥.

٢ ـ تاریخ دمشق(١٢/١٠٥).

٣ ـ هەمان سەرچاوە (١٢/١٠٥).

بەقەدەری خوا ڕوویـدا. [1] ئیمـام ئەحمـەد لـە (مـسند) ە کەیـدا و لەڕێگـەی معاویـەوە تەخریجی کردووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) زمان و دەمـی حەسـەنی دەمـژی و خـوای گەورەش زمانێ یان دەمێ سزانادات کە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) مـژیبێتی[2]، هـەروەها معاویە لەتەك خۆیدا ڕاستگۆ و دانی دەنا بەتاوانەکانیدا و ئومێدی لێخۆشـبونی خوابـوو، لەیبنو شەهابەوە لەعورەوە ئەویش لـە (المسور)ەوە تـەخریجی کـە هاتۆتـەلای معاویـە و معاویەش دەڵێ: ئەی میسور تانەی تۆ چی بەگەورەکان (أئمە) کرد؟ ووتم: لەوە وازبهێنە، ئەوەباشترە کە بۆیمان کردووە، وتی: ناختم بۆ باسبکە چیم لـەلێ بەعـەیب دەگـری؟ ووتم: هەمووشتێکم ڕونکردۆتوە، ئەویش ووتی: لەتاوان بەری نیم ئەو چاکسازیەم بۆ نـاژمێردرێ کە بۆ بەرژەوەندی گشتی کردوومە، تاوانەکان ئەژمێردرێن و چـاکەکان واز لـێ دەهێنـی؟ ووتم: بەڵی، ووتی: بۆ خۆم دان بەهەموو تاوانێك دەنێم، تۆ تاوانێکت هەیە، لێ ی بترسی؟ ووتم: بەڵێ، ووتی: کەواتە چی وای لێکردووی لەمن شیاوتربی بە ئومێـدی خـوا، سـوێند بەخوا لەنێو هەمووشتێکدا هەرخوام هەڵبژاردووە، ئاینێکم هەیە کاری تیادا قبوڵدەکرێ و چاکەش پاداشت دەدرێ، عوروە دەڵێ: میسوەر باسی عاویەی بیستایەسەلامی بۆ ئەناردو بۆی ئەپاڕایەوە[3]پشت بەخوا باسکردنی معاویە بەدوورو درێـژیی دێ گـەر خـوای گـەورە بەمنەت و بەخشندەیی خۆی هێزی پێداین و لەبارەی دەوڵەتی ئەمەویەوە دوایـن، لەگـەڵ باسکردن لەبارەی معاویـە(رضي الله عنه) بەدوورودرێـژیی ئـەوەهیچ ڕێگرێـك نیـە لـەوەی ترسـی لـەخوای بـاڵا دەسـت ڕون بکەینـەوە کاتێـك لەدانیـشتنەکەیدا ئەوفەرموودەیـەی ئـەبو هورەیرە(رضي الله عنه) لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) باسکردەوە کەیەکەمین کەسێکی ئومـەتی محمـد ئـاگری دۆزەخـی پـێ گەرمـدەکرێ: قورئـان خـوێنێکی ڕیابـازەو بەخـشەرێکی ڕیابـازەو موجاهدێکی ڕیابازە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی بۆ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ڕونکردۆتەوە: ((ئەی ئەبو هوڕیرە ئەو سێ کۆمەڵەیە یەکەمین مەخلوقی خـوان ئـاگری ڕۆژی قیامـەتیان

---

١ ـ الناهية عن طعن أمير المؤمنين معاوية، لا ٥٧.

٢ ـ المسند، رقم: ١٦٨٤٨ إسناده صحيح.

٣ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٣٩٢).

پیێ گەرمدەکریێ))[1] معاویە کاتێ ئەوفەرموودەیەی بیست ئەیووت ئەوانە وەهایان کـردوە ئەنجامیان وەها بوو دبێ خەڵکانی تر چۆن بن؟ ڕاویەکەی دەڵـێ: پاشـان معاویـە زۆرگریـا تاگومانمـان بـرد مردبـێ پاشـان هاتـەوە هـۆش و دەمـو چـاوی سـڕی و ووتـی: خواپێغەمبەرەکەی ڕاستیانکرد: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لا يُبْخَسُونَ (١٥) أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[ هود: ١٥، ١٦].

بەڕاستی کەسایەتی معاویە(ﷺ) و مێژووەکەی لە ئیسلامدا یارمەتیـدەرێکی گـرنگ بوو بۆ سەرخستنی ئاشتیدا، وەهاش دانانین لەڕیزی خەلیفـەی ڕاشـیدیەکاندا بـن، بـەڵکو لەپادشا دادپەروەرەکان بووە، ژیانیامەکەشی پڕە لە تێگەیشتنی سیاسـی و کاریگـەری و سـەربازی و ئـابوری و کۆمەڵایـەتی، ئـەوەش پێویـستی بـە توێژینەوەیـەکی قـوڵی سەردەمەکەی هەیە و لەخواش داوامانە بۆ ئەوتوێژینەوەیە سەرمان بخات.

## حەوتەم: هەژانی سوپای عێراق و خەڵکی کوفە.

دەرچونی خەواریج کاریگەریان هەبوو لە لاوازکردنی سوپای ئـەمیری ئیمانـداران علـی کوڕی ئەبو تالیـب دا (ﷺ)، هـەروەها جەنگـەکانی (صـفین و جەمـەل و نـەهرەوانیش) خەڵکی عێراقیان لەجەنگ بێزارکردو لەبەرامبەر هەڵدەهاتن، بەتایبەت جـەنگی خـەڵکی شام لەصەفیندا، جەنگی ئەوان وەکو جەنگی کەسانی تر نەبوو، چـونکە جـەنگی(صـفین) لەهاڕو لەنێوبەر بوو، چـەندە منـداڵی هـەتیو خـست وژنـی بێـوەژن کـرد بـەبێ ئـەوەی مەبەستیان بێتە دی، گەر ئەوئاشـتیە نەبوایـە کـە علـی ئـەمیری ئیمانـداران و زۆربـەی هاوەڵەکانی پێشوازیان لێکرد، ئەوەکارەساتەکانی بەسـەر جیهـانی ئیـسلامیەوە خـەیاڵی شوینەوارو کاریگەری نالەباریەکانی نەدەکرا، بۆیە جارێکی تر سـستی نوانـد لـە ڕۆیـشتن لەگەڵ علی (ﷺ) بۆ شام جارێکی تـر بۆلایـەنێکیان بـاش بـوو، دەرونیـشیان ئـارەزووی دەکرد [2]، لەوتەنگەژەیەکە هێزی ئەمیری ئیمانداران علی (ﷺ) کەمکردەوە، دەرکەوتنی گروپێك بووکە عەلیان گەورە کردوە گەیاندیانە پێگەی خوایـەتی، تـا بـۆ هەنـدێك وەهـا

---

١ ـ رواه الترمذي والحاكم عن أبي هريرة، وصححه الألباني، رقم: ١٧١٣.

٢ـ خلافة علي بن أبي طالب، عبد الحميد علي، لا ٣٤٥.

دەرکەوت کە پەرچەکرداری خواریجەکان بـن ئەوانـەی لـەعلی بـەریبوون وبـەبێ باوەڕیـان دەزانی[1]، بەڵام ئەوکەسانە مەبەستێکی بۆگەنیان هەبوو، کە هێنـانی بـۆ چـونی هـیچ و خراپەکاری بۆ موسڵمانان بوو بەمەبەسـتی و ێرانکردنـی ئـاین و لاوازکردنـی موسـڵمانان بەگشتی بوو نەك سوپای علی بەتەنیا[2]، بەڵام وەك ڕونمانکردەوە علی ئەمیری ئیمانـداران بە هەموو هێزو تینێکەوە ڕوبەڕویان بوویەوە و، گومانیش نیـە کـە جیـاوازی خـەواریج و کوشتاریان زۆرێك لایەنی علی لاوازکرد، پاشان دوایی زۆرێك لە علی ڕەوینـەوە، (خریـت بن راشد) لەکۆمەڵەکەی پێشەواعلی دورکەوتەوە وتراوەکە ناوی (الحـارث بـن راشـد)بـووە لەوالیـەکانی علـی بـووە لەئـەهوازدا، بانگـەوازی لادانـی علـی کـردووە، زۆر کـەس دوایکـەوتوون ولاّتـی خـستۆتە ژێردەسـت و سـەروەت و سـامانی کۆکردۆتـەوە، علـی بەسـەرکردایەتی معقـل بـن قـیس الریـاحی سـوپایەکی بـۆ نـاردووە و تێکـشکاندووە و کوشتویەتی[3]، خەڵکانی خەراجی علی تـەماحیان کردۆتـە شـکاندنی خـەراج و خـەڵکی ئەهوازیش ڕاپەڕیوون، بێگومان علی لەوەدا ڕوبەڕووی هەندێ نارەحەتی دارایی وسـەربازی بۆتەوە، لەم لایەنەشەوە بەتایبەت لەشەعبی ڕیوایەتکراوە کاتێك علی خەڵکی نـەهرەوانی کوشتووە و جەنگیان لەگەڵ کردووە، زۆرێك کەس پێـچەوانەیان کـردو، خـەڵکانی خـەراج تەماحیان کردوە بۆیە ڕاپەڕین بووەو نەوەی (ناجیە) دژی وەستاون، (إبـن الحضرمي) یـش هاتۆتە بەسرە و خەڵکی ئەهوازیش ڕاپـەڕیون، خـەڵکانی خـەراجیش تـەماحیان کردۆتـە شکاندنی و سەهل کـوڕی حـەنیفی کـار ڕاپەڕێنـەری علـی کـوڕی تاڵیبیـشیان لـەفارس دەرکردووە[4]، حەسەنیش (ﷺ) خیلافەتی گرتە دەست سوپای عێراق شـلەژاو و خـەڵکی کوفەش لەکاریان دا دوودڵ بوون، لە (المجتبى)یـی إبـن دورەیدیـشدا هـاتووە: حـسن دوای مردنی باوکی هەستاو ووتی: سوێند بەخوا گومـان و پەشـیمانیمان لەخـەڵکی شـام نیـە، بـەڵکو بەسـەلامەتی و ئارامیـەوە جـەنگیان لەگـەڵ دەکـردن، بۆیـە سـەلامەتیەکە بەدووژمنایەتی پڕبوو، ئارامیش بەنارەحەتی و ئێـوەش لـە ڕۆیـشتن بـۆ (صـفین) ئاینتـان لەپێش دونیاتانەوە بوو، واتان لێهات بۆیە خۆتان و دونیاشتان لەپێش ئاینتانەوەیە، ئێمـە

---

١ ـ نظام الخلافة في الفكر الإسلامي، لا ١٥، ١٦، مصطفى حلمي.

٢ ـ خلافة علي بن أبي طالب، عبد الحميد، لا ٣٥٠.

٣ ـ تأريخ الطبري(٦/ ٤٧/٢٧).

٤ ـ تأريخ الطبري (٦/ ٥٣).

ئیستا بۆ ئێوە وەکو جارانین، کەچی ئێوە بۆ ئێمە وەکو جاران نین، ئێوە لە نێو دووکوژراوەدا بوون، کوژراوێك لە (صفین) بەسەریدا ئەگریان و کوژراوێك لەنەهرەواندا داوای تۆڵە سەندنەوەی بۆ دەکەن، ئەوی تریش کەمایەوە دۆڕان وگریاویش تۆڵە سێنن، ئێستاش معاویە بۆ شتێك بانگی کردوین وگەورەیی تێدانیە بۆ ئێمە، گەر مەرگیان بۆی ئەوە وەڵامی ئەدەینەوە، گەر ژیانیشیان بویٚ ئەوە لەهەموولایەکەوە لەو کۆمەڵەی قبوڵی ئەکەین[1]، لەڕاستی دا خستنە پاڵی ئەووتارە بۆحسن گومانم هەبوو، بەڵام وێنەی حەسەنی پێشەوامان و شوێنەکەوتووانی ئەکات لەوەی لەئاشتی نێوان خۆی و معاویەدا(ﷺ) پەلەی یکردووە، [2] حسن لەبارەی ئەوکارەوە قسەیکرد، کە هەندیٚ خەڵکی عێراق پێیان کردووە و ئەو خراپەکاریانەشیان کەبەسەریدا هێناویانەو قسەی خۆی ئاشکراکردو فەرمووی: سوێند بەخوا وەهای ئەبینم معاویە بۆمن باشترە لەوکەسانەی خۆیان بە لایەنگرم ئەزانن، ویستیان بمکوژن و سەروەتەکەم ببەن، سوێند بەخوا گەرپەیمانیٚ لە معاویە وەربگرم و خۆم کەس و کارم ئەپاریٚزریٚ وباشترە لەوەی بکوژرێم و کەس وکارەکەم لە نێو بچن، سوێند بەخوا گەر صولحم لەگەڵدا بکەم خۆشەویست ئەبم و باشترە لەوەی بکوژرێم و بەند بکرێم، یان منەتم بەسەر دا بکەن، منەتکردن بەسەرنەوەی هاشمدا کۆتاییە، هەروەها ووتوی: خەڵکی کوفەم بۆ دەرکەوت و ئەیانناسم، ئەوەیان کە خراپن بۆ من ناشێن و وەفایان نیەو لەقسەو کرداردا هیچ لەئەستۆ ناگرن وجودان و دەڵێن: دڵیان لەگەڵماندایە کەچی شمشێریشیان بەسەرماندا بەناوبانگە [3]، دوای ئەوەی باوکیان کوشت و هەوڵی کوشتنی خۆیاندا و سەروەت سامانەکەیان بەتاڵانبرد، حسن متمانەی بەخەڵکی کوفە نەما، لەوتارێکدا ئەوەی دەربڕی و ووتی: ئەی خەڵکی عێراق بەسیٚ شت وریا بومەوە، کوژرانی باوکم لەلایەن ئێوەوە و لێدانم و بەتاڵان بردنی سەروەت وسامانم، بە حسن ووتراوە: چی وای کرد صولح بکەی؟ وتی: ڕقم لە لە دزنیا بو بینیم خەڵکی کوفە هەرکەسیٚ متمانەی پیٚ نەکردبن بەسەریان دا زاڵ بووە، لەگەڵ یەك هاوڕا نین، باوکم بەهۆیانەوە توشی کارەساتی گەورە بوو، دەبیٚ دوای من بۆ کیٚ باشبن [4]، ئەو قسەیەش بە

---

١ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٢٦٩).

٢ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٩٣.

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا٣٧٩ نقلاً عن الاحتجاج للطبرسي، لا ١٤٨.

٤ ـ الكامل في تاريخ (٢/ ٤٤٨).

ڕەهایی نەبووە، چونکە دەکرا سوپای حسن بەهێزبکرایەوە و کۆمەڵانێکی زۆری سوپاکەی ئامادەی جەنگ بوون و لە سەر هەموویانەوە قەیسی کوڕی سعدی خەزرەجی و سەرکردەوکانی تریش بوون.

## هەشتەم: دەسەڵاتی سوپای معاویە(ﷺ):

لەلایەکی ترەوە معاویە(ﷺ) بەهەموو ئامرازە نهێنی و ئاشکراکان بۆ لاوازکردووی لایەنی خەڵکی عێراق لەسەردەمی عەلیدا(ﷺ)کاری دەکرد، بۆیە ئەو لێکترازانەی سوپای علی بەکارهێنا بەسەرکردایەتی عمرو کوڕی عاص(ﷺ) سوپایەکی ناردە سەرمیسر خستیە سەرشام، لەوەشدا هۆکارگەلێك یارمەتیدەری بوون.

لەوانە:

١. سەقاڵبوونی ئەمیری ئیمانداران علی بەخەواریجەکانەوە.

٢. کارڕاپەڕێنەرەکانی علی ئەمیری ئیمانداران (ﷺ) لەمیسر محمدی کوڕی أبو بکرە و قەیسی کوڕی سعدی کوڕی عوبادەی سعدی خەزرەجی لێزان نەبوون، بۆیە لەگەڵ ئەوکەسانەی داوای خوێنی عثمانیان دەکرد کەوتە جەنگەوە، وەکو قەیس لەگەڵیاندا نەدەجوڵایەوە بۆیە تێکیان شکاند.

٣. ڕێکەوتنی بۆچوونی نێوان معاویە و داواکارانی خوێنی عثمان لەمیسردا و ئەوەش یارمەتیدەری زاڵبون بووبەسەر میسر بوو.[١]

٤. دووری میسر لەدەسەڵاتی ئەمیری ئیمانداران علی(ﷺ) و نزیکی لەشامەوە.

٥. سروشتە جوگرافیەکەی کە لکاوە بەوڵاتی شام لەڕێگەی سیناوە کە درێژییەکی سروشتی بۆ بەدیاردەخات، میسریش هێزێکی مرۆیی و ئابوری گەورەی خستە سەر هێزی معاویە(ﷺ)، علی ئەمیری ئیمانداران بۆ بەرپەرچدانەوەی هێزێکی نارد[٢] معاویەش(ﷺ) بۆڕاکێشانی گەورەی هۆزەکان و کارڕاپەڕێنەری علی(ﷺ) هەوڵیدا، هەروەها هەوڵیدا قەیسی کوڕی سعد کار ڕاپەڕێنەری علی(ﷺ) لە میسر بەلای خۆیدا

---

١ ـ الطبقات لإبن سعد(٨٣٩/٣)، خلافة علي بن أبي طالب، عبد الحميد، لا٣٥١إسنادة صحيح.

٢ ـ تاريخ خليفة، لا ١٩٨ بدون سند.

ڕابكێشێ، بەڵام لەوەشكستی هێناو توانی و كەسانی دەروبەری علی و ڕاوێژكارانی بوروژێنێ و قەیس لابدات، لادانی قەیسی كوڕی سعد دەسكەوتێكی گەورەبوو بۆ معاویە، هەوڵی دا زیادی كوڕی ئوبەی كار ڕاپەڕینێ علی ئەمیری ئیمانداران(رضي الله عنه) لەفارسدا بۆ خۆی ڕابكێشێ، لەوەشا شكستی هێنا [1]، معاویە بەو بەڵێنانەی ئەیدا توانی هەندێ گەورە دەسەڵاتدارو والی كاریگەر بكات، بەو توانایەی هەیبو، تەنانەت علی لە یەكێك لەوتارەكانیدا دەڵێ: بەسر لەلایەن معاویەوە هەڵهاتووە، وایدەبینم ئەو كۆمەڵەیە سەربكەون، ئەویش بە كۆمەڵبونیان لەسەر داوا باتڵیەكەیان و و پەرتەوازەیی ئێوە لەبەرامبەر ڕاستیدا، بۆگوێڕایەڵیكردنی ئەمیرەكەیان و سەرپێچیكردنتان بۆئەمیرەكەتان، بەگەیاندنی لەئەمانەت و بەناپاكی ئێوە، فلانەكەسم كردە والی، تەنانەت وای لێهاتووە هەركەس دابنێم لەپەیوەندی بەمعاویەوە ئەترسێم، خوایە گیان لێیان تورە بووم و تورەیان كردم، خوایە لەمن ولەوانیش خۆش بە [2]، تەنانەت تا دوای كوشتنی علی ئەمیری ئیماندارانیش(رضي الله عنه) معاویە لەپەیوەندیكردن بەعێراق بەردەوام بوو، كۆمەڵە هۆكارێك هەبوو بۆ معاویە كۆبونەوە كە یارمەتیدەری هێزەكەی بوون، لەوانە: گوێڕایەڵی سوپاكەی و كۆبونەوەی خەڵكی شام لەدەوری و توانا كارگێڕیەكەی لەولایەت كەبەرژەوەندی ئومەتی تیادا ئەبینی.

### مەرجەكانی ئاشتی:

سەرچاوە مێژووییە كۆن و نوێكان باس لەهێنانەدی ئاشتی دەكەن بەپێ ی ئەو مەرجانەی هەردوو لادایان ناوە، ئەومەرجانەش لە نێو مێژونوسان پەرت بوونەو هەندێ لەزانایانیش هەوڵی كۆكردنەوەو ڕێكخستنیان داوە، بەوە پێ ی گەیشتوون هەوڵدەدەین ڕێكی بخەین بەوپێیەی توانایی خۆمان لەگەڵ قسەكردن لەسەرگشت بەندەكانی صولح .

---

١ ـ الإستيعاب (٢/ ٥٢٥ ـ ٥٢٦).

٢ ـ التاريخ الصغير للبخاري(١/ ١٢٥) بسند منقطع و له شواهد.

## یەکەم: کارکردن بەقورئان و سونەتی پێغەمبەر و ژیانامەی خەلیفەکان:

ڕیوایەتێکی بوخاری باس لەوەدەکات کەحسن پرسیاری لەشاندەکە نەکردووە ـ کە عبدالرحمن کوڕی سەمرەو عبدالله کوڕی علی بوون ـ، تەنها دەڵێ: ئێمە بەوە لە گەڵتداین، باسکردنی کارکردن بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا و ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدیەکان گونجاوە لەگەڵ ئەو حاڵەتە کە ئاشتی تیادا هاتە دی و جۆرێکە لەیادکردنەوەو پابەندکردنی معاویە بە قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ڕێبازی خەلیفەکانی ڕاشیدین، گونجاویش نین لەگەڵ ئەوڕایەی کەهەندێ مێژوونوس و لەنێوانیاندا مامۆستام دکتۆر محەمەد بەتایبەت بۆی ڕۆیشتون بەوەی باسکرنی ئەوقسەیە لەنێو مەرجەکانی ئاشتیدا بۆ ڕاستکردنەوەی تۆمەتبارکردنی معاویە بووە و ئەوەش لە نێوان مەرجەکانی ئاشتی هەردوولانەبووە.[1]

هەندێ لە زانایان ئەومەرجەیان باسکردووە، لەوانە إبن حجر الهيثمي، کە باسی ئاشتی نێوان حسن و معاویەی کردووە و تیایدا هاتووە ئاشتەوایی کردووە کە ویلایەتی موسڵمانانی پێبدات، بەومەرجەی کار قورئان و سونەتی پێغەمبەرو ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدینەکان بکات[2]، تەنانەت هەندێ کتێبی شیعەش ئەومەرجانەیان باسکردووە، ئەوەش بەڵگەی ڕێز دانانی حەسەنی کوڕی عەلیە بۆ أبووبکر و عمرو عثمان و علی و تا ئەو ئاستەی کردتیە مەرجێك لەمەرجەکانی بەسەر معاویەی کوڕی أبوسوفیانەوە(ﷺ) کە کار بەقورئان و فەرموودەو ڕێبازی خەلیفەڕاشیدیەکان[3]، لەنوسخەکەی تردا ـ خەلیفە چاکەکاران ـ هاتووە[4]، لەم مەرجەشدا ڕێکی بنچینەو بەرنامەی ژیانی دەوڵەتی ئەمەوی دا دەردەکەوێ، ئەو مەرجانەش شتێ تێدەگەین:

١. سەرچاوەکانی بڕیاردان لەسەردەمی خیلافەی ڕاشیدیدا:

---

١ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٨.

٢ـ الصواعق في المحرقة (٢/٣٩٩).

٣ ـ الشيعة وأهل البيت، لا٥٤.

٤ ـ منتهى الأمال (٢/٢١٢) نقلاً عن الشيعة وأهل البيت لا ٥٤.

أ ـ قورئانی پیرۆز:

پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلا تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيماً﴾[ النساء: ١٠٥]، بۆیە قورئانی پیرۆز یەکەمین سەرچاوەیە ئەو حوکمە شەرعیانە لەخۆ دەگریٚ کەپەیوەستن بەکاروباری ژیانەوە، وەك بنەما چەند بنەماوحوکمیٚکی یەکلاکەرەوەی لایەنی ژیانی لەخۆ گرتووە، هەروەها قورئانی پیرۆز گشت ئەوشتانەی ڕوونکردۆتەوە کە موسڵمانان پیٚویستیان پیٚیەتی.

ب ـ سونەتی پیرۆز:

سەرچاوەی دووەمە کە دەستوری ئیسلامی بنچینەکانی لیٚ وەردەگریٚت و لەڕیٚگەیەوە دەتوانریٚت شیٚوازەکانی جیٚبەجیٚکردنی بڕیارەکانی قورئان وەردەگیریٚت[1]، خوا فرمانی داوە گویٚڕایەڵی پیٚغەمبەر(ﷺ)بکەین، فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾[ آل عمران: ٣٢]، خوای گەورە مەترسی ئەو کەسەشی ڕوونکردۆتەوە کە پیٚچەوانەی فرمانی پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) بکات و فەرموویەتی: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[ النور: ٦٣]، سەرپیٚچی کردنی ئیماندارانی ڕەتکردۆتەوە کە پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاریٚك بدات: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً مُبِيناً﴾[ الأحزاب: ٣٦]، خوای گەورە فرمانی داوە لەکاتی ناکۆکیکی لەسەر کاریٚك بۆ پیٚغەمبەرەکەی(ﷺ) بگیٚڕدریٚتەوە: ﴿ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ ﴾[ النساء: ٥٩]، گەڕاندنەوەی کار لەکاتی ململانیٚدا بۆ لای پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) یەکیٚکە لەپیٚویستیەکانی باوەڕ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾[ النساء: ٥٩]، بۆیە سروشتیە سونەتی پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرچاوەکانی تەشریعی سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدینی بیٚت، بیٚگومان دەوڵەتی خیلافەتی ڕاشیدیی ملکەچی شەریعەت بوو، سەردەمی شەریعەتی ئیسلامیش تیایدا لەسەروی گشت تەشریع و یاسایەکەوەبووە، ویٚنەیەکی

١ ـ فقه التمكين في القرآن الكريم للصلابي، لا ٤٣٢.

پرشنگداری بوو، دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتی شەریعەت بوو بەهەموو دەزگاکانیەوە ژێرباری بڕیارەکانی ئەم شەریعەتەبێ، دەسەڵاتدارە و حاکمیش پەیوەستە بە بڕیارەکانەوە لەبەرامبەریدا سستی و زیادەڕەوی ناکات[1]، بۆیە لەسەردەمی خیلافەتی ڕاشیدی و لەکۆمەڵگەی هاوەڵاندا، شەریعەت لەسەرووی هەمووانە بوو، حاکم ومەحکوم پێەوەپابەند بوون، بۆیە أبوبکری سدیق ئەو گوێڕایەڵیەی لە ئومەت داواو دەکرد و بە گوێڕایەڵی کردنی خواو پێغەمبەرەکەیەوە پەیوەست دەکرد و ووتی: گوێڕایەڵم بن تاگوێڕایەڵی خوا پێغەمبەرەکەی دەکەم، گەر گوێڕایەڵی خوا پێغەمبەرەکەیم نەکرد، ئەوە گوێڕایەڵیکردنم لەسەر ئێوە نیە.[2]

٢. گرنگی سونەتی خولەفایی ڕاشیدین:

- هەر وەکو باسمان کرد - حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه)باش لەسەردەمی خیلافەتی ڕاشیدی تێگەیشتبوو، هەروەك باسمانکرد لەو پەندو وانەو سودانەی سەردەمی أبو بکری سەدیق و فاروق ذولنورین و علی باوکی (رضي الله عنه) سودی وەرگرتبوو، چونکە سەردەمی ڕاشیدی گرنگی سەردەمی پێغەمبەرو نزیکیەتی لێ دەگەشایەوە، سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدی درێژووبونەوەی سەردەمی پێغەمبەرایەتی بوو، لەگەڵ ئەوە پارێزگاریکردن لەگشت ئەوانەی لەسەردەمی پێغەمبەردا هاتبووەدی چەسپاندنی بەدەق واتای خۆشیەوە و بەردەوام پابەند بوون پێیەوە، هەروەکو سەردەمی ڕاشیدی ئەو ڕێکخستنە نوێیانەی دانا کە پەیوەست بوون بەدامەزراوەکانی دەوڵەت و ئومەتی ئیسلامی سودیان لێوەرگرت و بەڵگەش لەبەر گرنگی سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدین بەسە بۆ دەسەڵاتدارانی موسڵمانان، ئەوەشی لەڕێی خوا واریسێیتی وهەر میراتی خوایە و پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ((عليكم بسنتي وسنته الخلفاء الرشدين المهديين من بعدى)): ((بەسونەتی من خەلیفە ڕاشیدیە ڕێنیشاندەرەکانی دوای خۆم پابەندبن))[3]، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی

---

١ - نظام الحكم في الإسلام، لا ٢٢٧.

٢- البداية والنهاية (٦/ ٣٠٦).

٣ - سنن أبي داود(٤/ ٢٠١)، الترمذي (٥/ ٤٤) حسن صحيح.

((اقتدوا بالذين من بعدى أبى بكر وعمر)): ((چاو لەم دوانە دواى مـن بكـەن أبـو بكـرو عمر)).[1]

**٣. بنەمایەکانی خیلافەتی ڕاشیدین.**

أ - خەلیفـەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) لـەبڕیارو مامەڵـە و ڕەچـاوکردنی دەوڵـەت و چارەسەرکردنی ڕووداوەکان ئیسلام سەر چاوەی موسڵمانان بڕیاریان بوو.

ب - هیچ کەسێکیان بە خۆسەپاندن کاری موسـڵمانانی نەگرتۆتـە دەسـت، هـەر لـە أبوبکرەوە تاوەکو علی، بەڵکو بەڕاوێژی مسولّمانان بووە، بـەڵام ئەوڕاوێـژە وێنەگـەلێکی جۆربەجۆری لە خۆگرتووەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیـسلام لـە هەڵبـژاردن و دیـاریکردنی خەلیفـەدا چـۆنیەتیەکەی نەسـەپاندووە، بـەڵکو چـۆنیەتیەکەی باسـنەکردووە بـەجیّ ی هێشتووە.

ج - دوای هەڵبژاردنی سەرچاوە گرتوو لە شورادا، بەیعەتدان بەخەلیفـە بەئاشـکرا بـو، گویّ بەو کەسانە نادریّ کەپەشێوی دروست دەکەن، گرنگ ئەوەیە زۆربەی ئومـەت پـیّ ی ڕەزامەندە و گەر بەیعەتیش درا نابیّ هەولّوەشێندرێتەوە کوفرێکی ئاشکرا (کفر بواح) لەو خەلیفەیە دەرکەویّ.

د - ئوممەت بەرپرسیارە لەگشت هەڵس وکەوتەکانی خەلیفە هەرلە کاروبـاری داریـیـەوە تا کاروبارەکانی سیاسەت و دەسەڵات و ولایەت، بـەڵام ئـەوەش لـە چوارچـێوەی ئیـسلام سنوری بۆ کێشاوە و لە ڕێگەی (أهل الحل و العقد)ەوە دێتەدی و نابێت ئومەت بەشـێوەی هەڕەمەکی بێتە دەنگ، چـونکە دەبێتـە مایـەی پەشـێوی و بـڵاو بونـەوەی دەنگۆکـان، هەروەکو لەفیتنەی عثماندا(رضي الله عنه) ڕویدا.[2]

بنەمای لێپرسـینەوە لـە دەسـەڵاتدار و مـافی ئومەتـە لەچـاودێرێکردنی دا، خەلیفـە ڕاشیدینەکان بە کردارو قسەیان بڕیاریانداوە، ئەوە أبـو بكـرى سـدیقە ئەفـەرمووێ: گـەر

---

١ - صحيح سنن الترمذي للالباني(٣/ ٢٠٠).

٢ - الخلفاء الراشيدين أعمال وأحداث، د. أمين القضاة، لا ١٣.

باشمکرد پشتیوانم بن و گەر هەڵەشمکرد ڕاستمبکەنەوە[1]، عمر دەڵێ: خۆشەویسترین کەس بەلامەوە ئەوکەسەیە عەیبەکانم پێشان بدات[2]، هەروەها دەڵێ: دەترسم هەڵە بکەم وەکەسێ لەئێوەش هەڵەکەم ڕاست نەکاتەوە [3]، عثمان دەڵێ: گەرلەقورئاندا بینیتان پێم بخەنە کۆتەوە، ئەوە پێم بخەنە کۆت و بەندەوە.[4]

علی (ﷺ) فەرموویەتی: ئەم کاروبارەی ئێوە تەنیا هی خۆتانە و منیش بێ ئێوە هیچ نیم[5]، بۆیە لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا لە ملکەچی بۆئومەت و مافی چاودێری کردنی دەسەڵاداران ئیش ئەکرا و کەسێکیش ئەوەی ڕەت نەکردۆتەوە و کۆدەنگی لەسەر بووە[6]، هەروەها هاوەڵاْن لەسەردەمی خیلافەتی راشیندیندا یەکدەنگن لەسەر ئەوەی (حاکم) و (محکوم) دەسلاتدارو دەسەڵات بەسەر کراو هاولاْتی یەك واتای هەبووە، ئەوەش تیگەیشتنی تەواو ولە قورئان وڕیگەی کارکردن بە سوننەت.[7]

هـ ـ خەلیفە بۆی هەیە ئەو کارەی دەقی لەسەرنیە، ئەویش لەژێر ناوی دروشمەکانی (المصالح المرسلە) و(شورادا) بەگوێرەی ئەوی لەهێنانەدی بەرژەوەندی گشتیدا وەگونجاوی ئەزانێ.

هەروەك أبوبکر لەکۆکردنەوەی قورئان و عمر لە (أرض السواد) وکاروبارە ڕێکخستنەکانی وەك دیوان وجوندو خەراج و عثمانیش قورئانی کۆکردەوە ناردیە هەرێم و شارەکان

و- جیاوازی زنیانی ئومەت شتێکی سروشتیە، بەلاْم لەژێر سایەی برایەتی و ئامۆژگاری و گەڕان بەدوای بەرژەوەندی ئومەتدا بێ، چونکە جیاوازی عەقلەکان جیاوازی بیروبۆ چونەکان ئەخاتەوە، هەروەکو لەسەقیفەی بەنی ساعیدە جەنگی هەڵگەڕاوەکان و

---

١ ـ البداية والنهاية (٦/٣٠٥).

٢ ـ الشيخان أبو بكر و عمر من رواية البلاذري، لا ٢٣١.

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٢٣١، نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين، لا ١٩٨.

٤ ـ مسند أحمد الموسوعة الحديثية، رقم: ٥٢٤ ثبت إسناده إلى عثمان.

٥ ـ تاريخ الطبري (٥/ ٤٤٩، ٤٥٧).

٦ ـ الدولة والسيادة في الفقه الإسلامي فتحي عبد الكريم، لا ٣٧٨.

٧ـ علي بن أبي طالب، للصلأبي(١/٣٤٥).

کۆکردنەوەی قورئاندا ڕوویدا، پێویستە ئەو جیاوازیە نەگاتە پەرتەوازەکردنی ئوممەت، چونکی ئەبێتە مایەی شکست و لەوەشداحاڵ نیە، بڕیاریش لەوەدا قورئان و سونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ).[1]

ز- ئەکرێت ڕوخسارەکانی خیلافەتی ڕاشیدی لەسیستەمی سیاسیدا لابدرێتەوەلای مەرجەعیەتی باڵای قورئان و سوننە، دەسەڵاتی شەریعەت، دەوڵەتی یاسا، حاکمێکی هەڵبژرداوە، بەیتول مال بۆ ئوممەتە نەك بۆ حاکم، سیستەمی شورا گشتگیرەو ئالیەتی ڕەزامەندی نێو ئەندامەکانی کۆمەڵگەیە لەبونیاتنانی کۆمەڵایەتیدا لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدی لەکۆی خۆیدا تایبەتمەند بوو، ئامادەی باوەڕیانەو هێزی ئامۆژگاری ناوەخۆیانە جەنگکردن دژبەڕگەزپەرستی و ئامادەیی تەواوی مرۆڤی موسڵمان و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ بەگشتی پارێزگاری کردنی یەکبوونی ناوخۆییو پاراستنی سنوری دەوڵە ت وبەر پرسیاریەتی شارستانیەتیش لەسەر هەموان بوو بەحاکم و مەحکومەوە، ئەوەشە بنەچینەو چەمکە بنەڕەتیەکان، کە بووبەنمونەو پێوەر لەهەموو سەردەمەکاندا، موسڵمانەکانیش بەوشەی خیلافەتی ڕاشیدین ناویان بردووە، تاوەکو لەهەموو شێوەکانی دەسەڵاتی تردا، جیاوازبێ.[2]

بۆیە حەسەنی کوڕی علی صولحەکەیدا لەگەڵ معاویە(ﷺ): کارکردن بەقورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) وڕێبازی خەلیفە ڕاشیدیەکانی بەمەرج دانا.

## دووەم: سەروەت و سامان:

بخاری لە(صحیحە) کەیدا باسیکردووە کە حسن بە شاندەکەی معاویەی ووت: کە عبدالرحمن کوڕی سەمرەو عبداللە کوڕی عامری کوڕی کریز بووە: ئێمە نەوەی عبدالمطلب لەسەروەتدا بەشمان هەبووە، بەڵێنم پێ دەدەن؟ ئەوانیش ووتویانە لەوەدا ئێمە لەئەستۆی دەگرین کە بۆت دەستە بەربێت.[3]

---

١ـ هەمان سەرچاوە. (١/٣٤٥)

٢ ـ الذاكرة التاريخية للأمة، د. قاسم محمد، لا ٧٠.

٣ـ البخاري، كتاب: الصلح، رقم: ٢٧٠٤.

حسن لەبارەی سەروەتەکەیەوەدوواوە کە پێشتر بۆ خۆی و کەسانی تر بووە، حسن دەیەوێ کە معاویە لەو سەروەتەدا وانەکانت و باس لەسەروەتێك نیە کە معاویە بیدات[1]، (إبن أعثم) باسیکردووە دەڵێ: حسن وتی: سەبارەت بەسەروەت و سامان ئەوە معاویە بۆی نیە مەرجم بۆ دابنێ[2]، ڕونیشەکە هێنانی خەراج و وەرگرتنی لەکارەگرنگەکانی دەوڵەت، لەم ڕووەوەشەوە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان حسن و خەڵکی بەسرەدا نیە، بەڵام ئەو ڕیوایەتە ئاماژە دەکات ئەوەی خەراجی برد لەو سەروتە نەبووەکە بۆ حسن نێردراوە وخەڵکی بەسرەش داوای پشکی خۆیانیان تیادا کردووە[3]، ئەگێڕنەوەحسن بە معاویەی ووتوە: من قەرزم لەسەرە، بۆیە ئەویش لەبەیتول مال چوارسەدهەزار یان زیاتری بۆداناوە[4]، إبن عەساکیر ئەگێڕتەوە: لەبیتول مالدا پارەی پێدراوە و ئەو قەرزو بەڵێنانەی بەجێهێناوە کە بەڵێنی پێدابوو، خەرجی خۆی و کەس و کارەکەشی پێ بەجێ هێنا[5]، هەندێ لە مێژوونوسان وەهای بۆ دەچن هۆکاری هێشتنەوەی پێنج ملیۆن درهەمی بەیتولمال بۆ خۆی بۆ جەنگاوەرەکانی خۆی بووەو بەسەریاندا دابەشی کردووە و بۆ بژێوی خۆی و هاوەڵانی دانابوو[6]، گومانیش لەوەدانیە دابەشکردنی سەروەت وسامان بەسەریاندا زۆر نارەحەتی و ڕاڕاییان کەم دەکاتەوە، ئەوەش کەلە گێڕانەوەکەی بوخاریدا هاتووە ئەو بۆچونەیەکە وەك بۆچونی منە، ئەو ڕیوایەش ئاماژە بەوەدەکات کە معاویە سالآنە ملیۆنێ دەرهەمی بەحسن داوە، دووملێونیش بۆ حسین، لەبەخشین و لەپەیوەندی دا بە نەوەی هاشمیەوە لەنەوەی عبدالشمس حسن بەڕێزترو لە پێشتر دانابێ[7] وەك ئەوە وەایە حسن خیلافەتی بە معاویە فرۆشتبێ، ئەو ڕیوای و لێکۆڵینەوانە کە لەبارەیەوە ووتراوە جێ متمانەو پشت پێ بەستن نین، چونکە هەستی

---

١ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٤.

٢ ـ الفتوح (٣/ ٢٩٣).

٣ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٤.

٤ ـ تاريخ الإسلام، عهد معاوية، لا ٧.

٥ ـ تاريخ دمشق (١٤/ ٩٠).

٦ ـ في التاريخ الإسلامي، شوقي أبو خليل، لا ٢٦٨.

٧ ـ الأخبار الطوال، لا ٢١٨.

حسن بۆ بەرژەوەندی ئومەت لەبەرامبەر بەرژەوەندیە تایبەتیەکاندا لاواز پێشاندەدات[1]، مافی بەخشندەیی تەنیا وەکو یەکێ لە موسڵمانان بووە، گەر پشکی لەکەسی تر زیاتر بێ ئەوە ڕێگری نیە، بەڵام ناگاتە یەك لەسەر دە ڕیوایەتەکان باسیان دەکەن.[2]

سێ یەم: خوێن

ڕێکەوتنی ئاشتی نێوان هەردوولا ئەوە لەخۆ دەگرێت گشت خەڵك پارێزراون و لەخۆڕا لێپێچینەوە لەگەڵ کەس ناکرێ، لە ڕیوایەتی بوخاریدا هاتووە حسن بەشاندەکەی معاویەی ووت: ئەم ئومەتە لەخوێن گەوزا، بۆیە شاندەکەش لەگشت ئەوانە خۆش بوو دەستیان لەخوێن ڕشتندا هەبوو گرنتی ئەو پاداشتەشیان بەحسن دا[3]، بەڵام گێڕانەوەی زەهری باسی لەوە کردووە کە عبیداللە کوڕی عباسی سەرکردەی سوپاکەی حسن کاتێك زانیویەتی حسن چی لە معاویە دەوێت، کەسی ناردۆتە لای معاویە و داوای پارێزراوی کردووە و مەرجی پارێزراوی داناوە، مەرجی پارەی بۆخۆی ویستووە، پاشان شەوێك دەرچووە و خۆی بەوان گەیاندەوە، قەیسی کوڕی سعدی کە لەجێگەکەی خۆی داناوە خۆی وسوپا پەیمانی کوشتنی معاویەیان دا، تاوەکو بۆ کۆمەڵەکەی علی پارەو خوێنیان دەستەبەربکرێت [4]، (فلهوزن)ی ڕۆژهەڵاتناسیش هەوڵیداوە ئەو تۆمەتە پوچە بە عبداللە کوڕی عباسەوە بلکێنی و، دەڵێ: سەکردەی سوپا عبداللە کوڕی عباس بووە، (فلهوزن) لەو قسەیەدا پشتی بەستووە بەوناوەی کەلەهەندێ دەستنوسەکانی مێژووی تەبەریدا ناوی عبداللە کوڕی عباس هاتووە، جیاوازی دەستنوسەکانیش لە عبداللە و عبیداللە دا سەرچاوەی نوسەرنیە، بەڵکو ڕاویەکانەکە ئەیانەوێ ئەو شەرمەزاریە بە عبداللە کوڕی عباسی باپیری عباسیەکانەوە بلکێنن کە براکانی عبیداللە بەلایانەوە ئاسایی بوو بێ بەرگری لێ نەکەن [5]، مێژوو دەڵێ: سەرکردەی سوپا حەسەنی کوڕی علی بووە،

---

١ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٣.

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ البخاري، كتاب: الصلح(٢/ ٩٦٣).

٤ـ تاريخ الطبري(٥/١٦٣. ١٦٤).

٥ ـ تاريخ الدولة العربية، لا ١٠٣، ١٠٦.

سەرکردەی پێشەنگی سوپاش قەیسی کوڕی سعد بووە ناوی عبداللە کوڕی عباس و عبیداللە برای لەم بارەوە باس نەکراوە[1] تەنیا ئەو ڕیوایەتە لاوازەکان ئەوەباس دەکەن کە بەڵگە نابن، هەروەك لە لایەن أبی حنیفەالدینوری لە (الأخبار الطوال)[2]، إبن حجر لە (المطالب العالیة)[3]، إبن الأعثم لە (الفتوح)دا [4] هاتووە، هەڵسوڕێنەری سوپا حەسەنی کوڕی علی قەیسی کوڕی سعد بوونە و باسی عبداللە کوڕی عباس و عبیداللە کوڕی عباس نیە[5]، فلهوزن دوپاتی دەکاتەوە عبداللە کوڕی عباس سەرکردەی سوپاو بووە نەك عبداللە و پێداگریشی وەك ئاماژەی پێدرا پێچەوانەیە بەو گێڕانەوەیەی زیادبن عبداللە البکائی و ئەویش لە (عوانة بن الحکم)ەوە کە بەخۆشەویستنی عباسیەکان تاوانبار ناکرێت دەڵێ: عبیداللە کوڕی عباس والی علی بووە لەیەمەن، کاتێك بیستویەتی (بسربن أرطاة) بۆی هاتووە عبیداللە کوڕی عەبدی لەجێ ی خۆی داناوەو بۆ کوفە بۆلای علی هەڵاتووەو ئەو ڕوداوەش لەساڵی چلی کۆچی بوو، علی سوپایەکی دژ بەسوپای (بسر) بۆ یەمەن ناردوو و لەهەمان ساڵدا علی شەهیدکرا، هیچ ڕیوایەتێکیش نیە ئاماژەبەوە بکات بەوەی عبیداللە کوڕی عباس بەرەو یەمەن کوفەی بەجێهیشتبێ[6]، گەر سەرکردەی سوپاش عبداللە کوڕی عباس یان عبیداللە یان هەر کەسێکی تربێت ئەوە هیچ پاڵنەرێك نیە تاوەکو سەرکردەی سوپاکەی حسن پەیوەندی بکات بە معاویەوەو داوای پارێزگاری بکات، وەك لای بوخاری هاتووە سوپای حسن بەهێزبووە، حسن سەرکردەکانی بۆ ئاشتی و دەست هەڵگرتنی بۆ معاویە تێگەیاند بوو، فرمانی پێ کردن بچنە نێو کۆمەڵ و بەیعەت بدەن بەمعاویە، قەیس وهاوەڵاکانی لەگەڵی دابوون کە بینیان لەگەڵ پێشەواکەیان نەماون پێویستیشە گوێڕایەڵی بکەن وازیان لەجەنگ هێناو بەیعەتیان بەمعاویەداو تێکەڵ بە

١ ـ تاريخ الطبري(٥/ ١٥٩ ـ ١٦٠).

٢ ـ الأخبار الطوال، لا ٢١٧.

٣ ـ المطالب العالية(٤/٣١٨، ٣١٩).

٤ ـ الفتوح(٣/٢٨٩).

٥ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٦.

٦ ـ تاريخ الطبري (٥/١٣٩، ١٤٠) دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا٦٦.

کۆمەڵ بوون [1]، بێگومان حسن مەرجی لەسەر معاویەدانا کە لەسەرهیچ شتێك داوای هیچ کەسێکی خەڵکی مەدینەو حیجاز و عێراق نەکات.[2]

ئەوەی مێژوونوس تێبی دەکات ئەوەیە لەوکاتەدا معاویە وازی لەخوێنی عثمان هێناوە [3]، ڕێکەوتنەکە هاتەدی هیچ کەسێ سزا نەدرێ لە هاوەڵانی علی، ئەوەش یاسایەکی گرنگەبوو، سیڕینەوەی ڕابردوو کردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێ کە گرنگی بخاتە سەر ئیستا و داهاتوو[4]، ڕیکەوتنەکە تەواو بوو بەپابەندبوون بەبتەماکانی شەرعەوە هاتەدی، ئاشتی ولێخوشبون و لێبوردەی ڕەها لەلایەن هەردوولاوە هاتەدی، هەرلەپێش ڕاگەیاندنی ئاشتیدا، بەکرداریش معاویە لەسەرکاری ڕابوردووکەسی سزانەدا، بەوەش ئاشتیەکەی حسن لەسەر چاکەکاری و لێبوردن دڵەکانی دامەزراندەوە، ئەوکارە گەورەبوو حسن پێ هەستاو کەبوەهۆی پاراستنی یەکبونی ئوممەت، سەرلەنوێ ئاشتی و ئاسایش و پاراستنی خوێن باڵی کێشاوە بەسەر ئومەت لەسەردەمی معاویەدا، بەپشتیوانی خوا بەدرێژی لە شوێنی خۆی باس دەکەین.

## چوارەم: ولایەتی عەهد، وازهێنا لە کارو باری موسڵمان بەشورا

ووتراوە: ئەو مەرجانەی هەردوولا لەسەری ڕێکەوتوون ئەوەیە کەدوای معاویە حسن خەلیفە بێت [5]، معاویە بەڵێنی دا ئەگەر ڕووداویکی بەسەرهات لەم کاتە حسن زیندووبوو ئەوا خیلافەت دەدا بەحسن[6]، بەڵام (إبن أعثم) لەم بارەیەوە لەحسن ڕیوایەدەکات دەڵێ: سەبارەت بە ولایەتی عەهد دوای ئەو ئەوەکەی من حەزم پێ هەبوو، گەر حەزم لێ بووایە بەوم نەدەدا[7] لەو دەقی ئەو ئاشتیە کە (إبن الهيثمي) باسیکردووە:

---

١ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا٦٧.

٢ ـ التبيين في أنساب القرشيين، لا ١٢٧.

٣ ـ الخلفاء الراشيدين للنجار، لا ٤٨٢.

٤ ـ الدور السياسي للصفوة في صدر الإسلام، لا ٣٤١.

٥ ـ فتح الباري (١٣/٧٠).

٦ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٢٦٤).

٧ ـ الفتوح (٣/٤/٢٩٣).

خیلافەت دوای معاویە بەشورا نێو موسڵمانان بو[1]، ئەگەر لەو ڕیوایەتانە وربینەوە باس لەوەدەکەن، کە حسن دوای معاویە خیلافەتی وویستوە ئەبینین دژ بەهێزو گەورەیی حسن، ئا خۆ چۆن لەبەر پاراستنی خوێنی موسڵمانان و ڕەزامەندی خوا دەستبەرداری بو و پاشان بە پا شکۆیەتی ڕەزامەند دەبو و داوای دونیای دەکرد، جارێکی تر خۆی بۆ خیلافەت دەخستە مەترسی لەچوون، بەڵگەی بێ بنەمایی ئەو قسەیەش ئەوەیە کە (جبیر بن نضیر) باسیکردووە دەڵێ: بە حەسەنی کوڕێ علی ووت خەڵکی وادوزانن تۆ خیلافەتت دەوێ؟ ئەویش دەڵێ: من ئێسك و پروسکی عەرەبم بەدەستەوە بوو ئاشتیم لەگەڵ هەرکەس بکردایە ئاشتیان لە گەڵدا دەکردو، جەنگی هەرکەسم بکردایە جەنگیان لەگەڵدا دەکرد، لەبەر ڕەزامەندی خوا وازم لێ هێنا.[2]

تێبینی: هیچ کوڕی هاوەڵێ یان هاوەڵێك باسیان نەکردووە کە لەماوەی بەیعەتی یەزیدا هیچ شتێکیان لەو مەسەلەیەدا باس نەکردووە، گەر وەك ئەوەی کە ڕیوایەتەکان باسی دەکەن ئەوەی دوای معاویە حسن بێت، ئەوە حوسەینی کوڕی علی(ﷺ) دەیکردە بەڵگە، بەڵام هیچ شتێك لەوەدا نابیستن و ئەوەشی دوپاتی ئەوەدەکەنەوە لە بابەتی جێ خیلافەتی حسن دوای معاویە دورە لە ڕاستی، گەر حسن (ﷺ) پلەی ولایەتی عهدی لە مەرجاکان بوایە، ئەوە بۆبەڕێوەبردنی دەوڵەت لە معاویە نزیك دەبوەوە، یان یەکێ لەهەرێمە گەورەکانی بەڕێوە دەبرد، نەك بڕوات لە مەدینەدانیشێت واز لەکاروباری دەسەڵات و بەڕێوەبردن بێنێ، هەروەها ڕۆحی ئەو سەردەمە ئاماژەدەکات بە بنەمای هەڵبژاردنی دەسەڵاتداری لەلایەن ئوممەتەوە و لەڕێگەی شوراوە.

## قسەوتن بەعلی ئەمیری ئیمانداران لەنێوان معاویەو و حسندا:

کتێبەکانی مێژوو لەوە باس دەکەن کە حسن(ﷺ) مەرجی لەسەر معاویە داناوە جنێو بەعلی نەدرێ و ئەو گوێ لێ بێت، وەك ئەوەی حسن لێ بوردە بێت بەرامبەر ئەوەی قسە

---

١ - الصواعق المرسلة (٢/ ٢٩٩).

٢ - البداية والنهاية(١١/ ٢٠٦).

بەعلی (ﷺ) بوترێ و ئەو گوێ ی لێ نەبێ، بۆیە مامۆستام دکتۆر محەمەد بطاینة دەڵـێ: ئەو باسە لەنێوان حسن و معاویە باس نەکراوە.[1]

شیعەش معاویەیان (ﷺ) تاوانبارکردووە بەوەی لەسەرمینبەری مزگەوتەکاندا خەڵکی بۆ جنێودان بەعلی و نەفرەت لێ کردنی هانـداوە، ئـەو قـسەیەش هـیچ ڕاسـتیەکی نیـە، ئەوەش کە دەری ئەخات ئەوەیە لێکۆڵینەرەوان بەبێ ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی ئـەو درۆیـەیان وەرگرتووە، تـاوەکو وەهـای لێهـاتووە بـەلای موحەقیقینـەوە بەیـەکێك لەوسـەلمێنراوانە دابنرێت کە بواری مشتومڕکردنی نیە و لـە ڕیوایـەتێکی صـەحیحدا هـاتوە هـیچ کـات نەسەلماوە، متامانەبەو ڕیوایەتانەناکرێت کـە لەکتێبـەکانی دەمـیری و یـەعقوبی و ئـەبو فەرەجی ئەسفەهانی هاتووە، بەجۆری مێژووی ڕاست وو پێـچەوانەی ئـەو مێژوونوسـانەیە لەڕیزو گەورەدانانی بۆمعاویە و ئەمیری ئیمانداران علی و ئال و بەیت.[2]

بۆیە بەنەفرەت کردن لـە علـی لەسـەر مینبـەرەکانی بـەنی ئومەیـە لەگـەڵ مـەنتقی ڕووداوەکان و سروشتی ناکۆکیکاراندا ناگونجێ و ڕێك ناکەوێت، هـەروەها گەربگەڕێینـەوە بۆ کتێبە هاوچەرخە مێژوویەکانی ئەمەویەکان ئەوە هیچ کات شتێکی لەو جۆرە نـابینین، بەڵکو لە کتێبی ئەو دوایە ئەبینین ئەوانەی مێژووەکـەیان لەسـەردەمی عباسـیدا نووسـی بەمەبەستی ناشیرینکردنی ناوبانگی ئەمەویەکان لـەتێڕوانینی جـەماوەری مەسـڵمانانداا، مەسعودی لە (مروج الذهب) وشیعەکانی تر ئەوباسەیان نوسیوە، ئـەو درۆیـەش خراوەتـە نێو کتێبەکانی مێژووی ئەهلی سوننەوەو ڕیوایەتێکی ڕاستی تێدانیە، بۆیە ئـەو ڕیوایەتـە سەلامەتی گواستنەوەی نیە و سەنەدەکەشی لە(تجريح) بـەری نیـە، مەتنەکەشـی قـسەی لەسەرەو کێشی ئەو پڕوپاگەندەیەش لای لێکۆڵەرەوان ئاشکرایە، معاویـە(ﷺ) لەنمونـەی ئەوتۆمەتانە بێ تاوانە، ئەوەش بەوگەورەییەی لە ئیسلامدا بۆی دانـراوە، ئـەو ژیاننامـە پوختەی لەنێو ئومەت و ستایشکردنی هەندێ هاوەڵان و تابیعەباشەکان شایەتیان بـۆ داوە

١ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٨.

٢ ـ الحسن والحسين، محمد(ﷺ)،لا ٨كلام المحقق د. أحمد أبو الشباب.

و شـایەتی ئـاین و زانـست و دادپـەروەری و نـەرمونیانی و هـەموو سیفەتەچـاکەکانیان بۆداوە[1]:

١.عمری کوڕی خەتاب(رضي الله عنه) کاتێ کردویەتیە والی شام: معاویە تەنیا بەچـاکە باسـی بکەن.[2]

٢.علی(رضي الله عنه) دوای گەڕانەوەی لە (صفین) دەڵێ: ئەی خەڵکینە ڕقتان والیەتی معاویە نەبێ، ئێوە گەر لەدەستان دا ئەوە لەئازاری ویلایەتە سەرەکان وەکو گوژاڵکە دەبینن.[3]

٣.إبن عمردەڵـێ: لـەدوای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە معاویـە گـەورەترم نـەبینیوە، ووتـراوە: باوکیـشت؟ ووتـی: عمـری بـاوکم لـە معاویـە باشـتر بـوو، معاویـەش لـەو گەورەتربوو.[4]

٤.إبن عباس دەڵێ: کەسم نەبینیوە وەك معاویە شیاوو بەڕێزبێت بۆ پادشایەتی[5]، لە صحیحی بوخاریدا هاتووە بە إبن عباس ووتراوە: هیچ شتێکت لەسەر ئەمیری ئیمانـداران معاویە هەیەکە دەسەڵاتی کردەهی خۆی، ئەویش ووتی: معاویە فەقیهە[6] لای إبن عباس باسی معاویە کراوە، ئەویش دەڵێ: (ئەڵلاّ إبن هیند چ گەورە هەیە کە ڕەچـەڵەکی چـەند بەڕێزە، سوێند بەخوا قەت لەسەر مینبەر جنێوی پێ نەداوین ولە هیچ شوێنێکدا گومانی ناشرینمان بەڕەچەڵەك یەکتر نەبردووە).[7]

٥.ماشاو الله لە إبن هند: ـ واتە معاویە ـ ئێمە لێی دەترساین و شیر لەکاتی چڕنوك وەشاندنی دا لە معاویە بەجەرگتر نەبوە وئێمە و فێڵمان لێ دەکرد و هیچ کەسی تر نەبووە لەسەر گۆیی زەوی لەو زیرەکتر بێت و خۆی وا پیشان دەدا، کە فێڵی لێکراوە، چاو پۆشی

١ ـ الانتصار للصحب و الآل، لا ٣٦٧للرحيلي.

٢ ـ البداية والنهاية(٨/٢٥).

٣ ـ البداية والنهاية(٨/ ١٣٤).

٤ ـ السنة للخلال (١/ ٤٤٣) سير اعلام النبلاء(٢/ ١٥٢).

٥ ـ البداية والنهاية(٨/١٣٧).

٦ ـ البخاري، رقم: ٣٧٦٥.

٧ تأريخ دمشق (٦٢/١٢٨ ـ ١٢٩).

له ئێمه دەکرد، لەگەڵ ئەوەش دا کە لێ دەترساین حەزمان دەکرد شاد بین بە تەمەن درێژی ئەو(معاویە) تا بەردێك لەم چیایەدا مەبەستیش لەم بەردە ئەبو قوبەیس.

٦. له عبدالله ی کوڕی زوبێرەوە کە دەڵێ: بۆ خوایە چاکەی هیند واتا معاویە چ گەوهەرێکە، ئێمە بەرێزمان دادەنا و گەورەش ئاماژەمان بۆ ئەکرد و لێ ی ئەسڵەمینەوە، شێر بە چرنوکەکانەوە لەو بوێرتر نەبووە، کەچی بۆ ئێمە ئەترسا، دەمانخەڵەتاند ولەزەویشدا کەسێك نەبوو وەکو (إبن لیله)ژیر تر بێ وبمانخەڵەتێنێ.

٧. الزهری دەڵێ: معاویە بەپێی ژیانی عمری کوڕی خەتاب ساڵانێك ئیشی دەکرد بە هیچ جۆرێ لێ لانەدەدا، ستایشی لای هاوەڵان و تابیعین زۆرە و ئێمەش تەنیا بەشێکمان باسکردووە.

هەروەها زانا مو حەقیقەکانی سیرەو مێژووو ستایشی معاویەیەیانکردووە (رضي الله عنه):

١. إبن تەیمیە (رضي الله عنه) دەڵێ: زانایان هاودەنگن لەسەرئەوەی معاویە باشترین پادشایانی ئەم ئوممەتەیە، چوارەکەی پێشووی خەلیفەی پێغەمبەرێتی بوون و ئەویش یەکەمین پادشابوو، پادشایەتیەکەشی پادشایەتی و سۆز بوو[1] دەڵێ هیچ پادشایە موسڵمانان نیە لە معاویە باشتربێ، خەڵکی زەمانی هیچ پادشایەتیەکیش نیە لە خەڵکی زەمانی معاویە باشتربن.[2]

٢. إبن کثیر لەباسی ژیانی معاویەدا (رضي الله عنه) دەڵێ: خەڵکی لەساڵی چل و یەکدا لەسەر بەیعەتدانی کۆبونەوەو یەکدەنگن بوون، لەوەدا بەردەوام بوو تا ئەوساڵەی مرد تیایدا جیهاد لە وڵاتی دوژمن بەردەوام بوو، ئاینی خوا باڵادەست بوو، لەهەموو لایەکی زەویەوە دەستکەوتی بۆ دەهات، موسڵمانانیش لەگەڵیدا لە خۆشی و حەسانەوەو لێبوردندا بوون.[3]

---

١ ـ مجموع الفتاوى (٤/ ٤٧٨).

٢ ـ منهاج السنة (٦/ ٢٣٢).

٣ ـ البداية والنهاية (٨/ ١٢٢).

٣. إبن أبی العز الحنفی دەفەرمووێ: یەکەمین پادشای موسڵمانان معاویە یە و باشترین پادشای موسڵمانان بووە.[1]

٤. (الذهبی) دەڵێ: ئەمیری ئیمانداران پادشای ئیسلام بووە[2]، دەڵێ: معاویە لەباشترین ئەو پادشایانەیە داد گەریان بەسەر ستەمکاریاندا زاڵ بووە[3] گەر ئەوە لەبارەی معاویەوە (ﷺ) سەلما، ئەوەزۆر مەحاڵە کەسێ ئەوە ژیان و ڕەوشتە بێت و لەسەر مینبەرەکاندا خەڵکی بۆ نەفرەتکردنی علی (ﷺ) هانبدات، ئەوەش واتای ئەوەیە زانیان دوای ئەوان بەوجۆرە ستایشیان کردووە دووریان خستۆتەوە لەو ستەمەی باسەکرێت[4]، ئەوەش بوختانێکی گەورەیە بۆ زانایانی هاوەڵان و تابعین ئەو زانا خوا ویستانەی ڕێبازی ئەوانیان وەرگرتووە، هەرکەسێك ژیانی معاویە(ﷺ) لەپادشایەتی و ئەو نەرمونیانی و دڵفراونی و جوان بەڕێوە بردنی ژێردەستیان بزانێ، ئەوە بۆی دەکەوێتە دەرکە گەورەترین درۆیە بەرامبەری دەکرێ، چونکە معاویە (ﷺ) لەنەرمونیانی و پێشەنگی نەوەکانمدا وەکو پەندو وانا ووتراونەتەوە.[5]

ئەوەش چەند نمونەیەك:

١. عبدالملك کوڕی مەروان کاتێ باسی معاویەی لا دەکرا دەیگوت: هیچ کەسێکم نەبینیوە لەنەرمونیانی وڕێزو بەخشندەییدا وەك معاویە بێ.[6]

٢. قبیصە کوڕی جابر دەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینیوە وەك معاویە نەمونیان و وقسەی خۆش و بەخشندەبێ.[7]

٣. پیاوێك بە معاویەی ووت: لە تۆ سووکترم نەبینیوە، معاویەش ووتی: بەڵێ هەرکەسێ ئاوها لەگەڵ پیاوان قسە بکات[1]، ئاخۆ نەرمونیانی کێ لە نەرمونیانی

---

١ ـ شرح العقيدة الطحاوية، لا ٧٢٢.

٢ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ١٢٠).

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٢٠،

٤ ـ البداية والنهاية (١٣٨/٨).

٥ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٣٧١.

٦ ـ هەمان سەرچاوە (١٣٨/٨).

٧ ـ البداية والنهاية (١٣٨/٨).

معاويه(ﷺ)زۆرتره، کەسێ ئەمیری ئیمانداران بۆ پاشان لەسەر مینبەردا فرمان بە جنێودان بکات به خەلیفەی ڕاشید علی کوڕی ئەبو تالیب وبەفرمانی والیەکانیشی خەڵکی لە شاراندا هان بدات و ئەو جنێوفرۆشیە بمێنێتەوە تاوەك عمری کوڕی عەبدوالعەزیز (بەڕەحمەت بێت) ئەو جنێو فرۆشیە هەڵ دەوەشێنێتەوە بڕیاریش لەوەدا ئەوەیه هەموو کەسێکی عاقڵ تێگەیشتنی خۆی هەیە[2]، ئەو درۆیەش کە شیعە بەبەڵگەی دەهێنێنەوە لە (صحيح مسلم) دا ئەوە نیە کە بەوەیان داناوە، لەعامری کوڕی سعدی کوڕی ئەبو وەقاسەوە ئەویش لەباوکیەوە کە معاویەی کوڕی سوفیان (ﷺ) بەسعدی ووتووە: چ شتێك ڕێگریت لێ دەکات لەوەی جنێوو قسەی ناشیرین بە ئەبو توراب بڵێی؟ ئەویش ووتی: سێ شت وەك پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەیەوە دەڵێ بۆیە جنێوی پێنادەم، هەریەکێ لەوانە لەو شتری (حمر النعم)[3] بەلامەوە خۆشەویسترن.

نەوەوی دەڵێ: ئەو قسەیەی معاویه ئەوەنیە کە فرمانی جنێو دانی بەحسن دابێ، بەڵکو لە هۆکاری ڕێگرتنی جنێو دانی لێ پرسیوە، وەك بڵێی: گەر ڕێزو گەورە دانان بێ ئەوە پێکاوتە و چاکەکاری، گەر لەبەرشتی تربێ ئەوە وەڵامێکی تری هەیە، لەوەدەچێت سعد لەنێو کۆمەڵێکدا بووبێ بە قسەو جنێودان بێ و ئەویش جنێوی نەدابێ و ڕێگری کردبێ و ئەویش ئەو پرسیارەی لێکردبێ.

ووتویانە: پێدەچێ ئەگەرێکی تریش هەڵگرێ کەواتاکەی ئەوە یە، ڕێگری چیە لەوەی بۆ چوونی دەربخەیت و بۆ چونی ڕاستی ئێمەش بۆ خەڵکی ئاشکرا بکەین کە حسن هەڵەیە.[4]

أبو العباسی القرطبي خاوەن (المفهم) لەسەر وەسفی (ضرار الصدائی ) لە علی(ﷺ)و ستایشکردنی بەئامادەیی معاویه لە وەداو بەڕاستخستنەوەی ضرار دەڵێ: ئەو قسەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە معاویه فەزڵ و گەورەیی علی (ﷺ) زانیوە و لەوەشدا دوورە معاویه داوای نەفرەتکردن و جنێو پێدانی کردبێ، لەبەرئەوەی کە معاویه عاقڵ و بەدین

---

١ ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ الأنتصاب للصحب والآل، لا ٣٧٢.

٣ ـ مسلم، کتاب: فضائل الصحابة(٤/ ١٨٧١).

٤ ـ شرح صحيح مسلم(١٥/١٧٥).

و نەرمونیان و ئەخلاق جوان بوو، ئەوەی لیّ ی دەگێڕدرێتەوە درۆیەو ئەوی ڕاست بیّ لەوقسانەش ئەوەیە، کەبەسعدی کوڕی ئەبو وەقاسی ووتوە: لە قسەووتن و جنێودان بەأبو توراب چ شتیّ ڕێگریت لیّ دەکات؟ ئەوەش داوای جنێودان و قسە پیّ ووتنی نیە، بەڵکو پرسیارێك بووە بۆ ئەوەی پیّ ی دەربکات کە هۆکاری قسە پیّ نەوتنی چیە، کە معاویە ئەوەی بیست بێدەنگ و کپ بوو، مافی خاوەنەکەشی زانی.[1]

دکتۆر إبراهیم الرحیلی خاوەنی کتێبی (النفس القیم الانتصار للصحب والأل من افتراءات السماوي الضال) دەڵیّ: ئەوەی لێرەدا بۆم دەردەکەوێت ئەوەیە: معاویە تەنیا بۆ خۆی ئەوەی بەسعد ووتوەو ویستویەتی هەندیّ فەزلی علی(ﷺ) بۆ دەرکەویّ، چونکە معاویە پیاوێکی ژیرو ووریا بووە، حەزی بەگاڵتەی پیاوان و دەرخستنی قسەیانی هەبووە، وویستویەتی بزانیّ سعد لەعەلیدا (ﷺ) چ شتێکی هەبووە، بۆیە بەوشێوازە ووروژێنەرە پرسیارەکەی کردووە، ئەووە وەك ئەو قسەیەتی (ﷺ) بە إبن عباس: تۆ لەسەر ئاینی عەلیت؟ إبن عباسیش دەڵیّ لەسەر ئاینی عثمانیش نیم، بەڵکو لەسەر ئاینی پێغەمبەری خوام (ﷺ).[2]

دیارە لێرەدا قسەی معاویە بۆ إبن عباس بۆ گاڵتە و خۆشی بووە، قسەش بۆ سعد بەهەمان شێوە بووە، ئەوەی شیعەش دەیەویّ جنێوی مەبەست بووە و فرمانی پێکردووە، پاکی بیّ گەردی بۆ معاویە شتی وای لیّ دەرکەویّ[3] ڕێگریش لەوەدا چەند شتێکە:

١. معاویە(ﷺ) خۆی جنێوی بەعلی(ﷺ) نەداوە تاوەکو کەسی تر فرمان پیّ بکات، بەڵکو گەورە ڕایگرتووە، دانی بەگەورەیی وزوو موسڵمان بوونی داناوە، قسە سەلماوەکانی لەبارەوە ئەو ڕاستیە دەسەڵمێنیّ.

---

١ ـ المفهم للقرطبي(٦/ ٢٧٨).

٢ ـ الإبانة (١/٣٥٥)، شرح أصول اعتقاد الالكائي(١/ ٩٤).

٣ ـ الأنتصار للصحب والال، لا ٣٧٤.

أ ـ إبن كەسیر دەڵێ: لەیەك ڕووەوە نەهاتووە: أبوموسلیمی خەولانی و کۆمەڵێك لەگەڵیدا هاتونەتەلای معاویەو پێی دەڵێن: علی باشترە یان تۆ وەك ئەوی ئەویش دەڵێ سوێند بەخوا ئەزانم لەمن باشترو بەڕێزترە و ئەوشیاوترە بۆ خیلافەت.[1]

ب ـ إبن کثیر لە جورەیەی کوڕی عبدالحمید ئەویش لەموغەیرەوە ڕیوایەتی کردەوە دەڵێ: کاتێ هەواڵی کوژرانی علی بە معاویە گەیشت، معاویە گریا، ژنەکەی پێ ووت: بۆی دەگری و جەنگیشت لەگەڵ دەکرد؟ ووتی: لەنێو بچی تۆ نازانی خەڵکی چ فیقە و زانستێکیان لەدەست داوە[2]، ئاخۆ لە ژیری و ئاین جێ ی دەبێتەوە معاویە قسە بەعلی بڵێ، بەڵکو خەڵکیشی بۆ هان بدات، ئاخۆ ئەوەی لێ چاوەڕێ دەکرێ[3]؟!.

٢ـ بەڵگەیەکی ڕاست نیە کە معاویە(ﷺ) لەجەنگەکانیداو لە ژیانی عەلیدا بە جنێو یان بەقسەی ناشیرین بەرامبەر علی(ﷺ) هاتبێتەوە، ئاخۆ عەقڵ قەبوڵ دەکات دوای کۆتایی هێنان بەجەنگ و مردنی جنێو و قسەی ناشیرینی پێ بڵێ، ئەوە زۆر دوورە لای خاوەنی عەقلان و دوورترە لەوەی بۆ جنێوو قسە پێ بڵێ و خەڵکی لەدژدا هان بدات.

٣ـ معاویە (ﷺ) پیاوێکی ژیرو بلیمەت و بەناوبانگ بوو، گەر بیوستبوایە، خەڵکی بۆ قسەووتن بە علی هان بدات ـ دوور بێ لە معاویە (ﷺ) ـ ئەو لەنمونەی سعدی کوڕی ئەبو وەقاس داوای قسە پێ وتن دەکات کەزیرەکی و گەورەیی و زۆر بەڕێز بووەو هەردوور بووە لەو ئاشوبەیە، ئەوکارەش کەسی کەم عاقڵ نایکا، چ جای معاویە.

٤ـ معاویە(ﷺ) دوای ئەوەی حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) وازی لەخیلافەت هێنا بۆ معاویە، ئەوە خیلافەت بۆ معاویە مایەوەو یەکدەنگی موسڵمانانی بۆ هاتەدی و هەموو ولایەتەکان چوونە ژێردەسەتی دەسەڵاتەکەیەوە، کەواتە جنێودان و قسەوتن بەعلی چ سوودێکی بۆ هەیە؟ بەڵکو دانایی و جوان بەڕێوەبردنی ئەو بڕیاردانە نادات، چونکە

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (٨/ ١٣٣).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(١٣٣/٨)

٣ ـ الأنتصار للصحب والآل، لا ٣٧٥.

ئارامی دەروونەکان و سەقامگیر بوونی کاروبارەکانی تێدایە، نمونەی ئەوەش لە معاویەدا (رضي الله عنه) شاراوەنیە کە ئوممەت شایەتی بەڕێوەبردنی ڕێکیان بۆ داوە.

٥ـ معاویە(رضي الله عنه) دوای بوونی بە خەلیفە لە نێوان خۆی و نەوەی عەلیدا خۆشەویستی و نزیکایەتی هەبوو، بەوەی لە کتێبەکانی سیرەوە مێژوودا بەناوبانگە[١]، حسن و حوسەینیش سەردانی معاویەیان کردووە و ئەویش دووسەد هەزاری پێداون و پێی ووتون: هیچ کەسێکم پێش خۆم ئاوەها نەبەخشیوە، حسین پێ ووتوە بەئێمە باشتریش نەدراوە[٢] جارێکیان حسن چووە لای معاویە ومعاویەش دەڵێ: بەخێر بێ ی ئەی کچەزای پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وسێ سەد هەزاری پێداوە[٣]، ئەوەش ئەو درۆیە دەمکوت دەکاتەوە لەبەرامبەر معاویەدا درۆ درۆ بانگەشە دەکات، بەوەی خەڵکی بۆ قسەوتن بەعلی(رضي الله عنه) هاندابێ، ئاخۆ چۆن شتی وا ڕوودەدات کە لەنێوان ڕاستی و ڕاستەقینە دەرئەکەون و شەوق دەدەنەوە[٤]، هەروەها ئەو کۆمەڵگەیەش بەگشتی پابەند بوون بەبڕیارەکانی شەرع و لەجێ بەجێ کردنیدا پابەند بوون، بۆیە دوورە پەرێزترین خەڵك بوونە لەتانەدان و نەفرەت و قسەی سووك و هیچ و پوچ، إبن مسعود(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ليس المؤمنين بالطعان ولاباللعان ولابالفاحش ولاالبذئي): ((ئیمانداران تانەدەرو نەفرەتکارو قسەی سوك و ناشیرینی و سووکی نالێ)).[٥] پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕێگریکردووە لەوەی جنێوو قسە بەموشریکە مردووەکان بدرێ ئەی بۆ دڵسۆزە چاکەکارەکانی خوا چی و چۆن دەبێ، لە عائیشەوە بەمەرفوعی ڕیوایەتکراوە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((جنێوو قسە بەمردوان مەدەن، چونکە ئەوان ڕۆیشتون بۆ لای ئەوکارەی ئەنجامیان داوە)).[٦]

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٣٦٧.

٢ ـ البداية والنهاية(٨/ ١٣٩).

٣ ـ هەمان سەرچاوە(٨/١٤٠).

٤ ـ الأنتصار للصحب والآل، لا ٣٧٧.

٥ ـ صحيح إبن جبان، رقمك ٤٧، صححة الألباني في الصحيحة، رقم: ٣٢٠.

٦ ـ البخاري، رقم: ٦٥١٦.

دوای ئەوەی کەئاشتی هاتەدی و حسن وازی لە خیلافەتی هێنا قۆناغەکانی خیلافەتمان ڕونکردەوە- لاپەڕەی ناکۆکی و پەرتەوازەیی بپچرایەوەو یەکدەنگی هاتەدی معاویەش بەیەکدەنگی بووە خەلیفەی موسڵمانان ووتراویشە کەساڵی چلی کۆچی بووە[١]، بەلام إبن ئیسحاق[٢] وواقیدی[٣] وەخەلیفە إبن خیاط[٤] ئەو ئاشتەواییەیان بە ساڵی چل و یەکی کۆچی داناوەو لەو مانگەدا جیاوازن، کە ئاشتی تیایدا بەرجەستە بووە: ئایە ڕەبیع الأول بووە، یان ڕەبیعی الثاني، جەمادی یەکەم بووە، یان جەمادی دووەم؟[٥] معاویەش کاروباری ئومەتی بەڕێوەبرد، بیٚ ئەوەی ڕێگەبۆ فیتنە خۆش بکات.[٦]

- هەڵوێستی معاویە بەرامبەر بە بکوژانی عثمان:

دەکریٚ بپرسریٚ معاویە دوای ئەوەی خیلافەتی گرتەدەست چی بەبکوژانی عثمان کرد؟ إبن قوتەیبە لە (عیون الاخبار)دا وەڵامی داوەتەوەو دەڵیٚ: معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، کە ساڵی کۆ بوونەوە(عام الجماعە) هاتەدی چوە ماڵی عثمانی کوڕی عفان، عائیشەی کچی عفانی کوڕی عثمان هاواریکردو گریاو بانگی باوکی کرد، معاویەش ووتی: کچی برام خەڵکی گوێڕایەڵیان داوەو ئێمەش ئەمانەتمان پێداون، نەرمونیانیمان بۆدەرخستوون و ژێرەوەی نەرمونیانیەکە توڕەییە، ئەوانیش ژێرباریەکیان بۆ دەرخستووین و ژێرەوەی ڕقە، هەموو مرۆڤێك شمشێرێکی پێەو شوێنی هاوەڵانیشی دەزانیٚ، گەر بەڵێن بشکێنین ئەوانیش پەشیمان دەبنەوە، ناشزانین ئێمە ئەیبەینەوە یان ئەوان، کچی مامی ئەمیری ئیمانداران بی لەوە باشترە ژنی بەردەستی خەڵکی بی.[٧]

ئەوەش کە قسەی إبن قوتیبەیە پشتی پیٚ دەبەستریٚ، لەو پەیمان وبەڵێن نامانە کەلە نێوان معاویە و حسندا هاتەدی و ئاشتی نێوان خەڵکی پێویستکرد و نەمانی جەنگ و

---

١ ـ المعجم الكبير للطبراني (٣/٢٦)، دراسة في الخلفاء الأمويين، لا ٦٩.

٢ ـ تهذيب التهذيب (٢/ ٢٩٩)ترجمة حسن بن علي.

٣ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٩.

٤ ـ تاريخ خليفة، لا ٢٠٣.

٥ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٦٩.

٦ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٦٩.

٧ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٧٠.

پاراستنی خوێن، سەرباری ئەوەی ئەو پێنج ساڵەی کە جەنگی جمل و سەفین و نەهرەوان و میسرو شوێنانی تری لەخۆ گرت ئەوکەسانەی لەنێو برد، کە بە تۆمەتی کوشتنی عثمان ناویان هاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا کوشتنی عثمان لەمێشکی زۆرینەی خەلیفەکانی ئەمەوی و شوێنگرەکانیان مابوویەوە، سەرخستنی ئەمەویەکان بۆ عثمان کارێکی ڕاستەقینە بوو، [1] هەروەها ئەو هاوڵانەی بەیعەتیان بە معاویە(ﷺ)دا دەکرێ حەڵاڵیان کردبێ لەسەر مینبەرەکانی ئەمەویەویەکان جنێو بەعلی درابێ و کەسیان قسەی نەکردبێ یان فەرمانیان بەچاکە و ڕێگریان لەخراپە نەکردبێ، ئەمەش ناوەکانیان: ئەوەی لە ئەوزاعیەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێ: خەلیفایەتی معاویە چەند هاوەڵێکی پێغەمبەری (ﷺ)دوپاتیانکردۆتەوە لەوانە: سعدو ئوسامەو جابرو إبن عمر و زەیدی کوڕی سابت و مەسلەمەی کوڕی موخلدو ئەبو سەعیدی خودری و رافعی کوڕی خدیج و أبوئومامەو ئەنەسی کوڕی مالیك و پیاوانێکی زۆر، کە چرای ڕوناکی و کانگای زانست و ئامادەی دابەزینی قورئان بوون و لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ)واتە کەیان وەرگرتوە، تابیعەکانیش ئەمانە بوون: عبدالرحمن کوڕی الأسود کوڕی عبد یغوث و سعید کوڕی المسیب و عروە کوڕی الزبیر و عبداللەی کوڕی محیریز و هاوشێوەکانیان دەستیان لە یەکبونی ئوممەتی محمددا(ﷺ)نەدەکێشاوە. [2]

## ئەنجامەکانی ئاشتی:

### یەکەم: یەکبونی ئوممەت

(عام الجماعە) لە مێشکی ئەم ئومەتەدا تۆمارکرا، ئەم ڕووداوە بە درێژایی سەردەمەکان بووە جێ شانازی ئوممەت، معاویە بەسەرکردەی هەڵبژاردو ڕەزامەند بوو، کە معاویە ئەمیری بێت و موسڵمانان لەدوای پەرتەوازەی لەناوبەر بەو یەکبونە گەشایەوە فەزڵ لەوەشدا بۆ خوا بوو، پاشان سەیدی گەورەو ئەندازیاری پرۆژەی چاکسازی حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو تاڵیب بوو(ﷺ)، (عام الجماعە) بەیەکێ لە نیشانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)و گەورەیی حسن دادەنرێ، بەوەش گوێی بوەی(العقاد) نادرێ لەبارەی

---

١ ـ دراسة في تاريخ الخلفاء الأمويين، لا ٧٠.

٢ ـ البداية والنهاية(٨/ ٣٣) نقلاً عن أثر العلماء عن الحياة السياسية في الدولة الأموية، عبد الله الخرعان، لا ٨٣.

(عام الجماعە) هێرشە هەڵەکەی بۆ سەر ئەو مێژوونوسانەی، کە ساڵی (٤١)ی یان بە (عام الجماعە) ناساندووە، نوسیویێتی لەوە گومڕاترو نەفامانەتر نیە ئەو مێژوو نوسانە ساڵی (٤١)ی کۆچیان بە (عام الجماعە) ناساندووە، چونکە ئەو ساڵەیە معاویە خیلافەتی داگیر کردو کەسی تری بەشدار نەکرد، چونکە ئیسلام لەسەرەتادا ساڵێکی وای نەبینیوە، وەك ئەو ساڵەی موسڵمانان تێدا پەرتەوازە بوون[1]، العقاد ئەو بڕیارە هەڵەیە یداو شتێکی تازەی نەهێناوە، بەڵکو زۆرێك لە مێژوو نوسە شیعە(الاثنا عشریە)یەکان لەوەدا پێشی کەوتون، معاویە ئەوەی بۆشانازییە، کە هاوەڵە زیندووەکان لەوماوەیە دا بەیعەتیان پێ داوە، بێ گومان زۆرێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیعەتیان پێ داوە.[2]

لەوەشدا (ئیبن حزم) دەڵێ: بەیعەت بەحسن درا، پاشان دەسەڵاتی دابەمعاویە، ئەو هاوەڵانەی کە مابوون لە هەردووکیان باشتر بوون و، لەپێش فەتحدا سەروەت و سامانیان بەخشی و جەنگیان کرد هەموویان بەیعەتیان بە معاویە دا پێشەوایەتییان تێدا بینی[3]، تێگەیشتنی حسن و هەڵوێستی هاوەڵان لەبەیعەتدان بەمعاویە تێدەگەین یان فێری تێگەیشتنی قوڵی ئەوان دەبین، بۆ ئەو ئایەتانەی ڕێگری لەجودایی و پەرتەوازەیی دەکەن پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ١٥٣﴾[ الأنعام: ١٥٣]. ڕێگای ڕاست: قورئان و ئیسلام و ئەو خۆرسکەیە (الفطرة) کەخوای گەورە خەڵکی لەسەر دروست کردووە، ڕێکچکەکانیش: هەواو ئارەزوو پەرتەوازەیی و بیدعەیە، موجاهید لەبارەی ئایەتی: ﴿وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ﴾ دەڵێ: واتە: بیدعەیە، گومان و گومڕاییە.[4]

خوای گەورە ڕێگری لەم ئومەتە کردووە، وەکو ئومەتەکانی پێشتر دوای هاتنی بەڵگەو کتێبی ئاسمانیان کەوتنە پەرتەوازەو جوداییەوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ٣١مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ

---

١ ـ معاوية بن أبي سفيان، لا ١٢٥ للعقاد.

٢ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، لا ١٦٧.

٣ ـ الفصل (٦/٥).

٤ ـ تفسير مجاهد، لا ٢٢٧ .

فَرِحُونَ۳۲﴾[ الروم: ۳۰ـ ۳۲] خوای گەورە هــەواڵی داوە پێغەمبــەر(ﷺ) بــەری و دوورە لەوکەسانەی ئاینەکەیان بەش دەکەن و دابەش دەبن بۆ چەند فرقەیەك[1] فەرموویــەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾[ الأنعام: ۱٥۹] پەروەردگار فرمانی داوە دەست بە ئاینی خۆیەوە بگرێت: ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ﴾.

بەفەزڵی خوا یەکبون هاتەدی و، پاشان بەسەرکەوتنی حسن لە ئاشتەوایەکەیدا لەگــەڵ معاویەدا یەکێك لەگەورەترین مەبەستەشەرعیەکانی یەکبونی موسڵمانان هاتــە دی، ئــەو مەبەستەش (مقصد) لــەگرنگترین هۆکارەکــانی جــێگیر کردنــی ئــاینی خوایــە، ئێمــەش فرمانمان پێ کراوە بەڕاستی و ئارامگرتن، بۆیە پێویستە هەواڵەکان چرپکرێتەوە لەلایــەن بانگەوازخوازان وسەرکردەی بزوتنەوە ئیسلامیەکان و لــەناو زانایــان و زانــستخوازان لــە پێنــاو چاکــسازیەکی ڕاســتەقینە لــەناو موســڵماناندا نــەك پێــچەوانە، چــونکە نیــوە چارەسەریەکان خراپترو زۆرترە لەوەی چاك دەکرێ، شێخ عبدالرحمن ســعدی قــسە لــەبارەی ئەو جهادە پەیوەستە بەموسڵمانانەوە دەکــات لەخۆشەویــستی و یەکــدەنگی دوای ئــەوەی ئەو ئایەت و فەرموودانــەی باســکردووە، کــە بەڵگــەی پێویــستی هاوکــاری و یــەکبونی موسڵمانانەو دەڵــێ: گــەورەترین جیهــاد هەوڵدانــە بۆیەکخــستنەوەی دڵــی موســڵمانان و کۆبونەوەیان لەدەوری ئاینەکەیان و بەرژەوەندیە ئاینی و دونیاییەکانیانە.[2]

بــە ڕاســتی وەرگرتنــی هۆکــارو شــێوازەکان ڕووەو یەکخــستنی دڵــی موســڵمانان و یەکخــستنی ڕیزەکانیــان گــەورەترین جیهــادە، چــونکە هــەنگاوێکی زۆر گرنگــە ڕووەو سەربەستکردنی موسڵمانان و دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان و حوکمکردنی شەرعی خوایــان، ئــەوەش تێگەیــشتنی خەلیفــە ڕاشــیدیەکان بــووە و لــەجوانترین و ڕازاوەتــرین وێنــەدا لەدەستبەردارکردنی حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه)لــە خیلافــەت بــۆ معاویــە (رضي الله عنه) لــەپێناو یەکبونی ئوممەت و پاراستنی خوێنی و پاداشت لای خوای گەورە دەردەکەوێ.

---

١ ـ دراسات في الأهواء والفرق والبدع، ناصر العقل، لا ٤٩.

٢ ـ وجوب التعاون بين المسلمين، لا ٥.

## دووەم: گەڕانەوەی فتوحاتەکان وەکو جاران

بانگەوازکردنی خەڵکی بۆ هاتنە ناو ئاینی خوا، یەکێکە لەمەبەستەگەورەکانی ئـاینی ئیسلام و هەروەها یەکێك لەو ئامرازانەی، کە لەسـەردەمی ڕاشـیدیندا بـۆی بـەکارهێنرا بزووتنەوەی فتوحاتە پیرۆزەکان بـوو، ئـەو ئاشـوبەیەش کـەبووە مایـەی شـەهید کردنـی عثمان(رضي الله عنه) بەگەورەترین ئەو تەنگەژانـەدادەنرێت، کەتوشـی بانگـەوازی ئیسلامی بـوو دوای بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوەی سەردەمی أبـوبکر(رضي الله عنه)، شـەهید کردنـی عثمـان بـووە مایەی وەستانی جیهادو ئاڕاستەکردنی شمشێری موسڵمانان بەرامبەر یەك لەئاشـوبەیەکدا گەر خوا ڕەحمی نەکردایەو حەسەنی کوڕی علی(رضي الله عنه) نەکردایەتـە هۆکـار بـۆ ئاشـتەوایی لەگەڵ معاویەدا(رضي الله عنه)، ئەوە ئەم ئومەتـە تیادەچـوو، سەرچـاوەکانیش پـڕ بـەو دەقانـەن کاریگەری ئەو ئاشوبەیان لە گەمارۆبوونی بزوتنـەوەی جیهـاد ڕونکردۆتـەوە[1]، ئەمـەش چەند نموونەیەکە:

١. لەحەسەنی کوڕی عەلیەوە(رضي الله عنه) کە فەرموویەتی: بەباشم زانی بگەڕێمەوە مەدینـە وخیلافەت بۆ معاویە بەجێ بهێڵم، ئەو ئاشوبە درێژەی کێشاوەو خـوێنی تیایـدا ڕژێنـراو سۆز و بەزەیی پچڕا وسنور و جیهاد لەکارکەوت.[2]

٢. ئەوەی أبوزرعە الدمشقی تەخریجی کردووە بە إسنادی خۆی، دەڵـێ: کـاتێ عثمـان کوژرا و جیاوازی کەوتە ناو خەڵکی، خەڵکی جیهاد و فتوحاتیان نـەبوو تـاوەکو معاویـە بوو بە خەلیفە.[3]

٣. قسەی أبوبکری مالیکی: ئەو ئاشوبە ڕوویدا و عثمان (رضي الله عنه) شەهید کـرا، عـەلیش (رضي الله عنه) دوای ئەوجێگـەی گرتـەوەو ئـەفریقیاش وەکـو خـۆی مایـەوە تـا خەلیفایـەتی معاویە(رضي الله عنه).[4]

---

١ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٣٠٩.

٢ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٣١).

٣ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٣١٠.

٤ ـ رياض النفوس(١/ ٢٧).

یەکێك لە ئەنجامەکانی ئاشتی گەڕانەوەی بزووتنەوەی فتوحات بووە، وەکو جاری جاران و لەسەردەمی معاویەدا سێ بەری سەرەکی هەبوو:

١.بەرەی ڕۆم:

ئەم بەرەیە بەگرنگترین بەرەکان و مەترسیترین بەرە دادەنرێت: ئەوەش بەڕوانین بۆ هێزی ڕۆم و هاوسێتیان بۆ وەڵاتی موسڵمانان، سەرباری خاوەنداریکردنی سوپایەکی پیادەیی و کەشتی دەریایی کەڕێکخستن و شارەزاییەکی لەڕادەبەری هەبوو، ئەوەش وەهای کرد موسڵمانان پاڵبدات لە ڕووی دەریایی و ووشکانیەوە جەنگی ڕۆم بکەن.

٢.بەرەی ڕۆژئاوا (جبهه المغرب).

ئەم بەرەیە پەیوەندیەکی توندو تۆڵی بەبەرەی ڕۆمەوە هەبووە، ئەوەش لەبەر بوونی موستەعمەرە ڕۆمەکانی وڵاتی مەغریب و کاریگەریەکی گەورەشی هەبوو لەتەنگەژە خستنەوەی بزوتنەوەی فتوحاتە ئیسلامیەکان لەو ناوچانەدا.

٣. بەرەی سیجستان و خوراسان و ماوراء النهر.[1]

خۆراسان و سجستان بە ووڵاتە یەکەمەکان دادەنرێت، کەدوای شەهید بوونی عثمان (رضي الله عنه) [2] دژ بەموسڵمانان هەستانەوە، بێگومان معاویە(رضي الله عنه)مەشخەڵ گەلێکی ڕوونی بەجێ هێشت لەسیاسەتە جیهادیەکەیدا و خەلیفە بن خیاط لە مێژووەکەیدا باسیکردووە دەڵێ: کۆتا شتێك معاویە وەسیەتی پێکرد بێ ئەوەیە: دەست بخەنە گەروی ڕۆم، چونکی ئێوە بەنەهیشتنی ئەوان نەتەوەکانی ترتان دەکەوێتە دەست[3]، معاویە بۆ جێ بەجێکردنی و هێنانەدی ئەو سیاسەتە لەماوەی خیلافەتەکەیدا کۆمەڵێك هەنگاوی گرتەبەر.

أ - گرنگی دان بەپرۆسەی پارتیزانی و بەبەشکردن وپەرتکردن، لەپێناو هێنانەدی ئامانج گەلێك لەوانە:

---

١ ـ مەبەست بەزاراوەی (ماوراء النهر) ئەو ولاتانەیە کەلەو دیوو دەریای جەیحونە.

٢ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٣١٤.

٣ ـ تاريخ خليفة، لا ٢٣٠.

* پەرتکردنی نەتەوەی ڕۆم و ماندووکردنی.

* بڕینی دەستپێشخەری ڕۆم و خستنیانە بەرگریەکی بەردەوامەوە.

* ناچار کردنی ڕۆم، کە هێزەکانیان بەش بکەن و بەهێرش گەلێکی یەکلاکەرەوە و بەهێز دژبە دەوڵەتی ئیسلامی نەتوانن.

ب ـ هێرش کردنە سەر ڕۆم لەجەرگەی وڵاتیان و گەمارۆدانی پایەتەختەکەیان ولەوەش ورەیان لاواز دەبێ و ترس خستنە دڵیانەوە.

ج ـ بەر تەسکردنەوەی هێزی دەریایی ڕۆم لە ڕێگەی سەر دەریای شام و لەوەشدا بێبەشکردنی کەشتیە ڕۆمیەکان لەپێگە دەرياييەکانی خۆیاندا، سیاسەتی معاویە(ﷺ) لە بەرەی ڕۆژئاوا دا (المغرب) بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

١. معاویە گرنگیەکی تەواوی بەبەرەی ڕۆژئاوا دابوو بە جۆرێ خۆی ی سەرپەرشتیاری دەکرد و تاساڵی ٤٧ کۆچی مەرجەعی ڕاستەوخۆی سەرکردەکانی ئەو بەرەیە بووە، ساڵی ٤٧ك ئەوساڵە کەبەرەی مغرب خرایە پاڵ والی میسر.

٢. معاویە(ﷺ) بۆ دامەزراندنی پێگەیەکی جیهادی پێشکەوتوو لەنێو جەرگەی وڵاتی مەغریبدا کاریکرد، کە سەر بەرزی بوو بۆ ئیسلام و موسڵمانان، ئەوەش بە دامەزراندن و دروستکردنی شاری قەیرەوان.[1]

سیاسەتەکانی معاویە(ﷺ) لەبەرەی سجستان و خوراسان و ماوراء النهر بەم شێوەیە بوو:

١. معاویە(ﷺ) پشتی بەسەرکردەی ڕزگاریکاری سجستان و خوراسان لە ڕۆژگاری عثماندا(ﷺ) بەست، کەعبداللە ی کوڕی عامر(ﷺ) بوو، داوای لێ کرد جارێکی تر فەتحی بکاتەوە.

٢. کارکردن بۆچەسپاندنی حوکمی ئیسلامی وبلاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لەو ناوچەیەداو لە ڕێگەی نیشتە جێکردنی پەنجا هەزار خێزانی عەرەب لە خوراساندا.[1]

---

١ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٣٦٣.

گەرخوای گەورە نەبوایە و، پاشان دەستەبەرکردنی حەسەنی کوڕی علی لە خیلافەت بۆ معاویە ئەوە وەکو جارانی فتوحات و جیهاد نەدەگەڕایەوە.

یەکێ لەئەنجامەکانی ئەو ئاشتی یە بەدیهاتنی ئەو مەبەستە شەرعیەگەورەیە بوو، چونکە یەکبونی نێوان موسڵمانان بەپێی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرهەمی پیرۆزی هەیە لەدونیای موسڵمان، گەر ئومەتیش بەگشتی و سەرکردەکان بەتایبەتی ئەم مەبەستە گەورەیەیان لەگۆێنا و خستیانە بەرچاوو لەژیانیدا جێ بەجێیان کرد، ئەوە هەل ومەرج و بۆ باڵادەستی دەڕەخسێ.

## سێ یەم: دەرکردنی خەواریج دەوڵەت

یەکێ لە ئەنجامەکانی ئەو ئاشتییە دەرکردنی خەواریج بوو لە دەوڵەتی ئیسلامی بەهۆی لاواز کردنیان، بێگومان معاویە توانی بە هێزو بەرنگاری بزوتنەوەکەی فروةبن نوفل الشجعي و بزوتنەوەکەی (المستورد بن عُلف التيمي) و بزوتنەوەی حیان بن ظبیان السلمي کە هەموویان لە کوفە دەرکەوتن[2]، بزوتنەوەکەی یزید الباهلي و سهم الهجيمي و بزوتنەوەکەی قريب الأزدي و زحاف الطائي و ئەوانەی تر لەبەسرە بوون[3] هەموویانی لاواز کرد، ئێرە شوێنی ئەوەنیە درێژەی ئەوململانێیەی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی و خەواریج باسبکەین، بەڵکو لە هەوڵی بڕیاردانی ئەنجامێکی سروشتی ئەو ئاشتیەیە، ئەویش بەرتەسکردنەوەو بەرەنگاربونەوەی خەواریجە، بۆیە بزوتنەوەی خەواریج لەسەردەمی معاویە(رضي الله عنه) سەرپێیانە و هەڕەمەکیانە و بێ ڕێکخستن بوو، پرۆسەکانیان شێوەی خۆکوشتنێکی کۆمەڵکاری هەبوو، چونکە بەکۆمەڵێکی کەم ئەهاتنە مەیدان و بێ ئامادەیی و ڕەخساو نەدەبوون پێویستیان بەسەرکردایەتێکی ووشیار بوو بتوانێ زیرەکی و جوامێریان لەبەدیهێنانی ئامانجەکانیان بەبەربهێنێ، هەڵەی بزوتنەوەکانی پێشویان دووبارە دەکردەوە لەو ئەزمونانە سودیان نەدەبینی و لەبانگەشەکانیان دیاربوون لەشێوازی

---

١ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، ٣٦٤، ٣٦٥.

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا ( ١٩٦،١٧٩ ).

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا( ١٩٧، ٢٠٨).

وتوویژو بەهێزەوە هەوڵی سەپاندنیان بیرخۆیان دەدا بەسەر کۆمەڵگەی موسڵماناندا، تێکەڵکردنی ئەو پاڵنەرە ئاینیانەی کە خەواریج بانگەشەی دەکرد لەگەڵ پاڵنەرەدەمارگیریە نەفامیەکانی بزوتنەوەکانیان خۆی لە تۆڵەی سەندنەوەی کوژراوەکانیان دەبینیەوەو هەستیان بەنامۆیی لەنێو کۆمەڵگەی موسڵمان دەکردو ویستی هەڵهاتن و باوەڕیان وەهابوو کە کوشتنی موسڵمانان باشترو لە پێشترە لە جیهادی بێ باوەڕان، بۆبڵاوکردنەوەی بانگەوازەکانیان بەشوێن خاکێکەی نوێدا دەگەڕان و گرنگیان خستبووە سەر هەندێ شاری عێراق، بەتایبەت کوفە و بەسرە[1] بۆیە ئەنجامە بەدەست هاتووەکانی ئەو ئاشتەواییە گوشاری بوو بۆ سەرخەواریج.

## - کۆتاهاتنی سەردەمی خیلافەتی ڕاشییدی:

بەدەست هەڵگرتنی حەسەنی کوڕی علی بۆ معاویە(ﷺ) سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدین کۆتایی هات، بێگومان پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەرایەتی تائەوکاتەی خوای گەورە بیەوێ لەناویاندا دەمێنێ، پاشان کەویستی لێ بێ هەڵیدەگرێ، پاشان خیلافەیەکتان بۆ دەهێنێ کە بەرنامەی پێغەمبەرایەتی بێت، ئینجا حەزی لێ بێت هەڵی دەگرێ و پادشایەتیەکی تەمبێکەر دەهێنێ، خوا چۆنی بوێ ئەمێنێتەوە ئینجا ئەویش ناهێڵێ، پاشان پادشایەکی زۆردار دەهێنێ و تاویستی لێ بێ دەمێنێتەوە، پاشان خوای گەورە ئەویش ناهێڵێ، پاشان خیلافەیەکی تر دێ، ئینجا خیلافەیەکی پێغەمبەریتی دەهێنێ، پاشان بێدەنگ بوو[2]، ڕونیکردۆتەوە کە خیلافەتی پێغەمبەریەتی سی ساڵە، پاشان خوای گەورە پادشایەتی دەهێنێ، یان دەسەڵاتی هەرکەسێکی بوێ[3]، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (الخلافه فی أمتی ثلاثون سنته، ثم ملك بعد ذلك): واتە: ((خیلافەت لە ئوومەتەکەم سی ساڵەو پاشان دوای ئەوە پادشایەتیە))[4]، بەخیلافەتی حسن سی ساڵی تەواو بوو، لەڕەبیعی یەکەمی ساڵی چل ویەك خیلافەتی بۆ

---

١ ـ هەمان سەچاوە، لا( ٢٠٩، ٢١٠).

٢ ـ مسند احمد(٤/ ٣٧١ ـ ٣٧٢)، سلسلة الاحاديث الصحيحة.

٣ ـ سنن ابي داود شرح عيون المعبود (٥١٢/ ٢٥٩)، صحيح سنن الألباني(٣/ ٨٧٩).

٤ ـ سنن الترمذي شرح تحفة الأحوذي (٦/ ٣٩٥ ـ ٣٩٧) حديث حسن.

معاویە جێ هێشت، ئەوەش لەگەڵ مردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سی ساڵی تەواوە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕەبیعی یەکەم لەساڵی یانزەی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد، ئەوەش یەکێکە لەبەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی[1] بەوەش قۆناغی خیلافەتی پێغەمبەرێتی بەدەست هەڵگرتنی حسن(رضي الله عنه) لەخیلافەت بۆ معاویە (رضي الله عنه) لەمانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی٤١ك کۆتایی هات.[2]

ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاماژە دەکات بۆ چەند قۆناغێکی مێژوویی:

١. سەردەمی پێغەمبەر.

٢. سەردەمی خیلافەتی راشیدین.

٣. سەردەمی پادشای توند.

٤. سەردەمی پادشای زۆردار.

٥. خیلافەت لەسەر بەرنامەی پێغەمبەریەتی.

پێغەمبەر(ﷺ) ڕونیکردۆتەوە کە خیلافەت پێغەمبەری و سۆزو پاشان پاشایەتی و سۆز ئەبێ[3]، دەشکرێ کەسانی دوای خەلیفە ڕاشیدینەکانیش بەخەلیفە نابرێ، گەرچی پادشاش بن و خەلیفەی پێغەمبەرانیش نەبن، بەبەڵگەی ئەوفەرموودەیەی کە بوخاری ومسلم لە (صحیحە) کانیاندا لەأبو هورەیرەوە ڕیوایەتیان کردوە ئەویش لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کەفەرموویەتی:(کانت بنوإسرائیل یسوسهم الانبیاء، کلما هلك بنی خلفه بنی وإنه لانبی بعدی، وستکون خلفاو فتکثر): واتە((بەنی ئیسرائیل پێغەمبەران کاروباریانیان بەڕێوە دەبردن، هەرکە پێغەمبەرێك نەمایە پێغەمبەرێکی تر جێگەی دەگرتەوەو دوای منیش پێغەمبەرێکی ترنیە، بەڵکو جێ نیشین وزۆرن))، وتیان: فەرمانمان بەچی پێ دەکەی؟: بەیعەتیان پێ بدەن و مافیان پێ بدەن[4]، (زۆرئەبن ـ فتکثر)

---

١ ـ البداية والنهاية(٨/ ١٦).

٢ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ١٦٥.

٣ ـ سنن الدارمي(٢/ ١١٤) الأشربة الفتاوى(٠٣٥/ ١٤).

٤ ـ البخاري، رقم: ٣٤٥٥.

بەڵگەیەلەسەر ئەوەی جگە لەخەلیفەڕاشیدیەکان، چونکە ڕاشیدیەکان زۆرنەبوون، ((وفوابیعة الأول فالأول))یش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جیاوازئەبن، ڕاشیدیەکانیش جیاواز نەبوون، هەروەها ((مافی خۆیانیان پێ بدەن، خوای گەورەش لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات لەوەی بەرپرسیاریانی کردووە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەهلی سوننە لەوەی لەسەروەت و دەسکەوت مافی ئەمیرەکان بدەن[1]، بۆیە معاویە باشترین پادشای ئەم ئومەتەیە و ئەوانەی پێش ئەویش خەلیفەی پێغەمبەریەتی بوون، ئەویش خەلیفایەتیەکەی پادشایەتی بوو، پادشایەتیەکەشی ڕەحمەت بوو، سودی زۆری بۆموسڵمانان هەبوو لەکاتی خیلافەتەکەی باڵی کێشابوو بەسەریاندا، معاویە گەرچی زاناو خاوەن وەرع ودادپەروە بوو وەکو خەلیفەکانی پێشووتر نەبوو هەروەك لەداری نێوان دڵسۆزانی خواو فریشتان و پێغەمبەرانیش ئەو جیاوازیە هەیە، کە ئەوە ئیمارەتەکەی گەرچی بەکۆدەنگی هاوەڵانیش ڕاستبێ و حسن(ﷺ) خیلافەتی پێ دا بەڵام لەسەربەرنامەی خەلیفەکانی پێش خۆی نەبوو، چونکە ئەو سنوری ڕێپێدراوەکانی(المباحات)ی فراوانکردنەوە کە چوار خەلیفەکەی پێشوو خۆیان لێ دەپاراست خەلیفەش و تەرجیحدانیان لەعیبادات و معاملەدا ڕوون و بێ پەردەیە.[2]

إبن خلدون مەودای ئەو گۆڕانکاریەی دیاریکردووەکە ڕویداوە، بۆیە دەڵێ: گەرچی بۆ پادشایەتی گۆڕاوە، بەڵام واتای خیلافەت هەندێکی هەرمابوو، بەڵکو گۆڕانکاریەکە لەدەسەڵاتدران بوو، دوای ئەوەی ئاین گۆڕا بۆدەمارگیری و شمشێر، مەبەستی لەوەش دوای ئەوەی خەڵکی بەئامۆژگاری ئاین مامەڵەیان دەکرد خیلافەتیش شورا بوو، دەسەڵات وەهای لێهات پشت بەدەمارگیری وهێز ببەستێ، بەڵام واتاو مەبەست و ئامانجەکانی خیلافەت وەکو خۆیان مانەوە، واتا مەبەست و ئامانجەکانی ئەو پادشایەتیە تەنها بەدیهێنانی مەبەستەکانی ئاین وکاردن بوو بەپێ ی شەریعەتی ئیسلام بەدادگەری و جێ بەجێکرنی ئەو ئەرکانەی ئیسلام فرمانی پێکردووە، ئەو قۆناغەشی ڕونکردۆتەوە کە خیلافەت پێداتێپەڕبووەو دەڵێ: ڕوونە کە خیلافەت سەرتا بێ پادشایەتی بووە، پاشان

---

١ ـ الفتاوى(٣٥/ ١٥).

٢ ـ الناهية عن طعن أمير المؤمنين معاوية، لا ٧٨.

واتاکەی ئالۆزو تێکەڵ بەپادشایەتی بووە، پاشان پادشایەتی یەکلا بویەوە و دەمارگیری تێکەڵ بەخیلافەت بوو.[1] قۆناغی یەکەم: ئامـاژەی بـۆکردووە ئەوەسـەردەمی خەلیفـە ڕاشیدینەکانە کەسەردەمی خیلافەتی پوخت و کامڵە، قۆناغی دووەم: سەردەمی خەلیفەی ئەمەوی و عباسیە ڕێگریش نیە لەوەی کـە عثمانیـەکـانیش ئـەوە سـەردەمی خیلافـەتی تێکەڵ بەپادشایەتیەیان پادشایەتی تێکەڵ بەخیلافەتە بکەن: واتا لەوکاتەدا مەبەستەکانی بەدی هاتووە. قۆناغی سێ یەم: سەردەمی پادشـایەتی ڕوونـە کەمەبەسـت لێ ی خـودی پادشایەتی مەبەستە دونیایەکانە و جیاوازبۆتـەوە لـە ڕاسـتەقینەی خیلافـەت یـان واتـە ئایینـەکان، ئـەوەش وەسـف یـان شـیکردنەوەی إبـن خلـدونی مێژوونوسـی تیگەیـشتوو وشارەزای ئەوپەرەسەندن و قۆناغانەیە کە خیلافەتی پێدا تێپەڕبووە.[2]

بێگومان خیلافەتی ڕاستەقینە، خیلافـەتی پێغەمبـەرێتی سـی سـاڵ بـەرەوام بـووە، ئەویش سەردەمی خەلیفە ڕاشیدیەکانە وپاشـان گـۆڕا بـۆ پادشـایەتی، بـەڵام بـۆ ئـەوەی حەقیقەت دەربڕین پێویستە ئـەو دیاریکردنـە ڕەچـاوبکرێت، ئـەوە بەخیلافـەت کۆتـایی نەهاتبوو، بەڵکو مەبەستەکانی مابوو، گۆڕانیش لەوبناغەیـەبوو کـە بناغەکـەی لەسـەر داندرا ودامەزرا، بەڵام حەقیقەتەکەی وەك خۆی مایەوە، کەواتە گۆڕانەکە گـشتی نـەبوو، بەڵکو بەشێکی بوو واتە: خیلافەت لەسەردەمی یەکەمدا خیلافەتی کامڵ ونمونـەیی بـوو، پاشان لەڕویەکەوە یان لەچەند ڕوویەکەوە لەو نموونەیە کەمبۆوە، بەڵام زۆربەی ڕەگەزەکانی مایەوە، خیلافەتێك بووکەمتر لەپلەدا بوو یان خیلافەتی تێکـەڵ بـە پادشـایەتی بـوو[3]، بۆچونی گشتی لەئیسلامدا خۆی بەنموونەدەبەستێتەوە یان بەخیلافەتی پێغەمبەریەتی یـان خیلافەتی کامڵ، کەلەسەر شواراو هەڵبژاردنی ئومەتەوە دەوەستێتەوە، گەرچـی واقیـع و هەل ومەرج و هۆکارەکۆمەڵایەتەکانیش گەیاندنیە ئەو پەرەسەندنە، هەڵگرتنی ئەوبارەیان قبوڵ کردنی کاتی نیە و لەڕووی پێویستەوە نیە، بەڵکو پێویست دەکات نموونەی کامـڵ و هەمیشە لەبیری ڕای گشتیدا بوونی هەبێ، تەنیا بەڕەوینەی ئەو گەڕانەوە بـۆ بـەدیهێنانی

---

١ ـ مقدمة إبن خلدون، النظريات السياسية، لا ١٩٥.

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٩٥.

٣ ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٩٧.

نموونـەی کامـڵ، بۆیـە نوسـینە ئیـسلامیە ڕەسـەنەکان بەوپابەندبوونـە ماوەنـەوە و بنەماکانیشی لەوەوە پوختەکراوەو جیاوازی نێوان ئەو خیلافەتە ڕاسـتەقینە و شـەرعیەی کردووە لەگەڵ ئەوخیلافەتە واقیعیەی کەم یان زۆر لە ڕاستەقینەکە دوورکەوتۆتەوە.[١]

إبن تەیمیە باسی کردووە: گواسـتنەوەی خیلافـەت بـۆ پادشـایەتی و والی و قـازی و ئەمیرەکانیشی تەنیا تەواوی ئەوکەسانەنیە بەتەنیا، بەڵکو ناتەواوی دەسـەڵاتدارو خەڵکـە بەگشتی، چونکە ئێوە چۆن بن ئاوەهـاش بەڕێوەئـەبرێن، خـوای گـەورەش فەرموویـەتی: ﴿وَكَذَلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا﴾[ الأنعام: ١٢٩].

بێگومان دەوڵەتی خەلیفـە ڕاشـیدینەکان نـەما و بویـە پادشـایەتی و ناتەواویـەتی لەئەمیرەکان دەرکەوت و چەند کەسێکی کەمی بەشـدار بـووی بـەدرمابوون وهـاوەڵانیش نەمان لە ئیمـارەتی زوبـیر وعبـدالملیك دا، کـۆی تـابیعی تابیعـەکانیش لەکۆتاییـەکانی دەوڵەتی ئەمەوی و سەرەتاکانی دەوڵەتی عباسی نەمان[٢].

ـ ئایە معاویە بەیەکێك لەدوانزە خەلیفەکەدادەنرێ؟

جابرکوڕی سمرە(ﷺ) دەڵێ: لەگەڵ باوکمدا ڕۆیشتمە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)گوێم لێ بوودەیفەرموو:(إن هذا الامر لاينقضي حتى يمضى فيهم اثنا عشر خليفة) واتە: ((ئـەم کاروبارە ئایینیە تەواو نابێ تا دوانزە خەلیفەکانی تیایدا بێ))، پاشـان لەسـەرخۆ قـسەی کردوو لەمنی شاردەوە، بەباوکمم ووت: پێغەمبەر(ﷺ) چی فـەرموو؟ ووتـی: ((گـشت ئەو دوانزە خەلیفەیە قورەیشین))[٣]، لەڕیوایەتێکی تـردا هەرلـەجابرەوە ئیـسلام تـادوانزە خەلیفەکە سەربەرزو عەزیزە هەمووقورەیشین))[٤]، هەرلەڕیوایەتێکی تردا لەوەوە: ((ئـەم ئایینـە سـەربەرزو عـەزیزە تـا دوانـزە خەلیفەکەهـەموویان قورەیـشین))[٥] أبـووداود لەسونەنەکەیدا زیادی کردووە بەئیسنادی خۆی لەجابرەوە (ﷺ) دەڵێ: کەگەڕایەوە مـاڵی خۆی و کۆمەڵێ قورەیش هاتن و ووتیان: پاشان چی دەبێ؟ فەرمووی: ((دەبێتە کوشـتارو

---

١ ـ الفتاوی(٣٥/ ١٥).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(١٠/ ٢٠٧).

٣ ـ صحيح مسلم على شرح النووي(١٢/ ٢٠٢).

٤ ـ هەمان سەرچاوە(١٢/ ٢٠٣).

٥ ـ هەمان سەرچاوە(٢٠٣/١٢).

ئاشووب))[1] إبن كثير ئەم فەرموودەیەی ڕاڤەکردووە دەڵێ: واتای ئەم فەرموودەیـەش دان نانە بەبوونی دەخەلیفەی چاك كەدادگەری بەر جەستەدەكەن، چواركەسیان لێ هـاتووە كـە أبوبكرو عمرو عثمان و علي (ﷺ) بەلای گـەورە زانایانیـشەوە بێگومـان عمـری كـوڕی عبدالعزیزییان تێدایە و هەندێ لەخەلیفەكانی (بنی العباس)یش، قیامـەتیش نایـەت تـا ولایــەتیان نەیەتـــەدی و مەهـــدی موژدەپێـــدراویش یەكێكـــە لەودوانزەكەســـە كەلەفەرمودەداموژدەی پێدراوە....لەپاڵ ئەوانیش كە إبن كثیر باسیی كـردووە پێنجـەمین خەلیفەی ڕاشیدینیش دێ كەئەمیری ئیماندران حەسەنی كوڕی عەلیە(ﷺ)، بیرو بۆچـونی ئەهلی سوننە و شیعەی ئیمامیشم ڕوونكردۆتەوە لە: (أسمى المطالب في سيرة المؤمنين علي بن ابي طالب شخصية وعصره) هەركەسێك باسـی تـەواوی ئـەوێ باتەماشـای بكـات و سوپاسی دەكەم، سەبارەت بەقۆناغی دوانزە خەلیفەكە ئەوەبەپشت بەستن بەوڕووەی كە إبن كثیر باسیكردووە، ئەوە ئەم قۆناغەش تایبەتمەندە بەوەی زەمەنەكەی تێكەڵ بەگـشت ئـەو قۆناغانەیە، خەلیفەكانی ئەم قۆناغەش دەركەوتنیان لەم ئومەتـەدا یـەك لـەدوای یەكـەو پەرتیشن، ئەوەش سۆزی ومیهری خوایە بۆئـەم ئوممەتـە، دەسـپێكردنی ئـەو خەلیفانـەش بەكۆچی دوایی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەست پێ دەكات، واتە: بەخیلافەتی أبـوبكر(ﷺ) و تەواو بوونی ئەو قۆناغەش بەدەركەوتنی كۆتایان لەئاخیرزەماندا تەواودەبێ.[2]

ئایە حەسەنی كوڕی علي(ﷺ) لە بەهێزی یان بێ هێزی بـۆ معاویـە دەسـتبەرداری خیلافەت بوو ؟ بەڵك و حەسەنی كوڕی علي(ﷺ) لەهێزدا بـۆ معاویـە دەسـت بـەرداری كرد، ئەمەش نیشانەو بەڵگەگەلێكە:

١. ئەو شەرعیەتەی حسن هەیبوو:

بەیعەت پێدادنی لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٠ی كۆچی بـوو، دوای شـەهید كردنـی علي(ﷺ) ئەمیری ئیماندارن، حسن دوای ئەو بەشـورا هەڵبـژێردرا و خەلیفـەی شـەرعی حیجازو یەمەن و عێراق و گشت ئەوشوێنانە بوو كەلەژێر دەسەڵاتی باوكیدا بوون، شـەش مانگ لە خیلافەتەكەیدا بەردەوام بوو، ئەوماوەیەش دەچێتە نێو ئەوخیلافـەتی ڕاشـیدیی

---

١ ـ سنن أبي دواد مع شرحها عون المعبود(١١/ ٢٤٩)، صحيح سنن الألباني(٣/ ٨٠٧).

٢ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ١٦٥.

که پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی پێداوە کەسی ساڵە و پاشان ئەبێتە پادشایەتی، ترمزی بە ئیسنادی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕیواتەی کردوە پێغەمبەر فەرموویەتی: (الخلافه فی أمتی ثلاثون سنته ثم ملك بعد ذلك) واتە: ((خیلافەت لە ئوممەتەکەمدا سی ساڵە، دوای ئەوە پادشایەتیە)).[1]

إبن کثیر لە بارەی ئەوفەرموودەیە دەڵێ: سی ساڵەکە بەخیلافەتی حەسەنی کوڕی علی تەواوبوو، چونکە لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چل و یەك بۆ معاویە وازی خیلافەت هێنا، لەوەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) تائەوکاتە سی ساڵی تەواوبوو، چونکە لەڕەبیعی یەکەمی ساڵی یانزەی کۆچی دواییکردوە، ئەوەش یەکێکەلە نیشانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)[2]، بەوەش حەسەنی کوڕی علی پێنجەمین خەلیفەی ڕاشیدین[3]، زۆریکیش لەزانایانی ئەهلی سوننە لەبارەی شەرعیەتی خیلافەتی حەسەنەوە قسەیان کردووە، لەوانە أبوبکربن العرین[4] وقاضی عیاض[5] وإبن کثیر[6]و ڕاڤەکاری طحاوی[7] ومناوي[8] وإبن حجر الهیثمی.[9]

ئەگەر حسن بیویستایە بەو پێیە شەرعیەتی هەیە ئەیتوانی معاویە ماندوبکات و هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی بەهێزی لەنێو خەڵکی شامدا دەست پێ دەکرد بۆ ڕاکیشانی متمانەیان یان بەلای کەمەوە پێگەی معاویەیان لا لاوازبکات، بێگومان هێزێکی مەعنەوی و ڕۆحی هەبوو بەوێنەیی شەرعیەتی هەبوو بەرئەوەی کچەزاونەوەی پێغەمبەری خوابوو(ﷺ).

---

١ ـ سنن الترمذي مع شرحها تحفة الأحوذي(٦/ ٣٩٧) حديث حسن.

٢ ـ البداية والنهاية(١١/١٣٤).

٣ ـ مآثر الأناقة (١/١٠٥) مرويات خلافة معاوية، لا ١٥٥.

٤ ـ كلام القران لإبن العربي(٤/ ١٧٢٠).

٥ ـ شرح النووي على صحيح مسلم (١٢/ ٢٠١).

٦ ـ البداية والنهاية(١١/ ١٣٤)

٧ ـ شرح الطحاوي، لا ٥٤٥.

٨ ـ فيض القدير (٢/ ٤٠٩٩).

٩ ـ الصواعق المحرقة(٢/ ٣٩٧).

### ٢. هەڵسەنگاندنی حەسەنی کوڕی علی بۆ هەڵوێستەکان و توانا سەرکردایەتیەکەی:

کاتێ نەفیری کوڕی حەزرەمی پێ ی ووت: خەڵکی وەهای دادەنێن کەخیلافەتت بۆی، ووتی: ئێسك و پروسکی عەرەبم لەبەردەستدا بوو، ئاشتەوایی هەرکەسم بکردایە ئاشتەوایان ئەکردو دوژمنایەتی هەرکەسم بکردایە جەنگان ئەکرد، بۆیە لەبەر ڕەزامەندی خوا دەستم لێ هەڵگرت.[1]

ئەوەش شایەتیەکە لەحەسەنەوە(ﷺ) بەوەی لەهەلومەرجێکی بەهێزدا بوو. شوێنکەوتوانیشی ئامادەی جەنگ و ئاشتی بوون، هەروەها توانایی وتاربێژی وزمان پاراوی ڕونی هەبوو، سۆزی ڕاستگۆیانە و کاریگەری بەهێزو نزیکی لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) هەبوو، ئەوەش تواناو هێزی زۆر پێدابوو، بەڵگەشمان بۆ ئەو دەرچونەیی خەڵکی کوفە لەگەڵ باوکیدا، ئەبو موسای ئەشعەریش(ﷺ) لەدەرچوون و کوشتار ڕێگریکردن و ئەوئاگادارکاریەی بەگوێدان کەلە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بیستووی لەبەشداریبوون لەئاشوبەدا.[2]

علی(ﷺ) پێش حسن، محمدی کوڕی أبوبکر و محمدی کوڕی جعفری نارد، بەڵام لەکاری خۆیاندا سەرکەوتوو بوون، دوای ئەوەش علی هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاسی ناردوە، ئەویش لەکاری خۆیدا شکستی هێنا، ئەوەش بۆ ئەوە بوو أبووموسا کاریگەری لەسەریان هەبوو[3]، علی عبدالله عباس نارد ئەویشان سارد کردەوە، بۆیە عماری کوڕی یاسر و حەسەنی نارد[4]، حسن کاریگەری ڕوونی هەبوو، بۆیە لەنێوخەڵکەکەدا هەستاو ووتارێکی دا ووتی: ئەی خەڵکینە بەدەم بانگەوازی ئەمیرەکەتانەوە بچن و بۆلای براکانتان بەڕێکەون، چونکە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم دەسەڵات و کارە کەسێ دەدۆزێتەوە بۆی

---

١ ـ البداية والنهاية (٢٠٦/١١).

٢ ـ تاريخ الطرى (٥/ ٥١٤) مصنف إبن أبي شيبة(١٢/١٥) إسناده حسن.

٣ ـ خلافة علي بن أبي طالب، لا ١٤٤، عبد الحميد، سير أعلام النبلاء(٣/ ٤٨٦).

٤ ـ فتح الباري(٥٣/١٣)، علي بن أبي طالب للصلابي(٢/ ٦٠).

بێـت، لەخێراییـدا نموونـەی هەیـەو لەئەنجامیـشدا پاداشـتە، بۆیـە بەدەمانـەوە وەرن و یارمەتیمان بدەن لەوەی ئێمە و ئێوە پێیەوە تاقی بوینەوە [1]، لەوەشدا زۆرێك لە خـەڵكی کوفە لەگەڵ عمارو حسندا بەشەش تا حەوت هەزار پیاو بۆلای علی دەرچوون.[2]

ئەوەشمان لە بیر نەچێ أبوموسـای ئەشـعەری والی کوفـە ویـەکێك بـووە لەسـەرکردە خۆشەویستەکانی عێراق لەسەردەمی عمرو لەگەڵ ئـەو زانـست و زوهـد و پێگەیـەی لای خەڵکیدا حسن توانیویتی بۆرێزەکەی خۆی خەڵکی ڕاکێشێ و لەگەڵیدا دەربچن.

١. کۆمەڵەکەی حەسەنی کوڕی علی خاوەنی سەرکردە گەورەکان بوو، وەکو حوسەینی برای و عبداللـە کـوڕی جعفـر ئـامۆزای و قەیـسی کـوڕی سـعدی عوبـادە کەلـە عاقـل شارەزایەکانی عـەرەب بـوو، عـەدی کـوڕی حاتـەم و ئەوانـەیتر، بۆیـە گـەر خیلافـەتی بویستایە ئـەوە بـواری جولانـەوەی بەسـەکردەکانی ئـەدا خـەڵکی ئامادەبکـەن ولەگـەڵ معاویەدا بچنە جەنگەوە و بەلای کەمەوە تاوەختێك لەدەوڵەتەکەی خۆیدا خەلیفە دەبوو.

٢. حـسن توانایـەکی بـەهێزی هـەبوو لەمامەڵـە کردنـی لەگـەڵ خـەڵکی عێـراق وشارەزابوونیان و بۆیە لەسەرتای خیلافەتەکەیدا بەخشینی بۆزیادکردن، هـەروەها هـەوڵی گرنگی خۆی کە بۆ سەرکەوتنی پـرۆژەی ئاشـتەوایی ئەیبەخـشی سـەخت بـوو لەجـەنگی لەگەڵ معاویەدا، لەگەڵ ئەوەشـدا زاڵبونەبەسـەرزۆرێك لەوتەنگەژانـەی بـەرووی دەبـووە، هەولیانـدا بیکـوژن، هەنـدێ خـەڵکی ئاشـتیان، بـەلام بەسـەر هەموویانـدازاڵ بـوون، ئەوئامانجانەشی هێنایەدا کەبۆ پاراستنی خوێن ویەکخستنی ئوممەت و پاراستنی ڕێگاکـان و گەڕانەوەی بزوتنەوەی فتوحات و...هتد وێنای کێشا، ئەوەش بەڵگەی توانا سەرکردایيە لەڕادەبەدەرەکەیەتی.

٣. هەڵسەنگاندنی عەمری کوڕی عاص و معاویە بۆ هێزەکانی حسن(رضي الله عنه):

لە صحیحی بوخاریدا هاتووە حسن بەهێزێك ڕوبەڕووی بۆوە نموونـەی چـیابوون، بۆیـە عەمری کوڕی عاص ووتی: من وای دەبیـنم هـەموو لەناوبچن، معاویـەش ووتـی: ئـەی

---

١ ـ تاريخ الطبري(٥/٥١٦).

٢ ـ مصنف عبدالرزاق(٥/٤٥٦ ـ ٤٥٧) بسند صحيح إلى الزهري.

عەمر گەر ئەوانە بکوژرێن چی لەژن و منالّ و پیرەکانیان بکەم؟ بۆیە دووپیاوی ناردکە عبدالله کوڕی عامری کوڕی کریز وعبدالرحمن کوڕی سەهرە لەنەوەی عەبەشەش بوون ووتی: هەردووکتان بڕۆنەلای ئەوپیاوەو چەند شتێکی بخەنە بەردەست و داوای لێبکەن.[1]

أ ـ عەمری کوڕی عاص(ﷺ) سەرکردەی سەربازی بەناوبانگ وسیاسیەکی هەڵکەوتوو بووکە جەنگ پیری کردبوو فەرمووی: من ئەبینم ئەم کەتیبانە هەموویەك بکوژن.

ب ـ معاویەش (ﷺ) هەڵسەنگاندنی بۆ هەڵوێستە سەربازیە ئەوە بووکە هیچ کەسێك ناتوانێ سەربکەوێ و تەنیا دوای زیانێکی زۆری هەردوولا ئەتوانرێ سەرکەوتنێکی سەربازی بەدی بهێنرێت، تەنانەت گەر معاویەش سەربکەوێ ئەوە ناتوانێ ئەودەرهاوێشتانەی لەبێوەژن و هەتیو و کوژرانی باشترین موسڵمانان گریتە ئەستۆ کە جەنگ بەجێ ی هێشتووە، چونکە زیانێکی گەورەی کۆمەڵایەتی و سیاسی وئابوری ئەخلاقی بۆ ئوممەتی ئیسلامی بەجێ دەهێڵێ .

ج ـ دووکەسیایەتی گەورەی لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵبژارد کەخاوەن پێگەیەکی باڵابوون لەکۆمەڵگەی ئیسلامی ئامادەیی و ڕێزیان بوولای حەسن(ﷺ) و هەردووکسی قورەیشی بوون ئەوانیش:

* عبدالرحمنی کوڕی سەمرەی کوڕی حەبیب کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عبدالشمس کوڕی عبدالمناف أبوسەعید القرشی العبشمی یە، عبدالرحمن لەڕۆژی فەتحدا موسڵمان بوو، یەکێکیش بوو لەگەورەناودارەکان، لەبەسرە دانیشت و غەزای سجیستانی کرد[2]، ئەوکەسەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبارەوە فەرموویەتی: ((ئەی عبدوالرحمن، داوای بەرپرسیاریەتی و دەسەڵات مەکە، کە بێ هۆ ئەنجامت دا ئەوە پەشیمانی لەسەر ئەکێشێ، گەر وەکو خۆیشی گەیاندت ئەوە پاداشت لێ هەیە))[3]، لەمسندی بقی إبن مخلد چواردە فەرموودەی هەیە، ئەمانەش لەبارەیەوە قسەیان کردووە: إبن عباس و سعید کوڕی مسیب و عبدالرحمن بن أبی لیلی، حّیان کوڕی عمیر وإبن سیرین و حسن و سعیدی

---

١ ـ البخاري، كتاب: الصلح، رقم: ٢٧٠٤.

٢ ـ سير أعلام النبلاء(٢/ ٥٧١).

٣ ـ مسلم، كتاب: الإيمان، رقم: ١٦٥٢.

کوڕی ئەبو حەسەنی بڕای وحەمیدی کوڕی هیلال، گوتراوە ناوی عبدالکلال بووەو پێغەمبەری(ﷺ) ناوەکەی گۆڕیووە[1] بۆ عبدالرحمن و ساڵی پەنجا لەبەسرەدا کۆچی دوایی کردووە، ووترایشە ساڵی پەنجاویەك بووە. [2]

عبدالرحمنی کوڕی سەمرە هاوەڵێکی پایەبەرزو خاوەن پێگەبوو لەوسەردەمەدا لە فتوحاتەکان و بەڕێوە بردنی سوپا بەشەداربوو لەسەردمی عثمان، بەئاشتی سجیستانی فەتح کردوو، دوای ئەوەش شاری (بوست)ی فەتح کردووە و دواتریش بۆکابول و زابلستان ڕۆیشتووەو هەمووی فەتح کردووە و غەنیمەی بۆ إبن عامر(رضي الله عنه) ناردووە[3]، ئەویتریش عبدالله کوڕی عامری کوڕی کریز کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عبدالشمس کوڕی عبدالمناف کوڕی قوسەی قورەیشی عبدالشمی بوو[4]، ساڵی چواری کۆچیدا لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) لەدایك بووە [5]، کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ساڵی حەوتی کۆچی چویەوە مەکەبۆ عەمرە، عبدالله کوڕی عامیریان هێنایەلا، إبن حەجەر دەڵێ: یاری لەگەڵدا کردو پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی ئەوە کوڕی سولەیمە؟ ووتیان: بەڵێ، فەرمووی: بە ئێمە دەچێ، پاشان تفی کردە دەمی و دوعای بۆ دەکرد و ئەویش تفەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) قوت دا و فەرموی: ((ئاوم پێدەات)) بەهەر زەویەکەوەدا بڕوات ئاوی بۆدەردەکەوێ [6]، لەکتێبەکەمدا لەبارەی ژیانی عثمان(رضي الله عنه) ولەبارەی دامەزراوەی ولایەتەکانی سەردەمی عثمان(رضي الله عنه)باسی ژیانیمان کردووە.

إبن تەیمیە دەڵێ: ئەو پیاوەبوو کە خۆشەویستی ودڵسۆزی لەدڵی خەڵکیدا هەبوو، زەهەبیش لەبارەیەوە دەڵێ: لەگەورە ئەمیرانی عەرەب سەخیترینیان بوو، نەرمونیانی تێدا بووە[7]، ئەوکەسە بوو لە (جمل وصفين) دا لە کوشتن دورکەوتەوە، بۆیە ئەو دووپیاوەی

---

١ ـ سير أعلام النبلاء(٢/ ٥٧٢).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٢/ ٥٧٢).

٣ ـ تاريخ دمشق(٢٦/ ٢٨٩ ـ ٢٩٠).

٤ ـ البداية والنهاية(٨/٠٩١).

٥ ـ تهذيب المتهذيب(٥/ ٢٧٢).

٦ ـ الطبقات (٥/ ٣١)، تهذيب التهذيب(٥/ ٢٧٢).

٧ ـ سير أعلام النبلاء(٣/٢١).

معاویـه(ﷺ) ناردیـانی بەڵگـەی پێـداگری بـوو لەسـەر کـەوتنی ئاشـتی لەگـەڵ حسن بەهەرنەریتێك کە بکرێت، جڵەوی کاروبـاریش بەدەسـتی حەسـەنی کـوڕی علـی(ﷺ) و پشتوانەکانی بوو، هەروەکو ڕیوایەتەکانی بوخاری باسکراوە.

ڕوبەڕوبونەوەی حەسەنیش (ﷺ)بۆکوشـتن و دەسـتدرێژی ئـەوە ئەگێڕێتـەوە بـۆ چـەند هۆکارێك کە پەیوەستە بەکوشتارو ئاشتی لەگەڵ معاویەدا، ڕاستەقینە بێ یـان درۆ وەکـو باسمانکرد، بێگۆمان ترسێنەران تێکشکان ئـەو پیـاوەش کـوژرا کـە بەسـتەمکردنە سـەر هەستا و دواتریش لەگەڵ معاویە کۆبۆوە معاویەش پێویستی پێ بوو تویژی لەگەڵ بکـات و دەستەبەر یەکانی قبوڵ بکات، بەڵام لاوازی و پەشێوی بێ هێزی ڕێگا بەچاوانیەوە بینی و بێ وتوێژی کەسی یان وازهێنانی لە مەرج و داواکاری دەچویە کوفە.[1]

حسن لەتوانایدا هەبوو جەنگی لەگـەڵ معاویـەی بکردایـە، ئـەوەش بـەو پـشتیوان و یاریدەرانەی کە هەبوو، بەڵام حسن حەزی لەئاشتی و ڕقی لەئاشـوب و پەرتـەوازیی بـوو، خوای گەورەش بەهۆی ئـەو موسـڵمانانی یەکخـستنەوە، پێغەمبـەریش (ﷺ) ئامـاژەی بەوەکردووە[2] و فەرموویەتی: (إن انبی هـذا سید، ولعل الله یصلح به بین فئـتین عظیمـتین من المسلمین) واتە: ((ئەم کوڕەی منە سەیدە، هیوادارم وەهایە خـوای گـەورە ئاشـتەوایی نێو دوکۆمەڵی گەورەی موسڵمانی بکات)).[3]

## حسن وبەکەمگرتنی دەسەڵات:

حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) لەخۆبەرزگرتن لە بەرامبەر ئارەزووی دونیاو داواکردنی ئەو پاداشتە لای خوای گەورە هەیە پێشەنگە بۆ موسڵمانان، چونکە گوێنـەدان بەپلـە وپایـەو دەسەڵاتەکان لەوشتانەیەکە لە سەر دەرونی مرۆڤەوە قورسـە، بـراو دڵـسۆزان و نزیکـانی لەسـەر کورسـی و دەسـەڵات یـەکتر دەکـوژن، بۆیـە بڕوانـە مێـژووی کـۆن و نـوێ سەرسوڕهێنەرترین شت دەبینی، بەکەمگرتنی سەرۆکایەتی کـەمترین کارێکـە لـەدونیای

---

١ ـ دراسة في تاريخ خلفاء الدولة الأموية، لا ٦١.

٢ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٦١.

٣ ـ البخاري، رقم: ٧١٠٩.

خەڵکیدا، ئاخۆ چەندە خەڵکی دوریان نواندووە لەسەروەت و ئافرەت و شتە دنیایەکانی تردا، بەڵام لەبەرامبەر سەرکردایەتی کردن وپلە وپایەکاندا تێکشکاون، بۆیە دوری نواندن لەدەسەڵات کەمترین شتێکی دونیای خەڵکیە ووتراویشە کۆتاشتێکە لەدڵی چاکەخوازاندا ئەبێتەوەو بڕوانە وتەکەی سوفیانی سەروری کەفەرمویەتی: ((زوهدم نەبینوە لەشتێکدا کەکەمتر بێت مەگەر لە سەرۆکایەتی نەبێت، کەسێ دەبینی لەخواردن و خواردنەوەو سەروەت و بەرگدا زوهد دەنوێنێ، ئامان تۆو خۆشەویستی دەسەڵات و گەورەیی، چونکە ئەو پیاوەی سەرۆکایەتی لەزێرو ئاڵتون بەلاوە خۆشەویسترە، ئەوە لەدەرگایەکی تەمومژاویەوە، تەنیا زاناماستاوچیەکان ئەیبینن، بۆیە خۆت ووشیاربکەو بەنیازەوە کاربکە، بزانە خەڵکی دۆڕاندو فرمانیدا کەکەسە بمرێت.[1]

بۆیە حەسەنی کوڕی علی فێرمان دەکات چۆن واز لەدەسەڵات وکورسی بهێنێین و لێ ی دوورکەوینەوە، گەرلەوازلێهێنانیدا ئەمانەی تێدابوو: ڕەزامەندی خواو بەرژەوەندی ئوممەت و پاراستنی خوێنیان وکارکردن لەیەکخستنیان و لەو کاروبارانەش کەیارمەتی دونیا بەکەمگرتنمان ئەدات، هیوا کورتی ویادی مەرگ و سەردانی گۆڕستانە، حەسەنی کوڕی علی لەسەر ئەنگوستیلەکەی نوسرابوو:

قدّم لنفسك ماستطعت من التُقى    إن المنية نازل بـــــك يافتى

أصبحت ذا فرح كأنك لاتـــــرى    أحباب قلبك في المقابر والبلى[2]

واتە: چەندە دەتوانی خواپەرستی بۆخۆت ئەنجام بدە، چونکە مردنت بۆدێت ئەی لاو، بویتە بەخاوەن خۆشیەك وەك ئەوەی نەبینی خۆشەویستان لەگۆڕو خۆڵدان.

بێگومان حەسەنی کوڕی علی زاهیدترین کەسی سەردەمی خۆی بوو، ئەوپلەو پایەشی بەدەست هێنا، وازی لەدونیا وخۆڵ وخاشاکەشی هێناو بەڕەزامەندی خواوە سەرقاڵبوو وازی لەپلەو پایەی لای دروستکراوەکانی هێنا، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەروە خۆشەویستی

١ ـ حلية الأولياء(٣٧٦/٦)، فقه الفتن، عبدالله شعبان، لا ١٤٢.

٢ ـ تاريخ دمشق(١٤/ ٨٦).

و ڕێـزی حەسـەنی خـستبووە دڵـی مرۆڤەکانـەوە، گەرچـی خۆیـشی ئـەوەی نەدەویـست وبەشوێنەیدا دەگەڕا، بەڵکو سەخترین شێوە لیّ ی هەڵدەهات تـاوەکو مرۆڤـەکان لـەخوای گەورەی دانەبڕن: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا٩٦﴾[ مريم: ٩٦]، واتە لەدڵی بەندەکانیدا، لەفەرموودەشـدا هـاتووە: ((إن الله إذا أحب عبداً نـادى ياجبريل إني أحب فلان فيحبه جبريـل، ثـم يحبـه أهـل الـسماء ثـم يوضـع لـه القبـول في الأرض)).[1]

بەهەرحاڵ گەڕان بەدوای ڕێزی ئاخیرەتدا ڕێـزی دونیاشـی لەگەڵـدا دێتـە دی، گەرچـی خاوەنەکەشی ئـەوەی نـەویّ، گـەڕان وداواکـردن ڕێـزو گـەورەیی ودونیـاش لەگـەڵ ڕێـزی ئاخیرەتـدا کۆنابێتـەوە، بەختـەوەریش ئەوکەسـەیە مانـەوەی بەسـەر لەوناوچـوودا پـێش ئەخات.

أبو الفتح البُسستي دەڵێ:

أمران مفترقان لستُ تراهـــما يتشوقان الخلطة وتلاقي

طلب المعاد مع الرياسة والعُلى فدع الذي لما هو باقي[2]

دوو شـتی جیـاوازن و نـابینم ئـارەزووی بەیەکگەیـشتن و تێکـەڵبون بکـەن، ویـستی ئاخیرەت لەگەڵ ویستی گەورەیی و سەرۆکایەتی، بۆیە واز لەوە بهێنەکە لـەنێو بـچیّ بـۆ ئەوشتەی کە ئەمینێتەوە.

بەڕاستی حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) فێرمان دەکات چۆن دەسەڵات و ناوبانگی بەکـەم بگرین لەپێناو ڕەزامەندی خوادا، بۆیە حسن(ﷺ) بەوازهێنانی لەدونیا گەورەیی و پلـەی زیاتر بەرزبونەوەو بویە هێمایەکیش بۆ خۆڕەتکردنەوەوبویە مامۆستاو قوتابخانەو شـانازیی بۆ ئومەت لەوەی یەکبونی ئومەتی پێشخست و خوێنەکـەی پاراسـت و پێشخستە سـەر بەرژەوەندیەکانی تر...

---

١ ـ مسلم، رقم: ٢٦٣٧.

٢ ـ أمراض النفس، د. كرزون، لا ٧٧.

بێگومان حەزی گەوریی دڵی زۆرێکی داگیر کردووە و بۆ پێ گەیشتنی ڕکابەری و کێبڕکێیانە و لەپێناویدا سەروەت و ووە دەبەخشن و بەفێڵ و لەخشتە بردن هەوڵی پێگەیشتنی دەدەن و ئەیخەنە پێش ئارەزووی ماڵ خۆشویستن، ئەوەش لەبەرئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١. چونکە بەهۆی گەورەیی گەیشتنە سەروەت و سامان ئاسانترە لەبەماڵ گەیشتنە گەورەیی، چونکە زانایان خواناس کە گەورەیی لەدڵەکاندا هەیە گەر سەروەتی بوێ ئەوە خەڵکی لەماڵی خۆیان سەروەتی بۆ کۆدەکەن.

٢. سەروەت و سامان ئەگەری تیاچون و مەترسی پێ گەیشتنی هەیە، بەڵام گەورەیی گەر چوە دڵانەوە، ئەوە دەبێتە خاوەنی وتیایدا جێگیردەبێت، مەترسی نامینێت تا ئەوکاتەی تێڕوانینی خەڵکی بۆ ئەوکەسە دەگۆڕێت.

٣. بوون بەخاوەنی دڵان ئاسانەو بەپێ ی خۆماندووکردن و ڕق نواندن زیاد دەکات، خەڵکیش ئەگەر بەکەسێ سەرسام بن زۆر پێیدا هەڵ دەڵێن وقسەی لەبارەوە دەکەن وناوبانگی لە ناویاندا بڵاودەبێتەوە.[1]

## - ژیانی حسن دوای ئاشتەوایی لە مەدینەدا:

حسن بۆ دەستەبەر کردنی خیلافەت بۆ معاویە، لەگەڵ هاوەڵان و نەوەی هاشمدا کوفەی بەجێ هێشت ڕووەو مەدینەو لەوێ گیرسایەوە، هاشمیەکان جێ ی ڕێزو گەورەیی معاویە بوون(ﷺ) و سەرکردایەتیشیان لای حەسەنی کوڕی علی (ﷺ)، مەدینەش لەو کاتەدا ژمارەیەکی زۆری هاوەڵانی تێدا بوو، سەرباری ژمارەیەك لەو تابیعانەی قوتابی هاوەڵە زاناکان بوون و ڕێبازی ئەوانیان وەرگرتبوو، ئەوانەش تێکەڵەیەکی کۆچەران وئەنصاران و جگەلەوان بوو، کاری گرنگی ئەو خەڵکەش پەرستن و فێرکردنی خەڵکی و گێرانەوەی ئەوفەرموودانەبوو کە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لەبەریان کردبوو، بەشداری ئەوە دەبوون کەئوممەت دەچویە ناویەوە، دژی کەس نەبوون، لەوانە عبدالله کوڕی عمر و عبدالله کوڕی

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٧٧.

عباس و ئەبو هورەیرەو أبوو سەعیدی خدری و جابری کوڕی عبداللە [1]،ژیان لـە مەدینـە ژیانێکی زانستی بوو، کەزانستخوازان تیایدا یەکلاببونەوە بۆگێڕانەوەی فەرموودە و ڕاڤـە کردنی قورئان و هەڵێنجانی حوکمـە شـەرعیەکان، چـونکە ئـارامی و دڵنیـایی تێـدابوو ئەوەش یارمەتیدەری زانست و لێکۆڵینەوە بوو.[2]

١. پەیوەندی نێوان حسن و معاویە(ﷺ) دوای ئاشتی:

حەسەنی کوڕی علی(ﷺ) لەکاتی خیلافەتی معاویـە دا سـەردانی معاویـەی دەکـرد، جارێکیان ڕۆیشتە لای معاویەش پێ ی ووت: پاداشتێکت دەدەم هیچ کەسێکم پێشتر بـەو جۆرە پاداشت نەدابێ، لەوێدا چوار سەد هەزاری پێداو ئەویش وەریگرت[3] لەو ڕیوایەتەس هاتووە:حەسەنی کوڕی علی هەمووساڵێك سـەردانی معاویـەی دەکـرد، معاویـەش سـەد هەزار درهەمی پێ دەدا، ساڵێك نەڕۆیشت و معاویـەش هیـچی بـۆ نـەنارد، بۆیـە داوای پـەڕەی کـرد تـابۆ معاویـە نوسـراو بنوسـێت، لـەوەدا خـەوی لێ کـەوت و لەخەویـدا پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی پێ ووت: بـۆ دروسـتکراوێك نامەدەنوسـی و داوای پێویـستی لێ دەکەیت ولەپـەروەردگارت داوا ناکـەیت؟ حەسـەنیش ووتـی: چـیبکەم ئـەی پێغەمبـەری خواقەرزم زۆربووە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: بڵێ: ((اللهم إني أسالك مـن كـل امـر ضعفت عنه قوتي وحياتي ولم تنتصه إليه رغبتي، ولم يخطر ببالي ولم يبلغـه أملـي، ولم يجر علـى لـساني مـن الـيقين الـذي أعطيتـه أحداًمن المخلـوقين الأولـين والمهـاجرين والأخـرين الإخصتني ياأرحم الراحمين))، حـسن دەڵـێ: وریـا بوومـەوە فەرموودەکـەم لەبـەرکرد و ئەموتەوەو ئەوەندەی پێنەچوو کەوتمە بیری معاویـەوە ووتـی: ئـەم سـاڵ بۆنـەهات، بۆیـە دووسـەد هـەزار درهـەمی بۆنـاردم[4] لەڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە کەئـەو پاڕانـەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخەودا حسن فێر کرد ئەمەیـە(ﷺ): ((اللـهم اقـذف مـن قلـبي رجاك، واقطع رجائي عمن سواك حتى لا أرجو أحداً غيرك اللهم ومـا ضعفت عنـه قـوتي

---

١ ـ تاريخ الطبري (٦/٨٠)، المدينة في العصر الأموي، لا ٨٤ شراب.

٢ ـ المدينة في العصر الأموي، شراب، لا ٦٢.

٣ ـ سير اعلام النبلاء(٣/٢٦٩).

٤ ـ تاريخ دمشق(١٤/٨).

وقصر عنه عملي، ولم تنته غليه رغبتي، ولم تبلغه مسالتي ولم يجر على لساني مما أعطيت أحداً من الأولين والآخرين من اليقين فخصني به يارب العالمين)) دەڵێ: سوێند بەخوا هەفتەیەکی پێنەچوو لەوتنی ئەوپاڕانەیەوەدا تامعاویە هەزار هەزار و پێنج سەد هەزاری بۆناردم، منیش ووتم: سوپاس بۆ خوا کە یادی لەبیر ناکرێ و لەهاوارپێکردنی یدا بێ ئومێدمان ناکات، لەخەودا پێغەمبەر(ﷺ)م بینی فەرمووی ئەی حسن چۆنی؟ ووتم: باشم ئەی پێغەمبەری خواو بۆم گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: ئابەوشێوەیە کوڕی شیرینم هەرکەس داوا لە خوای بکات داوا لەدروستکراوەکانی نەکات خوای گەورە دوعای قەبوڵ دەکات)).[1]

## ٢. سەردانی معاویە بۆلای حسن و حسین و عبداللە کوڕی زوبیر (رضي الله عنهم):

معاویە فەرمانی سەد هەزار بدەن بە حسن بۆی برد، بە کەسانەی دەورەوبەری ووت: هەرکەسێ ئەیەوێ با بیبات و فرمانی دا سەد هەزار بۆ حسین کوڕی علی، دووسەد هەزاریش بە عبداللە کوڕی جعفردا[2] معاویە هەرکات بەحەسەنی کوڕی علی بگەیشتایە دەیگوت: سڵاو و ڕێز ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەر بەعبداللە کوڕی زوبەیریش بگەیشتایەدەیگوت: سڵاوت لێ بێت ئەی کوڕی پوری پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فرمانی سێ سەد هەزار بەحسن و سەد هەزاری بە عبداللە کوڕی زوبەیر دا[3]، هەندێ ڕیوایەتیش بە (سندێکی حسن)هاتووە بەوەی معاویە هەمیشە پەیوەندی بە حسینەوە هەبووەو بۆ جێ بەجێ کردنی داواو پێداویستیەکانی زو جێ بەجێی دەکرد[4]، شیعەکانیش خۆشیان دانیان ناوە بەبەخشینی معاویە بەحسن و حسین و عبداللە کوڕی جعفر[5]، وادەر دەکەوێ پەیوەندیەکانی حسین بە معاویە باش بووە و پەیوەندیەکانی نێوان هەردوولا ڕێزو گەورەیی بووە هەروەها دوای دەرچونی حەسن وحسین لەکوفەو نیشتەجێبونیان لەمەدینەدا خەڵکی

---

١ ـ هەمان سەرچاوە(١٤/ ٨).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٦٢/ ١٣٣).

٣ ـ هەمان سەرچاوە.(١٣٣/٦٢)

٤ ـ مصنف إبن أبي شيبة(١١/ ٩٤)، بسند حسن، موافق المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية، لا١٧٧.

٥ ـ بڕوانە: (جلاء العيون)ی المجلسي، لا ٣٧٦، و. الكافي في الفروع كتاب: الحقيقة باب الأسماء. والكنى (٦/ ١٩) الأمالي للطوسي(٢٢/ ٣٣٤)، شرح إبن أبي الحديد(٢ ـ ٨٢٣) وقد فصل الدكتور محمد الشيباني في كتابة موافق المعارضة في خلافة يزيد حول الحسين، لا ١٧٧.

کوفە پەیوەندیان بەحسن و حسین نە پچڕا، بەڵکو پەیوەندیان بەردەوام بوو لەڕێگەی ئەو نامانەوە کە خەڵکی دەیاننارد، لەوەدەچێ نامەکان داوای بەر هەڵستکاری دەسەڵاتیان لێ کردبێ، مافی خیلافەتیان بۆ دووبارەکردبێتەوە و پەژارەیی خۆیان بۆنیشانداوە، ئەو نوسراوانەکاری نەکردۆتە سەر حسن بەڵکو سروشتێکی ڕونی پێداوە بەرامبەر شیعەی کوفە بەوەی خراپ وئاشوبەچین و یەکدەنگی و یەکبونی ئوممەتیان ناوێ[1] لە ڕێزبەندی لاپەرە هاتووە دەڵێ: حسن کۆمەڵە لاپەڕەیەکی بۆ هێنراو ووتی: ئەی جاریە شتەکەم بۆ بهێنەو لاپەرەکانی خستۆتە ناو ئاوەو هیچی لێنەخوێندوە و تەماشاشی نەکرد، ووتم: ئەی باوکی محمد ئەم نامانە هی کێیە؟ ووتی خەڵکی عێراق خەڵکانێکن بۆلای ڕاستی ناگەڕێنەوەو لە پوچەڵی دوور ناکەونەوەو دەست هەڵناگرن، بەڵام ناترسم من لەخشتە بەرن، بەڵام دەترسم حسین لەخشتە بەرن[2]، کاتێ حەسەنی کوڕی علی کۆچی دوایی کرد شیعە لەماڵی سلیمان بن صرد کۆبونەوەو نامەی پرسەیان بۆ حسین نارد وتیایدا نوسیبویان: خوای گەورە تۆی گەورە دروستکردووە لەوەی ڕابردوو، ئێمەش ئەولایەنگرەیەن(شیعە) کەبەکۆستەکەت کۆستمان کەوتووە، بەخەفەتیشت خەفەتبارین، بەخۆشیت خۆشحاڵین و چاوەڕێ ی فەرمانتین[3] حوسەینیش وەڵامی دانەوە، داوا دەکەم خوا ڕەحم بەبراکەم بکات، لەشوێنێ خۆتاندا دانیشن و هەوا و ئارەزوو بکوژێنەوە تاوەکو إبن هیند زیندووە، گەر شتێکی لێ ڕوویدا و منیش زیندووبم ئەوە پشت بەخوا دێمە پاڵ بۆ چونتان[4] بێگومان لەدوای حسن پایەی حسین لەلای موسڵمان گومان هەڵناگرێ، هەستێکی بەهێز هەبوو، بەوەی دوای کۆچی معاویە تاکە پاڵێوراو بۆ خیلافەت حسین کوڕی علی بووە (ﷺ) گەورەیانی حیجازو کوفە سەردانیان دەکرد گومانیان نەبوو لەوەی دوای معاویە دەبێتە خەلیفە.[5]

---

١ ـ موافق المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية، لا ١٧٨.

٢ ـالمعرفة والتاريخ(٢/ ٧٥٦) بإسناد حسن، معجم الطبراني وقال المعجم(٦/ ٢٤٣) ورحاله الصحيح غير عبد الله بن محكم بن أبي زياد وهو ثقة.

٣ ـ أنساب الآشراف (٣/ ١٥٢)، بإسناد جمعي، الأخبار الطوال، لا ٢٢١، ٢٢٢.

٤ ـ هەمان سەرچاوە(٣/ ١٥٢)، موافق المعارضة، لا ١٧٩.

٥ ـ هتمان سترضاوة(٣/ ١٥٢) بإسناد جمعي، نقلاً عن مواقف المعارضة في خلافة يزيد، لا ١٧٩.

هەواڵی خەڵکی کوفە کورت نەبویەوە سەر حسین، بەڵکو داوایان لە محمدی إبن الحنفیە کرد کەسەردانی کردبوون ووریابوو لەمەترسی خەڵکی کوفە بەسەر خۆی و بنەماڵەی کوڕی ئەبو تالبەوە(ﷺ) بۆیە حسین وریا دەکردەوە کە بکەوێتە دوایان و قسەکانیان بەڕاست بزانێ، وەك بەحوسەینی ووتووە: ئەمانە دەیانەوێ نانمان لێ بخۆن و خوێنمان بڕێژن.[1]

بێگومان نامەکانی نێوان حسین و خەڵکی کوفە مەترسی بەنی ئومەیە لەمەدینە وروژاندو نامەیان بۆ معاویە نووسی و لەکاری حسین دا ڕاوێژیان پێ دەکرد: ئەویش بۆیانی نووسی کەهیچ کات بەرهەڵستکاری نەکەن[2]، ناشبێ ئەو نامانە ئەو پەیوەندیە توندو تۆڵانەی کە حسین و خەڵکی کوفەی پێکەوە بەستۆتەوەبەلای معاویەوە شاراوەبێ، بۆیە معاویە بۆ حسین نوسی: کە لەخوا بترسێ و ڕێزی موسڵمانا پەرت نەکات و لەکاروباری موسڵماندا خوای بیر هێنایەوە[3]، بێگومان حسن و حسین(ﷺ) دڵسۆزی پەیمانەکەیان بوون بە معاویە و حسین ڕەئیان وابوو کەبە یعەتەکەیان پەیوەستە بەژیانی حسن و معاویە.

### ٣. ئایە تاونبارکردنی معاویە بەزەهرپێدانی حسن کوڕی علی (ﷺ) ڕاستە؟

هەندێ لەڕیوایەتەکان باس لەوەدەکەن کەحسن بەوژەهر مردوە کەبۆی دانرا بوو، پەنجەی تاوانیش ئاراستەی ژنەکەی حسن کراوە کە جعدی کچی ئەشعەسی قەیسی ئەمیری کیندە بوو، أم موسی سربەی علی جەعدە تاوانبار ئەکات بەوەی ژەهری بەحسن داوە، سەری ئێشاوەو تەشتە ئاوێکی بۆ چل ڕۆژ خراوەتەوە ژێر[4]، ئەم ڕیوایەتە ئینسادەکەی لاوازە[5]، هەندێ ڕاوی و مێژوو نوسیش هەوڵیانداوە کە پەیوەندی بەنێوان بەیعەتدان بەیەزیدو وەفاتی حەسەنەوە هەبێ، وایانداناوە کەیەزیدی کوڕی معاویە نامەی بۆ جەعدی کچی قەیس ناردووە، ژەهر بەحسن بدات و دوای خۆی مارەی بکات ئەویش ژەهری

---

١ ـ الطبقات إبن سعد(١٥/ ٣٥٦).

٢ ـ أنساب الأشراف(٣/ ١٥٢) موافق المعارضة، لا١٧٩.

٣ ـ أنساب الأشراف(٣/ ١٥٢) موافق المعارضة، لا ١٨٠.

٤ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/٣٣٨)إسناده ضعيف.

٥ ـ هقمان سقرضاوة(١/٣٣٨).

پێداوە، کاتێکیش حسن مرد هەواڵی بۆ یەزید نارد کە بەرامبەر پەیمانەکەی بەوەفا بێت، ئەویش دەڵێ: سوێند بەخوا ئێمە لەوەدا ڕەزامەندیمان نەکرد ئیستا بۆ خۆمان لەپەیمانی تۆ دڵنیا بین[1]، لەسەنەدەکەشدا یەزیدی کوڕی عەیاز هاتووە، إبن جەعدیە کەمالیك و کەسانێکی تر بە درۆزنیان داناوە[2]، ئەو گێڕانەوەیەش بەبێ پوختکردنەوە لەکتێبەکانی ئەهلی سونەدا هاتووە، بۆ زانیارش ئیسنادەکانی ئەو گێڕانەوە لاوازە.[3]

زانا موحەقیقەکانیش لەو بارەیەوە قسەیان ووتویانە:

أ ـ إبن العربی دەڵێ: گەر ووتراوە ژەهر بەحسن دراوەو پێ گەیشتون ئەوە لەدووڕووە دەڵێین مەحاڵە. یەکەمیان: کەی لەحسن ترساوەو لەکاتێکدا کاروباری دەسەڵاتی وازلێ هێنابوو. دووەم: کارێکی شاراوەو نیە تەنیا خوا دەزانێ، ئاخۆ چۆن لەزەمەنێکی دوورەوە دەیخەنە پاڵ بەندەیەکی خواوە و متمانەش بەکەسی ڕاوی ناکرێ کەلەنێوان کۆمەڵێکی ئارەزوو بازو لەدۆخێکی ئاشوبەوە و دەمارگیردا بووە، هەمووکەس ئەودەخاتە پاڵ دوژمنەکەی، بۆیە تەنیا گوێ بۆ ڕاستی ڕاستی ڕادەگیرێ[4]

ب ـ إبن تیمیە دەڵێ: ئەوەی دەڵێ: معاویە ژەهری بەحسن داوە، ئەوەیە کە هەندێ خەڵکی باسیان کردووە، ئەو بەبەڵگەیەکی شەرعی یان بڕیارێکی ئیعتیبار کراو ناسەلمێ، ئەوەیە زانیاری لەسەر نیە، بۆیە قسە لەسەرکردنی بێ زانیاریە.[5] لە إبن تەیمیە هاتووە بۆ ڕەتدانەوەی تۆمەتبارکردنی معاویە بەکوشتنی حسن لەلایەن معاویەوە بەژەهر پێدان بەوەی فرمانی بە ئەشعەسی کوڕی قەیس داوە بۆئەوەی ئەو تاوانە ئەنجام بدات، چونکە کچەکەی خێزانی حسن بووە، ئەوەش بەڵگەی ڕەخنەی زانستی بەهێزی إبن تەیمیەیە بۆ ڕیوایەتە مێژووییەکان دەڵێ: گەر ووتراوە معاویە فرمانی بە ئەشعەسی باوکی جەعدە داوە، حسن ژەهر خواردو بکات ئەوەتەنیا گومانێکی ڕووتە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: (إیاکم والظن، فإن الظن أکذب الحدیث....)، واتە (ووریایی گومان بن،

---

١ ـ تهذیب الکمال (٦/ ٤٥٣) لە سەندەکەش یەزیدی کوڕی عەیاز هاتووە و مالیك بەدرۆزنی داناوە.

٢ ـ تهذیب التهذیب، لا ٦٠٤

٣ ـ مرویات خلافة معاویة في تاریخ الطبري، لا ٣٩٣٣.

٤ ـ العواصم من القواصم، لا(٢٢٠، ٢٢١).

٥ ـ منهاج السنة النبویة (٤/٤٦٩).

چونکە گومان درۆترین شتە)، پاشان ئەشعەسی کوڕی قەیس ساڵی چل یان کە وتراوە چل ویەك کۆچی دوای کردوە، بۆیە لەو ئاشتەوابییەدا باسی نەهاتووە کە لەنێوان معاویەو حەسەنی کوڕی علی لەو ساڵەدا ئەنجامدرا کە بەساڵی (عام الجماعة) ناسراو ساڵی چل ویەك بوو، ئەشعەس خەزوری حەسەنی کوڕی علی بوو، گەر تائەو کاتە لەژیاندا بوایە ئەوە باسێکی لەوەدا دەبوو، ئاخۆ ئەو پێش حسن بەدە ساڵ مرد بێ چۆن فرمانی بە کچەکەی کردووە کەئەو کارە ئەنجام بدات.[1]

ج- الذهبی ئەڵێ: ووتم: ئەمە ڕاست نیە وکێ بینویەتی[2]

ح- إبن کثیر دەڵێ: هەندێکیان ڕیوایەت دەکەن کەیەزیدی کوڕی معاویە نوێنەری نارده لای جەعدەی کچی ئەشعەس حسن ژەهرخواردی بکات، خۆی مارەی بکات، ئەویش کارەکەی ئەنجام دا، حسن مردوو نامەی بۆ یەزید ناردووبۆ ئەوەی پەیمانی جێ بەجێ بکات، ئەویش دەڵێ: ئێمە بەکوشتنی حسن ڕازیبون بەکوشتنی خۆمان نارەخسێنین و بۆ کوشتنی حسن ڕازی بوم، ئاخۆ بۆ خۆم ڕازی دەبم؟ ئەمە بەلامەوە ڕاست نیەکەیەزید کردبێت، بۆ معاویەی باوکی ئەولاترە ڕاست نەبێت.

ث- إبن خلدون دەڵێ: ئەوەی ڕیواتکراوە کە معاویە لەڕێگەی خێزانەکەیەوە جەعدەی کچی ئەشعەس حسن کوشتبێ قسەی شیعەیەو دورە لە معاویە ئیشی وای کردبێت.[3]

ج ـ دکتۆر جمیل المصری لە بارەی ئەم باسە دەڵێ: پاشان باسی دەرمان خواردکردنی حسن لەلایەن معاویەوە یان یەزیدەوە گەورە بوە.پێدەچێت گەورەکردنی ئەوباسە ئەوکاتە بڵاو نەبووبێ، چونکەلەباسی هەستانی حسن شوێنەواری نابینین، یا لەلایەن حسین بۆ معاویە هیچ سەر زەنشتەك نابینین.[4]

---

١ ـ المنتقی من منهاج الاعتدال، لا ٢٦٦.

٢ ـ تأریخ الاسلام، عهد معاویة، لا ٤٠.

٣ ـ تاریخ إبن خلدون (٥٢٧/٢).

٤ ـ *أثر أهل کتاب في الفتن والحروب الأهلیة*، لا ٤٨٢ *مرویات خلافة معاویة*، لا ٣٩٥.

(دکتۆر خالد الغیث)یش لەکتێبەکەی (مرویات معاویة فی تاریخ الطبري) لایەنی پزیشکی لەگێڕانەوەکاندا گفتوگۆدەکات کە، ئینو سعد بەئیسنادی خۆی تەخریجی کردووە: کەحسن چووەتە ئاودەستەکەی خۆی پاشان دەرچوو فەرمووی......سوێند بەخوا پارچەیەك لەجەرگم کەوت بەدارێك ئاودیو ئەودیوم کرد، چەند جار ژەهر خواردکراوم هیچ جارێك وەك ئەم جارە نەبووە [1]، إبن سعد بەئیسنادی خۆی تەخریجی کردووە، کە حسن(ﷺ) دەڵێ: زیاتر لەجارێك ژەهر خواردکراوم وەك ئەم جارە ژەهر خوارد نەکراوم و جگەرم دەتوێتەوە [2]، هەروەها إبن سعد بەئیسنادی خۆی تەخریجی کردووە، دەڵێ: حەسەنی کوڕی علی چەند جارێ: ژەهر خوارد کراوەو لیێ ی ڕزگار بوو، تا ئەوەجاری کۆتایی کۆچی دوایی پێ کردووەو بەردەوام چۆوە حەمام ئاودەست لەپاشەوە جگەری تواوەتەوە [3]، ئەم دەقانەش پەیوەستە بەلایەنی پزیشکی ئەم باسەوە هەیە خستمە بەردەم أ.د.کمال الدین حسین الطاهر وئەویش وای وەڵام دایەوە: نەخۆش لەهیچ خوێن بەبەربونێك ئازاری نەدیووە، تاوەکو هیچ مادەیەکی کیمیاوی پێ بدرێت کە بتوانێ خوێنەکە ببەستێت و لەتوانەوە بیپارێزیت، ڕوونیشەکە هەندێ مادە کیمیاوییەکان و ژەهرە دەگەیننە خوێن بەربوون، چونکە توانای وەستانی جگەری هەیە خوێن ببەستێ، یان ئەو بەرگریانەی توانای پرۆسەی هەیە، چونکە خواردنی ئەومادانە دەبێتە هۆی خوێن بەربوونی هەندێ ئەندامەکانی جەستەوەکو: چاوو دەم و لوت و گەدەو خوێن لەپاشەوە بەربێت، لەشێوەی تۆپەڵێشدا دەرناکەوێ، بۆیە دوورە نەخۆش مادەیەك لەومادە کیمیاو ژەهرەی پێدرابێت کەتوانای ڕودانی خوێن بەربونیان هەیە. [4]

لە بارەی سروشتی ئەوپارچەخوێنەی ڕیوایەتەکان ئاماژەی بۆ دەکەن بەوەی پارچەجەرگەك بووە، دکتۆرکمال الدین حسین الطاهر دەڵێ: جۆری شێرپەنجە یان وەرمی گەدە هەیە، جێگیریان یان گوازراوە لەڕێگەی ڕیخۆڵەکانەوە کەدەبێتە هۆی خوێن بەربونی

---

١ ـ الطبقات تحقیق السلمي(١/ ٣٣٥) إسناده ضعیف.

٢ ـ هەمان سەرچاوە (١/ ٣٣٨) إسناده ضعیف.

٣ ـ الطبقات، تحقیق السلمي(١/ ٣٣٩) غسناده ضعیف.

٤ ـ مرویات خلافة معاویة، لا ٣٩٦.

بەستوو تێکەڵ بە شانەکان و ناوەوەی گەدە بەشێوەیەی پارچە دەردەچن یان پارچەی جەرگ وەك لەگێڕانەوەکان هاتووە بۆیە بەلامەوە وەهایە کە نەخۆشیەکە جۆرێ بووە لە شێرپەنجە یان ئاوساوی ڕیخۆڵەکان بووە.[1]

ئەم شیکاریە پزیشکیەش لەبارەی ڕیواتە لاوازەکان هاتووە و پاشان ملکەچ بوون بۆ ئەوئەنجامەی کە پێ گەیشتوە سەختە، سەبارەت بەژەهر خواردنی حسن(ﷺ) ئەوە ڕەتیی ناکەینەوە، چونکە گەر سەلما ژەهر خواردکرابێ ئەوە شایەتیەکی گەورییەکە بۆ خۆی[2]، بەڵام تاوانبارکردنی معاویەو کوڕەکەی ئەوە لەڕووی سەنەد بەڕاست نازانرێ، ئاخۆ جەعدەی کچی ئەشعەسی کوڕی قەیس پێویستی بەگەورەیی وسەروەت هەبووە- وەکو ڕیوایەتەکان باس دەکەن- کەبۆ بەجێهێنانی ئارەزووی زەید لە جێ بەجێکردنی ئەو پیلانەدا و ببێتە خێزانی، کێ یش کچی ئەمیری هۆزی کیندە ئەشعەسی کوڕی قەیس، پاشان ئایا مێردەکەی حەسەنی کوڕی علی نیە کەبەڕێزترین خەڵکیەو لەوەشدا ئێچەوانە نیە، چونکە حسن دایکی فاتیمەیەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) باپیریەتی کەشانازی پێ کردنیشی بەسە، باوکیشی علی کوڕی ئەبو تاڵیبە یەکێك لە دەکەسە موژدە پێ دراوەکانی بەهەشت و چوارەمین خەلیفەی ڕاشیدینە، کەواتە ئەو شتە چیە جەعدە هەوڵی بۆدەدات، تاوەکو ئەو کارە ترسناکە جێ بەجێ بکات[3]، زۆرێك هەن لەوانەی دوژمنی یەکبونی ئیسلامن ورق ئەستور بوون بەرامبەر ئەوەی حەسەنی کوڕی علی پێ ی هەستا، قەناعەتی بەهێزیان هەبوو بەوەی زیندوو بونی حسن سەرچاوەی ئاسابشی ئوممەتە، پاشان بۆ ئەوەی ڕووداوەکان پەشێو بێ و ئاشوبە وەك جاران بگەڕێتەوە ئەو پێویستە لەناو ببرێت، بۆیە لە بۆ چونی مندا تاوانبار سەبەئیەکانن، شوێنکەوتەکانی عبداللە کوڕی سەبەئن، ئەوانە بوون حسن گورزێکی بەهێزی لێدان کاتێ دەستبەرداری خیلافەت بوو بۆ معاویە و بۆململانێ یەسنورێکی دنا، پاشان ئەوخەواریجانەی ئەمیری ئیمانداران علی

---

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا ٣٩٧.

٢ ـ منهاج السنة (٤/ ٤٢).

٣ ـ موافق المعارضة في خلافة يزيد بن معاوية، لا ١٢٣.

کوڕی ئەبو تاڵیبیان شەهید کرد، خەنجەریان لە لە ڕانی دا پێدەچێت ویستبان تۆڵەسەندنەوەی کوژراوەکانی نەهرەوان و ئەوانی تر کرد بکەونەو.[١]

## ٤ـ خەو بینیی حسن و نزیکبونەوەی مردنی:

عمرانی کوڕی عبدالله کوڕی تەلحە ووتی : حەسەنی کوڕی علی خەوی بینی لەنێوان هەردووچاویدا نوسرا بوو((قل هو الله أحد)) و موژدەی بەکەس وکارەکەی دا، ئەوانیش بۆ سەعیدی کوڕی موسەیبیان گێڕایەوە، ئەویش ووتی: گەر وەها بێ ئەوە مردنی زۆری نەماوە، تەنها چەند ڕۆژێکی تر ژیا.[٢]

## ٥ـ ڕۆژگارەکانی کۆتایی ژیانی حسن:

لە ماوەی ژیانی لە مەدینەدا چەند جارێ ژەهرخواردکرا، جاری کۆتایی پزیشک هاتەلای ووتی: ژەهر ڕیخۆڵەکانی بڕیوە[٣]، عومەیری کوڕی ئیسحاق دەڵێ: من و قوڕەیشیەك چوینە لای حەسەنی کوڕی علی، ئەچوە ئاودەست و دەهاتەوە ووتی: پارچەیەك لەجەرگم توایەوە بەو دارە وەرم گێراوە، چەند جارێك ژەهر خواردکراوم هیچ جارەك وەك ئەم جارە سەخت نەبووە، بەو پیاوەی ئەوت: لێم بپرسە پێش ئەوەی لێم نەپرسی، ئەویش ووتی چیت لێ بپرسم خوا شیفات بدات، ئینجا ڕۆیشتین بەیانی کە هاتینەوە سەیرمان کرد لەسەر مەگدا بوو، حسین هاتە لای سەری دانیشت ووتی: براکەم کێ دوژمنتە؟ ووتی: ئەتەوێ بیکوژی؟ووتی:بەڵێ، ووتی: گەر دوژمنەکەم ئەوە بێ کە گومانم لێیەتی ئەوەنەهامەتیەکی سەختە بۆم گەر ئەو نەبێ، حەزناکەم لەبەرمن بێتاوانێك بکوژی.[٤]

١ ـ هەمان سەرچاوە، لا ١٢٤.

٢ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٣٤) إسناه منقطع عمران لم يدرك الحسن. (عيمران حةستنى نتبينيبو)

٣ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٩٧، ٩٨.

٤ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٣٥) إسناده ضعيف.

أ ـ وەسیەتی حسن بۆ حسین(رضي الله عنه):

إبن عبدالبر دەڵێ: لەچەند کەسێکەوە بۆمان گێڕدراوەتەوە حسن کوڕی علی کاتێ گەیشتە سەرەمەرگ بەحسین برای ووت: براکەم باوکمان ڕەحمەتی خوای لێ بێت کاتێ پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد، داوای ڕاپەڕندنی ئەو کاروبارەی لێ کر ئەویش داوای کرد لێ ی لادەن خواش لێ دوورخستەوە، أبوبکر بەڕێوەی برد، کە أبو بکر گەیشتە سەرەمەرگ ویستی بۆ هەبوو، بەڵام خوا بەعمری دا، ئەویش کە گەیشت سەرەمەرگ کردی بەشورا لەنێوان شەش کەس ئەویش یەکێکیان بوو، لەوەشدا بۆ عثمان بوو گومانیشی نەبوو، کەعثمان کوژرا بەیعەت بەودرا، پاشان ململانێ ڕویدا و شمشێری هەڵکێشرا، هیچ شتێ لەوانە سوودی بۆ نەبوو، سوێند بەخوا خوای گەورە لەئێمەی ئەهلی بەیتدا پێغەمبەرایەتی و خیلافەت کۆنا کاتەوە، زۆر دەترسم نەفامەکانی کوفە هەڵت بخەڵەتێنن بەتخەنە ناوکێشەوە[1]، إبن عبدالبر لەو ڕیوایەتەدا ئیسنادەکانی باسنەکردووە، بەڵام لەمەتنەکەیدا شتێ هەیە، هەروەك دژبەوەیە، کە علی (رضي الله عنه) خیلافەتی بەشیاوی أبوبکر و عمر زانیوە لەکتێبەکانم ئەوم لەبارەی أبو بکر و عمرەوە(رضي الله عنه) ڕونکردۆتەوە.

ب ـ بیرکردنەوەی حسن لەمەلەکوتی ئاسمانەکان و لێپرسینەوەی خوای گەورە:

کەحەسەنی کوڕی علی گەیشتە سەرە مەرگ ووتی: بمهێنە بمبەنە حەوشە تابڕوانمە ئاسمان، بۆیە جێگەکەیان بردە دەرەوەو ڕوانی وئینجا ووتی: خوایە گیان لێپرسینەوەی خۆم لای تۆدەکەم کە خۆشەویسترین شتێکە لامەوە، ئەم هەڵوێستەگەورەو دیمەنە ترسناکەیە، ڕووکردنی حسن ڕوەو خوایەتەنیا دانانی خوا لەگەورەیی وکبیریادا دەردەکەوێ، لەودەربڕینانەوە واتای ملکەچی و کزۆڵی بۆخوای گەورە دەردەکەوێ، لەگەڵ تەواوی ئومێد و پەیوەستبوونی دڵ خوای تاك و تونها، چونکە نابێ دڵمان بەجگە لەخواوەپەیوەست بێ، هەروەها ئەوکەدونیا بەجێ دەهێڵێ پەرستنی بیرکردنەوەی بیرناچێ لە مەلەکوتی

---

١ ـ الأستيعاب (١/ ٣٩١).

ئاسمانەکان وبونەوەرە جۆربەجۆرەکان: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ واتە (بەڕاستی لەدروستکردنی ئاسمانەکان وزەوی وجیاوازی شەوو ڕۆژ بەڵگەی زۆر هەیە بۆ خاوەن ژیریەکان)[ آل عمران: ١٩٠] . پاشان ڕوانیە خۆی کەدوای پێغەمبەری خوا پیرۆزترین دەرونە لای خۆی لای خوای گەورە دیاری کردوە: ﴿ وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُونَ ﴾[ الذريات: ٢١] بێگومان ڕامان و بیرکردنەوە لەگەردون و دەروون و ئایەتە بینراوەکانی خوای گەورە پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ باوەڕهێنان، چونکە ئەوشتانەی تێدا دەبینرێت کە بەڵگەی گەورەی خوایە، کەجوانی ورێکی ئەو فەرمانانەی تێدایە خاوەن عەقڵەکان دەستەوستان دەکات، بەڵگەی فراوانی زانستی خواو وگشتگیری حیکمەتەکانیەتی، ئەو سودو نیعمەتە زۆرانەی تێدایە ناژمێردرێت و بەڵگەی فراوانی سۆزو بەخشندەیی خوایە، گشت ئەوانە داوای گەورەیی ڕاگرتنی داهێنەرو دروستکاری خۆیان دەکەن بۆ دڵسۆزی ئاینی خوای گەورە، ئەوش گیانی باوەڕو نهێنیەکەیەتی[1]، گەر بڕوانینە دروستکراوەکانی خوا ئەوەدەبینین لەهەموو ڕوەکانەوە پێویستی بەپەروەردگارێتی و بەچاوتروکانیکیش بێ خوا ناکرێ، بەتایبەت لەدەرونی خۆتدا بەڵگەی هەژاری و ئەوپەڕی ناچاری دەبینی، هەموو ئەوانەش بەندە ناچار دەکات بۆ پاڕانەو کڕوزانەوە بۆ خوا دەکات: بەوە سوودی ئاین و دونیایی دێنێتەدی و ئەوەی زیانی دونیاو و ئاینی هەیە لەلایاندەدات و ئەوپەڕی پشت بەستنە خواو وتەواوی متمانە یە بەبەڵێن و ڕوانین و بەخشندەیی دەخاتەوە، بەوەش ئیمان دێتەدی و خواپەرستی بەهێز دەبێ، چونکە پاڕانەوە کرۆك پەرستنە[2]، بۆیە حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) باش لەپەرستنی بیرکردنەوە گەیشبوو، لەساتەی لە کۆتاییەکانی کۆتایی ژیانیدا بوو، واتایەکی گەورەو مەزنیشی لە تێگەیشتن وچەمکە گشتیەی پەرستنمانی دەکردوە لێپرسینەوەی خۆی کردووە وساتەکانی خۆی ژماردووە، هاوەڵانیش بەو شێوەیە تێگەیشتبوون، موعاز(ﷺ) کاتێ بە أبوموسای ئەشعەری ووتی: دەخەوی ئەی موعاز؟ ئەویش ووتی: سەرەتای شەو دەخەوم و ئینجا هەڵدەستم کەبەشێکی خەوم کردووە و قورئان دەخوێننم و خەوەکەم دەژمێرم چۆن هەست

---

١ ـ شجرة الإيمان للسعدي، لا ٤٩، الوسطية في القران الكريم للصلابي، لا ٢٣٩.

٢ ـ التوضيع والبيان لشجرة الإيمان، لا ٥١، الواسطية للصلابي، لا ٢٣٩.

ناکەم ژماردووەمە[1]، بۆیە خواردن و جوتبونیش گەر موسڵمان لای خوا حیسابی بۆ بکات، ئەوەپاداشتی لای خوا گەرورە هەیە، حەسەنی کوڕی علی حیسابی خۆی لای خوا دەکات وبەپەرستنی بیرکدنەوە و بیرکدنەوە لە نەهامەتیەکان خوا حافیزی لەدونیا دەکات، ڕەزای خوای لێبێت ئەم فەرمایشتەی خوای دەگوتەوە: ﴿قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾ [الأنعام: ١٦٢، ١٦٣].

ج. براکەم من، من دەڕۆمە فرمانێك لەفرمانەکانی خواوە و هیچ کات بۆی نەچووم و دروستکراوێکی خواش دەبینم کەهیچ کات نەم بینوە:[2]

أبو نەعیم دەڵێ[3]: کاتێ حەسەنی کوری علی ئازاری زۆربوو پیاوێك هاتەلای و پێ ی ووت: ئەی باوکی محمد و ئەم ئازارە چیە؟ من وای دەبینم ڕۆحت جەستەت بەجێ دەهێڵێ وبرۆی بۆلای علی باوکت و فاتیمەی دایکت و پێغەمبەری باپیرت(ﷺ) و خدیجەی داپیرت ومامەکانت حەمزەو جعفرو و خالۆکانت قاسم و طیب و إبراهیم و پورەکانت ڕوقیەو و (أم کلثوم)و زەینەب، وترا پێ خۆشحاڵ بوو[4]، لەڕیوایەتێکیشدا هاتووە ئەوکەسەی وەای گوتوە، حسن پێ ی ووتوە: براکەم: من ڕووەو فرمانێکی خوا ڕێگا دەبرم هیچ کات بەفرمانی وا نەڕۆیشتوم و دروستکراوێکی خوا دەبینم کە هیچ کات دروستکراوێکی وام نەبینوە، ووتی: حسین (ﷺ) گریا[5]، لەڕیوایەتێکیشدا: براکەم من ڕوەو کارێکی گەورەو پەژارەیی ڕێگەدەگرم کەهیچ کات ئەو ڕێگەیەم نەبریوە[6]، گەشتی مرۆڤی گێڕاوەتەوە لەوکاتەی ڕۆحی دەردەچێ تاوەکو بەهەشتیان لە بەهەشتدا و دۆزەخیانیش لە دۆزەخدا دەگێرێتەوە، بۆیە سەلەف لەپاشەڕۆژی خراپ دەترسان، هیچ کەسیان نەیاندەزانی بەچ کارێ کۆتایی دێت، چونکە کاروکردەوەکان بەکۆتاییەکانە، ئیماندارانیش لەهەموو جوڵەو

---

١ ـ البخاري، كتاب: المغازي، رقم: ٤٣٤٢.

٢ ـ البداية والنهاية(١١/ ٢١٠).

٣ ـ الفضل بن دكين.

٤ ـ البداية والنهاية(١١/ ٢١٠).

٥ ـ تاريخ دمشق(١٤/ ١٠٩).

٦ ـ تهذيب الكمال(٦/ ٢٥٦)، سكب العبرات(١/ ١٤٦).

هەنگاوەێکدا لەئەنجام و پاشەڕۆژی خراپ دەترسن، ئەوانەن کەخوای پەروەردگار وەسفیانی کردووە:﴿ قَدْ كَانَتْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ تَنْكِصُونَ﴾[ المؤمنون: ٦٦] لەسەرمەرگ و ڕۆح کێشان و پاشەڕۆژ زانین دەترسان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (اللهم هون على سكرات الموت) ((خوایەگیان ڕۆح کێشانم لەسەر سووك بكە))[١]، لەگەڵ ترسان لەسەرەمەرگدا فریشتەی سەرەمەرگ لەوێنەی فریشتەی گیان کێشان دێت و ترس و بیم دەکەوتە دڵان .[٢]

قورتوبی دەڵێ: بینینی فریشتەلەکاتی سەرەمەرگ ئەو ترس و بیمەی دەکەوێتە دڵەوە، کارێکە لەگەورەیی و ناخۆشی و سەخت بینی دەرنابڕێت، هیچ کەسێکیش ئەو حەقیقەتە نازانێ ئەو کەسە نەبێ کەدەگاتە سەرە مەرگ و دەیبینێ.[٣]

لەگەڵ ئەو ترسەی کەلە سەرەمەرگ و وێنەی فریشتەکەدا دەبینێ، چونکە ئەوکارە مەترسی دارە، کەترسی زیاترمان بۆدەخاتەسەرئەوە، دەرکەوتنی ئەنجامی تاقی کردنەوەی دونیایە لەو کاتەدا ئاخۆ ئێمە لەوانە بین کە فریشتان پێیان دەڵێن: ﴿أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ﴾[ فصلت: ٣٠] (مەترسن وخەفەت مەخۆن ومـوژدەی ئەوبەهەشتەتان بۆ هەیە لەدونیادا بەڵێنتان پێدراوە) یان لەوانەین....؟ ﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ [الانفال:٥٠ ]پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: هەرکەسێ حەزی بەلیقای خوا بێت خواش حەزی بەلیقایەتی، هەرکەسێکیش ڕقی لە لیقایەتی خوا بێ، خواش حەزی بەلیقای نیە)) عائیشەش ووتی: ئێمە حەزمان بەمردن نیە، فەرمووی: ((ئەوەنیە، بەڵکو ئیماندار کاتێ بەمەرگ ئەگات بەڕەزامەندی خوا موژدە ئەدرێ و هیچ شتێکی بەلاوە خۆشەویست نیە لەوەی لەپێشدایە وەکو لیقای خوا و خواش حەزی بەلیقای ئەوە، بێباوەڕیش کە بە مردن ئەگات بەسزا و تۆڵەی خوا موژدەی پێ دەدرێ و هیچ شتێکی بەلاوە ناخۆشترنیە

---

١ ـ الترمذي، كتاب: الجنائز، رقم: ٩٧٨.

٢ ـ الإيمان أولا، لا ٩٤.

٣ ـ التذكرة: (١/ ١١٣).

وەکو ئەوەی لەپێشدایە، بۆیە حەزی بەلیقای خوا نیە و خواش حەزی بەلیقای ئەوناکات.[1]

لەأبو هوریرەوە(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی: ((کەڕوحی بەندەی باوەڕدار دەردەچێ دووفریشتە دێن وبەرەو ئاسمان ئەیبەن و بۆ نەخۆشەکەی بڵاو دەبێتەوە و فریشتەی ئاسمانیش ئەڵێن: بۆنێکی پاك لەزەویەوە دێت سەلامی خوات لەسەر بێ و لەلاشەیەی بەخێوت کرد، ڕۆحەکەئەبەنەلای خوای و پاشان خوا دەڵێ: ئەم ڕۆحەببەنە شوێنی خۆی و تاکاتی خۆی دێت، بیباوەڕیش کەڕۆحی دەردەچێ بۆنێکی بۆ گەنی لێ بڵاودەبێتەوە فریشتەی ئاسمانەکانیش ئەڵێن: ڕۆحێکی پیس و بۆگەن لەلایەن زەویەوە هات، ئەوتریێ: بیبەن بۆ شوینی خۆی و تاکاتی خۆی دێت[2] گوڕیش گوشێنەری هەیە و کەسی لێ ڕزگار نابێ)).

هەروەکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((گۆرگوشینی هەیە گەر کەسێکی لێ ڕزگار بووایە ئەوە سعدی کوڕی موعاز أبوو))[3] گۆڕیش هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: یان چاڵێکە لەدۆزەخ یان باخچەیەکە لەبەهەشت[4] لەپیشمانیشداحەشر و هاتنی قیامەتە، پەروەردگاریش ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾[ الحج: ١] هەموولەسەرەتاوە تاکۆتای قیامەت کۆتایی بەسەردادێنێت[5]: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ ذَلِكَ يَوْمٌ مَجْمُوعٌ لَهُ النَّاسُ وَذَلِكَ يَوْمٌ مَشْهُودٌ﴾ [هود: ١٠٣]، قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خواش لەبارەی ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت دواون: ﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا (٢١) وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا (٢٢) وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنْسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى (٢٣) يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ

---

١ ـ البخاري، رقم: ٦٥٠٧.

٢ ـ صحيح مسلم، صحيح الجامع، رقم: ٥٠٤.

٣ ـ مسند أحمد (٦/ ٥٥) رجاله رجل الصحيح.

٤ ـ سنن الترمذي، رقم: ٢٥٧٨ حديث غريب.

٥ ـ الإيمان اولاً فكيف تبدأ به، لا ٩٦.

لِحَيَاتِي﴾ [الفجر: ٢١ـ ٢٤] پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: جەهەنم ئەهێنرێ و حەفتا هەزار جڵەوی هەیە و هەرجڵەوێکی حەفتاهەزار فریشتە گرتوویەتی و ڕایئەکیشن.[١]

ئاخۆ چی دیمەنێکی ترسناکی هەیە دڵان پێ ی ڕادەچەڵەکێن[٢]، بۆیە حەسەنی کوڕی علی ووتی (ﷺ)( العار خير من النار)[٣] ترسا لەدەرونە پاکەکەی خۆی لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات، پێغەمبەریش(ﷺ)فەرموویەتی (أول ما يقضي بين الناس يوم القيامة في الدماء) واتە:((یەکەمین شتێك لەڕۆژی قیامەتدا خەلکی لێپرسینەوەی لەسەر بکرێت خوێنە)).[٤]

یەکێك لەدیمەنە ترسناکەکانی قیامەتیش فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((لەڕۆژی قیامەتدا کوژرا و بکوژ دەهێنێت ونێو چاوانی بەدەستەوەیەتی و لەهەموولاکانیەوە خوێن دەچۆڕێ و دەڵێ: پەروەردگار لەمەبپرسە کەبۆچی منی کوشت؟ تاوەکو لەعەرش نزیکی ئەکاتەوە))[٥] بەڵێ ئازارو نارەحەتیەکانی بەڕێوەیە، گەر گەورەی گەنجانی بەهەشت بترسێ لەوەی ڕووەو فرمانێکی خوا دەڕوات قەت بۆی نەچووە، ئاخۆ من و تۆی خوێنەری بەڕێز، پێویستە پەند و وەربگرین و بۆ ئەو شوێنەی ترسناکە کاربکەین و داوا بکەین خوای گەورە بەرەحم و لێبوردنی خۆی لێمان ببورێ، هەر خۆشی بەڕێزو نەرم ونیان و بەسۆزە.

## ٦. ناشتنی لە بەقیعدا:

کاتێ حەسەنی کوڕی علی گەیشتە سەرەمەرگ بەحسین ووت: ئەوە لای باوکم ـ واتە پێغەمبەر (ﷺ) بمنێژن، گەر لەخوێن ڕشتنێ نەترسان، گەر ترسان ئەوە لەبەر من خوێن مەرێژن، لەگۆرستانی موسڵمانان بمنێژن، کە گیانی دەرچوو حسین خۆی پڕ چەك کردو لایەنگرانی کۆکردەوە، بۆیە أبوهورەیرە پێ ی ووت: لەبەرخوا داوات لێ دەکەم وسیەتی براکەت بپارێزە ئەو کۆمەڵە تەنیا خوێنیان دەوێ، چونکە مەڕوانی کوڕی حەکەم

---

١ ـ مسلم، كتاب (صفة النار)، صحيح الجامع، رقم: ٨٠٠١.

٢ ـ الرحلة إلى الدار الآخرة، لا ٣٩٠.

٣ ـ البداية والنهاية(١٢/ ٢٠٤).

٤ ـ أخرجه البخاري، ومسلم وأحمد عن مسعود، صحيح الجامع، رقم: ٢٥٧٧.

٥ ـ رواه الترمذي والنسائيوابن ماجه وصحيحه الألباني في صحيح الجامع، رقم: ٨٠٣١.

نەیهێشت لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بنێژرێ، ووتی بەهیچ جۆرێ لێرە نانێژرێ، أبوهورەیرەو جابری کوڕی عبداللە و إبن عمر و عبدالله کوڕی جعفر و مسور إبن فرمەو ئەوانیتر زۆریان هەوڵدا تاپاشگەزبێتەوەو لە (بقیع) نێژرا لای زەهرای دایکی.[1]

لە ڕیوایەتە لاوازەکانیش باسی ناشتنی حەسەنی کوڕی عەلیدا(رضي الله عنه) تێکەڵەیان کردووە، خاوەن هەواو ئارەزووەکانیش ئەو بوارەیان شێواندو پیلانیان دۆزیوەتەوە، هەندێکیان وایان داناوە کە عائیشە ڕەتی کردۆتەوە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و أبوبكر و عمر بنێژرێ دەڵێ: نابێ ببنە چوارکەس و ئەمە لەماڵی منە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەژیانیدا پێمی بەخشیوە، ئەمەش ناسەلمێ و ئیسنادەکەشی نادیارە[2]، إبن تیمیه ئەوەی سەلماندوە عائیشە(رضي الله عنها) ڕێگەی داوە لەماڵی دا بنێژرێ، بەڵام خەڵکانێکی تر قبوڵیان نەکردووە، چونکە عثمان (رضي الله عنه) تێیدا نەنێژراوە بۆیە نابێ کەسی تری تێدا بنێژرێ و خەریك بوو ئاشوب هەڵگیرسێ[3]، ئەوەی لەکتێبەکانی مێژوو دەوترێتەوە بەوەی ئەبانی کوڕی عثمانی کوڕی عەفان دەڵێ: ئەمە سەیرترین ئیشە کوڕی بکوژی عثمان لەگەڵ پێغەمبەری خواو(ﷺ) أبوبکرو عمردا بنێژرێ، ئەمیری ئیمانداری شەهیدی ستەم لێکراویش لە(بقع الغرقد)نێژرابێ[4]، هەندێ ڕیوایەتیش هەیە باس لەناڕازیبونی مەروانی کوڕی حەکەم دەکەن لەناشتنی حسن لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بەڵام ئیسنادەکانیان لاوازە، دکتۆر محمد صامل السلمی لە لێکۆڵینەوەی کتێبی(الطبقات) باسیکردووە[5]، بەڵام گێڕانەوەی ڕاست لەمەدا بریتی یە لەوەی کە أبو حازم گێڕاویەتەوەو دەڵێ: کەحسن کەوتە سەرەمەرگ بەحسین ووت: لای باوکم ـ واتە پێغەمبەری خوا(ﷺ)بمنێژن ـ گەر لەخوێن ڕشتن نەترسان، گەر لەخوێن ڕشتن ترسان ئەوە لە پێناوی مندا خوێن مەڕێژن و لەگۆرستانی موسڵمانان بمنێژن. کە مرد حسین شمشێری هەڵگرت و لایەنگرەکانی

---

١ ـ الدوحة النبوية الشريفة، لا ٩٨.

٢ ـ سيرة أعلام النبلاء(٣/٢٧٦).

٣ ـ الفتاوى(٢٧/ ٢٢٢).

٤ ـ الغرقد: گۆرستانی خەڵکی مەدینەیە (الطبقات)، تحقي السلمي(١/٣٥٥) إسناده ضعيف جداً.

٥ ـ هەمان سەرچاوە(١/ ٣٥٥).

کۆکردەوە، بۆیە أبوهورەیرە ووتی: بۆ خاتری خوا وەسیەتی براکەت بپارێزە، چونکە ئەم نەتەوە ناهێڵن لەنێوانتاندا خوێن برێژرێ، هەر بەردەوام بوون لەگەڵیدا تا پاشگەزبۆوە و پاشان لەبەقیعدا نێژرا، أبوهورەیرەش ووتی: نابینن کە کوڕەکەی موسا هێنرا تاوەکو لەگەڵ باوکیدا بنێژرێ و ڕێگیرکرا ئاخۆ ستەمیان لێکردووە؟ ووتیان بەڵێ، ووتی: ئەمەش کوڕی پێغەمبەری خوایە و هێنراوە تاوەکو لەتەنیشت باوکی بنێژرێ[1]، سەعیدی کوڕی عاص نوێژی لەسەر حەسەنی کوڕی علی کردوو گریا، ئەو نەخۆشیەش کەهۆیەوەکۆچی دوای کرد چل ڕۆژبوو [2]،حسین کوڕی علی داوای لەسعیدی کوڕی عاص کرد لەسەرحسن نوێژبکات، چونکە سعید والی مەدینە بوو لەلایەن معاویەوەو لەئاشوبەکەوە دوری گرت و لەگەڵ معاویەشدا جەنگەی نەکرد، بۆ عثمانی کوڕی عەفانیش والی کوفەی بوو و فەرزدەقیش لەبارەوەو دەڵێ:

ترى الغُر الجحاجح[3] من قريش إذا ما الأمرذو الحدثان عالا

قياماً ينظرون إلى سعيـــــد كأنهم يرون بـــــــه هلال[4]

سعیدی کوڕی عاس بەهۆی زمان پاراویەکەی وشێوازی قسەکردی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) عثمانی کوڕی عوفان کردیە نوسەری کۆکەروەی قورئان. [5]

أبوهورەیرە لەمزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وەستا بوو دەگریاو بە دەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی خەڵکی ئەمڕۆ خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی دوای کردوو ئێوەش بگرین [6]، خەڵکیش بۆ تەرمەکەی کۆبونەوە وای لێهات بقیع لەقەرەباڵغیدا جێ ی کەسێکی تر نەدەبۆوە[7]، گەر دەرزی فڕێ بدرایە دەکەوتە سەر خەڵکی[8]، حسن (رضي الله عنه)

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (١/ ٣٤٠)إسناده صحيح.

٢ ـ المستدرك على الصحيحين(٣/ ١٩٠).

٣ ـ گەورەیەکی بەخشندە و لێبوردە.

٤ ـ سير أعلام النبلاء(٣/ ٤٤٥).

٥ ـ هەمان سەرچاوە(٣/ ٤٤٨ ـ ٤٤٩).

٦ ـ البداية والنهاية(١٢/ ٢١١)، الدوحة النبوية الشريفة، لا ٩٨.

٧ ـ البداية والنهاية(١٢/ ٢١١).

٨ ـ الطبقات، تحقيق السلمي(١/ ٣٥١) إسناده ضعيف.

نەرم ونیان و خۆبەکەمگرو بەڕێزبوو، دونیا بەکەمگرتنەکەی هانی دەدا بۆ وازهێنان لە دەسەڵات و دونیا و حەزکردن لەبەخشین و ڕەزامەندی خوا، زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێ: ئەم پێشەوایە سەیدو و کەشخەو جوان و ژیرو بەخشندەو سوپاسکرا و ئاین پەروەرو بەڕێز بوو[1]، بۆیە سۆزو بەزەیی و لێخۆشبونی خوا بۆئەم سەیدە پایەبەرزو و خوای گەورە ئەو لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهید و چاکەکاراند کۆمان بکاتەوە.

بۆیە ژیاننامەی پەندە بۆکەسێ پەندوەربگرێ وبەرچاوڕونیشە بۆ کەسێ عیبرەت وەرگرێ، ڕەحمەتی خوا لەمحمد ئیقبال بێ، کەدەڵێ:

| | |
|---|---|
| في روض فاطمة نما غضـــان لم | ينجبها في النِّيرات سواهـــا |
| فأمير قافلة الجهاد وقـــطب دا | ئرة الوئام والاتحاد إبناهـــا |
| حسن الذي صان الجماعة بعدما | أمسى تفرقها يحلُّ عُراهـــا |
| ترك الإمامة ثم أصبح في الديا | إمام ألغتها وحسنُ علاها[2] |

## ٧. لێکۆڵینەوە لەساڵی مردنی و تەمەنی:

مردنی حەسەنی کوڕی علی بەپێ ی زۆربەی بۆ چونەکان ساڵی چل و نۆی کۆچی بووە[3]، ووتراویشە ساڵی پەنجا بووە[4]، ووتراویشە ساڵی پەنجاویەك بووە[5]، دکتۆر (خالد الغیث) یش ئەوەی بەڕاست داناوە کە کۆچی دوایی حەسەنی کوڕی علی لەساڵی ٥١ ی کۆچیدا بووە[6] ئەوەش وتەی بوخاریە[7] ومنیش هەمان بۆ چونم هەیەو (جعفر بن صادق)یش ووتویەتی: حسن چل وحەوت ساڵ ژیاوە[8] لەوەدا زەهەبی تەعلیقی داوە کە بەهەڵە تێکەڵی کردووە ئەوکەسەی لەجعفرەوە گواستویەتیەوە تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵ

---

١ ـ سير أعلام النبلاء(٣/٢٥٣).

٢ ـ تاريخ الخلفة، لا ٢٠، أنساب الأشراف(٣/ ٦٤)، تهذيب الكمال(٦/ ٢٥٦).

٣ ـ الأنباء بأنباء وتواريخ الخلفاء، فتح الباري(٧/ ١٢٠).

٤ ـ مرويات خلافة معاوية في تاريخ الطبري، لا ٤٠٢.

٥ ـ هەمان سەرچاوە.

٦ ـ سير أعلام النبلاء(٣/٢٧٩).

٧ ـ هەمان سەرچاوە(٣/ ٢٧٧).

٨ ـ هەمان سەرچاوە.

بووە [1]، دکتۆر خالد الغیث دەڵێ: لەتەمەنی چل و هەشتساڵیدا کۆچی دوایی کردووە [2] بەوتەی إبن عبدالبر دەڵێ: کەلەدایکبونی حسن لەنیوەی مانگی ڕەمەزانی ساڵی سێ ی کۆچی بووە، ئەوە تەواوترین بۆ چونە کەلەوەدا وتراوە [3]، لەوەشدا إبن حەجەر بڕیویەتیەوە [4]، بەوەش تەمەنی حسن لەکاتی مردنیدا چل و هەشت ساڵ بووە و لەساڵی ٥١ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە، والله أعلم. [5]

بەو جۆرە حەسەنی کوڕی علی (ﷺ) بەشەهیدی وبەدەستی غەدر وخیانەت لەدونیا دەرچوو، دوای ئەوەی کارگەلێکی پیرۆزو پرۆژەیەکی چاکسازی دەگمەنی پێشکەشکرد، کە بووە هۆی یارمەتیدەری یەکبونی ئوممەت و گەڕاندنەوەی ڕۆڵە شارستانیەتیەکەی بوو لەبڵاو کردنەوەی ئاینی خوا، ئومەتی ئیسلامیش بەقەرزارداری ئەم سەیدەگەورە و پایەبەرزە دەمێنێتەوە، کە ئالای یەکبونی و برایەتی و پاراستنی خوێن و چاکسازی لەنێوان خەڵکی و جیهاد و پیرۆزیەکەی و ئارامگریەجوانەکەی دەمێنێتەوەو نمونەگەلێکن بۆ ئەو کەسانەی بەدرێژایی سەردەمەکان بەپێشەوای خۆیانی دەزانن، هەڵویستە بڵندو بەرزڕاگرتنی بەسەر خۆڵ و خاشاکی دونیاو مێژوو بۆی پاراستوینە شەوگارەکانیش لەبیریان نەکردووەو و لەمپەرەکانی زەمەن و سەردەمەکانیش لەئێمەیان دانەبڕیووە.

بەوجۆرە لە ٢١ سەفەری ١٤٢٥ ك بەرامبەر ١١/ ٤/ ٢٠٠٤ زاینی کاتژمێر نۆو چل و پێنج دەقیقەی شەو لەم کتێبە بومەوە.

لەکۆتایشیدا فەزڵ و پیرۆزی بۆ خوایەو داواکارم خوای گەورە ئەم کارە سادەیەم لێ وەربگرێت و دڵی بەندەکانی بۆ سوود لێ وەرگرتنی فراوان بکات و بەمنەتی خۆی بەرەکەتداری بکات، پەروەردگاریش دەفەرموێ:﴿ مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[فاطر:٢].

---

١ ـ هەمان سەرچاوە.

٢ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٤٠٢.

٣ ـ الاستيعاب(١/ ٣٨٤).

٤ ـ الإصابة(٢/ ٦٨).

٥ ـ مرويات خلافة معاوية، لا ٤٠٢.

لەکۆتایی ئەم کتێبەشدا ئەوەم بۆ مایەوە بەدڵێکی پڕپاوەڕەوە لەخوا بپاڕێمەوە و دان بەنازو نیعمەت و فەزڵ و بەخشندەییدا بنێم و داوای دەکەم بەناو و سیفەتەجوانەکانی خۆی ئەم کارەم بەدڵسۆزی و لەبەرڕەزامەندی خۆی و سودی بۆ بەندەکانی هەبێت و هەر پیتێك نوسیبم پاداشتم بکات و بیخاتە سەر تەرازووی چاکەکانم و پاداشتی ئەو برایانەشم بدات کەهاوکاریانن کردووم.

لە هەموو مسوڵمانێکی خوێنەری ئەم کتێبەشم داوایە کە ئەم کتێبەی بەندەی هەژاری بە بارەگایی ڕەحمەتی خواو لەدوعای چاك بێ بەشم نەکەن: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾{النمل: ١٩}.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك، وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

بەندەی هەژاری بەربارەگایی ڕەحمەتی خوای پەروەردگار

علي محمد محمد الصَّلاَّبي

١٨ ذي الحجة ١٤٢٤كۆچی

# ناوەڕۆك